www.alibapir.com

ئیمـــان و ئیلحـــاد

نووسینی: عەلی باپیـــر

مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر

چاپی دووەم ٢٠٢٠ز- ١٤٤١ك



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوكردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەكردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
ئیمـــان و ئیلحـــاد ،
عەلـــی باپـیـــر (نووسەر)،
٥٥٥ لاپـــەڕە ،
١٧* ٢٤ سـم ،
بابـەت ، ئـــایینی
تیراژ ، ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان - هەرێمی كوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧٢٤ ) ی ساڵی ٢٠١٨ز پێدراوە.

ISBN: 978-9922-620-23-7

"بیروبۆچونی ئەم كتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خـەتی بـەرگ : نـــەوزاد كۆیـــی**

**دیزاینی ناوەوە : زەردەشت كاوانی**

www.alibapir.com

دره‌وشاوه‌یی پوچه‌ڵیی

# ئیمان و ئیلحاد

له‌به‌ر تیشکی زگماك و عه‌قڵ و زانست و وه‌حیی دا

به‌رگی 1

نووسینی
عه‌لی باپیر

www.alibapir.com



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُۤ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكۡرِمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ (١٨) ﴾ الحج.

له تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي

AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir

کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

AliBapir
Google Play
App Store

www.alibapir.net
English - عربي - کوردی

ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر




لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## پێشەکی چاپی دووەم

الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام والبركات على النبي الخاتم محمد المبعوث رحمة للعالمين، وآله أجمعين من الصّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسانٍ إلى يوم الدين.

**خوێنەری بەڕێز و خۆشەویست :**

بۆ جاری دووەم چاپکرانەوەی ئەم مەوسوعەیە لەم ماوە کەمەدا، بەڵگەو نیشانەی تامەزرۆیی و تاسەی خوێنەرانی کورد بەگشتی و، بەتایبەت چینی گەنج و لاوە بۆ چاکتر و زیاتر ناسینی خوای بەرزو مەزن و بێ وێنە و، بەرپەچدانەوە و هەڵوەشاندنەوەی قسە و تۆمەت و گومانی نەیارانی: خواناسیی و دینداریی.

کە بێگومان هەرئەوەش شتێکی سروشتیی و چاوەڕوانکراوە، چونکە بەڕاستی مرۆڤ بەبێ خواناسیی و ئیمان لە ژیانی دنیای دا، وەك بابایەکی هەڵوەداو بزربووی نێو دەشت و بیابانێکی چۆڵ و هۆڵ و کاکی بەکاکییە!

هیواداریشم ئەم بەرهەمەی بەندە سەرجەم ئەو ئامانجانەی بۆیان بەرهەم هێنراوە، بە هەر سێ شێوەی: ڤیدیۆیی، ڕادیۆیی، نووسین، بەباشترین شێوە بهێنێتەدی.

شایانی باسیشە ئەم مەوسوعەیە، لەم چاپی دووەمی دا، کت و مت وەك چاپی یەکەمیەتی، تەنیا دوو گۆڕانکاریی تێدا کراون:

**یەکەم:** ڕاست کردنەوەی هەڵە چاپییەکانی - کە کەم نەبوون - وێڕایی چاککردنی چەند هەڵەیەکی کەم لە هەندێك برگەو تەعبیردا.



**دووەم:** کردنی بە دوو بەرگ، کە بەرگی یەکەمیان دوو بەشی {یەکەم و دووەم} و بەرگی دووەمیش سێ بەشی {سێیەم و چوارەم و پێنجەم}ی گرتوونەتە خۆی.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، والسلام على المرسلين
والحمدلله رب العالمين

٣ صفر ١٤٤١ ك
٢٠١٩/١٠/٢ ز
هـــــــــــەولێر

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## سەرگوزشتەی ئەم مەوسووعەیە

بەڕێــــزان!

دوای ئەوەی کەوتمە بیرو خولیای بەرپەرچدانەوەی ئەو شەپۆلە ئیلحادییەی ڕووی کردۆتە زۆرێك لە وڵاتانی مسوڵماننشین و، لە نێویشیاندا عێراق و کوردستان، سەرەتا "وەك عادەتی خۆم" کەوتمە موتاڵاو لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەو شەپۆلە تازەیەی ئیلحادو خواناسییەوە:

١- تایبەتمەندییەکانی.
٢- بنەما فیکرییەکانی.
٣- کارەکتەرو ئاڵابەدەستە سەرەکییەکانی.
٤- ئامانجی.
٥- ئامرازو شێوازەکانی.

ئیدی ئەوەبوو کەماوەی چوار پێنج مانگێك، بە چڕو پڕیی کەوتمە سەر خوێندنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو کتێب و بەرهەمانەی، پێشڕەو و دەمڕاستانی ئەو شەپۆلە ئیلحادییە خستوویاننە ڕوو، بەتایبەت:

١)- ریشارد داوکینز (Richard Dawkins).
٢)- ستیفن هۆکینگ (Stephen Hawking).
٣)- کریستوفر هیتشنز (Christopher Hitchens).
٤)- سام هارس (Sam Harris).
٥)- دانیل دینت (Daniel Dennett).
٦)- ڤیکتور ستنگر (Victor Stenger).





**٧)- ئەنتۆنی فلۆ (Anthonio Flow)[١].**

هەروەها کۆمەڵێکی دیکەی زۆریش لەکتێب و بەرهەمی فیکریی و زانستیی پەیوەست بەو بابەتەوە، کە لەکۆتایی ئەم مەوسووعەیەدا وەك سەرچاوە، ناوەکانیان نووسراون.

پاشان لەسەرەتای مانگی ڕەمەزانی ڕابردووەوە (١٤٣٩ك) کەوتمە تێفکرین و لە تەتەڵەو بێژینگدانی بیروڕاو قسەو ئیددیعایەکانی ئاڵاهەڵگرانی بیرۆکەی ئیلحادی تازەو، هەڵسەنگاندنی و ڕەخنە لێگرتنی، هەتا سەرەنجام کەرەستەی خاوی ئەم مەوسووعەیەم ئامادەکردو، دواتر لە پەنجا (٥٠) ئاڵقەی چل - چل و پێنج (٤٠ - ٤٥) دەقەییدا، پەنجا وتارمان تۆمار کرد، تاکو بەهەرسێك شێوەی:

أ- ڤیدۆیی ب- دەنگیی ج- نووسین

سوودی لێ وەربگیرێ و، لە پانتاییەکی فراواندا بکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

دەبێ ئەوەش بڵێم کە:

ئەم بەرهەمە پاش ڕاوێژو ئیستیخارە و هەبوونی دڵخۆشکەر (مبشِّرة)ێکی هاندەر هاتۆتەدی و، هیوادارم خوای میهرەبانی خاوەن پێز، فەرو پێزێکی چاکی تێبخات و، ئەو ئامانجانەی بۆیان ڕەخسێنراوە، بەباشترین شێوە بیانهێنێتەدی.

لێرەوەش پڕ بە دڵ سوپاس و دەستخۆشیی خۆم لە هەموو ئەو بەڕێز و دڵسۆزانە دەکەم، کە بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان هاوکارو دەستبارگری بەپەرۆش و خۆبەخشم بوون، بۆ هێنانەدی ئەم بەرهەمە:

١- چ ئەوانەی کتێب و سەرچاوەکانیان بۆ دابین کردووم.

٢- چ ئەوانەی وتارەکانیان بەشێوەی دەنگیی و ڤیدیۆیی ئامادەکردوون و بڵاویان کردوونەوە[٢].

٣- چ ئەوانەی وتارەکانیان تایپ کردوون و، هێناویاننە سەر کاغەزو، بەوردیی چەند جارێك هەڵەچنیان کردوون.

---

(١) ئەنتۆنی فلۆ، دواتر وازی لە ئیلحاد هێناوەو کتێبێکیشی لەبارەی پشتگیریی خواناسیی و بەرپەرچدانەوەی ئیلحادەوە نووسی بە ناوونیشانی: (خوا هەیە)، (There is a God).

(٢) بۆ بینینی سەرجەم ئاڵقەکان لە کەناڵی تایبەتی خۆم لە یوتیوب سەردانی ئەم لینکە بکە:
https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwun_elM0xXR18ky2DLArszy

www.alibapir.com







٤- چ ئەوانەی بەسەرنج و پێشنیاری دڵسۆزانەیان هاوکارم بوون...

خوای بەخشەرو بەخشندە بەباشترین پاداشت پاداشتیان بداتەوەو، تای تەرازووی چاکەکانیان قورس و گران بکات.

**لە کۆتاییشدا دەڵێم:**

١- بێگومان ئەم بەرهەمە گەلێك باس و خواسی جۆراو جۆری گرتوونە خۆی، لە بواری بەرگریی لێکردنی خواناسیی و ئیمان و خوا بەیەکگرتن و، پووچەڵکردنەوە و بەرپەرچدانەوەی ئیلحادو کوفرو بێ دینییداو، ئاساییە کە هەمووکەس لەهەموو باس و خواسەکانی تێنەگات و، بەئاسانیی بۆی فام نەکرێن، بەڵام پێموایە بەگشتیی خوێنەران "بەتایبەت چینی گەنج" لێی بەهرەمەند دەبن، هەرکەسە لەقەدەر خۆی و، بێگومانیش دووبارەو سێبارە خوێندنەوەو سەرنجدانی بابەتێکیش، کاری لێتێگەیشتن و فام کردنی ئاسان دەکات.

٢- هەوڵمداوە هیچ قسەیەکی هیچکەس نەهێنم، مەگەر ئاماژە بەسەرچاوەکەی بکەم[1]، جگە لەو زانیاریی و بیرۆکانەی بوونەتە موڵکی گشتیی و، خەڵك تێیاندا هاوبەشە.

بێگومانیش گێڕانەوەی هەر قسەو بیرۆکەیەك بۆ خاوەنەکەی پاراستنی ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەیخوازێ.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

٢٨/ ربیع الأول/١٤٤٠ك
٢٠١٩/١/٤ز
هـــــــــــــــــەولێر

---

(١) بە نسبەت ناوی کتێب و سەرچاوەکان و، ناوی نووسەرەکانیان و، سەرجەم ئەو کەسایەتییانەوە، کە لەم بەرهەمەدا ناویان هاتوە، بەزۆریی وەك لەو سەرچاوەیەدا کە سوودم لێ بینیون، دەیاننووسم و، جاری واش دەبێ لە سەرچاوەیەکەوە بۆ یەکی دیکە، یان لە زمانێکەوە بۆ یەکی دیکە، لە ناوو ناوونیشانەکاندا جیاوازیی دەبێ.

www.alibapir.com





# پێشەكیی و ڕێخۆشكردن

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد:

فَإِنّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله، وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحمَّد صَلَّى اللَّه عَليهِ وَسلَم، وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلَّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلَّ ضَلالةٍ في النّار.

www.alibapir.com





بەڕێـــزان!

لە ئەنجامی ئەوەدا کە خواناسیی (مَعْرِفَةُ الله) ڕاستییەکی ڕۆچوو و ڕیشە داکوتراوە لە زگماك (فِطرة)ی مرۆڤداو، هەموو مرۆڤێك لە ناخیەوە، شەیداو عەودالّی خوای پەروەردگاری خۆیەتی و، بۆی تینوویەو، هەست بە ئاتاجیی و پێویستیی دەکات بۆی، وەك پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

{مَا مِنْ مَوْلُودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟}[١].

واتە: هەموو منداڵێك لەسەر خوارِسکی خواناسیی (زگماکی خواناسیی) لە دایك دەبێ، بەڵام دوایی باب و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەصرانیی، یان دەیکەنە مەجووسیی، هەروەك چۆن بەچکەی ئاژەڵ کە لە دایك دەبێ تێر و تەواوە، ئایا هیچی دەبینن گوێی بڕابێ {نوقصانییەکی هەبێ}؟.

هەروەها خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الروم)دا دەفەرموێ:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

واتە: ڕووی خۆت ڕاست ڕابگرە بەرانبەر بە دین و بەرنامەی تێر و تەواو، بە ڕێك و ڕاستیی، ئەو خوارِسك و زگماکەی خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، دەستکاریی کردن و گۆڕان نیە بۆ دروستکراوی خوا، ئا ئەوە دینداریی و ئاییینی ڕێك و ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

---

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيّ برقم: ١٢٩٢، وَمُسْلِم: برقم: ٦٩٢٦، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة.





**ئێستاش با ئەم (پێشەکیی و ڕێخۆشکردنە) بۆ دوازدە (١٢) بڕگە دابەش بکەین:**

(١)- ئەم ئایەتە ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم، لێی وەردەگیرێ، کە ئەوەی دین و وەحیی خوا (سبحانه وتعالى) دەیفەرموێ، لەگەڵ ئەو حاڵەتەدا کە مرۆڤی لەسەر سروشتێنراوە و خوڵقێنراوە، وەك دوو ڕووی دراوێك وان، دوو ڕووی حەقیقەتێکن، ئەوەی کە شەریعەت دەیفەرموێ، لەگەڵ ئەوەی کە لە فیطرەت و زگماکی مرۆڤدا هەیە، وەك یەکن، واتە: فیطرەت و زگماکی ئینسان، پشتگیریی ئەوە دەکات کە خوا لە ئایین و شەریعەتەکەیدا فەرموویەتی.

(٢)- ئنجا لە ئەنجامی ئەوەشدا کە عەقڵی سەلیمی هەر مرۆڤێك کە عەقڵەکەی تێك نەچووبێ و، لاینەدابێ و، کارتێکەرێکی دەرەکیی نەیگۆڕی بێ و، لە ڕەوت و ڕێبازی ئاسایی خۆی لای نەدابێ، چەند یاسایەکی ڕوون و بەڵگە نەویستی تێدان، کە زانایانی لۆژیك (منطق) پێیان دەڵێن: (المبادیء الأولیة) پڕەنسیپە یەکەمەکان، هەروەها پێیان دەڵێن: (البَدِيهِيَاتُ العَقْلِيَّة) بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان، ئەو یاسا عەقڵییانە، مرۆڤ ناچار دەکەن، کە پەیدا بوونی خۆی و، دەوروبەری و، گەردوون، پاڵ بداتە لای بەدیهێنەرێك و، خاوەن و پەروەردگارێك، بۆ وێنە:

یەکێك لەو یاسا عەقڵییانە: یاسای هۆکاریی (قانون السببيّة)یە، کە دەڵێ: {هەموو پەیدابوویێك پەیداکەرێکی هەیە}.

هەروەها یەکی دیکەیان: یاسای ڕێك و پێکیی (قانون النظام)ە، کە دەڵێ: {هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە}.

ئەوانە دوو یاسای عەقڵیین، لە شوانێکەوە بگرە هەتاکو پڕۆفیسۆرێك و، لە منداڵێکی گچکەوە بگرە، تاکو هەرکەسێك چەند شارەزا و زانابێ، مەحکوومی

ئەو دوو یاسایەیە، هەروەها کۆمەڵێك یاسای دیکەش هەن، کە خوا پشتیوان بێ لە شوێنی خۆیدا پێیان دەگەین.

کەواتە: وەك چۆن فیطرەت و زگماکی مرۆڤ، مرۆڤ ناچار دەکات بەرەو خوا بچێ، عەقڵی سەلیمیش، دیسان پاڵ بە ئینسانەوە دەنێ کە بەرەو خوا بچێ و، خوای خاوەن و پەروەردگاری خۆی بناسێ.

**(٣)**- دیسان لە ئەنجامی ئەوەشدا کە لەوەتەی مرۆڤ لەسەر زەوی دەژی و، خوا مرۆڤی لەسەر زەوی داناوە، خوای کارزان و میهرەبان، پەیتا پەیتا بە پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) پەیام و بەرنامەی خۆی بۆ ڕەوان کردوون و، وەك چۆن خوا (سبحانه وتعالى) هەموو دروستکراوەکانی خستۆتە سەر سیستم و ڕێیەك، بە پێی وی بەڕێوە بچن، بەڵام بە شێوەیەکی جەبریی، مرۆڤیشی خستۆتە سەر بەرنامەو ڕێیەك، کە پێی بەڕێوەبچێ، بەڵام بەشێوەیەکی خۆویستیی (إختياري)، بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ:

﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾.

واتە: ئایا (بەرنامەیەکی دیکە) جگە لە ئایین و بەرنامەی خوا دەخوازن، لە حاڵێکدا کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، چار و ناچار بۆ خوا ملکەچە و، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە؟!

واتە: ئەی مرۆڤ! تۆش لەگەڵ کاروانی گەردووندا هاوئاوازبە و ڕیزپەڕ مەبە، لا مەدە، وەك چۆن گەردوون هەمووی بە پێی ئەو سیستم و بەرنامەیەی کە خوا بۆی داناوە، بەڕێوە دەچێ، بەڵام بە شێوەیەکی ئیجباریی و بێ ئەوەی خواست و ویستی ئازادی هەبێ، تۆش بە خواست و ویستی ئازادانەی خۆت، بە پێی ئەو شەریعەت و بەرنامەیە بەڕێوەبچۆ، کە خوا بە پێغەمبەراندا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، بۆی ناردووی.





بەڵگەش لەسەر ئەوە کە هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، خوا پێغەمبەرێکی بۆ نەنێرێ، ئەوەیە کە لە سوورەتی (الفاطر)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، مەگەر هۆشیارکەرەوەیەك، (ترسێنەرێك)ی تێدا نێردراوە.

کە مەبەست پێی پێغەمبەرانە (عليهم الصلاة والسلام).

کەواتە: وەحییش دیسان پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ کە خواناس بێ و، ڕوو لە پەروەردگاری خۆی بکات و، بەندایەتیی بۆ بکات.

(٤) ئنجا لە ئەنجامی ئەم سێ هۆکارەدا، واتە: ١- داخوازیی زگماك، ٢- داخوازیی عەقڵی سەلیم، ٣- داخوازیی وەحیی، هەر لە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە، زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤان بە شێوەیەك لە شێوەکان، خوا و بەدیهێنەر و پەروەردگاری خۆیانیان ناسیوەو، بە شێوەیەکی ڕاست، یان هەڵە، جۆرێك لە بەندایەتییشیان بۆ ئەنجامداوە، چ ڕاست، ئەگەر بە پێی وەحیی خوا بووبێ، چ هەڵە، ئەگەر مرۆڤ لای دابێ.

(٥)- بەڵێ، هەمیشە خواناسیی (مَعْرِفَةُ الله) بناغەو بنچینە بووە لە ژیانی بەشەردا، بەڵام خوانەناسیی، لادان (إلحاد) شتێکی ڕیزپەڕو دەگمەن بووە، بەڵام لەبەر کۆمەڵێك هۆکار {وەك لە باسی یەکەمی بەشی سێیەمدا: (سەرگوزەشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ڕۆژئاوادا} دەیخەینەڕوو لە سەدەی شازدەیەمەوە، (شازدەیەمی زایینی) تەوژمی خوانەناسیی (إلحاد) لە ڕۆژئاوادا پەرەی ستاند، وەك دکتۆر (رَمْسِيس عِوَض) لە کتێبەکەی خۆیدا: (الإلحادُ فِي الغرب)[1]، ئاماژە دەکات کە سەرەتای تەشەنە کردنی بیرۆکەی (إلحاد) لە ڕۆژئاوا (یانی: ئەورووپا بە ئەمریکاشەوە) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٥٧٤)ی زایینی، کە لەو ساڵەدا زانایەکی فەڕەنسیی بە ناوی (جیوفری ڤالیا) بە تۆمەتی (إلحاد)

---

(١) ص١٥.

ئیعدام کرا، لەسەر ئەوەی کتێبێکی نووسیبوو، کە ناوونیشانەکەی بە عەرەبی ئاوا تەرجەمە دەکرێتەوە: (ذِرْوَة الصفاءِ الروحي عند المسيحيين) واتە: (چڵەپۆپەی صافیی ڕووح لەلای مەسیحییەکان)، لەسەر ئەو کتێبە کە دوایی کتێبەکەشی قاچاغ کراو سووتێنرا، دادگایی کرا و، لە سێدارە درا، هەرچەندە (ڤالیا) بۆ خۆی زۆر تووڕە بووە لەوە کە تۆمەتی بێبڕوایی (إلحاد)ی پاڵ بدرێتە لا، بۆیە وا پێدەچێ کە هۆکاری ئەصڵیی لە سێدارە درانی (ڤالیا) ئەوە بووبێ، کە ڕەخنەی گرتوە لە ئایینی تێکدراوو شێوێنراوی نەصرانیی، نەك لەبەر ئەوەی کە مولحید بووە، بەو واتایە کە: دان بە بوونی خوادا نەهێنێ.

(٦)- ئیدی لە سەدەی شازدە (١٦)ی زایینییەوە، لەوێوە شەپۆلی خوانەناسیی (إلحاد) وەك دیاردەیەك لە ڕۆژئاوا (لە ئەورووپا) سەری هەڵدا، کە وەك دوایی باسی دەکەین: زیاتر کاردانەوە بوو بۆ هەڵس و کەوتەکانی چینی کەهەنووت، [پیاوانی کڵێسا] کە زۆر توند و تیژ بوون بەرانبەر بە زانایان و، بیرکردنەوەی ئازاد و، زانست و، بەرانبەر بە دۆزینەوەی نهێنییەکانی خوا لە سروشت و گەردووندا، سەرەتا زیاتر کاردانەوە بوو، بەڵام لەوێوە ئیلحاد وەك ڕەوتێك سەری هەڵدا.

(٧)- دوایی لە هەردوو سەدەی هەژدەو نۆزدە (١٨ و ١٩)ی زایینییدا، تەوژمی خوانەناسیی (إلحاد) لە ڕۆژئاوا زیاتر پەرەی ستاند و، لەو دوو سەدەیەشدا، دۆزراوە زانیارییەکان (المُكتشفات العلمية) زۆر پەرەیان ستاندو، خەڵکەکە تووشی جۆرێك لە لەخۆبایی بوون (غرور) و، لە کەوڵی خۆ دەرچوون و بێ نیاز بوون بەرانبەر بە خوا، بە هۆی ئەو تۆزە زانستەوە کە ئەو کاتە وەریانگرتبوو، چونکە: کۆمەڵێك نهێنی سروشتیان کەشف کردن بوون و، کۆمەڵێك یاسای پەروەردگاریان لە گەردووندا دۆزیبوونەوەو، پێیان وابوو کە پێویستییان بە خوا نیە!

لەو لاشەوە: ئەوانەی کە ئایینی عیسا (عليه السلام)یان بەڕێوە دەبرد بە هەڵە، ئەوانەش بێگومان هەڵسوکەوتی وایان هەبوو کە خەڵکیان بە گشتیی و بە تایبەت زانایانیان، زۆر بێزار و پەست و تووڕە کردبوو و، زۆربەی ئەوانەی کە ڕوویان لە خوانەناسیی (إلحاد) دەکرد، لە ڕقی کڵێسا و هەڵس و کەوتی ئەوەی





که پێی دەگوترا: (ئەکلیرۆس) (چینی پیاوانی ئایینی) بوو، که ئێستاش هەندێك خەڵك لە ئیسلامیشدا ئەو وشەیە بەکاردێنێ! بێخەبەر لەوەی کە لە ئیسلامدا چینی پیاوانی ئایین (طبقة رِجال الدين)مان نیە و، لە ئیسلامدا هەموو پیاوان پیاوی دینن، هەروەها هەموو ئافرەتان، ئافرەتی دینن و، خوای پەروەردگار لە هەموو قورئاندا، تەنانەت یەك جاریش ئاماژەی نەکردوە بەوە، کە چینێکی دیاریی کراو هەبن، تەنیا ئەوان مشووری دین بخۆن، بەڵکو هەر دەفەرمویَ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾ النساء: ١، ئەی خەڵکینە!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ البقرة: ١٧٢، ئەی بڕوادارینە!

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ الأعراف: ٢٦، ئەی وەچەی ئادەم!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾ الإنفطار: ٦، ئەی مرۆڤ!

تەنانەت بۆ یەك جاریش خوا لە قورئاندا نەیفەرموە: (یا أیها العلماء)، یان (یا أیها المشایخ)، یان (یا أیها المسؤلون).

بەڵکو ئەو حاڵەتە تایبەت بوو بە ئایینی تێکدراوی کڵێساوە، کە چینێك دروست کرابوو، بە ناوی چینی پیاوانی ئایینی و تەنیا ئەوان بۆیان هەبوو، ئەوەی کە پێیان دەگوت: (الكتاب المُقدَّس) (کتێبی پیرۆز) تەفسیری بکەن، بیخوێننەوە، لێکی بدەنەوە و، لە خەڵکی دیکە قەدەغە بوو! لە حاڵێکدا کە خوا (سبحانه وتعالى) و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی فەرمان دەکەن بە هەموو مرۆڤەکان کە لە قورئان ورد بنەوەو لە ئیسلام تێبگەن، چونکە ئەرکی هەموو لایەکە کە دەبیَ لە ئاییندا شارەزا بن، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویَ: {طَلَبُ العِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ} (أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَه برقم: (٢٢٤)، وَصَحَّحَهُ الألبَاني).

واتە: داوا کردنی زانست لەسەر هەموو مسوڵمانێك پێویستە. ورد بیَ، درشت بیَ، پیاو بیَ، ئافرەت بیَ، گەورە بیَ، یان گچکە بیَ.

www.alibapir.com





(٨)- ئنجا (د. رَمسیس عِوَض) لە کتێبەکەی خۆی: (الإلحَادُ في الغَرْب)دا دەڵێ: زۆربەی هەرە زۆری ئەو کەسانەی لەلایەن کڵێساوە بە زەندەقەو ئیلحاد تۆمەتبار دەکران، خواناس بوون! بەڵام ڕەخنەو گلەییان لە کڵێساو ئایینی نەصرانیی هەبوو، کە بێگومان ئێمەش هەر گلەییمان لێی هەیە، چونکە بێگومان نەصرانییەتی ئێستا، ئەو ئایینە نیە کە خوا بە عیسا دا ناردی، بەڵکو ئەو ئایینەی خوا بە عیسا دا (صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ) ناردی، وەك ئەوەی بە هەموو پێغەمبەراندا ناردوویەتی، کرۆك و جەوهەرەکەی بریتی بووە لە تەنیا خواپەرستیی (التوحید) بەڵام نەصرانییەت بە ڕەسمیی لە کۆبوونەوەی (نیقیة) یە، لە ساڵی (٣٢٥)ی زایینیی دا {واتە: (٣٢٥) ساڵ دوای لە دایك بوونی عیسا (علیه السلام)}، (قُسطنطین) پادشای ڕۆمی ئەو کاتە، ئەوەی تەبەننیی کرد: کە خوا (سبحانه وتعالی) سێیە و، لە سێیان پێك هاتوە (الأب، الإبن، الروحُ القُدُس) (خوا، کوڕ، گیانی پیرۆز)، کە دەڵێن: ئەو سێیە وەك یەکن! کە ئەوەش لادانێکی زۆر زەق و گەورە بوو لە ڕێبازی مەسیح عیسا (علیه السلام)، هەروەها لە ڕێبازی هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) کە هاتوون، تاکو خەڵك تەنیا خوا بپەرستێ، کەچی نەصرانییەت سێ پەرستراویی (ثالوث)ی تەبەننیی کرد، وەك خوای بێ هاوتا لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ... ﴿٧٣﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئەوانەی گوتیان: خوا سێیەمی سێیەکانە، بێبڕوا بوون.

بەڵێ، زانایان لە ڕۆژئاوا ڕەخنەیان هەبوو لە کڵێسا و لە هەڵسوکەوتەکانی کڵێسا، کە یەکێك لە هەڵسوکەوتە هەڵەکانیان ئەوە بوو: بە ڕەسمیی تەبەنییان کرد کە: خوا تبارك وتعالی سێیە، نەك یەك! جگە لەوەی کە وەك دوایی باسی دەکەین، بە ناوی خواوە خۆیان کردبووە نوێنەری خوا، هەروەها بە ناوی خواوە پسوولەی لێبوردن (صَكّ الغُفران)یان بۆ خەڵك دەردەکردو، ئەو پیاوەی ئایین، ئەگەر پاپا بوو، ئەگەر ئەوانی خوار پاپا بوون، بابایەکی تاوانبار دەچوو بۆ لای، دەیگوت: من ئەوەندە گوناهەم کردوون: ئەوەندە قەتڵە، ئەوەندە زینایە،





ئەوەندە دزییە، ئەوەندە خراپەیە، ئەویش دوای گوێگرتن، مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد: تۆ ئەوەندە پارەیە بدە بە کڵێسا، منیش چەکێکت بۆ دەنووسم، (واتە: پسوولەی لێخۆش بوون)، ئیدی ئەوە خوا لێت خۆش بوو، چونکە من وەکیلی خوام لەسەر زەوی!

خەڵك ئەوەیان دەبینی لە ڕۆژئاوا، بۆیە پشتیان لە ئایین کرد، بەڵام کڵێسا دەیگوت: ئەوانە خوانەناس (مُولحِد)ن و، بە تۆمەتی ئیلحادو زەندەقە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، کە دوایی لە باسی یەکەمی بەشی سێیەمدا، (چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئیلحاد) بە درێژیی دەخەینە ڕوو.

(٩)- ئنجا لەم ڕۆژگاری ئێستاشماندا، کە ئێمە ئێستا لە سەدەی بیست و یەك (٢١)ی زایینی و، لە سەدەی پازدە (١٥)یەمی کۆچیی داین، جارێکی دیکە دیسان بە پلەی یەکەم لە وڵاتانی ڕۆژئاوا بە ئەمریکاشەوە، خەریکە شەپۆلی ئیلحاد بەهێز دەبێتەوەو، کەم و زۆر جیهانی ئیسلامییش کارتێکراو دەبێ بە ڕۆژئاوا، بە داخەوە لە ئەنجامی ئەوەدا، کە جیهانی ئیسلامیی لە حاڵەتێکی دوا کەوتووانەی ماددیی و تەکنۆلۆژیی و شارستانیی و ئیداریی دایە، پریشکی ئەو شەپۆلی ئیلحادە، کەم و زۆر گەیشتۆتە جیهانی ئیسلامییش، هەڵبەتە ژمارەیەك لە بانگخوازانیش بە تایبەت لە نەتەوەی عەرەب، ڕووبەڕووی ئەو شەپۆلە ئیلحادییە بوونەتەوەو، چەند بەرهەمێکیش لەو بارەوە نووسراون و، هەندێکیشیان وەرگێڕدراونە سەر زمانی کوردیی.

(١٠)- شایانی باسە بەندەش هەر لە سەرەتای تەمەنمەوە لە خەمی ئەو بابەتەدا بووم، هەر بۆیە کاتی خۆی:

١- لە کتێبی (ئیسلام و ڕێچکان)دا {وتووێژی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا}، بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کراوە.

٢- دواتر لە ڕوونکردنەوەی عەقیدەی (الطحاوي)دا، کە لە ساڵی (٢٠١٥ز)دا چاپکرا، ئەگەرنا لە ساڵی (١٩٩٣ز)ەوە شەرحی عەقیدەی (الطحاوي)م کرد

بوو، لەوێشدا جارێكی دیكە باسی ئیسپاتی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی خوا (سبحانە وتعالى) كراوە.

٣- هەروەها لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا، كتێبی دووەم (بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی خوا (سبحانە وتعالى) بۆ ئەو بابەتە تەرخان كراوە.

٤- كتێبی: {خواناسیی، ئایین، ئیمان: ڕاستییەكانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو، ئەفسانەكانی ڕێچكان دەپووچێنەوە}، لەوێشدا دیسان پانتاییەكی زۆرم تەرخان كردوە بۆ قسەكردن لە بارەی بوونی خوای تاك و تەنیاوە.

ئەو بەرهەمانەمان هەبوون لە كاتی خۆیدا، بەڵام بە پێویستم زانی لەم ڕۆژگارەشدا، جارێكی دیكە لە بارەی ئیمان و ئیلحادەوە بێمە قسە، چونكە شەپۆلی ئیلحادیی ئەم ڕۆژگارە، جیاوازە لە هی ڕابردوو، بۆیە پێویستە بە شێوەیەكی جیاواز و تایبەتییش، وەڵامی مولحیدەكان و شەپۆلی ئیلحادیی ئەم ڕۆژگارە بدرێتەوەو، پێویستە زیاتر هەوڵی چەسپاندنی ئیمانی ئیمانداران بدرێ و، بەرپەرچی ئەو ئیشكال و گومانانەش بدرێتەوە، كە نەیارانی ئیسلام لەوبارەوە دەیانخەنە ڕوو.

(١١)- ئەم لێكۆڵینەوەیەش گرنگییەكی باشم پێداوەو، - وەك پێشتریش گوتم - سێ چوار مانگ دەبێ خۆم بۆ تەرخان كردوەو، شێلگیرانە لە بارەیەوە بیرم كردۆتەوە، موتاڵام كردوە، لێم كۆڵیوەتەوەو، دەیان كتێبم لەو بارەوە خوێندوونەوە، چ لەوانەی پێشێ، چ لەوانەی تازە، بە تایبەت ئەو كتێبانەی كە لە زمانە بیانییەكانەوە وەرگێڕدراون.

(١٢)- ئنجا وەك بەرچاو ڕوونیی و ڕێ خۆشكردنێك لە بارەی ئەم بابەتەوە، دەڵێین: ئێمە كۆی ئەم بابەتەمان بۆ پێنج بەش دابەش كردوەو، هەر بە شەش لە چەند باسێك پێك دێ، بەم شێوەی خوارێ:





## بەشی یەکەم

## حەوت کورتە باسی پێویست

باسی یەکەم: پێناسەی ئیمان و ئیلحاد.

باسی دووەم: گرنگیی و پێویستیی ئیمان.

باسی سێیەم: زیان و شوێنەوارە شوومەکانی ئیلحاد.

باسی چوارەم: فەلسەفە لە بارەی ئیمان و ئیلحادەوە چی گوتوە؟

باسی پێنجەم: ئەهلی ئیسلام و فەلسەفە.

باسی شەشەم: ئایا نەدەگونجا بوونی خوا (سبحانە وتعالی) جێی مشت ومڕ نەبێ؟

باسی حەوتەم: ڕێگای وەدەستهێنانی زانست، یاخود زانستناسیی (ئیبستمۆلۆژیا).

## بەشی دووەم

## بەڵگە درەوشاوەکانی ئیمان

کە بە (بەرایی)یەك دەستمان پێکردوەو گوتوومانە: [بەڵگەکانی بوونی خوا (سبحانە وتعالی) ناژمێردرێن].

باسی یەکەم: زگماك (فِطرة) شایەدی بوونی خوایە.

باسی دووەم: عەقڵ شایەدیی بۆ بوونی خوا دەدات.

باسی سێیەم: زانست گەواهیدەری بوونی خوایە.

باسی چوارەم: وەحیی بەڵگەی بوونی خوایە (سبحانە وتعالی).

## بەشی سێیەم

## سەرگوزشتەی ئیلحادو بیانووە پووچەڵەکانی و هۆکارە ڕاستەقینەکانی

ئەمیش لە چوار باس پێك دێ:

باسی یەکەم: سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد و بێ دینیی لە ڕۆژئاوا.

باسی دووەم: ئیلحاد لەگەڵ هەر کام لە زگماك و عەقڵ و زانست و وەحییدا، ناکۆکەو تێکدەگیرێ.

باسی سێیەم: بیانووە پووچەڵەکانی ئیلحاد.

بیانووی یەکەم: بەرهەست (محسوس) نەبوونی خوا (سبحانه وتعالى)، کە بە پێنج هەستەکان دەرك ناکرێ.

بیانووی دووەم: هەبوونی نارێك و پێکیی لە گەردووندا.

بیانووی سێیەم: هەبوونی شەڕو خراپە لە ژیانی مرۆڤدا.

بیانووی چوارەم: مادام گەردوون یاسادار (منظم)و، سیستماتیك و ڕێك و پێکە، پێویستیی بە بەدیهێنەر نیە.

بیانووی پێنجەم: گەردوون یان ماددە، هەر بوو (أزلي)یەو پەکی لەسەر بەدیهێنەر نەکەوتوە.

بیانووی شەشەم: گەردوون بە ڕێکەوت پەیدا بووە.

بیانووی حەوتەم: ئەگەر هەموو شتێك بەدیهێنەری هەبێ، خواش بەهەمان شێوە. (ئەگەر هەموو شتێك خوا دروستیکردوە، ئەدی خوا کێ دروستی کردوە؟)

بیانووی هەشتەم: مرۆڤ لە ئەنجامی پەرەسەندن و گەشەسەندنی ژیاندارانەوە دروستبووەو، پێویستیی بە خوا نیە.

بیانووی نۆیەم: خوا چ پێویستییەکی بە بەندایەتیی مرۆڤەکان هەیە، کە داوای لێکردوون بیپەرستن؟





بیانووی دەیەم: شوێن کام ئایین بکەوین (گریمان خوامان ناسیی، کوا ئایینەکەی؟ شوێن کام ئایین بکەوین؟).

باسی چوارەم: هۆکارە ڕاستەقینەکانی ئیلحاد.

هۆکارە ڕاستەقینەکانی سەرهەڵدان و تەشەنە کردنی ئیلحاد، لەم ڕۆژگارەدا، پێمان وایە ئەو حەوت هۆکارەن:

١- خوتخوتەو دنەدانی شەیتان.
٢- خۆ بەزلگریی و لە خۆبایی بوونی بابای مولحید.
٣- ئارەزوو پەرستیی و دنیا ویستیی.
٤- تێکدران و شێوێنرانی کتێب و بەرنامەکانی خوا.
٥- پشت نەبەستن بە وەحیی ڕاست و دروست و دەستکاریی نەکراوی خوا، بۆ خواناسیی.
٦- واقیعی پێشکەوتووانەی ئەهلی کوفر و، دواکەوتووانەی ئەهلی ئیسلام.
٧- ڕەواج پێدرانی ئیلحاد لە لایەن زلهێزە باڵادەست و دەست ڕۆیشتووەکانەوە.

## بەشی چوارەم

### ڕەواندنەوەی تەم و مژی دوازدە (١٢) ئیشکال و گومان، لە بارەی خواناسیی و ئیمانەوە

گومانی یەکەم: گەردوون زۆر فراوانە و زەوی کە نشینگەی مرۆڤە، زۆر بچووکە و، مرۆڤیش هەر زۆر زۆر بچووکە.

ئەم مەسەلەیە دەکەنە ئیشکالێك لەسەر بوونی خواو دەڵێن: گەردوون هێندە فراوان! زەوی هێندە بچووك! مرۆڤیش هێندە وردیلە! ڕەنگە ڕاست نەبێ خوا دروستی کردبێ!

گومانی دووەم: ئایا ماقووڵە تەنیا مسوڵمانان بچنە بەهەشت و، خەڵکی دیکە هەمووی بچێتە دۆزەخ؟

گومانی سێیەم: کوا تەمەنی مرۆڤ بەشی هەڵسەنگاندنی ئەو هەموو ئایینانە دەکات، تاکو سەرەنجام ئایینی هەق و ڕاست هەڵبژێرێ؟

گومانی چوارەم: ئەگەر ڕاستە یەکتاپەرستیی (التوحید) ئەصڵی ئایینی خوا بووە، بۆچی بە پێی زانیاریی شوێنەوارناسیی (علم الآثار) (Archeology) بە پێچەوانەوە دەردەکەوێ، وا دەردەکەوێ کە بتپەرستیی زیاتر باو بووبێ؟

گومانی پێنجەم: هەتا زیاتر زانست بەرەو پێشەوە بچێ و، نهێنییەکانی سروشت و گەردوون ئاشکرابن، زیاتر جێ بە ئیمان لێژ دەبێ، چونکە (إِذَا ظَهَرَ السَّبَبُ بَطَلَ العَجَبُ) کاتی خۆی چونکە هۆکاری ڕوودانی دیاردە سروشتییەکانیان نەزانیوە، بۆیە پاڵیان داونە لای خوا!

گومانی شەشەم: وزەی سالیب و موجیبی گەردوون، یەکسانن کەواتە: گەردوون لە هیچەوەیە.

گومانی حەوتەم: هەبوونی هێزی کێشندە، بێنیازمان دەکات لە بوونی خوا.

گومانی هەشتەم: دوای سەرهەڵدانی (میکانیکی کوانتۆم) یاسای هۆکاریی کە بەهێزترین بەڵگەی بوونی خوایە، هەڵوەشاوەتەوە.

گومانی نۆیەم: گەردوونە زۆرەکان (الأَكْوَانُ المُتَعَدِّدَة) جێگرەوەی بەدیهێنرانی گەردوونە لەلایەن خواوە.

گومانی دەیەم: گەردوون حاڵەتی لەرەلەر (تَذَبْذُب)ی هەیە و، بەردەوام دێتەوە یەك و پاشان دەتەقێتەوە، بۆیە پێویستیی بە بەدیهێنەرێك نیە دروستی کردبێ!

گومانی یازدەیەم: بۆچی خوا نامەیەکی تایبەتی بۆ هەرکام لە مرۆڤەکان نەناردوە، کە خۆییان پێ بناسێنێ و داوایان لێ بکات بڕوای پێ بێنن؟

گومانی دوازدەیەم: بۆچی خوا سزایەکی نەبڕاوەی کافران دەدات، لەسەر ماوەیەکی سنووورداری کافر بوونیان لە ژیانی دنیادا؟!



## بەشی پێنجەم و كۆتایی

### داخوازیی و دەرەنجامەكانی ئیمان

باسی یەكەم: ئیمان بە خواهێنان و بەندایەتیی كردن بۆ خوا.

باسی دووەم: گەڕان بە دوای ئایین و بەرنامەیەكی ڕاست و دروستی خوادا، بۆ ئەنجامدانی بەندایەتیی.

باسی سێیەم: بڕواهێنان بە فریشتەكانی خواو كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانی و بە ڕۆژی دوایی و بە نەخشەو ئەندازەگیریی خوا (القدر والقضاء).

باسی چوارەم: ڕێكخستن و بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەران، لەسەر ئاستی تاك و خێزان و كۆمەڵگاو دەوڵەت، بە پێی ئایین و بەرنامەی خوا.

AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
Stay in touch on social media
archive.org/details/@alibapir
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - كوردي

www.alibapir.com



# باسی یەکەم

# پێناسـەی ئیمـــان و ئیلحـــاد

## دەستپێك

لە سەرەتاوە دەبێ ئەوە بڵێم: کە وشەی (ئیمان) کە ئێمە ئێستا پێناسەی دەکەین، لە بەکارهێنانی ئێمە، لەم بابەتەدا، مەبەستمان پێی (خواناسیی- معرفة الله)یە، پێچەوانەی (ئیلحاد)، چونکە (ئیلحاد) یانی: خوانەناسیی، ئنجا (ئیمان) لێرەدا مەبەستمان پێی خواناسییە، ئەگەرنا چەمك و واتای ئیمان، فراوانترە لە خواناسیی، ئیمان بریتیە لەوەی:

١- هەم خوابناسی، ٢- هەم بیپەرستی، ٣- هەم هەرچی فەرمووشیەتی بە ڕاستی دابنێی، ٤- هەروەها پێغەمبەرانی بەڕاست دابنێی، ٥- بڕوا بە فریشتەکانی بێنی، ٦- بڕوا بە کتێبەکانی بێنی، ٧- بڕوا بە ڕۆژی دوایی بێنی.

ئیمان هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە (ئیمان) خواناسیی (معرفة الله)یە.

www.alibapir.com







## بڕگەی یەکەم: پێناسەی ئیمان:

### أ/ لە ڕوانگەی زمـــانەوە:

١- (إِبْنُ مَنْظُور) دەڵێ: (الإِيْمَانُ: بِمَعْنَى التَّصْدِيقِ ضِدُّ التَّكْذِيبِ، يُقَالُ: آمَنَ بِهِ القَوْمُ، وَكَذَّبَ بِهِ القَوْمُ)[1].

واتە: (ئیمان) واتە: بە ڕاست دانان، پێچەوانەی بە درۆ دانانە، دەگوترێ: خەڵکەکە بە ڕاستیان زانی، دەشگوترێ: خەڵکەکە بە درۆیان زانی.

هەروەها دەڵێ: (وَفِي التَّنْزِيلِ: ﴿...وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧﴾ يوسف، أَي: بِمُصَدِّقٍ، وَالإِيْمَانُ: التَّصْدِيقُ، فَهُوَ مَصْدَرُ آمَنَ، يُؤْمِنُ، إِيمَاناً، فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَاتَّفَقَ أَهْلُ العِلْمِ مِنَ الُّلغَوِيينَ أَنَّ الإِيْمَانَ، مَعْنَاهُ التَّصْدِقُ)[2].

واتە: لە دابەزێنراودا (واتە: لە قوڕئاندا) خوا فەرموویەتی: ﴿..وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧﴾، (کوڕەکانی یەعقووب بە بابیان دەڵێن: تۆ ئێمە بە ڕاست دانانێی ئەگەر ئێمە ڕاستگۆش بین)، واتە: تۆ بە ڕاستدانەری ئێمە نی، کەواتە: ئیمان، واتە: بە ڕاست دانان و بەڕاستزانین، وشەی (إيمان) چاوگە، (آمَنَ، يُؤْمِنُ، إِيمَاناً) بڕوای هێنا، بڕوا دێنێ، بڕوا هێنان، (فَهُوَ مُؤْمِنٌ) ئەو بڕوادارە، ئنجا لێرەدا یانی: بە ڕاستی دانا، بەڕاستی دادەنێ، بەڕاست دانەرە، دوایی دەڵێ: زانایان لە شارەزایانی زمان و غەیری ئەوانیش گوتوویانە: یەکەمین مانای ئیمان بریتیە لە: بەڕاستزانین.

٢- (جارُ الله الزَّمَخْشَرِي) دەڵێ: (وَمَا أُومِنُ بِشَيءٍ مِمَّا يَقُولُ، أي: مَا أُصَدِّقُ، وَمَا أَثِقُ، وَمَا أُومِنُ أَجِدُ صَحَابَةً، يَقُولُهُ: ناوي السفر، أي: مَا أَثِقُ أَنْ أَظْفَر بِمَن أُرَافِقُهُ)[3].

---

(١) لِسَان العَرب، ج١٣، ص٢١.

(٢) لِسَان العَرب، ج١٣، ص٢٣.

(٣) أَسَاسُ البَلاَغَة، ص٢٢.

www.alibapir.com





واتە: لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (مَا أُومِنُ بشَيءٍ مِمَّا يَقُولُ) واتە: ئەوەی کە دەیڵێ، هیچی بە ڕاست دانانێم و متمانەم بە هیچی نیە، یاخود دەڵێ: (مَا أُومِنُ أَجِدُ صَحَابَةً) واتە: کەسێك کە دەیەوێ سەفەر بکات دەڵێ: متمانەم نیە هەندێك هاوەڵم چنگ بکەون، سەفەریان لەگەڵدا بکەم.

٣- هەروەها هەمان مەبەست و جۆرە لێکدانەوە: (الفيروز آبادي)یش لە (القاموس المُحيط)[1]دا هێناویەتی.

٤- هەروەها (الرازي) لە (مُختار الصِحاح)[2]دا هێناویەتی.

٥- دیسان (المُنجِد)[3]یش، هێناویەتی.

٦- هەروەها (محمد فَريد وَجدي) لە (دائرة معارف القرن العشرين)[4]دا، هێناویەتی و هەموویان هەمان شت دووبارە دەکەنەوە.

**ب/ لە ڕوانگەی شـــەرعەوە:**

١- پێناسەی یەکەم: (إبن منظور) دەڵێ: (الإِيْمَانُ: إِظْهَارُ الخُضُوعِ وَالقبُولُ للشَّرِيعَة، وَلِمَا أَتَى بِهِ النَّبِيُّ، وَاعْتِقَادُهُ وَتَصْدِيقُهُ بالقَلْبِ)[5].

واتە: (ئیمان) بریتیە لە پێشاندانی ملکەچیی و، پەسند کردنی بەرنامە و، هەموو ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی و، بڕوا پێ بوونی و بەڕاست دانانی بە دڵ.

٢- پێناسەی دووەم: (الفيروز آبادي) دەڵێ: (الإِيْمَانُ: الثِّقَةُ وَإِظْهَارُ الخُضُوعِ وَقَبُولُ الشرِيعَةِ)[6].

---

(١) ج٣ص٩٩.

(٢) ص٢٦.

(٣) ص١٨، ط٢٢.

(٤) ج١، ص٥٩٨.

(٥) لِسَان العَرب، ج١٣، ص٢٣.

(٦) القاموس المحيط، ج٤، ص٩٩.





واتە: (ئیمان) بریتیە لە متمانە پێ بوون و، خستنە ڕووی ملکەچیی و پەسند کردنی بەرنامەی خوا.

٣- پێناسەی سێیەم: (راغب الأصفهاني) لە کتێبە ناودارەکەی خۆیدا[1] وردتر و ڕوونتر، پێناسەی ئیمان دەکات لە ڕوانگەی شەرعەوە و لە زاراوی شەرعداو دەڵێ:

(وَالإِيْمَانُ يُسْتَعْمِلُ تَارَةً اسْمَاً للشَّرِيعَة الَّتِي جَاءَ بِهَا مُحَمَّدٌ عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم، وَيُوصَفُ بِهِ كُلُّ مَنَ دَخَلَ فِي شَرِيعَتِهِ مُقِرّاً باللهِ وَبنُبُوّتِهِ، وَتَارَةً يُسْتَعْمَلُ عَلَى سَبيلِ المَدْحِ، وَيُرَادُ بهِ إِذْعَانُ النَّفْسِ لِلْحَقّ عَلَى سَبيلِ التَّصْدِيقِ، وَذَلِكَ باجْتِمَاعِ ثَلاَثَة أَشْيَاء: تَحْقِيقٌ بالقَلْبِ، وَإِقْرَارٌ باللِّسَانِ، وَعَمَلٌ بحَسَبِ ذَلِكَ بالجَوَارِحِ، وَيُقَالُ لِكُلّ وَاحِدٍ مِنَ: الإِعْتِقَاد، وَالقَوْلِ الصّدْقِ، وَالعَمَلِ الصَّالحِ، إِيْمَانٌ).

واتە: جاری وا هەیە وشەی ئیمان بە کاردێ و مەبەست پێی ئەو شەریعەت و بەرنامەیە کە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لە خواوە هێناویەتی، هەروەها هەرکەسێکیش کە چۆتە نێو ئەو بەرنامەیەوەو دانی بە خوادا هێناوە و، بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەددا (صلی الله علیه وسلم) هێناوە، ئەویش بە ئیمان وەصف دەکرێ، جاری واش هەیە وشەی ئیمان بەکاردەهێنرێ وەك مەدح کردن و پێدا هەڵدان و، مەبەست پێی تەسلیم بوونی مرۆڤە لە ناخەوە بۆ هەق، بە شێوەیەك کە بە ڕاستی بزانێ، ئەویش لە حاڵێکدا دەبێ کە سێ شتی تێدا کۆ ببەنەوە:

**یەك:** ئەو شتە بە دڵ بە ڕاست بزانێ.

**دوو:** بە زمان دانی پێدا بێنێ.

**سێ:** بە ئەندامەکانیشی بە پێی ئەوە ڕەفتار بکات.

ئنجا بە هەر کام لە ئیعتیقادی نێو دڵ و، قسەی ڕاستی سەر زمان و، کردەوەی چاکی ئەندامەکانیش، هەر کامێکیان بە جیا جیاش پێیان دەگوترێ ئیمان و، بە هەرسێکیشیان پێیان دەگوترێ ئیمان.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٢٢.

www.alibapir.com





٤- پێناسەی چوارەم: ئەوەیە کە زۆربەی پێشینی چاکمان لەسەری ڕێککەوتوون، بەڵکو بوخاریی ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتوویەتی: زیاتر لە هەزار لە زانایانی ئۆممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە شارەکانی مەککە و مەدینە و کووفە و بەصرەو شام و میسر و ئەوانەم بیستوە، کە گوتوویانە: (الإِيْمَانُ: قَوْلٌ وَعَمَل، يزيد وينقص)، واتە: ئیمان قسەیەو کردەوەیە، زیاد دەکات و کەم دەکات[1].

هەروەها زۆربەی زانایان لە پێناسەی ئیمان دا گوتوویانە: (الإِيْمَانُ: قَوْلٌ وَعَمَل، قَوْلُ القَلْبِ وَاللِّسَان، عَمَلُ القَلْبِ وَالجَوَارِح)[2]، واتە: ئیمان قسەیەو کردەوەیە، قسەی دڵ و زمان و، کردەوەی دڵ و ئەندامەکان.

هەڵبەتە مەبەستیان لە قسە (قول) کە دەڵێن: (قَوْلُ القَلْب) قسەی دڵ: قبووڵ کردنی دڵە، هەروەها قسەی زمان: دان پێداهێنانی زمانە، یانی: قسەی دڵ بەڕاست زانینی دڵە، قسەی زمانیش دان پێداهێنانی زمانە، بەڵام (عَمَلُ القَلْبِ وَالجَوَارِح) کردەوەی دڵ و ئەندامەکان، بریتیە لە خۆشویستنی ئەوە کە عەقڵ و دڵ بە ڕاستیان زانیوەو، دانیان پێدا هێناوە، کە بە دڵ پەسندی بکات و قبووڵی بکات و خۆشی بوێ، کردەوەی ئەندامەکانیش ئەوەیە کە بە جەستە و بە ئەندامەکانی، بە پێی ئەوە بە ڕێوە بچێ و ڕەفتار و مامەڵە بکات.

٥- پێناسەی پێنجەم: پێناسەی خۆمە کە لە مەوسووعەی: (الإِسْلَامُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ)[3] لە (الكتاب الثاني)دا، کە ناوونیشانەکەی ئاوایە: (مفهوم الإِيْمَانِ والكُفرِ وَثِمَارهُمَا وَالمُقَارَنَةِ بَينهُمَا)، بەو شێوەیە پێناسەی ئیمانم کردوە:

---

(١) بڕوانە: (شرح أصول اعتقاد أهل السَّنة والجماعة)، لِلاّلكائي، ج٥ ص٨٨٦، و(فتح الباري) لابن حجر العسقلاني،ج١ ص٤٧، هەروەها: مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٤٦٠).

(٢) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي. ج١ ص١٤٦)، هەروەها: (شرح السَّنة للبغوي) ج١ ص٣٨، ٣٩، هەروەها: (التمهيد، لابن عبدالبر) ج٩، ص٢٣٨-٢٤٣.

(٣) الطبعة الثانية، ص١٠٩.

www.alibapir.com







(الإِيْمَانُ: هَو النُّورُ الَّذِي يَكْتَسِبُهُ الإِنْسَانُ بتَوْفِيقِ اللهِ وَتَيْسِيرِهِ وَهِدَايَتِهِ، وَمُسَتَقَرُّهُ القَلْبُ، وَلَكِنْ يَنْعَكِسُ ضِيَاؤهُ عَلَى بَاطِنِ الإِنْسَانِ، فَيُثْمِرُ فِيهِ اليَقِينَ وَالطَّمَأْنِيْنَة وَالتَّصْدِيقَ، وَكَذَلِكَ يَنْعَكِسُ عَلَى ظَاهِرِهِ، فَيُزَيِّنُهُ بالإِقْرَارِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَالإِتِّبَاعِ، وَيَجْعَلُهُ مُتَحَلِّيَاً بالفَضَائِلِ النَّفْسِيّةِ وَالخُلُقِيّةِ، كَالشَّمْسِ الَّتِي تُضِيءُ بُشْعَاعِهَا مَا حَوْلَهَا وَمَا بَعُدَ عَنْهَا).

کە بە کوردیی مانایەکەی ئاوایە:

ئیمان ئەو ڕووناکییەیە کە مرۆڤ وەدەستی دێنێ، بە هۆی ئەوەوە کە خوا دەستی دەگرێ و، کاری ئاسان دەکات و ڕێنمایی دەکات و، نشینگەی ئیمان بە شێوەی سەرەکیی بریتیە لە دڵ، بەڵام ڕۆشنایی ئیمان لەسەر دەروون و دیوی نێوەوەی مرۆڤ عەکس دەبێتەوە و دەردەکەوێ و، دڵنیا بوون و ئارامیی و بەڕاست زانینی تێدا بەرهەم دێنێ، هەروەها ئیمان لەسەر ڕواڵەتی ئینسان و لەسەر دیوی دەرەوەی ئینسانیش شوێنەوارەکانی دەردەکەون و، ڕواڵەتی ئینسان و جەستەی ئینسان جوان دەکات، بە دان پێدا هێنان و، گوێ گرتن و فەرمانبەریی کردن و شوێن کەوتن، هەروەها ئیمان ئەو مرۆڤە وا لێ دەکات کە بە سیفەتە بەرزە دەروونییەکان و، ئاکارو ڕەوشتە ڕواڵەتییەکان بڕازێتەوە و، ئیمان وەك خۆرێك وایە کە بە تیشکەکەی دەوروبەرەکەشی و ئەوەش کە لێی دوورە، ڕووناك دەکاتەوە.

ئنجا پێشتریش گوتم و لێرەش دووبارەی دەکەمەوە: کە ئێمە لە بەرکارهێنانی وشەی (ئیمان) لەم زنجیرە ئاڵقەی بابەتی: (دڕەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد)دا، مەبەستمان پێی (خواناسیی)یە، کە پێچەوانەی (ئیلحاد)ە، ئیلحاد واتە: لادان لە خوا و داننە هێنان بە بوونی خوادا.

ئەمە بە کورتیی پێناسەی ئیمان بوو.

www.alibapir.com





## بڕگەی دووەم: پێناسەی ئیلحـــاد:

### أ- لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە:

١- (راغب الأصفهاني) لە پێناسەی (إلحاد)دا دەڵێ: (اللَّحْدُ: حُفْرَة مَائِلَةٌ عَنِ الوَسَطِ وَقَدْ لَحَّدَ القَبْرَ: حَفَرَهُ، وكَذَلِكَ أَلْحَدَهُ، وَقَدْ لَحَّدْتُ الميِّتَ وَأَلْحَدتُهُ: جَعَلْتُهُ فِي اللَّحْدِ، وَيُسَمَّى اللَّحْدُ مُلْحَداً، وَذَلِكَ اسْم مَوْضِوعٍ مِنْ أَلْحَدتُه، وَلَحَدَ بلِسَانِهِ إِلَى كَذَا: مَال، قَالَ تَعَالَى: ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ ﴿١٠٣﴾﴾ النحل، من لَحَدَ وقُرِئَ "يُلحِدونَ إليهِ" وَأَلْحَدَ فُلاَنٌ: مَالَ عَنِ الحَقِّ)[1].

واتە: وشەی (لَحْدْ) قوڵتێکە لە نێوە ڕاست لا دەدا بە لایەکدا {بە کوردیی پێی دەڵێن: لا گۆڕ، تەنیشتی گۆڕەکە دەکۆڵن، دوایی جەنازەکە دەخەنە ئەو شوێنەوە، نەك نێوەڕاستی گۆڕەکە}، دەگوترێ: (لَحَّدَ القَبْرَ: حَفَرَهُ) گۆڕەکەی هەڵقەند، هەروەها (أَلْحَدَهُ) یانی: گۆڕەکەی هەڵقەند، یاخود لا گۆڕی کرد، (لَحَّدْتُ الميِّتَ وَأَلْحَدتُهُ جَعَلْتُهُ فِي اللَّحْدِ)، (لَحَّدْتُ الميِّتَ وَأَلْحَدتُهُ) هەردووکیان، واتە: خستمە ئەو لا گۆڕەوە، (وَيُسَمَّى اللَّحْدُ مُلْحَداً)، (مُلْحَد) کەسێکە خراوەتە لا گۆڕەوە وای پێ دەگوترێ، ئەویش ناوەو بۆ ئەوە دانراوە، هەروەها: (أَلْحَدتُهُ) واتە: خستمە لا گۆڕەوە، (وَلَحَدَ بلِسَانِهِ إِلَى كَذَا: مال) واتە: زمانی لادا، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ ﴿١٠٣﴾﴾، واتە: زمانی ئەو کەسەی کە بە لایدا لادەدەن، زمانی غەیری عەرەبییە.

ئەوە یەکێکە لە دوو خوێندنەوەکان، (يَلحِدونَ إليهِ) ئەگەر بڵێ: (يَلْحِدونَ إِلَيْهِ، لَحَدَ، يَلْحَدُ، يَعْنِي مَالَ يَمِيلُ)، هەروەها: (أَلْحَدَ يُلحِدُ) ئەویش هەر یانی: (مَالَ، يَمِيلُ)، {بەڵام (لَحَدَ) (ثلاثي)ە و، (أَلْحَدَ) (رُبَاعِي)ە و هەردووکیان یەك مانایان هەیە}، (وَأَلْحَدَ فُلاَنٌ: مَالَ عَنِ الحَقِّ) واتە: لە هەق لایدا، هەتلە بوو.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٧٣٧.

www.alibapir.com







٢- هەروەها (لِسانُ العَرَب)یش[١] هەر بەو شێوەیەی ڕاغیبی ئەصفەهانیی، وشەی (ئیلحاد) شی دەكاتەوە.

٣- خاوەنی (المُعجَمُ الوسیط) دەڵێ: (لَحَدَ، یَلْحَدُ، لَحْداً، مَالَ عَن طَرِيقِ القَصْدِ، وَيُقَالُ: مَالَ السَّهْمُ عَنِ الهَدَفِ: عَدَلَ عَنْهُ ...، وَأَلْحَدَ السَّهْمُ عَنِ الهَدَفِ: عَدَلَ عَنه، وَأَلْحَدَ فُلَانٌ: عَدَلَ عَنِ الحَقِّ)[٢].

ئەمیش بە هەمان شێوە دەڵێ: (لَحَدَ، یَلْحَدُ، لَحْداً) واتە: لە ڕێی ڕاست لایدا، هەروەها دەگوترێ: تیرەكە لە ئامانجەكە (لە نیشانەكە) لایدا، دەشگوترێ: (أَلْحَدَ السَّهْمُ عَنِ الهَدَفِ) هەر بە هەمان شێوە، یانی: تیرەكە لایدا و نیشانەی نەپێكا، هەروەها دەگوترێ: (أَلْحَدَ فُلَانٌ) یانی: لە ڕێی هەق لایدا.

٤- هەروەها (المُنجِد)یش[٣]، دیسان لە بارەی وشەی ئیلحادەوە هەروەك وان دەڵێ.

**ب- لە ڕوانگەی شـــەرعییـــەوە:**

خاوەنی: (المنجد) لە پێناسەی (ملحد وملاحدة)دا، گوتوویەتی:

(الإلحَادُ: مَصْدَرُ أَلْحَدَ: الكُفْرُ، ... والمُلْحِدُ الجَمْعُ مَلَاحِدَة وَمُلْحِدُون: الكَافِر، المَلَاحِدَة: فِرْقَة مِنَ الكُفَّارِ يُسَمَّون بالدّهرِيين وبالدهرية).

واتە: (إلحاد) چاوگی (أَلْحَدَ)یە، كەواتە: (إلحاد) یانی: كوفر، (مُلحِد)یش كە بە (مَلاحِدَة ومُلحِدون) كۆدەكرێتەوە (مُلحِد)، واتە: كافر، بێبڕوا، (مَلاحِده) كۆمەڵێكن لە كافرەكان پێیان دەگوترێ: (دَهریین) و پێشیان دەگوترێ: (الدَّهرية).

كەواتە: (مُلْحِد): كەسێكە دان بە بوونی خوادا ناهێنێ و، (ئیلحاد) واتە: دان نەهێنان بە بوونی خوادا (سبحانه وتعالی)، شایانی باسە: خوا (سبحانه

---

(١) ج٣، ص٣٨٨-٣٩٠.

(٢) ص٨١٧.

(٣) ص٧١٥، ط٤٣.

www.alibapir.com



وتعالى) وشەی (ئیلحاد)ی بەکارهێناوە لە قورئاندا، بەڵام بە مانای لادان لە ناوەکانی یان لە ئایەتەکانی خوا بەکارهێنراوە، وەك دەفەرمویٚ:

﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: خوا ناوە هەرە چاکەکانی هەن، هەر بەو ناوە هەرە چاکانەی لیٚی بپاڕێنەوە و، واز لەوانە بێنن کە لادان دەکەن لە ناوەکانیدا.

هەروەها لە سووڕەتی (فصلت)دا خوای پەروەردگار وشەی (ئیلحاد)ی بۆ کەسانێك بەکارهێناوە کە لادان دەکەن لە ئایەتەکانی خوادا (سبحانە وتعالى)، وەك فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ﴿٤٠﴾ ﴾.

واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی لادان لە ئایەتەکانماندا دەکەن، لیٚمان ناشێررێنەوەو پەنهان نابن.

کەواتە: وشەی (ئیلحاد) لە قورئاندا بەکارهێنراوە، بەڵام نەك بەو واتا باوەی ئیٚستای واتە: (دان نەهێنان بە بوونی خوادا)، بەڵکو بە مانای لادان لە ناوەکانی خوا، یان لە ئایەتەکانی خوا و لە بەرنامەی خوا.

بەڵیٚ: (ئیلحاد) وەك چەمك و واتایەك کە ئیٚستا باوە: بریتیە لە حاڵەتێك کە لە ئینسانـدا دێتە دی، داننانیٚ بە بوونی خوادا، کە خوٚی و دەوروبەری و گەردوون، بەدیهێنەر و پەروردگار و خاوەنێکیان هەبیٚ، لە قورئاندا بەکارهێنراوە، بەڵام بێگومان وشەی بێبڕوایی (کفر) کە لە ئەسڵدا بە مانای: داپۆشینی هەق و دان پێداهێنانیەتی، چەمکەکەی (ئیلحاد)یش دەگرێتەوەو ئیلحادیش هەر جۆرێکە لە جۆرەکانی کوفر.

ئەمە پێناسەی هەر کام لە ئیمان و ئیلحاد.





## باسی دووەم



# گرنگیی و پێویستیی ئیمان

### دەستپێك

ئیمان و خواناسیی لە زۆر ڕووەوە پێویستە لە ژیانی مرۆڤدا: لە ژیانی تاكدا، لە ژیانی خێزاندا، لە ژیانی كۆمەڵگادا، دەگونجێ لەو بارەوە زۆر بە دوور و درێژیی قسە بكەین، بەڵام لەبەرئەوەی بابەتەكەی ئێمە، باسی خواناسییە، باسی ناسینی خوایە، هەروەها باسی پێچەوانەكەیەتی، كە ئیلحاد و خوانەناسییە، بۆیە بە كورتیی ئەو باسانە دەكەین كە پەیوەستن بە خواناسییەوە و، لێرەش لە حەوت ڕووەوە، باسی گرنگیی و پێویستیی خواناسیی دەكەین:

### ١- لە ڕووی فیكریی و پەیبردن بە ڕاستییەكانەوە:

ئیمان بە خوا، بناغەی زانین و زانستە و چەقی هەموو زانستەكانە و، لە ڕاستییدا دوای ئەوەی مرۆڤ خوا دەناسێ، چەقێكی دەست دەكەوێ، لە ڕووی فیكرییەوە، لە ڕووی عەقڵییەوە، چەقێكی دەست دەكەوێ كە هەموو شتەكانی

www.alibapir.com



دیکە بەوییەوە پەیوەست بکاتەوە، هەر بۆیە خوا (سبحانه وتعالى) لە بارەی ئەوانەوە کە خوا ناناسن، دەفەرمویّ:

﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴿١٩﴾ ﴾ الحشر.

واتە: وەك ئەوانە مەبن کە خوایان لە بیر چوو، خواش خۆیانی لە بیر بردنەوە، ئینسان کاتێك کە خواناناسیّ، خۆیشی ناناسیّ، خۆیشی لیّ ون دەبیّ، خۆی لیّ بزر دەبیّ، نازانیّ لە کوێوە هاتوە! نازانیّ بۆ کویّ دەچیّ! نازانیّ کیّ هێناویەتی! نازانیّ بۆچی هاتوە! نازانیّ دەبیّ چی بکات! نازانیّ چی چاکە و چی خراپە!!

بەڵیّ لە ڕاستییدا خواناسیی بناغەی خۆناسینە و، بناغەی گەردوون ناسینە و، بناغەی دەوروبەر ناسینە، هەروەها بناغەی شت زانینە، (إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ قسەیەکی جوان دەکات، دەڵیّ: (والعِلْمُ بِهِ أَعْلَى العُلُومِ، وَغَايَةِ العُلُومِ، وَمُنْتَهى العُلُومِ، وَتَحْقِيقُ العُلُومِ، وَأَصْلُ العُلُومِ، فَهُوَ أَصْلٌ لِتَحْقِيق تِلْكَ العُلُومِ الَّتِي بهِ تَسْتَحِقُّ بهَا أَنْ تَكُونَ عُلُوماً)[1].

واتە: زانیاریی بە خوا، بەرزترینی زانیارییەکانە و، ئەو پەڕی زانیارییەکانە و، ئامانجی زانیارییەکانە و، ساغکردنەوەی زانیارییەکانە و، بنچینەی زانیارییەکانە و، بڕوا بوون بە خوا (سبحانه وتعالى) بنچینەیەکە بۆ ئەوە کە هەموو ئەو زانیارییانەی دیکە ساغ ببنەوە و نێوەڕۆکیان پەیدا بیّ و، شایستەی ئەوە بن کە پێیان بگوتریّ: زانیاریی.

قسەکەی زۆر جوانە: چونکە ئەگەر دان بە بوونی خوادا نەهێنریّ، واتە: دەبیّ هەموو سەرەتا عەقڵییەکان و هەموو بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان، ڕەت بکرێنەوە:

١- هەموو پەیداکراوێك پەیداکەرێکی هەیە.

٢- هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە.

٣- هەموو مشوور لیّ خوراوێك مشوور خۆرێکی هەیە.

---

(١) شرح الأصبهانية، ص١١٠.





٤- هەموو سەرپەرشتییکراوێك سەرپەرشتییکەرێكی هەیە.

٥- هەموو تەگبیر بۆ کراوێك تەگبیر کرێکی هەیە.

هەموو ئەوانە دەبێ ڕەت بکرێنەوە، کە هەموویان وا لە مرۆڤ دەکەن خوا بناسێ، ئەمە جگە لە مەسەلەی زگماك (فطرة) و، جگە لە واقیع و مێژووی بەشەر و، جگە لە وەحیی، کە دوایی باسیان دەکەین.

## ٢- لە ڕووی ڕەوشت و بەهایەکانەوە:

لە ڕووی ڕەوشتەوەش دیسان خواناسیی زۆر گرنگ و پێویستە، چونکە بڕوا بە خۆ بوون و، خواناسین، بناغە و جەوهەری ڕەوشت و ئاکارەکانە و، بەبێ خواناسیی، هیچ شتێك واتای نیە، ڕاستگۆیی باشە، درۆ کردن خراپە، دەستپاکیی باشە، خیانەت خراپە، وەفاداریی باشە، بێ بەڵێنیی و بێ پەیمانیی خراپە، کێ وا دەڵێ؟! بەڵگەت چیە؟! حەڵاڵ و حەڕام، یانی چی؟! حەڵاڵ و حەڕام، خوا دیارییان دەکات، ئەو ڕەوشتە باشە، ئەوەیان خراپە، کێ وا دەڵێ؟! کەسێك کە بەرژەوەندیی لە درۆدایە، ئەگەر خوا نەبێ و ڕۆژی دوایی نەبێ، بۆچی ڕاستیی بڵێ؟

کەسێ بەرژەوەندیی لە دزییدا بێ، بۆچی دەستپاك بێ؟

کەسێك بەرژەوندیی دنیایی لە بێ بەڵێنیی و بێ پەیمانییدا بێ، بۆچی خاوەن بەڵێن بێ؟

کەسێك بەرژەوەندیی لە خۆ بەزلگریی و دڵڕەقیی و خوێن ڕێژییدا بێ، بۆچی خۆ بەکەم زان و بە ڕەحم بێ؟!

لە ڕاستییدا ڕەوشت و بەهایەکان هیچ واتایەکیان نامێنێ، بە بێ خواناسیی.

www.alibapir.com





## ٣- لە ڕووی ئارامیی و ئۆخژنیی دەروونەوە:

تەنیا بە ئیمان بە خوا، بە خواناسیی، واتا بۆ ژیانی مرۆڤ پەیدا دەبێ، مرۆڤ بەرچاو ڕوون دەبێ و دڵنیا دەبێ، دڵی دادەسکنێ و ئۆخژن و ئارامیی بۆ دێ، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨ ﴾.

واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو بە یادی خوا دڵیان دادەسکنێ و ئۆخژنی بۆ دێ و ئارام دەبێ، ئاگادار بن! تەنیا بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن.

لە ڕاستییدا بەبێ پەیوەندیی لەگەڵ خوا، مرۆڤ شوێنی ئیعرابی خۆی لە گەردووندا نابینێ، ئەصڵەن نازانێ کێ هێناویەتی؟ لە کوێوە هاتوە؟ بۆچی هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ وەك خوا لە سوورەتی (الأنعام)دا، زۆر جوان حاڵەتی ئینسانی خواناس و ئینسانی خوانەناس، ئینسانی ئیماندار و ئینسانی بێبڕوامان، بۆ وێنا دەکات، دەفەرموێ:

﴿ أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢٢ ﴾.

واتە: ئایا کەسێك کە مردوو بوو، زیندوومان کردەوە {وەك جەستە زیندوو بوو، بەڵام لە ڕووی ڕووح و ناخ و مەعنەوییەوە لە ڕووی دەروونییەوە، مردوو بوو، بە هۆی ئیمانەوە زیندوومان کردەوە} و ڕووناکییەکمان پێدا کە لە نێو خەڵکیدا پێی بڕوا {بەر پێی خۆی پێی ببینێ، دەوروبەی خۆی پێ ببینێ، ڕابردووی خۆی پێ ببینێ، بزانێ لە کوێوە هاتوە؟ ئێستای خۆی پێ ببینێ بزانێ بۆچی هاتوە! داهاتووی خۆی پێ ببینێ، بزانێ بۆ کوێ دەچێ؟ خاوەنی خۆی پێ بناسێ، ئەرکی خۆی لەم ژیانەدا بزانێ، کە ئەوە حاڵەتی ئینسانی بڕوادار و خواناسە}، ﴿ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَا ﴾، {ئایا کەسێکی ئاوا کە بە

هۆی خوا ناسیی و ئیمانەوە، هیدایەتمان داوە و خستوومانەتە سەر ڕووناكیی}، وەك كەسێك وایە لە تاریكاییان دایە، لێشیان دەرباز نابێ؟ {تەماشای ڕابردووی دەكات: تاریكاییە و نازانێ لە كوێوە هاتوە، تەماشای ئێستای دەكات تاریكاییە و نازانێ بۆچی هاتوە؟ تەماشای داهاتووی دەكات، تاریكاییە و نازانێ بۆ كوێ دەچێ؟ تەماشای سەرەوەی خۆی دەكات خۆی بێ خاوەن دەبینێ و، خۆی بێ ئامانج دەبینێ، خۆی بێ مراد دەبینێ}، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾، ئاوا بۆ بێبڕوایەكان ئەوەی كە دەیكەن، بۆیان ڕازێنراوەتەوە.

كە بێگومان لەلایەن شەیتانەوە بۆیان ڕازێنراوەتەوە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا كوفر هەمووی تاڵاوە، كوفر زەلكاوێكە هەر كەسێ بیكەوێتێ، تێیدا نغرۆ دەبێ، تێیدا دەخنكێ، بەڵام شەیتان جاری وایە شتی خراپ بۆ خەڵك دەڕازێنێتەوە، بۆیان جوان دەكات و تامی لێ دەكەن، هەروەك چۆن كەسێك كە گرانەتا دەگرێ، ئاوی شیرین و زوڵاڵی لەسەر زاری تاڵە، شتێكی شیرین بخوات، لەسەر زاری زەقنەبووتە، چونكە میزاجی تێكچووە، ئینسانی مولحیدو بێبڕواو خوانەناسیش، میزاجی تێكچووە، ئەگەرنا ئەوە چ ژیانێكە ئەو دەژیێ، ژیانەكەی هەمووی بریتیە لە تاریكایی و بە تاریكاییان ئابڵووقە دراوە، وەك خوا (سبحانە وتعالی) فەرموویەتی:

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
كەناڵی ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## ٤- لە ڕووی خێزانیی و کۆمەڵایەتییەوە:

هەروەها خواناسیی و ئیمان لە ڕووی خێزانیی و کۆمەڵایەتییشەوە، گرنگە و پێویستە، چونکە ئیمان بناغەی خێزان و خزمایەتیی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، ئیمان پێت دەڵێ: ئەو ئافرەتە بۆ تۆ حەڵاڵە و بە پێی گرێبەستێك بۆتە هاوسەری تۆ، ئەوەیان دایکتە، ئەو پیاوە بابتە، ئەوانە براتن، ئەوانە خوشکتن، ئەوانە کوڕتن، ئەوانە کچتن، ئەوانە خزمتن، ئەوە دراوسێتە، ئیمان ئەو واتا و چەمکانە پەیدا دەکات و، لە ڕاستییدا هەر پەیدا بوونی خێزان، بناغەیەکی ئیمانیی هەیە.

هەر بۆیە کاتی خۆی (ئەنگڵز)[1] کتێبێکی داناوە، بە ناوی: (خێزان) دەڵێ: دەبێ خێزان هەڵبوەشێتەوە! هەڵبەتە ئەگەر ئیلحاد هەبێ، کە مارکسیزم و دواتر لینینیزم و ستالینیزم و لەولا ماویزم، بە ڕەسمیی ئیلحادیان تەبەننیی کردبوو بۆ دەوڵەتەکانیان، ئنجا ئەگەر ئیلحاد تەبەننیی بکرێ، مانایەك نامێنێتەوە بۆ خێزان، کە بگوترێ: تەنیا ئەو ئافرەتەت بۆ حەڵاڵە و بە پێی گرێبەستێك بۆ تۆ حەڵاڵ بووە، ئەوانی دیکە قەدەغەن، کێ وا دەڵێ؟ ئەگەر خوا وا نەفەرموێ و خواناسیی لە ئارادا نەبێ؟!

لە ڕاستییدا خێزان مانای نامێنێ، خزمایەتیی مانای نامێنێ، دراوسێیەتیی مانای نامێنێ، چاکەکاریی مانای نامێنێ، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، هەڵدەوەشێنەوە، وەك ئێستا دەیبینین، شتێکی هێندە دوور نیە، لە ژیانی مولحیدەکاندا تەماشا بکە، ئەگەر ڕاست بکەن لەگەڵ ئیلحادەکەیاندا، ئەو شتانە هەموویان: خێزان و خزمایەتیی و ڕێز و حورمەت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، لە لای وان هیچ واتایەکیان نیە.

---

(١) فریدریك ئەنگڵز: ١٨٢٠-١٨٩٥ز، برادەری نیزیکی (کارل مارکس) بووە، بڕوانە: الموسوعة الميسَّرة، ص ٦٩، ٧٠.

www.alibapir.com







پرسیارێکیان لە (ڕیتشارد داوکینز) کردوە، کە ئایا کەسێك زینا لەگەڵ مەحرەمەکان(محارم)ی دا، بکات، واتە: لەگەڵ دایکی، لەگەڵ خوشکی، لەگەڵ کچی؟ تۆ هەڵوێستت لە بارەیەوە چییە؟ گوتوویەتی: لە ڕووی عورفییەوە خراپە!

ناتوانێ هیچ شتێکی دیکە بێنێتەوە، چونکە خوا دەفەرموێ: حەڕامە و، وەحیی خوا دەفەرموێ: حەڕامە، بەڵام وەختێك خوا و وەحیی و شەریعەت لە ئارادا نەمان، هیچ واتایەك نامێنیتەوە بۆ حەڕام و حەڵاڵ، ئەو ئافرەتە کەیفی بەو پیاوە دێ، یان ئەو پیاوە کەیفی بەو ئافرەتە دێ، کەیفی خۆیانە داخۆ خوشك و بران، یان چین؟! بۆیە لە ڕووی خێزانیی و کۆمەڵایەتییەوەش، خواناسیی پێویست و گرنگە و، مرۆڤایەتیی پەکی لەسەری کەوتوە.

## ٥- لە ڕووی ئابووریی و گوزەرانەوە:

هەروەها ئیمان و خواناسیی، بناغەی ژیانێکە کە خەڵك تێیدا یەکسان بن، تێیدا ئازاد بن، دادگەریی ئابووریی تێدا بچەسپێ، بۆچی؟ چونکە بە هۆی خواناسییەوە، مرۆڤەکان یەکسان دەبنەوە لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانی خوادا؟ یەکسان دەبنەوە لە بەرانبەر خوادا، وەك بەندە، هەروەها یەکسان دەبنەوە لە بەرانبەر چاکە و نیعمەتەکانی خوادا، کە هەموویان وەك یەك بەشیان پێیانەوە هەیە، بەڵام ئەگەر ئیمان لە ئارادا نەبێ، خواناسیی لە ئارادا نەبێ، ئەو کاتە بە شێوەیەکی دیکە مامەڵە دەکرێ، وەك دوایی باسی دەکەین.

www.alibapir.com





## ٦- لە ڕووی سیاسییەوە:

هەروەها ئیمان و خواناسیی بناغەی دادگەرییە لە ڕووی حوکمڕانیی و سیاسییشەوە، خوا (سبحانە وتعالی) لە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سووڕەتی (الأنبیاء)دا باسی ئەوەمان بۆ دەکات، کە هەموو پێغەمبەرانمان ناردوە بۆ ئەوەی خوا تاکە پەرستراوی مرۆڤەکان بێ و، تەنیا بەندایەتیی بۆ ئەو بکەن.

لە ئایەتی (٢٥)ی سووڕەتی (الحدید)یشدا خوا دەفەرموێ: هەموو پێغەمبەرانمان صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، ڕەوانە کردوە تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچێ.

لە سووڕەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ٢٥﴾.

واتە: لە پێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێكمان ڕەوان نەكردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە، کە جگە لە من هیچ پەرستراو نین و، جگە لە من بەندایەتیی بۆ کەس مەکەن.

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە ئادەمەوە تاكو خاتەم (صلی الله علیه وسلم) هاتوون بە خەڵك بڵێن: تەنیا خوا بپەرستن، تەنیا خوا شایستەی پەرستران و بەندایەتیی بۆ کرانە، ئەوی دیکە، یان وەك خۆتە، کە مرۆڤەکانن، یان لە خوار خۆتەوەن، کە ڕووەك و ئاژەڵان و ماددەی بێ ژیانن.

کەواتە: هەموو پێغەمبەران بۆ چەسپاندنی خوا بەیەکگرتن (توحید) هاتوون.

ئنجا لەو لاشەوە دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِ ٢٥﴾ الحدید.



واتە: پێغەمبەرانمان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون، بە موعجیزەکانەوە و کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچن...

ڕەنگە ئەگەر بە سەرکێڵیی تەماشای ئەو دوو ئایەتە بکرێ بگوترێ: تێك دەگیرێن و دژ بە یەکن؟! چونکە:

ئایەتی (٢٥) لە سوورەتی (الأنبياء) دەفەرموێ: هەموو پێغەمبەران هاتوون، کە خەڵك تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن.

ئایەتی (٢٥) لە سوورەتی (الحديد)یش دەفەرموێ: هەموو پێغەمبەران هاتوون، کە خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن!! بەڵام وانیە چونکە: تەنیا خوا پەرستن (توحید) بناغەی دادگەرییە و، ئەگەر خەڵك هەمووی بەس خوا بە پەرستراو دابنێ و، هەموویان بەندەی خوا بن، پێکەوەش تەبا دەبن، کەواتە: دادگەریی کاتێك دەچەسپێ، کە خواناسیی و ئیمان و تەوحید لە ئارادا هەبێ.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## ٧- لە ڕووی تەبایی نەتەوەكانەوە:

لە ڕووی ئاشتەوایی نێوان مرۆڤایەتییشەوە، خواناسیی و ئیمان گرنگە و، لە ڕاستییدا ئیمان و خواناسیی بناغەی تەبایی و پێكەوە ژیانی نەتەوەكانە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (الحجرات) لە ئایەتی (١٣)دا دەفەرمویٚ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾.

واتە: ئەی خەڵكینە! ئێوەمان لە نێر و مێیەك وەدیهێناوە، دوایی گێڕاومانن بۆ چەند نەتەوە و هۆزێك تاكو پێك ئاشنابن، بەڕێزترتان لەلای خوا پارێزكاترتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

كەواتە: كەس لە كەس گەورەتر نیە و، هیچ كەسێك بۆی نیە بە هۆی ئینتیمای بۆ نەتەوەیەكی دیارییكراوەوە، خۆی بەسەر كەسێكی دیكەدا هەڵكێشیٚ، كە ئینتیمای بۆ نەتەوەیەكی دیكەی هەیە، هەموو نەتەوەكان و هەموو هۆز و تیرەكان، بە ویستی خوا دروست بوون و، هەمووشیان دەچنەوە سەر دایك و بابێك، كە ئادەم و حەووان صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
كەناڵی ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر





## باسی سێیەم



# زیـان و شوێنەوارە شوومەکانی ئیلحاد

### دەستپێك

زیان و شوێنەوارەکانی ئیلحاد زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە لێرەدا لە حەوت کورتە خاڵدا بە گوشراویی باسیان دەکەین:

### ١- لە ڕووی فیکریی و دۆزینەوەی ڕاستییەکانەوە:

وەك پێشتریش باسمان کرد، ئەگەر ئیلحاد تەبەننیی بکرێ، هیچ ڕاستییەك بوونی نابێ، نە سەرەتا عەقڵییەکان، لە پێش هەموویانەوە: یاسای هۆکاریی، کە یاسای هۆکاریی (قانون السَّببيَّة) بناغەی هەموو دۆزینەوەکانە، بناغەی هەموو زانستێکە، هەروەها نە یاسای: (هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە)، هەروەها ئینسان کە کاتێك ئیلحاد تەبەننیی دەکات، چەقێکی نیە بۆی بگەڕێتەوە لە ڕووی فیکریی و عەقڵییەوە.

www.alibapir.com



## ٢- لە ڕووی ڕەوشت و بەهایەکانەوە:

لە ڕووی ڕەوشت و بەهایەکانیشەوە، لە سایەی شوومی ئیلحاددا، هەموو شتێك ڕەوایە و جیاوازیی نیە لە نێوان: هەق و بەتاڵ، ڕاست و چەوت، ستەم و دادگەریی، حەڵاڵ و حەڕام، تێکدان و ئاوەدان کردنەوەدا، هەمووی یەکسان دەبێتەوە، ئەگەر حیساب بۆ خوا نەکرێ و حیساب بۆ ڕۆژی دوایی نەکرێ، ئەو کاتە مرۆڤ تەماشا دەکات: ئەم تۆزە ژیانە دنیاییەی ئێستای چۆن خۆشتر لێ دەگوزەرێ، وا دەکات، با لەسەر حیسابی تێکدانی وڵات و، لەسەر حیسابی تێکدانی ئاسوودەیی خەڵکییش بێ و، بە هۆی خوێنڕێژیی و، ماڵ زەوتکردنی خەڵك و، بە هۆی گوناە و تاوان و خراپەکارییشەوە بێ.

## ٣- لە ڕووی دەروونییەوە:

زیان و شوێنەواری شوومی ئیلحاد زۆر و جۆرا و جۆرن و، خراپترینیان ئەوەیە کە لە ڕووی دەروونییەوە، مرۆڤ تووشی دڵە ڕاوکە و بێ ئامانجیی و ڕەشبینیی و تاریك بینیی دەکات: تەماشای ڕابردووی خۆی دەکات، هەر تاریکە، نازانێ لە کوێ هاتوە؟ تەماشای ئێستای دەکات، تاریکە، نازانێ بۆچی هاتوە؟ ئەرکی چییە و بۆچی دروستکراوە؟! حیکمەت لە بوونی چییە؟! تەماشای داهاتووی خۆی دەکات، هەر تاریکە و نازانێ بۆ کوێ دەچێ؟

واتە: کەسێك لە سەرووی خۆیەوە نابینێ، مشوورخۆری بێ، خەم خۆری بێ، پەروەردگاری بێ، تەگبیرکاری بێ، بۆیە زۆر لە مولحیدەکان ئەوانەی کە زۆر بە ئیلحاددا چوونەتە خوار، سەرەنجامیان بریتیە لە خۆ کوشتن، وەك لە ژمارەیەك لە مولحیدەکان ڕوویداوە.

www.alibapir.com


## ٤- لە ڕووی خێزانیی و کۆمەڵایەتییەوە:

پێشتریش باسمان کرد کە زیان و شوێنەوارێکی شوومی ئیلحاد، بریتیە لە هەڵوەشانەوەی خێزان و پچڕاندنی پەیوەندییەکان، چونکە ئەوەی کە واتا پەیدا دەکا بۆ خێزان، پێش هەموو شتێك ئەوەیە کە ئەو ژن و پیاوە بۆ یەك حەڵاڵن، لەبەر ئەوەی لەسەر بناغەی گرێبەستێکی شەرعیی پێکەوە هاوسەرگیرییان کردوە، وەك لە ئایین دا[1] هەیە، ئنجا وەختێك وەحیی نەبێ، ئەوە هیچ واتایەکی نامێنێ کە بگوترێ: ئەوانە باب و دایکن، دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێ، ئەوانە نەنك و باپیرن، ئەوانە مام و خاڵن، ئەوانە پوور و پلکن، ئەوانە کوڕو کچن، ئەوانە خوشك و بران، ئەوانە خزمن، ئەوانە دراوسێن، هەموو ئەو بەهاو ئاکارە خێزانیی و کۆمەڵایەتییانە، لە سایەی شوومی ئیلحاددا لە بەین دەچن و، هیچ واتایەك نامێنێتەوە نە بۆ خزمایەتیی، نە بۆ ڕێزی باب و دایك، نە بۆ ڕەحم و بەزەیی، نە بۆ چاکەکاریی، هیچ واتایەك نامێنێتەوە لە سایەی ئیلحاددا، بۆ هیچ ڕەوشت و بەهایەك.

## ٥- لە ڕووی ئابووریی و گوزەرانەوە:

لە حاڵێکدا کە خواناسیی و ئیمان بناغەی ئابوورییەکی یەکسانە بۆ مرۆڤەکان، کە لە بەرانبەر نیعمەتەکانی خوادا هەموویان خۆیان یەکسان ببیننەوە، بە پێچەوانەوە: لە سایەی شوومی ئیلحاددا، قڕیی و پڕیی، چینایەتیی و، هەر کەس بۆ خۆی و، هی خۆم بۆ خۆم، هی تۆش دەخۆم، دێتە ئاراوە، وەك ئێستا لە واقیعی جیهانی سەرمایەداریی و لە سایەی کاپیتالیزمدا دەبینین:

---

(١) ئایین (دین) بە مانا و چەمکە عورفیی و باوەکەی، ئەگەرنا مانای ئەسڵیی (دین) بەرنامە و ڕێبازی ژیانە، هەرچییەك بێ و لە هەر کەسێکەوە بێ.

www.alibapir.com





که (٥٪)ی واریداتی دنیا، هی (٩٥٪)ی خەڵکە و، (٩٥٪)ی واریداتی دنیا بە تایبەت لە جیهانی سەرمایەدارییدا، هی (٥٪)ە!

کە ئەوە شتێکی زۆر زەقە و ئیلحاد و خوانەناسیی و بێ ویژدانیی و لە خوا دوورکەوتنەوە، ئا ئەوەی بۆ بەرهەم هێناوین، وێڕای ئەوەی کە لە ڕووی جەنگ و کوشتاریشەوە، دیارە ئیلحاد چی بەرهەم هێناوە! هەروەها لە ڕووی بەرهەم هێنانی چەکی کۆ کوژیشەوە، شارەزایانی بواری چەك و تەقەمەنی دەڵێن: زلهێزەکان بە تایبەت ئەوانەی مافی (ڤیتۆ)یان هەیە واتە: (ئەمریکا و بەریتانیا و فەڕەنساو ڕووسیاو چین) ئەو پێنج دەوڵەتە بایی هێندە چەکی کۆ کوژیان هەیە، بە تایبەت چەکی نێوکیی، کە حەوت جاران هەموو خەڵکی سەر زەوی پێ قەلاچۆ بکرێ!! ئەوەش بەرهەمی زانستێکە - هەرچەندە زانست بۆ خۆی شتێکی باشە - بەڵام زانستێك بە دەست ئەهلی کوفر و ئیلحادەوە بێ، ئا ئەوە بەرهەم دێنێ.

## ٦- لە ڕووی حوکم و سیاسەتەوە:

هەروەها لە سایەی ئیلحاددا، چەوساندنەوەو خۆ سەپاندن، حاکم دەبێ، با چەند وێنەیەکی خێرا بێنینەوە:

ئەدیبێکی ناوداری ڕووسیی بە ناوی: (ألكسندر سولجنستين) خاوەنی پاداشتی نۆبڵ دەڵێ: لە ماوەی حوکمی بەلشەفیی دا (٥٥) ملیۆن کەس لە یەکێتی سۆڤیەتی لە بەین چوون، کە لە سەردەمی (لینین)دا دەستی پێکرد و تەنیا لە پەلاماری پاککردنەوە (حملاتُ التطهير)دا، لە ماوەی ساڵانی: (١٩٣٦ - ١٩٣٩) دا، لە ماوەی (٣) ساڵدا: (٨ - ١٠) ملیۆن کەس لە یەکێتی سۆڤیەت قەلاچۆ کران، هەر لەبەر ئەوەی دەیانگوت: نەیاری فیکری مارکسیزم لینینیزمین![1]

---

(١) لە سەردەمی حوکمڕانیی ستالین دا: (١٩٢٤-١٩٥٣)، دەوری (٢٠)بیست ملیۆن کەس کوژراون، بڕوانە: (وهم الشيطان: الإلحاد ومزاعِمُهُ العلمية)، دیفید بیرلینسکیی ص٥٢.

www.alibapir.com





ئنجا (لینین) شەش شتی بە تاوان دانا بوون، لەو تاوانانەی کە خەڵکیان لەسەر ئیعدام بکرێ، یەکێك لەوانە: بانگەشەی دژی بیری شیوعیی و ئیلحادیی بوو، کە لە ساڵی (١٩٢٢ز)دا، ئەو یاسایەی دەرکرد.

هەروەها لە چین بە ناوی شۆڕشی کلتووریی (ماوزی دونگ)[1] (Maozedong) چل (٤٠) ملیۆن کەسی کوشت لە ماوەی حوکمی خۆیدا[2].

لە کۆتایی ساڵی (٢٠١٠ز)دا، چووم بۆ (کەمبۆدیا) و چووم بۆ پایتەختەکەی (پنۆمنە) لەوێ قەڵای کەللە سەرانیان دروستکردوە، کە کاتی خۆی (پۆڵپۆت) ژمارەی خەڵکەکە کە نزیکەی دە (١٠) ملیۆن بووە، دەوری سێ (٣) ملیۆنی لێ کوشتوون، واتە: (٢٢٪)، یاخود زیاتری خەڵکی کەمبۆدیای ئیبادە کردوە، لەبەر ئەوەی بە پێچەوانە و نەیاری خۆی زانیون[3] کە مارکسیی بووە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) زیاتر بە (ماوتسی تۆنگ) گۆ دەکرێ، ئەگەرنا لە ڕاستیی دا (ماوزی دۆنگ)ە.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٥٣، بەڵام خاوەنی کتێبی: (موسوعة الردّ على الملحدين) د.هیثم طلعت، لە (ص٥٩) دا، دەڵێ: (٥٠)پەنجا ملیۆن کەس کوژراون، هەروەها هەمان سەرچاوە دەڵێ: لە نێوان ساڵانی: (١٩٤٩-١٩٧٥ز)دا، (٢٦) بیست و شەش ملیۆن مسوڵمانی چینی لە تورکە ئیگۆرییەکان کوژراون.

(٣) بەڵام (وهم الشيطان...) لە (ص٥٣)دا، دەڵێ: لە نێوان ساڵانی: (١٩٧٥-١٩٧٨)دا: (١،٦٥٠،٠٠٠) ملیۆنێك و شەست و پەنجا هەزار کەس کوژراون!

www.alibapir.com





## ٧- لە ڕووی نەتەوەکان و مرۆڤایەتییەوە:

هەروەها ئیلحاد شوێنەوارێکی زۆر شوومی هەیە لە ڕووی پێکەوە ژیانی نەتەوەکان و، ئاشتیی نێوان مرۆڤایەتییەوە، چونکە جەنگ و کوشتارێکی زۆر بە هۆی ئیلحادەوە پەیدا دەبێ و پەیدا بووە، بۆ وێنە:

ئەمریکا لە دە (١٠) ملیۆن لە هیندە سوورەکان، تەنها دوو سەد هەزار (٢٠٠،٠٠٠) کەسی لێ هێشتنەوە، لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا و، هەموو ئەوانی دیکە قەلاچۆ کران و بنبڕ کران[1].

ژمارەیەکی زۆر لە ڕەش پێستەکانی ئەفریقیای وەك کۆیلە هێنا، بۆ ئەوە ئەمریکایان پێ ئاوەدان بکاتەوە.

خەڵك دەپرسێ: ئەو ڕەش پێستانە چی دەکەن لە ئەمریکا؟

کاتی خۆی پێشینانیان هەموو بە کۆیلایەتیی هێنراون و، ئەوانەی ئێستا بەرهەمی زاوزێی ئەوانن، وەچەی ئەوانن!

لە جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەمدا، بە پێی هەندێك سەرژمێر: دوو سەد و پازدە (٢١٥) ملیۆن کەس، کوژراو و بریندار و کەمئەندام هەبوون، حەفتا (٧٠) ملیۆن کەس، لەوانە کوژراون، یانی: (٥٪)ی خەڵکی جیهان لەو دوو جەنگەدا لەبەین چوو ون، کە جەنگەکان لە نێوان هیتلەر و مۆسۆلێنی لە لایەك و، ستالین و زلهێزەکانی دیکە لە لایەکی دیکەوە، ڕوویاندا.

پاشان لە ئەڵمانیا لە ساڵی (١٩٣٣)دا هیتلەر بڕیارێکی دەرکرد کە چوار سەد هەزار (٤٠٠٠٠٠) گەنج بە بیانووی ئەوەی کە نەخۆشییان هەیە، دەبێ

---

(١) (موسوعة: الرد على الملحدين العرب) ص٢٤٨،٢٤٩.

نەزۆك بكرێن و، بە شوێنێكیاندا تێپەڕاندن، كە تیشكی (X)ی زۆر بە قووەتی لێبوو و نەزۆكی دەكردن[١].

دیارە سووتاندنی جوولەكەكانیش كە (هۆلۆكۆست)ی پێ دەڵێن، ئەگەر ئەوەش ڕاست نەبێ كە جوولەكە دەڵێن: شەش(٦) ملیۆنیان لێ سووتێنراوە، بەڵام بە لای كەمەوە ملیۆنێك، یان زیاتر یان كەمتریان لێ سووتێنراوە.

ئەوەش تەنیا لوێچێك لە تەغارێكی مامەڵەی ئەوانە كە خوانەناس و مولحیدن، لەگەڵ نەتەوەكان و، لەگەڵ مرۆڤایەتییدا.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥٠، هەروەها: (وهم الشيطان: الإلحاد ومزاعِمُهُ العلمية، ص٥٢).

www.alibapir.com



# باسی چوارەم

## فەلسەفە لە بارەی ئیمان و ئیلحادەوە چی گوتوە؟!

### دەستپێك

لەوەتەی کە مرۆڤ لەم سەرزەوییە دەژی، لەبەر ئەو هۆکارانەی کە لە پێشەکی ئەم بابەتەدا باسمان کردن: کە هەم زگماك (فطرة)ی مرۆڤ، هەم عەقڵی مرۆڤ، وێڕای واقیع، مرۆڤ ناچار دەکەن و، لەو لاوەش وەحیی بانگی دەکات بۆ خواناسیی، بۆیە لەوەتەی مرۆڤ لەم سەر زەوییە دەژی، لە هەوڵی ناسین و خۆ لێ نیزیك خستنەوەی خوای پەروەردگاردا بووە، ئنجا چەندە توانیویەتی خوا بناسێت، وەك بۆ خوا شایستەیە و، چەندە توانیویەتی خۆی لێ وە نزیك بخات و، بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، کە بۆ خوا شایستەیە، ئەوە بێگومان مرۆڤ لەوەدا هەم سەرکەوتنی هەبووە، هەم شکستی هەبووە، سەرکەوتنەکانی کاتێك بوون کە پابەند بووە بە وەحییەوە، بەو پەیامەوە کە خوا بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی و، شکستەکانیشی لەو کاتەدا بوون، کە وەحیی نادیدە گرتوە، یاخود دەستی نەگەیشتوە بە پەیامی خوا (سبحانە وتعالی).

ئێمە لە سێ خاڵی سەرەکییدا باسی فەلسەفە دەکەین:

خاڵی یەکەم: پێناسەی فەلسەفە.
خاڵی دووەم: پەیوەندیی نێوان فەلسەفە و زانستەکان.
خاڵی سێیەم: فەلسەفە کەلەپوورێکی هاوبەشی بەشەرە.

www.alibapir.com


## خاڵی یەکەم: پێناسەی فەلسەفە:

لێرەدا چوار پێناسەی شارەزایان و پسپۆڕانی ئەو بوارەمان هێناون:

**یەکەم:** کتێبی (تأريخُ الفلسفة)ی (إبراهيم الزيني)[١] هەم ئەویش و، هەم سەرچاوەکانی دیکەش هەموویان دەڵێن: وشەی فەلسەفە لە ئەسڵدا وشەیەکی یۆنانییە (فیلۆسۆفیا) لە دوو وشە پێکهاتوە (Phillia) واتە: (مُحِبّ) خۆشویست، یان خوازیار (Sophia)، واتە: حیکمەت.

کەواتە: فەیلەسووف (فیلۆسۆفیا) کەسێکە کە حیکمەتی خۆشدەوێ و، (فەلسەفە) یانی: خۆشویستنی حیکمەت.

ئنجا پسپۆڕانی بواری فەلسەفە دەڵێن: (فیساغۆرس) زانای ماتمیك و فەیلەسووفی یۆنانیی، کە لە سەدەی شەش (٦)ی پێش زایندا ژیاوە، یەکەمین کەس بووە کە ئەو وشەیەی بەکارهێناوە، هەندێکیش، دەڵێن (طاليس) کە دواتر ئاماژەیەکی پێ دەکەین، ئەو یەکەمین کەس بووە ئەو وشەیەی بەکارهێناوە.

وەك لە: (الموسوعة الفلسفية المُختصرة)دا هاتوە، کە لە ژێر چاودێریی دکتۆر (زكي نجيب محمود)ی میسرِیی دا، وەرگێڕراوە، دیارە دەستەیەکی ئەورووپایی دایانناوە، بەڵام دوایی لە ژێر چاودێریی ئەودا تەرجەمە کراوە[٢]، دەڵێ:

(لَعَلَّ الأَفْضَلَ أَنْ تُتَرْجَمَ فيلوسوفيا إلى مَحَبَّةِ المَعْرِفَة) واتە: ڕەنگە باشتر وابێ (فیلۆسۆفیا) بە: خۆشویستنی زانست و زانین، وەرگێڕرێ، یانی: ئەو وشەی (مَعرفة)ی پێ نزیکترە لە واتای (فیلۆسۆفیا) لە وشەی حیکمەت، دیارە حیکمەت و مەعریفەش خاڵی هاوبەشیان زۆرن.

---

(١) ص١٧.

(٢) ص٤.

www.alibapir.com





**دووەم:** خاوەنی کتێبی: (الفَلْسَفَة الإِسْلَامِية دِرَاسَة نَقْدِية مُنْتَخَبَة)، (د. سعدون محمود ساموك)[١]، دەڵێ: (الفَلْسَفَةُ: هِيَ العِلْمُ الَّذِي يُبحَثُ فِيهِ عَنْ حَقَائِقِ الْأَشْيَاءِ، وَعَلَى مَا هِيَ عَلَيْهِ بقَدَرِ الطَّاقَّة البَشَرِيَّة).

واتە: فەلسەفە بریتیە لەو زانیارییەی کە تێیدا لێ دەکۆڵدرێتەوە دەربارەی چییەتی شتەکان، بەو شێوەیەی کە لە واقیعدا لە سەرینی، بە ئەندازەی توانای مرۆڤ.

**سێیەم:** دکتۆر (مُحَمَّد يوسُف مُوسى) لە سیاقی چەند قسەیەکدا دەڵێ:

(الفَلْسَفَةُ: هِيَ المَعْرِفَةُ الحَقَّةُ للهِ وَالكَوْنِ السَّمَاوِي وَالأَرْض وَالإِنْسَان، أَو: هِيَ نَظر العَقْلِ فِي تَفْكيرِهِ الَّذِي يُرَادُ بِهِ مَعْرِفَةُ حَقَائِق الوُجُودِ فِي العَالَمِ الأَكْبَر المُحِيط بالإِنْسَان، وَالعَالَمِ الأَصْغَرِ الَّذِي هُوَ الإِنْسَان، وَالمبْدَأ الأَوَّلِ لِذَلكَ كُلِّه)[٢].

واتە: فەلسەفە بریتی بووە لە ئاشنایی ڕاستەقینە بە خوا، یان هەوڵدان بۆ ناسینی خوا و، ئەو گەردوونە ئاسمانییە و، زەوی و، مرۆڤ، یاخود بریتیە لە تێفکرینی عەقڵ و بیرکردنەوەی، کە مەبەست لێی: پەیبردن بووە بە ڕاستییەکانی بوون، چ لە جیهانی گەورەدا، کە دەوری مرۆڤی داوە، (واتە: گەردوون و دەوروبەر) و چ لە جیهانی بچووکدا، کە مرۆڤ خۆیەتی و، سەرەتای ئەوە هەمووی (واتە: سەرچاوەکەی کە بریتیە لە خوا (سبحانه وتعالى)).

شایانی باسە کە فەلسەفە لە شتە بنەڕەتەکانی کۆڵیوەتەوەو نەچۆتە وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانە، بۆ وێنە: ئیشی فەیلەسووف نەبووە بزانێ ناوی دراوسێیەکانی چییە؟ یان فڵان خواردنە چۆن ئامادە دەکرێ؟ فڵان شەربەتە چۆن دەگیرێتەوە؟ بۆیە باسی وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانە، نەچۆتە نێو جوغزو بازنەی گرنگیی و بایەخی فەلسەفەوە.

---

(١) ص٢١.

(٢) القُرْآنُ وَالفَلْسَفة، ص١١.

www.alibapir.com







**چوارەم:** (الموسوعة العربية)ش[1] بەو شێوەیە پێناسەی فەلسەفە دەکات:

(الفَلْسَفَة لُغوياً: فيلوسوفيا محبة الحِكْمَة، إِصْطِلَاحاً: العِلْمُ الَّذِي يبحثُ فيهِ عَنْ حَقائق الأَشْيَاءِ وَمَبَادِئها عَلَى مَا هِيَ عَلَيْهِ بقَدَرِ الطَّاقَةِ البَشَرِيَّة، وَالعَمَلِ بِمَا هُوَ أَصْلَح).

واتە: فەلسەفە لە ڕووی زمانەوانییەوە فیلۆسۆفیا، یانی: خۆشویستنی حیکمەت، یان خۆشویستنی زانست.

لە ڕووی زاراوەییەوە: ئەو زانیارییەیە کە تێیدا لێ دەکۆڵرێتەوە لە بارەی چییەتی شتەکانەوە و سەرەتایان، بەو شێوەیە کە لە واقیعدا هەن، بە ئەندازەی توانای مرۆڤ و، کارکردنی بەوە کە باشترە و چاکترە.

واتە: ئەم پێناسەیە تەنیا پەیپێبردن و دەرککردن بە کاری فەیلەسووف نازانێ، بەڵکو کارکردن بەوەش کە باشترە، واتە: دەیکات بە دوو بەشەوە: هەم تیۆریی و هەم کردەیی.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) ج١٢، ص٦٦٢.

www.alibapir.com





## خاڵی دووەم: پەیوەندیی نێوان فەلسەفەو زانستەکان:

ئایا فەلسەفە لە کوێی زانستەکان (المعارف والعلوم)ە، بە گشتی و، چ پەیوەندییەکی پێیانەوە هەیە؟

(د. كميل الحاج) خاوەنی (الموسوعة المُيَسَّرة في الفِكر الفلسفي والإجتماعي)[1]، هەروەها (الموسوعة العربية)[2]، هەردووکیان دەڵێن:

(فِي السّابق كَانَت جَمِيع العُلُوم الخَاصّة كالفيزياء وَالفَلَك والرّياضيات، وَعِلْم النَّفْس، كَانَت منضوية تَحْتَ لِوَاء الفَلْسَفَة ... وَاسْتَمّر اقتران العلُوم بالفَلْسَفَة حَتَّى مطلع القَرن السَّابع عَشَر..).

واتە: لە ڕابردوودا پەیوەندیی هەموو زانستەکان وەك: فیزیا، گەردووناسیی، ماتماتیك، دەروونزانیی، هەموو ئەو زانیارییانە لە ژێر ئاڵای فەلسەفەدا بوون و، فەلسەفە ناوی گشتی و ناوونیشانی گشتی بووە بۆ هەموو زانستەکان، ئنجا ئەو پێکەوە بوون و جووت بوونەی فەلسەفە و زانستەکان بەردەوام بووە، تاکو سەرەتای سەدەی حەڤدەیەم.

هەڵبەتە ئەو مەسەلانە لە بۆ چوونی زانایەکەوە بۆ یەکی دیکە، جیاوازییان هەیە، بۆ وێنە:

هەندێکیان دەڵێن: لە سەدەی نۆزدەیەم (١٩)دا بوو، کە زانستەکان و فەلسەفە لەیەك پچڕان بە یەکجاریی.

کەچی یەکێکی دیکە دەڵێ: نەخێر ئەوە لە سەدەی حەڤدەیەمدا بوو، هەڵبەتە ئەو شتانە ڕێژەیین و زیاتر لە بۆچوونێك هەڵدەگرن، گرنگ ئەوەیە

---

(١) ص٤٠٧.

(٢) ج١٤، ص٦٠٣.



لە ڕابردوودا کە گوتراوە: فەیلەسووف، یان حەکیم، وای لێ چاوەڕوان کراوە لە هەموو زانستەکان سەردەر بکات و شارەزابێ: لە زانستە بنەڕەتییەکان، دەربارەی گەردووناسیی، دەربارەی فیزیا، دەربارەی زەوی ناسیی، دەربارەی مرۆڤناسیی، دەربارەی پزیشککەریی، دەربارەی مۆسیقا، بۆ وێنە: (إبن سینا) کە فەیلەسووفێك بووە، هەم پزیشك بووە و، کتێبێکی گەورەی داناوە لە (طب)دا بە ناوی (القانون)، هەم مۆسیقار بووە، هەم لە ڕووی تەصەووفەوە شارەزا بووە و، هەم لە ڕووی گەردووناسییەوە قسەی کردوە.

جارێ فەیلەسووف ئەگەر بێت و شتێك دەربارەی گەردوون و بوونەوەر و مرۆڤ، نەزانێ، ئەوە هەر پێی ناگوترێ: فەیلەسووف، چونکە فەلسەفە هەر لەو شتانە دەکۆڵێتەوە.

کەواتە: لە بنەڕەتدا فەلسەفە ناوونیشانی گشتی هەموو زانستەکان بووە و، فەیلەسووف کەسێك بووە کە هەوڵی داوە لە هەموو شتەکان بزانێ، ئنجا ئەو کاتەش زانیارییەکان ئاوا زۆر و جۆراوجۆر نەبوون و لق و پۆپ و وردەکاریی زۆریان نەبووە، بۆیە هەم فەیلەسووفێکی یۆنانیی، هەم زانایەکی ئیسلامیی، هەم زانایەکی چینیی، یان هیندیی، هەوڵی داوە کە دەربارەی هەموو ئەو شتانەی هەن: لە خودی خۆیدا، لە دەوروبەریدا، شارەزایی و بەرچاوڕوونیی هەبێ و بتوانێ هەڵیان بسەنگێنێ و، ڕاوبۆچوونی تایبەتیی خۆی لە بارەیانەوە بڵێ، بەڵام دوایی وردە وردە بە تایبەت کە زانستە ئەزموونییەکان (العلوم التجربیة) پێشکەوتن، وای لێ هات هیچ کەس نەتوانێ دەورەی هەموو زانستەکان بدات، بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ تاکو زانست بەرەو پێشەوە دەچێ و لق و پۆپی زیاتر لێ دەبێتەوە: پسپۆڕیی لە زانستێکی دیاریی کراودا، یاخود لە لقێکی زانستێکی دیاریی کراودا، زیاتر دەبێ و، دەورەدانی هەموو زانستەکان کەمتر دەبێتەوە.

www.alibapir.com





## خاڵی سێیەم: فەلسەفە کەلەپووریێکی هاوبەشی بەشەرە:

فەلسەفە بریتیە لە هەوڵی مرۆڤ بۆ دەرککردنی بوون (معرفة الوجود): ئاشنابوون بە خۆی، ئاشنابوون بە خوا، ئاشنابوون بە بوونەوەر و گەردوون، بە دەوروبەری و پەیپێبردنی ڕاستییەکان، فەلسەفە بەرهەمی ئەو هەوڵانەی مرۆڤە و، ئەوەش دەبێ کەلەپووریێکی هاوبەشی بەشەر بێ، بۆچی؟! چونکە هەموو مرۆڤەکان خوا عەقڵی پێداون، هەموو مرۆڤەکانیش خولیای ئەوەیان هەیە کە لە خۆیان تێبگەن و لە بوون تێبگەن و، خوا بناسن و، وەڵامی ئەو پرسیارانەیان دەستکەوێ:

١- من کێم؟

٢- ئەم دەرووبەر و گەردوونە چییە؟

٣- کێ خاوەنمانە؟

٤- لە کوێوە هاتووین؟

٥- من بۆچی هاتووم؟

٦- بۆ کوێ دەچم؟

٧- دەبێ چی بکەم؟

٨- چاکە چییە؟

٩- خراپە چییە؟

هەموو کەس، هەموو مرۆڤێك بە زگماك و خوارِسك عەوداڵ و تینووی وەڵامی ئەو پرسیارانەیە، فەلسەفەش بریتیە لە هەوڵدان بۆ پەیداکردنی وەڵامی ئەو پرسیارانە، دیارە بە دوور لە وەحیی، چونکە وەحیی حازر و بزر وەڵامی ئەو پرسیارانەی خستۆتە دەستی مرۆڤ، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵام کە دەگوترێ: فەلسەفە، واتە: بەکارهێنانی مرۆڤ بۆ عەقڵی خۆی، بە مەبەستی



پەیداکردنی وەڵامی ئەو پرسیارە مەزنانە، ئەو پرسیارە زگماك و خوارِسکانە، کە هەموو مرۆڤێك ئەو پرسیارانەی لە عەقڵ و هۆشدا هەن، هەر بۆیەش فەلسەفە کەلەپوورێکی هاوبەشی هەموو بەشەرە، بە هەموو نەتەوەکانەوە.

کەواتە: کە زیاتر وشەی (فەلسەفەی یۆنانیی) باوە، لە ڕاستییدا ئەوە هیچ بنەمایەکی نیە، بەڵێ یۆنانییەکان - وەك دوایی ئاماژەی پێ دەکەین - گرنگیی زۆریان داوە بە فەلسەفە، بەڵام ئەوە مانای وا نیە کە فەلسەفە لەسەر ئەوان قۆرخ کراوە، تەنیا ئەوان بیریان کردۆتەوە لە: خۆیان و، لە دەوروبەریان، لە گەردوون![1]

(ویل دیورانت) خاوەنی کتێبی (قِصَّة الحَضارَة) کە کتێبێکی چل، پەنجا (٤٠-٥٠) بەرگییە، چەند چاپێك کراوە، لە هەندێ چاپاندا چل بەرگە و، لە هەندێ چاپاندا پەنجا بەرگە، باسی مێژووی بەشەر دەکات، مێژووی شارستانێتیی بەشەر، دەڵێ:

شارستانییەتەکانی ڕۆژهەڵات (مەبەستی پێ هیند و چین و فارس و میزۆپۆتامیا و میسرٍ و شام و هەموو ئەوانەیە)، پێش شارستانییەتی یۆنان کەوتوونەوە، لە هەشت بواراندا:

١- بواری دین.

٢- بواری کردەوە.

٣- بواری ڕێکخستنی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی.

٤- بواری ڕەوشت و ئاکار.

٥- بواری زانست.

٦- بواری فەلسەفە.

٧- بواری ئەدەب.

٨- بواری هونەر.

---

(١) ئەوە یەکێکە لەو مەسەلانەی کەمتر بینیومە - ئەگەر نەڵێم: هەر نەمدیوە - پێشتر ئاماژەی پێکرا بێ.

www.alibapir.com





واتە: لە هەموو ئەو بوارانەدا کە جێی گرنگیی و بایەخیی بەشەرن، شارستانییەتەکانی ڕۆژهەڵات پێش شارستانیی یۆنان کەوتوونەوە، باسی ڕۆژئاواشی نەکردوە بە گشتی، بۆ وێنە: ڕۆمانەکان، چونکە یۆنانییەکان لە پێش ڕۆمانەکانەوە بوون و، ڕۆمانەکان زیاتر میراتگری گریك و یۆنانییەکان بوون، بە تایبەت لە ڕووی بیرکردنەوەی فەلسەفییەوە.

ئنجا ئێمە ئاماژە دەکەین بە شەش لەو شوێنانە، یاخود لەو نەتەوانەی کە گرنگییان داوە بە فەلسەفەو بیرکردنەوەی فەلسەفیی و پەیپێبردنی نهێنییەکانی بوون (إِدراك أسرار الوجود)، هەڵبەتە مەرج نیە وشەی فەلسەفە بەکارهاتبێ، بەڵام نێوەڕۆك و جەوهەری فەلسەفە باس و خواسی بووە، کە بریتی بووە لە هەوڵی مرۆڤ بۆ پە یبردن بە نهێنییەکانی گەردوون و ژیان، نهێنییەکانی بوون.

## یەکەم: (مصر):

شوێنێکی زۆر دێرینە لەو ڕووەوە، چونکە لە کۆتاییەکانی هەزارەی پێنجەمی پێش زایین، یانی: پێنج هەزار (٥٠٠٠) ساڵ پ.ز، واتە: حەوت هەزار (٧٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش میسرییەکان لەو بارەوە قسەو باسیان بووە، وەك كتێبی: (تأريخُ الفَلْسَفَة مِنْ قَبلِ سُقْرَاط إلى مَا بَعْدَ الحَدَاثَة)ی (إبراهيم الزيني)[1] دەڵێ:

١- میسرییەکان لە بارەی پەروەردگاریتیی، کە کێ خاوەنی ئەم بوونەیە؟ قسەیان کردوە، کە هەیانبووە خوا بەیەکگر و خواناس بووە، هەشیانبووە بتپەرست بووە، یاخود بڕوای بەوە هەبووە کە چەند پەرستراوێك هەبن.

٢- هەروەها لە بارەی ئەوەوە کە سەرەتای هاتنی ئەم بوون و گەردوونە، ئایا یەك خوای تاکە، کە هەموو شتێکی وەدی هێناوە و، سەرپەرشتیی هەموو شتێك

---

(١) ص٤٢.

www.alibapir.com







دەكات؟ یاخود چەند پەرستراوێكی جیاوازن؟ لەو بارەشەوە لێكۆڵینەوە و قسە و باسیان بووە.

٣- میسرییەكان لە بارەی مرۆڤەوە لێیان كۆڵیوەتەوە، جەستەی مرۆڤ، ڕووحی مرۆڤ، ژیانی مرۆڤ، مەرگی، پاشان دوای مەرگی، كە ئەوە شتێكی هاوبەش بووە لە نێوان هەموو نەتەوەكاندا، لە هەموو كۆمەڵگاكانی مرۆڤایەتیی سەر زەویدا بە گشتی، لەو بارەوە لێیان كۆڵیوەتەوە و زۆربەیان بڕوایان بەوە بووە - ئەگەر نەڵێم هەموویان - كە مرۆڤ ژیانەكەی لەم ژیانەی سەر زەویدا خوڵاصە نەبۆتەوە، بەڵكو دوای ئەم ژیانە زەمینییە، ژیانێكی دیكە هەیە، بەڵێ جەستەكەی دەبێتەوە بە خاك، بەڵام ڕووحەكەی دەمێنێ.

٤- میسرییەكان چەند پەرستراوێكیان هەبوون:

أ- (راع) كە پەرستراوی خۆریان پێ گوتوە، یانی: خۆر(شمس) كە پەرستراوی هەرە گەورەیان بووە، ناویان ناوە (راع).

ب- (ئامون)یان هەبووە، واتە: پەرستراوی شێردراوە، كە ئەمە بە بەدیهێنەری هەموو شتێكیان داناوە و، پێشی گوتراوە: پەرستراوی ئیمپڕاتۆڕ.

ج- (ئوزوریس)یان هەبووە، ئەمەش پەرستراوی خۆشویستن و هاوكاریی و ئاشتیی، بووە.

د- (ئیزیس)یان هەبووە، ئەمەش پەرستراوی ژیان، بووە.

بۆیەش من ناڵێم: خوا، چونكە خوا (سبحانە وتعالی) ناوی عەلەمە بۆ ئەو زاتەی كە تاكە بەدیهێنەر و خاوەن و پەروەردگاری گەردوون و ژیان و مرۆڤە، ئەوانیش وشەی (إلە)یان بەكارهێناوە، (إلە) واتە: پەرستراو، ئنجا دەگونجێ زیاتر لە پەرستراوێك هەبێ، بەڵام خوا هەریەكە (لا إلە إلا اللە) هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا، یانی: پەرستراوی بە هەق، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق زۆرن، بەڵام ناگونجێ زیاتر لە خوایەك زیاتر لە بەدیهێنەرێك هەبێ، كێشەی مرۆڤیش لە ژیانیدا، هەمیشە بریتی بووە لەوە: كێ پەرستراو بێ، ئایا

www.alibapir.com





بە تەنیا خوا (الله)ی بەدیهێنەر و پەروەردگار، پەرستراو (إله) بێ، یاخود لەگەڵ ئەویشدا پەرستراوانێکی دیکەش هەبن؟! کێشەی مرۆڤ لەوێدا بووە، هەر بۆیە وشەی (الله) لە زمانی عەرەبییدا، نە دووانە (تَثنية) نە کۆ (جَمع) ناکرێ، بەڵام (إله: إلاهان، إلهين، آلهة).

٥- ئنجا شایانی باسە کە لە میسڕی کۆندا (ئەخناتوون) هەبووە، کە وەك (الموسوعة الميسرة)[1]، دەڵێ:

لە ساڵی (١٣٧٢ تاکو ١٣٥٤)ی پێش زایین دا، ژیاوە و فیرعەونێکی میسڕیی بووە، لە ڕەچەڵەك (سلالة)ی هەژدەیەم و یەکەمین کەس بووە لە دنیادا، کە باسی خوا بەیەکگرتن و تەنیا یەکبوونی خوای کردوە، (ئەوە بە بۆچوونی وی، بەڵام لە ڕاستییدا وا نیە).

ئنجا دەڵێ: لە تەمەنی (٢٣) ساڵییدا بە وەزیرەکەی خۆی کە ناوی (رَعْمَس) بووە، پێی گوتوە: خوا کردوویەتی بە پێغەمبەر و ناردوویەتی بۆ بەشەر، بەو پێیە دەبێ ئەخناتوون پێغەمبەر بوو بێ، کە ئەصڵی خۆیشی ناوی (ئەمنحوتەبی چوارەم) بووە، بەڵام دوایی خۆی ناو ناوە: ئەخناتوون، کە وا پێدەچێ ئەخناتوون ناوێك بێ کە لەگەڵ خوا بەیەکگرتندا بگونجێ.

ئەو ئەخناتوونە کاتی خۆی شۆڕشی کردوە بەسەر بتەکان و بتپەرستەکاندا و، جاڕی خوا بەیەکگرتنی داوە و، شاری (ئەخیتاتون)ی کردوە بە پایتەخت لە جیاتی (طيبة) کە کاهینەکانی ئاموونی لێ بوون و، بتەکانی هەموو تێکشکاندوون و، ناوو وێنەی بتەکانیشی لەسەر دیوارەکانیش سڕیونەوە، واتە: کودەتایەکی کردوە بەسەر شیرك و بتپەرستییدا، بەڵام دوای خۆی جارێکی دیکە خەڵکەکە وازیان لە ئاینی تەنیا خوا پەرستیی هێناوە و، گەڕاونەوە بۆ چەند پەرستراویی (الآلهة المتعدِّدة)[2].

---

(١) ص ١٦.

(٢) (موسوعة الأديان في العالم)، ج١، ص١٩-٢١، (ديانات مصر القديمة).

www.alibapir.com







کەواتە: میسرییەکانیش لێیان کۆڵیوەتەوە کە مرۆڤ چییە؟ ژیان چییە؟ ئەم گەردوونە خاوەنەکەی کێیە؟ پێویستە مرۆڤ چۆن بژی و چی بکات؟

## دووەم: (میزوپۆتامیا) نێوان دوو ڕووبارەکان دیجلەو فورات:

لەو دەڤەرەش چەند شارستانییەتێك دروست بوون:

١- سۆمەرییەکان، کە لە ساڵی (٣٤٠٠) پ. ز، تاکو (٢٤٠٠) پ. ز، سۆمەرییەکان لە دەڤەری میزوپۆتامیا حوکمڕانییان کردوە و دەوڵەتیان هەبووە و، ئەوانە زیاتر دیاردە سروشتییەکانیان پەرستوون و، چەند پەرستراوێکیان هەبوون، وەك: (نیمۆ، ئینیل، ئۆتۆ، ئەتانا) ئەوانە ناوی پەرستراوە سەرەکییەکانیانن.

٢- ئەکەدییەکان، کە لە ساڵی (٢٣٦٠) پ.ز، تاکو (٢١٨٠) پ. ز، دەوڵەتیان هەبووە لە دەڤەری میزوپۆتامیا، لە نێوان دوو ڕووبارەکە، ئەوانیش زیاتر سێکوچکەیەکیان پەرستوە، واتە: سێ پەرستراو:

أ- (ئۆنۆ) گوتوویانە: ئەوە پەرستراوی ئاسمانە.

ب- (ئینلیل) گوتوویانە: ئەوە پەرستراوی هەواو زەوییە، واتە: سەرپەرشتیی هەواو زەوی دەکات.

ج- (ئانکی) گوتوویانە: ئەوە پەرستراوی دەریا و زەریاکان و ئۆقیانووسەکانە.

٣- بابلییەکان، کە لە ساڵی (١٨٣٩) پ. ز، تاکو (١٥٩٤)ی پ. ز، لە دەڤەری میزۆپۆتامیا دەوڵەتیان هەبووە و شارستانیەتییان هەبووە، ئەوانیش چەند پەرستراوێکیان هەبوون، وەك: (ئەداد، نوسکۆ، عەشتار، تەمووز، مەردۆك).

دوایی حامۆڕابی گوتوویەتی: (مەردۆك) گەورەترین پەرستراوەو، گەورەی هەموو پەرستراوەکانە، کە بە داخەوە ئەوانە زۆربەیان بڕوایان بە چەند پەرستراویی هەبووە، وا دیارە زانیویانە کە خوا بەدیهێنەر و خاوەنی هەموو کەون و کائیناتە،

www.alibapir.com



بەڵام لەگەڵ خوادا ئەوانەشیان پەرستوە، بە حساب بۆ ئەوەی لە خوایان نیزیك بخەنەوە، وەك هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، خوای تاك و پاك لێیان دەگێڕێتەوە لە سوورەتی (الزمر)دا، دەفەرموێ:

﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ ٣﴾.

واتە: نایانپەرستین مەگەر بۆ ئەوەی كە لە خوامانەوە نیزیك بخەنەوە،

٤- ئاشوورییەكان، كە لە ساڵی (١٩٠٠) پ. ز، تاكو (٦١٢)ی پ. ز، لەو دەڤەرە دەوڵەتیان هەبووە، ئەوانیش دوو پەرستراوی سەرەكییان هەبوون، ئەوانیش: (ئاشوور) و هاوسەرەكەیشی (عەشتار)، ئەمانە هەم یۆنانییەكان، هەم زۆر لەوانەی بتپەرست بوون، پێیان وابووە: ئەو پەرستراوانەی دەیانپەرستن، هاوسەرگیرییش دەكەن و، شەڕو ئاشتییان پێكەوە دەبێ، گەورەترین پەرستراوی ئاشوورییەكان ناوی (ئاشوور) بووە و هاوسەرەكەیشی ناوی (عەشتار) بووە، دەبێ عەشتار مێیەنە بوو بێ.

٥- كەنعانیی و فینیقییەكان، ئەوانیش گەورەترین پەرستراویان ناوی (بەعل) بووە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ:

﴿أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ ١٢٥﴾، (بَعل)، (بَعلَبَك)یش وا پێدەچێ بە ناوی ئەوەوە ناونرابێ، هەروەها پەرستراوێكی دیكەیان هەبووە بە ناوی (یەم) و، پەرستراوێكی دیكەش بە ناوی (مووت).

ئەمانە هەموویان، - ئەوانەی میزۆپۆتامیا، هەروەها ئەوانەی میسرییش كە باسمان كردن - بڕوایان بەوە بووە كە لە دوای مەرگ و مردنی مرۆڤ، ژیانی دیكە هەیە[1].

---

(١) موسوعة الأديان في العالم، ج١، ص٢٨ إلى ٣١. و" البَحثُ عَن الحَقيقة الكبرى" ص١٤١، ئەم دوو كتێبە زۆر وردەكارییان باسكردوە كە من زۆر بە كورتیی و بە پوختیی دەیهێنم و، مەبەستیشم لە هێنانی ئەو باسانە، ئەوەیە كە بزانرێ: مرۆڤ لە هەموو شوێنەكانی سەر زەوی كە لێیان ژیاوە، هەوڵیداوە پەی بە ڕاستییەكان بەرێ و، نهێنیی و مەتەڵەكانی بوون و گەردوون و ژیان و ئینسان بزانێ.

www.alibapir.com







## سێیەم: وڵاتی فارس (ئێران):

لە وڵاتی فارس کۆمەڵێك بیروڕاو فەلسەفە بوو ون، بەڵام لە هەموویان ناودارتر زەردەشتایەتیی بووە، کە دیارە ئەویش ئایینێکی فارسیی دێرینە و، پاڵدەدرێتە لای زەڕادەشت، کە دوایی وردتر باسی زەردەشت، یان زەڕادەشت دەکەین، کە لە ڕۆژگاری (کشتاسب کوڕی لهراسب)دا کە پادشا بووە، لە سەدەی پێنجەمی (پ. ز)دا ژیاوە، زۆربەی مێژوونووسان دەڵێن: لە (ئازربیجان) بووە، ئازربیجانی ئێستا لە ئێران.

ئێستاش با لە شەش کورتە خاڵدا باسێکی زەردەشتایەتیی و مەجوسییەت بکەین، شایانی باسیشە ئێمە لە کاتی هەڵسەنگاندنی کتێبە ئاسمانییەکان و ئایینە ئاسمانییەکاندا، بە تایبەت قسە لە بارەی زەردەشتایەتی و زەردەشت و کتێبەکەیەوە: (ئاڤێستا) دەکەین، بەڵام لێرە بەس ئاماژەیەکی پێ دەدەین:

١- (زەردەشتییەکان) پێیان وا بووە کە خوای بەدیهێنەر، تەنیا چاکە دەخوڵقێنێ و، ناگونجێ خراپە و زیان و دروستکراوە زیان بەخشەکان دروست بکات، بۆیە ئەوان پێیان وابووە، خوای پەروەردگار، هەر ئەو پەروەردگارەیە کە خێر و چاکەی لێ چاوەڕێ دەکرێ و، ئەویش ئەسڵە و ئەویش گەورەترە، کە هەم: (مەزد)یان پێ گوتوە، هەم (مەزدا)یان پێ گوتوە، هەم (ئاهوڕامەزدا)یان پێ گوتوە، هەروەها (یەزدان)یشیان پێ گوتوە.

بەڵام ئەوی دیکە: بەدیهێنەری خراپە (ئەهریمەن)یان پێ گوتوە، کە وا پێدەچێ ئەو شەیتانەی کە لە وەحییدا باس کراوە، لە کتێبە ئاسمانییەکاندا، هەر ئەوەبێ، بەڵام ئەوان گوتوویانە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئاهوڕامەزدا یاخود مەزدا، یان یەزدان، بیری خراپی کردەوە، ئەهریمەن دروست بوو! ئنجا ڕەمزو

www.alibapir.com



هێمای (ئاهوڕامەزدا)، یان (مەزدا)، بریتیە لە ڕووناکیی و، ڕەمزو هێمای ئەهریمەنیش بریتیە لە تاریکیی.

٢- زەردەشتییەکان ئاگر بە پیرۆز دەگرن.

٣- زەردەشتییەکان پێیان وایە کە (زەردەشت)، - ئەوان زەردەشت بە پێغەمبەر دادەنێن کە مشت و مڕی لەسەرە و دوایی باسی دەکەین - بیست (٢٠) بەرگ کتێبی نووسیوە، لە سەد هەزار (١٠٠،٠٠٠) ڕستەدا، یان بڕگەدا، (کە ئێمە ئایەتی پێ دەڵێین)، ئنجا ئەو سەد هەزار (١٠٠،٠٠٠) ئایەتە، یان بڕگەیە، بە حیساب دەبێ زەردەشت وەك وەحیی بۆی هاتبێ، لەسەر دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) چەرمی گا نووسراوەتەوە، بەڵام دوایی (ئەسکەندەری مەقدۆنیی) کاتێك بەسەر دارا پادشای فارسەکاندا سەردەکەوێ، لە ساڵی (٣٣٠) پ. ز دا، هەمووی دەسووتێنێ، (ئاڤێستا) دەسووتێنێ، بەڵام دوایی لەسەدەی سێیەم، تاکو دەیەمی زایینی، جارێکی دیکە، ئەوەی ماوە و زارەکیی(شفهي) لە نێو خەڵکدا باو بووە، کۆی دەکەنەوە و، کۆنترین دەستنووسی (ئاڤێستا) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٢٥٨)ی زایینی.

٤- دوایی لە سەردەمی حوکمڕانیی ئەردەشێری یەکەم و، لە سەردەمی حوکمڕانیی کوڕەکەی: سابووری یەکەم دا، خزمەت بە ئاڤێستا و ئایینی زەردەشتایەتیی کراوە و، هەندێك دەقی دیکەش خراونە نێو ئاڤێستاوە.[1].

٥- شایانی باسیشە کە دوایی زەردەشتایەتی ناوی لێنراوە (المجوسية)، (ئایینی مەجووسیی) کە خوای پەنهانزان لە یەك شوێنی قورئاندا باسی ئایینی مەجووسیی دەکات، لە سووڕەتی (الحج)دا کە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾.

---

(١) (موسوعة الأديان في العالم) ج١، ص٢٦٥-٢٩٠.

www.alibapir.com





٦- ماوەیەك ئەو ئایینە پێی گوتراوە: مەجووسییەت، دوایی ناوی لێنراوە: (المَزدَكية) (مەزدەك)یش زانایەكی ئێرانیی بووە و دەستكاریی ئایینی مەجووسیی كردوە و، بە شێوەیەكی دیكە دایڕشتوە، ئنجا لە دوای وی پێی گوتراوە: (المانوية) چونكە (مانی)یش جارێكی دیكە دەستكاریی ئەو ئایینەی كردوە! وردەكاریی زیاتریش هەیە دەربارەی كتێبی ئاڤێستا و ئایینی زەردەشتایەتیی و مەجووسییەت، دواتر باسی دەكەین.

## چوارەم: چینی كۆن (الصِّين القديمة):

دوو كەسایەتیی هەن لە چینی كۆندا، كە زۆرترین ڕۆڵیان بینیوە لە ڕووی فیكریی و فەلسەفییەوە:

**یەكەم:** (كۆنفشیۆس) كە لە ساڵی (٥٥١)ی (پ. ز)دا، لە دایك بووە و، لە ساڵی (٤٧١)ی پ. ز دا مردوە، ئنجا هەرچەندە هەندێكیان بە پێغەمبەری دەزانن كە وەحیی بۆ هاتبێ، بەڵام ئەوەی بە ئێمە گەیشتوە و لە سەرچاوە مێژووییەكاندا باس دەكرێ، وا پێدەچێ هەر بابایەكی بیرمەند و چاكە خوازێكی دنیایی بوو بێ و، بە ناوی خوا و بە ناوی پێغەمبەرایەتییەوە قسەی نەكردوە.

لە سێ كورتە خاڵیشدا باسی فەلسەفەی كۆنفۆشیوسیی دەكەین:

١- فەلسەفەی (كۆنفشیۆس) دەگونجێ زۆر قسەی لەسەر بكرێ، بەڵام بە كورتیی ئەوەیە كە گوتوویەتی: چارەنووسی مرۆڤ لە ئاسمانەوە دیاریی دەكرێ و، خەڵكیش: یان چاكەكارن، یان خراپەكار، ئنجا چاكەكارەكان دەبێ ڕێزیان بگیرێ و، خراپەكارەكانیش بە پێچەوانەوە.

٢- (كۆنفشیۆس) زیاتر گرنگیی داوە بە ڕێكخستنی كۆمەڵگا و، دابین كردنی بەختەوەریی مرۆڤ لەسەر بناغەی فەرمانبەریی كردن بۆ پێشینان و گەورەكان و بەرپرسان، هەروەها ڕێزگرتنی كلتوورێك كە لە نێو كۆمەڵگادا باوە و، پابەند بوون بە سیستمێكەوە كە گەردوون پێی بەڕێوەدەچێ.

www.alibapir.com





٣- (کۆنفشیۆس) بە پێی ئەوەی کە بە ئێمە گەیشتوە، هەندێك لە مێژووزانان دەڵێن: دانی بە بوونی خوای پەروەردگاردا نەهێناوە، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: خواناس بووە، بەڵام گوتوویەتی: خوا لەوە مەزنترە کە عەقڵی مرۆڤ بتوانێ باسی بکاو تێی بگا و مشتومڕی لە بارەوە بکات، لەبەر ئەوە با ئێمە عەقڵی خۆمان بەکاربێنین بۆ چارەسەری گرفتەکانمان و، ڕێکخستنی ژیانی دنیامان و، دابین کردنی بەختەوەریی و، سەقامگیر کردنی تەبایی و دادگەریی و ئاشتەوایی.

بە پێی ئەوەش بێ (کۆنفشیۆس) دەستی لە پەیام و وەحیی خوا گیر نەبووە، تاکو لەبەر ڕۆشنایی وەحیی خوای زانا و توانادا بەڕێوەبچێ، بۆیە ئەو جۆرە قسانەی کردوون، کە لە هی عەلمانییەکانی ئەم ڕۆژگارە دەچن[1].

**دووەم:** کەسایەتیی دووەم[2] (لاوتزو): کە لە ساڵی (٦٠٤)ی پ. ز دا مردوە و، ڕێبازێکی دامەزراندوە بە ناوی (طاويزم) یان (طاوية) (Toism) کە ئەمیش جەختی کردۆتەوە لەسەر ڕووح و، توانا ڕووحییەکانی مرۆڤ و، بەکارنەهێنانی عەقڵ، پاساویشی ئەوە بووە کە گوتوویەتی: عەقڵ لەوە بچوکترو بەرتەسکترە کە بتوانێ پەی بە نهێنییەکان بەرێ، بەڵام بە حیسابی خۆی لە ڕێی ڕووحەوە، ئیشی لەگەڵ ناخ و زگماك دا کردوە، هەروەها زۆر بڕوای بە دنیا بە کەم گرتن و سادە ژیان و خزمەتکردنی ڕووح لەسەر حیسابی جەستە، هەبووە[3].

---

(١) بڕوانە: (تأريخ الفلسفة من قبل سقراط إلى ما بعد الحداثة) ص٤٥-٥٣، هەروەها: (الموسوعة الميسرة) ص٤٧٨.

(٢) کە لە (چینی کۆن)دا کاریگەریی لەسەر خەڵکی چین هەبووە.

(٣) سەرچاوەی پێشوو.

www.alibapir.com



### پێنجەم: هیندی کۆن:

لە هیندی کۆن، هیندی دێریندا، دوو ئایین، زۆر باوبوون:

#### ا- بووذایی:

کە دامەزرێنەرەکەی (بوذا)یە و لە ساڵی (٥٦٠)ی پێش زایین لە دایك بووە و لە ساڵی (٤٨٠)ی پێش زاییندا مردوە، (بوذایی) دواتر بۆتە ئایینێکی جیهانیی، سەرەتا لە هیند سەری هەڵداوە لەسەر سنووری نیپاڵ، لە کۆتایی سەدەی شەشەمی زایینیدا، بەڵام دوایی لە یابان و چین و نیپاڵ و بۆرما و وڵاتانی دیکەی ئاسیایی دا بڵاوبۆتەوە.

(بوذا) ناوی خۆی (سید هارتا)یە کە دامەزرێنەری ئایینی (بوذایی)یە، دوایی نازناوی (بوذا)ی وەرگرتوە، (بوذا) یانی: پیاوی ڕۆشنبیر.

**پوختەی فەلسەفەی (بوذا):**

پوختەکەی ئەوەیە کە مرۆڤ هەوڵبدات خۆی لە ئازار دەرباز بکات، بە هۆی پێگەیشتنی ڕووحیەوە و، بە هۆی ئەوەوە کە مرۆڤ غەریزەو داخوازییە جەستەییەکانی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی داخوازییە ڕووحییەکانی و، بگاتە حاڵەتی (نیرڤانا) (Nirvana).

(نیرڤانا)ش بە مانای کوژانەوە دێ، ئەویش قۆناغێکە کە مرۆڤ تێیدا هەست بە بوونی خۆی ناکات، بەڵکو دەتوێتەوە لە بووندا و، لەو ڕاستییەدا کە لە پشت بوونەوە شێردراوەیە، پشت ئەو گەردوونەی ئاشکرایە، ئەوحاڵەتەش پێی دەگوترێ: ڕۆشن بوون[١].

---

(١) الموسوعة الميسَّرَة، ص١٢٥ و ١٢٦.

www.alibapir.com





## ٢- هیندۆسیی:

هەموو ئایینەکانی هیند لە یەك سوورِگەدا دەخولێنەوە، بەڵام هیندۆسیی بریتیە: لە دایکی هەموو ئایینەکانی دیکە، کە لە هینددا هەن و، ئەوانەی دیکە هەموویان وەك لق و پۆپ لەو جیادەبنەوە و، ئایینەکانی هیند هەموویان لە هیندۆسییەوە سەرچاوە دەگرن، ئایینی (هیندۆسیی)ش دامەزرێنەرێکی دیاریی کراوی نیە، بەڵکو هەوڵی کۆمەڵگای هیندی بووە بۆ گەیشتن بە ڕاستییەکان، ئەگەرنا دامەزرێنەرێکی تایبەتی نیە، وەك ئایینەکانی دیکە کە باسمان کردن، بەڵام پێنج مەسەلە لە هیندۆسییدا و، لە هەموو ئایینەکانی هینددا خاڵی هاوبەشن:

**یەکەم:** بڕوایان هەبووە بە (کارِما)، واتە: ئەوە کە ئینسان هەر شتێك بکات لە دنیادا، یان لە دوارِۆژدا، سزا، یان پاداشتەکەی دەبینێتەوە، مانا گشتییەکەی (کارِما) ئەوەیە.

**دووەم:** بڕوایان هەبووە بە دۆناودۆن (تناسخ)، واتە: ڕووحی مرۆڤ دەچێتە بەر مرۆڤێکی باش، یاخود مرۆڤێکی خراپ، یاخود ژیاندارێك، یاخود دڕندەیەك، بە پێی ئەو کردەوانەی کردوونی، لە چاك یان خراپ، کە ئەوەش بیرۆکەیەکی ئەفسانەیی بێ بنەمایە.

**سێیەم:** هەوڵدان بۆ دەربازبوون لە ئازار، ئەویش بە کوشتنی ئارەزووەکان و خۆ بێبەش کردن لە تێرکردنی غەریزە جەستەییەکان، هەموو ئاییەنەکانی ڕۆژهەڵات، ئەوە خاڵی هاوبەشیانە: جەستە خستنە ژێر کۆنترِۆڵی عەقڵەوە.

**چوارەم:** بە زۆریی ئایینەکانی هیند، ڕوویان لە ڕەشبینیی(تشاؤم)یە و بەرەو دنیا بە کەم گرتن و دنیا بە هیچ دانان، ڕۆیشتوون.

**پێنجەم:** هەوڵدان بۆ گەیشتن بە (نیرِڤانا) کوژانەوە، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ هەست بە جەستەو غەریزەکانی خۆی نەکات و، بگات بە حاڵەتی یەکبوونیی (وحدة الوجود) و تێکەڵ بە بوونی ڕەها ببێ، وەك چۆن جۆگەلەیەکی ئاو تێکەڵ بە دەریا دەبێ!.





ئنجا لە ئایینی هیندۆسییدا ژمارەیەكی زۆر لە پەرستراوان هەن، بەڵام ئایینی (جینیی) كە هەر لە هیند پەیدا بووە، نكووڵییان كردوە لە بوونی پەرستراو، (بوذا)ش كە پێشتر باسمان كرد، گوتوویەتی: من قسە ناكەم لە بارەی خواوە (سبحانە وتعالی) بە بوون و نەبوون، واباوە كە: هەر كام لە ئایینی جینیی و بوذایی: یان بوونی خوایان ڕەفز كردوە، یاخود گوتوویانە: قسەی لێ ناكەین، بە چاك و خراپ، بەڵام دوایی شوێن كەوتووانی ئایینی جینیی (مُهاویرا) كە دیارە قیددیسێك، زانایەكیان بووە، كردوویانە بە پەرستراو و، بوذاییەكانیش زۆریان (بوذا)یان لە شوێنی خوا داناوەو پەرستوویانە.

ئنجا هەڵوێست لە بەرانبەر خوادا (سبحانە وتعالی) لە فیكریی هیندییدا، بۆ سێ حاڵەت دابەش دەبێ:

أ- یان بڕوایان بە چەند پەرستراوێتیی هەبووە، واتە: چەند هاوبەشێك بۆ خوا دابنێن.

ب- یان نكووڵییان كردوە لە بوونی خوا.

ج- یاخود پشت گوێیان خستوە و گوتوویانە: قسەی لێ ناكەین.

جێی سەرنج ئەوەیە كە هەڵوێستی جینییەكان (شوێنكەوتووانی ئایینی جینیی) و بوذاییەكان (شوێنكەوتووانی ئایینی بوذایی) ئەوەی وای لێكردوون كە دان بە بوونی خوادا نەهێنن، یاخود پشتگوێی بخەن، كاردانەوەیان بووە بۆ هەڵسوكەوتی خراپی چینی بەرهەمییەكان (البراهِمة) و خۆ سەپاندنیان، بۆیە هەر كام لە جینییەكان و بوذاییەكان ترساون كە ئەگەر ئەوانیش دان بە بوونی خوادا بێنن، یەكسەر چینی پیاوانی دینییان بۆ دروست ببێ، وەك بەرهەمییەكان و، خۆیان بەسەردا فەرز بكەن و، بە ناوی دینەوە دنیایان لێ زەوت بكەن!

ئنجا ئەمە! زۆر جێی دەرس و پەندە، كە ئەگەر بێت و ئەهلی ئایین وریا نەبن، بە ناوی دینەوە كەسانێك پەیدا دەبن، كە دنیایەكەیان دەخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە، كە ئەمەش تایبەت نیە بە هیندو چین و، بە ئایینی نەصرانیی و

www.alibapir.com



...هتدەوە، بەڵکو ئەهلی ئیسلامییش ئەگەر لە خۆیان وریا نەبن، هەمان حاڵەتیان بۆ دروست دەبێ و، ئەگەر ئێستا تەماشای هەندێك لە وڵاتانی دنیای ئیسلام بکەین، ئەمە زۆر بە زەقیی دەبینین: کە ئایین خراپ بەکارهێنراوە بۆ حوکمڕانیی و، خۆ بەسەر خەڵکدا فەرز کردن و، قۆرخ کردنی موقەددەراتی خەڵك و وڵات بۆ بنەماڵەیەك یان چینێکی دیاریی کراو[1].

## شەشەم: یۆنـانی کۆن:

پێشتر ئاماژەمان پێدا، کە فەلسەفە زیاتر بە ناوی یۆنانەوە ناوزەد کراوە، بەڵام ئەوەتا لە شوێنەکانی دیکەش کەم و زۆر بیرکردنەوەی فەلسەفیی و، هەوڵدانی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە ڕاستییەکانی بوون و ژیان و گەردوون، هەر بووە، بەڵام نکوولیی ناکرێ کە ئەو کەلەپوورەی لە فەلسەفەی یۆنانییەوە بۆ ئێمە بەجێماوە، لە هەموو کەلەپوورەکانی دیکە زیاترە، کە ڕەنگە زیاتریش هۆکارەکەی ئەوە بێ، ئەوان پاراستوویانە، بەڵام هی شوێنەکانی دیکە، ڕەنگە نەنووسرابێتەوەو نەپارێزرابێ.

لێرەدا ئاماژە بە پازدە(١٥) لە فەیلەسووفەکانی یۆنان، دەکەین:

١- **(طالیس)**، لە ساڵی (٦٤٠)ی پ. ز دا لە دایك بووە و لە (٥٤٨) پ.ز دا مردوە و بە یەکەمین فەیلەسووفی یۆنانی دادەنرێ، (طالیس)، پێی وا بووە ئەسڵی بوون، ئاوە، ئنجا ئایا مەبەستی ئەوە بووە کە جگە لە (ئاو) هیچ شتێکی دیکە نیە، یان مەبەستی ئەوە بووە کە خوا(سبحانە وتعالى) هەموو شتەکانی دیکەی لە ئاو دروست کردوون، وەك خوا دەفەرموێ:

---

(١) هەموو ئەو زانیارییانەم لە: (موسوعة الأدیانِ فِي العالم) ج١: (الدیاناتُ القَدیمة، أدیان الهِند)، ص (٢١٦ و ٢١٧) وەرگرتوون و، لە زۆربەی سەرچاوە مێژوویی و فەلسەفییەکاندا ئەو زانیارییانە هەن.




﴿ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ ﴾ ﴿٧﴾ هود.

واتە: بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، کەواتە: خوا بەر لەوەی گەردوون بخوڵقێنێ، ئاو هەبووە، ئایا مەبەستی پێ کامیانە؟ دیار نیە، گرنگ ئەوەیە (طالیس) هەندێك لە شارەزایان بە خواناسی دادەنێن و، هەندێکیشیان دەڵێن: باسی خوای پەروەردگاری نەکردوە.

بەڵام ئەوەی کە دەردەکەوێ - کە پێشتریش ئاماژەم پێدا - کاتێك وەحیی خوا لەبەر دەستی مرۆڤدا هەبوو بێ، ئەو گەڕان و سووڕان و پشکنینەی لە کۆڵ مرۆڤ کردۆتەوە، کە بزانێ خاوەنی ئەم گەردوونە کێیە؟ مرۆڤ چۆن هاتوە؟ لە کوێوە هاتوە؟ لە چییەوە هاتوە؟ بۆچی هاتوە؟ دەبێ چی بکا؟ خێر چییە؟ شەڕ چییە؟ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی بە حازری خستۆتە بەر دەست، ئنجا فەیلەسووفەکانی یۆنانیی دیارە دەستیان لە وەحیی خوا گیر نەبووە، هەر لە (طالیس)ەوە تاکو ئەوانی دیکە، بۆیە بیرۆکەی سەیر سەیریان بۆ دروست بوون، لەو بارەوە کە ئایا ژیان چییەء؟ ئەو گەردوونە لە کوێوە هاتوە؟[1]

٢- **(ئەنکسمندریس)** کە لە ساڵی (٦١٠)ی پ. ز دا، لە دایك بووە و، لە (٥٤٧)ی پ. ز دا، کۆچی دوایی کردوە، قوتابی (طالیس) بووە و، پێی وابووە کە بنەڕەتی جیهان، ماددەیە، بەڵام گوتوویەتی: ئەم گەردوونە بێ سنوورو کۆتایی یە و، شتەکانی گەردوون کێشەیان لەبەیندا هەیە، پەیوەندییەکی دژ یەکی (تناقض)، یان دیالەکتیکیی یان پێکەوە هەیە و، لە ئەنجامی ئەوەدا جیهانەکان، هەندێکیان هەندێکیان سزا دەدەن، بە هۆی ئەوەوە کە ستەم لە یەکدی دەکەن![2].

---

(١) (تأريخ الفلسفة من قبل سقراط إلى عصر الحداثة)، ص ١٠٣، هەروەها: (تأريخ الفلسفة اليونانية)، يوسف كرم، ص ٢٥، ط ٢٠١٦م.

(٢) (تأريخ الفلسفة من قبل سقراط إلى عصر الحداثة)، إبراهيم الزيني، ص ١٠٢، هەروەها: (تأريخ الفلسفة اليونانية)، ص ٢٧.

www.alibapir.com





٣- **(ئەناسکیمینس):** (٥٨٨ - ٥٢٤) پ. ز، ئەمیش پێی وابووە هەوا بریتییە لە بنەڕەتی گەردوون و، هۆکاری پەیدا بوونی گەردوون، بریتیە لە هەوا (با)[١].

بەڵام وەك گوتمان: هەموو ئەوانە ئەگەری ئەوەی هەیە مەبەستیان ئەوە بێت کە خوا گەردوونی لە هەوا دروست کردوە، ئەوی دیکە پێی وابێ کە خوا گەردوونی لە گڵ دروست کردوە، ئەوەی دیکەیان دەڵێ: خوا گەردوونی لە ئاو دروست کردوە، هەروەك دەشگونجێ مەبەستیان ئەوە بوو بێ: نکووڵییان لە بوونی خوای بەدیهێنەر کردبێ و گوتوویانە: هەموو گەردوون لە هەواوەیە، یان لە ئاوەوە، یان لە گڵەوە هاتوە.

٤- **(هیرکلیطس):** (٥٤٠ - ٤٧٥) پ. ز، ئەم دەڵێ: گۆڕانکاریی و بەردەوامیی، بریتیە لە بنەڕەتی گەردوون و، ئەو قسە ناودارەی هەیە کە گوتوویەتی: (هیچ کام لە ئێمە دووجاران لە ڕووبارێکدا مەلە ناکەین و، هەمیشە ژیان و گەردوون لە گۆڕاندایە)[٢].

٥- **(ئەبارمنیدس):** کە لە ساڵی (٥٤٠)ی پ. ز دا، مردوە و گوتوویەتی: بوون (وجود) نەگۆڕە و گۆڕانی بەسەردا نایەت، واتە: ڕای پێچەوانەی ئەوەیە کە (هِرقلیگس) گوتوویەتی، هەروەها گوتوویەتی: بنەڕەتی گەردوونیش بریتیە لە (بوون) خۆی[٣].

٦- **(ئەمبادوکلیس):** ئەمیش لە ساڵی: (٤٩٠)ی پ. ز دا، لە دایك بووە، لە ساڵی (٤٣٥) پ.ز دا، مردوە و، پێی وابووە: بنەڕەتی گەردوون و ژیان، بریتیە لە چوار توخمەکان کە ئەوان گوتوویانە: (الإسطقسات الأربعة) چوار توخمەکان، واتە: ئاگرو هەواو ئاوو گڵ[٤].

---

(١) (تأريخ الفلسفة اليونانية)، ص ٢٩.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٣٠،٣١، هەروەها (تأريخ الفلسفة اليونانية) إبراهيم الزيني ص١٠٢-١٠٣.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، ص١٠٣.

(٤) سەرچاوەی پێشوو، ص١٠٣.

www.alibapir.com







٧- **(ئەكسنیوفانوس):** (٥٧٠ -٤٨٠)ی پ. ز، ئەمیش گوتوویەتی: بنەڕەت و سەرچاوەی پەیدابوونی گەردوون، بریتیە لە گڵ[١].

٨- **(ئەنكساغوراس):** (٥٠٠ - ٤٢٨) پ. ز، ئەم گوتوویەتی: بنەڕەت و سەرچاوەی پەیدابوونی گەردوون، بریتیە لە ژمارەیەكی بێ كۆتایی لە توخمەكان، یاخود لە تۆوەكان كە عەقڵێكی زانای سەر ڕاست دەیانجووڵێنێ، واتە: ئەو بە ڕوون و ڕاشكاویی دانی بە بوونی خوادا هێناوە، گوتوویەتی: هەموو ئەو گەردوونە بریتییە لە چەندان توخمی زۆری بێ كۆتایی، بەڵام عەقڵێكی (وای تەعبیر كردوە، ئەگەرنا ئێمە وشەی عەقڵ بۆ خوا بەكارناهێنین) زانای مەزن دەیانجووڵێنێ[٢].

٩- **(دیمقراطیس):** (٤٧٠ - ٣٦١) پ. ز، ئەم گوتوویەتی: بنەڕەتی ئەم گەردوون و بوونە، بریتیە لە گەرد و گەردیلەكان، هەروەها گوتوویەتی: گەردیلەكان بریتین لە شتی زۆر بچووك، كە بە چاو نابینرێن[٣].

١٠- **(فیثاغورس):** (٥٧٢ - ٤٩٧) پ.ز، گوتوویەتی: بنەڕەتی ئەم بوونە و سەرچاوەكەی، بریتیە لە ژمارە (عدد).

١١- **سوفسطائییەكان:** كە خەڵكی زۆر سەرناس و ناسراویان (١- غورغیاس: (٤٨٠ - ٣٧٥) پ. ز. ٢- بروتاغوڕاس: (٤٨٠ - ٤١٠) پ . ز، بوون و ئەم دووانە دەمڕاستی (سُفْسَطائیة)كان بوون، كە گوتوویانە: هیچ شتێك جێی متمانە نیە، چاو بە هەڵەدا دەچێ، گوێ بە هەڵەدا دەچێ، هەستی تام كردن و، بۆن كردن و، عەقڵ و خەیاڵ و ئەندێشە بە هەڵەدا دەچن، لەبەر ئەوە هیچ شتێك جێی بڕوا نیە و، دانیان بە هیچ شتێكدا نەهێناوە و، بە هیچ شتێكیان نەگوتوە: نە هەیە، نە نیە، تەنانەت لە بارەی بوونی خوای پەروەردگارەوە گوتوویانە: ناڵێین: هەیە، یان نیە، نازانین! چونكە هیچ ئامرازێكمان پێ نیە كە بوون،

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٠٣، هەروەها: (تأریخ الفلسفة الیونانیة)، ص ٤٠.

(٢) سەرچاوە پێشوو، ص٥٣-٥٥.

(٣) سەرچاوە پێشوو، ص٥١.

www.alibapir.com





یان نەبوونی شتێکمان بۆ ساغ بکاتەوە[1]! کە بێگومان ئەوە بیرکردنەوەیەکی هەم زۆر پووچ بووە، هەم زۆریش جێگای مەترسیی بووە، چونکە ئەگەر وابێ، دەبێ مرۆڤ هەوڵنەدات هیچ شتێك بزانێ! بەڵام خۆشبەختانە لە ڕۆژگاری ئەوان و گەرمەی مشت و مڕە بێ سوودەکانیاندا سوکڕاط پەیدا دەبێت، کە لە ڕاستییدا سوکڕاط وەرچەرخانێك لە فەلسەفەی یۆنانییدا دروست دەکات و، یەکەمین فەیلەسووفی خواناسیش بووە، کە زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی باسی خوای پەروەردگاری کردوە.

١٢- **سوکڕاط** لە ساڵی (٤٦٦) پ. ز، دا، لە دایك بووە، لە (٣٩٩)دا، مردوە و، جێی خۆیەتی پێنج لە هەڵوێستە گرنگەکانی سوقڕاط بخەینە ڕوو:

١- سوقڕاط ئەوەی ڕەفز کردەوە کە ئینسان نەتوانێ شت بزانێ، شایانی باسیشە سوقڕاط هیچ کتێبێکی لە پاش بە جێ نەماوە، بەڵکو عادەتی وا بووە زیاتر لە ڕێی دیالۆگەوە و، لە ڕێی پرسیارکردن لە بەرانبەرەکەی، کە وەڵامەکەشی لە خۆی هەڵهێنجاوەتەوە، بیروڕای خۆی خستۆتە ڕوو و بەرپەرچێکیی باشی سوفسطائییەکانی داوەتەوە.

٢- سوکڕاط ئەوەی ڕەفز کردوە کە پاڵدراوەتە لای پەرستراوەکان، کە گوایە: ئارەزوویان هەیە و پێکەوە بەشەڕ دێن، بەڵکو بڕوای بەو پەرستراوانە هەر نەبووە، چونکە گوتوویەتی: تەنیا یەك پەرستراو هەیە و، زۆرێك لە مێژوونووسان و پسپۆڕانی بواری فەلسەفە دەڵێن: سوکڕاط لەسەر ئەوە ئیجبار کرا کە دەبێ ژەهر بخواتەوە، چونکە بڕوای بە پەرستراوەکانی یۆنانییەکان نەبوو، کە لە ئەثینا دەپەرستران، بەڵکو دەیگوت: تەنیا یەك پەروەردگارو، بەدیهێنەر هەیە و، ئەوانی دیکە هەر خۆتان ناوتان ناون.

٣- بڕوای بەوە بووە کە سیستمێك هەیە، ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات و گوتوویەتی: جیهانێکی ئایدیالیی چەسپاو هەیە، کە هەستەکان ناتوانن بچنە

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٦٠-٦٣.





نێو ئەو جیهانەوە، واتە: جیهانی ڕووحانیی، گوتووشیەتی: ڕووح شتێکی جیایە لە پێنج هەستەکان و، کاری ڕووح بریتیە لە عەقڵ و تێگەیشتن.

٤- گوتوویەتی: لە دوای ئەم ژیانە دنیاییە، ژیانێکی دیکە هەیە، کە ڕووحی مرۆڤ ئەو ژیانەی ناسیوە، پێش ئەوەی بێتە نێو ژیانی سەر زەوی و، لە میانی ئەو ژیانەی پێشێیدا ئەو ڕاستییانەی کە پەیوەندییان بە خوای پەروەردگارەوە هەیە، ناسیونی و زانیونی، واتە: ڕاستییە زگماکەکان (الحقائق الفطرية)ی کە لە مرۆڤدا هەن، گوتوویەتی: لە ژیانی پێشتردا فێریان بووە.

٥- بڕوای بەوە بووە کە ڕووح هەر ماو(أَبَدي)ە و، لە بەین ناچێ و، بە مردن لەم سجنی جەستەیە دەربازی دەبێ و، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو حاڵەتە صافە سروشتییە چاکەی خۆی[1].

١٣- **(ئەفلاطون):** کە قوتابی سوکڕاط بووە، لە ساڵی (٤٢٨)ی پ. ز، دا، لە دایك بووە، لە (٣٤٧)دا، مردوە و، ئەمیش دەتوانین فەلسەفەکەی لە پێنج خاڵدا خوڵاصە بکەینەوە، هەڵبەتە هەرکامێك لە سوکڕاط و ئەفلاتوون و ئەڕەستۆ و طالیس و فەیلەسووفەکانی دیکە، کتێبی گەورە گەورەیان لەسەر نووسراون، بەڵام من دەمەوێ ئەوەی گوتراوەو نووسراوە، زۆر خوڵاصەی بکەمەوە:

**بیرۆکەی یەکەم:** بڕوای بووە بە جیهانی ئایدیا (عَالم المُثل) گوتوویەتی: ئەم جیهانە سروشت و بەرهەستەی ئێمە، نوسخەیەکە لە جیهانی ئایدیا، یانی: ئەم جیهانەی ئێستا، وێنە و ڕەنگدانەوەی جیهانی ئایدیا(مِثال)یە و، پێی وا بووە، هەر شتێك کە ئێمە دەیبینین و بەرهەستە، ئەوە وێنە و ڕەنگدانەوەی ئەو شتەیە کە لە جیهانی ئایدیا(مِثال)و ڕووحانییەتدا هەیە.

**بیرۆکەی دووەم:** بڕوای بە (هیولا) بووە و گوتوویەتی: ماددەیەکە دەکەوێتە نێوان ئەو شتە کە هەیە و نەبوون (عدم)، یانی: ئەو کەرەستەیەی کە ئەو شتەی لێ دروست بووە.

---

(١) الموسوعة الميسَّرة، ص٢٩٢، هەروەها: (تأريخ الفلسفة اليونانية) يوسف كرم، ص٦٤-٧٩.

www.alibapir.com



**بیرۆکەی سێیەم:** گوتوویەتی: جیهان بە پێی سیستمێکی ڕێك و پێك بەڕێوەدەچێ، بۆیە دەبێ عەقڵێکی خوایی هەبێ ئەم مادده ئەزەلییەی ڕێك خستبێ، بە پێی یاسا ئەندازەییەکان، دیارە ئەفلاتوونیش خواناس بووە، وێڕای بیروبۆچوونی هەڵە، یاخود بەکارهێنانی وشەی نەگونجاو، بۆ خوا، بۆ وێنە: وشەی عەقڵیان بۆ خوا بەکارهێناوە، یاخود ڕەنگە تەرجەمەکان وا هاتبن.

**بیرۆکەی چوارەم:** گوتوویەتی: ڕووح پێش ئەوەی بێتە نێو جەستەوە، بوونی بووە (ئەمە هەمان قسەی سوکڕاتە)، بەڵام دوایی لە جیهانی سەرەوە ڕا دابەزیوە بۆ نێو جەستە.

**بیرۆکەی پێنجەم:** گوتوویەتی: مادام هەموو شتێك لە گەردووندا بە سیستم و بە ڕێك و پێکیی بەڕێوەدەچێ، ژیانیش دەبێ ڕێك و پێکیی زۆری تێدا هەبێ، بۆیە زۆر کاری کردوە لەسەر مەسەلەی ئەخلاق و، مەشهوورە کە (ئەفلاطون) کتێبێکی ناوداری هەیە بە ناوی (کۆماری ئەفلاتون)[1].

**١٤- (ئەرەسطـــۆ)** کە لە ساڵی (٣٨٤)ی پێش زایین دا، لە دایك بووە و، لە ساڵی (٣٢٢)دا، کۆچی دوایی کردوە، (ئەرسطو)ش قوتابی (ئەفلاطون) بوو، وەك چۆن (ئەفلاطون) قوتابی (سوکراط) بووە، ئەمیش دەگونجێ فەلسەفەکەی لە سێ خاڵاندا خوڵاصە بکەینەوە:

١- گوتوویەتی: بوونی سروشتیی هەیە و، بوونی ناسروشتیی هەیە، یاخود فیزیك هەیەو، میتافیزیك هەیە، سروشت هەیە و، ئەو دیوی سروشت هەیە، یانی: بڕوای بە لایەنی ڕووحانیی هەبووە، بۆ گەردوون و پێش ئەوەش، بۆ خوا (سبحانه وتعالی) کە لەو دیوی سروشتەوەیە.

٢- خواناس بووە و ناوی لە خوا ناوە: جووڵێنەری یەکەم (المُحَرِّك الأَوَّل) هەروەها گوتوویەتی: خوا دەبێ لە دەرەوەی سروشت بێ، لە دەرەوەی کائینات و دروستکراوەکانی خۆی بێ و، سروشتەکەیشی جیا بێ، لە هی دروستکراوەکانی.

---

(١) الموسوعة الميسَّرة، ص٤٧-٥٠، هەروەها بڕوانە: (تأريخ الفلسفة اليونانية) يوسف كرم، ص٧٩-١٢٨، زۆر بە درێژیی باس و خواسی لە بارەوە کردوە.

www.alibapir.com





٣- گوتوویەتی: خوا خاوەن عەقڵ و هۆشە، بەڵام تەنیا خۆی دەرك دەكات، چونكە جگە لە خۆی هەموو دروستكراوی خۆیەتی، ئنجا كە هەموویان دروستكراوی خۆینی، ناتەواون و لە خواش(سبحانە وتعالی) ناوەشێتەوە شتی ناتەواو دەرك بكات و بایەخی پێ بدات و، پێیەوە سەرقاڵ بێت![1].

هەڵبەتە ئەوە بیركردنەوەیەكی خەیاڵیی بووە، ئنجا ئەو فەیلەسووفانە ویستوویانە: خوا بە پاك بگرن و مەبەستیان لەو قسانە بە پاك گرتنی خوا بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستیان نەگەیەشتۆتە سەرچاوەی ڕوون و زوڵاڵی وەحیی، بۆیە ئەو جۆرە بیرۆكانەیان بۆ هاتوون، ئەگەرنا خوا (سبحانە وتعالی) دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: لە سەرووی ئێوەوە، حەوت چینی ئاسمانمان دروست كردوون و، ئێمە لە دروستكراوەكانی خۆمان بێ ئاگا نین.

هەڵبەتە ئەم جۆرە بیركردنەوەیەی (ئەڕەسطۆ)یە، كە دوایی كڵێسا تەبەننیی دەكات و، لە سەدەكانی نێوەڕاستدا هەتا سەدەكانی (١٦ و ١٧)ەش، ئەو بیرۆكانە هەر بەردەوام بوون و، كاریگەریی زۆریشیان بووە لەسەر شێوەی دینداریی خەڵكی ڕۆژئاواو ئەورووپا، كە پێیان وا بووە خوا ئەم گەردوونەی وەك سەعاتێك قوڕمیش كردوەو وەگەڕی خستوە و دوایی لێیگەڕاوە! ئنجا ئەو وێنا كردنەی خوا لە كوێ و، ئەوە لە كوێ، كە وەحیی پێمان دەڵێ: - وەحیی بەرجەستە لە هەموو كتێبەكانی خوادا، پێش ئەوەی بگۆڕدرێن - كە خوا هەمیشە ئاگای لە دروستكراوەكانی خۆیەتی و، ئاگای لە هەست و خوستی نێو دەروونتانە و، وەڵامگۆی پرسیارەكانتانە و، ئاگادارتانە و، چاودێرییتان دەكات و، مشوورتان دەخوات؟!

**١٥- (ئەفلوطین)** كە لە ساڵی(٢٠٥)ی زایینیی دا لە دایك بووە و لە ساڵی (٢٧٠)ی زایینیی دا، مردوە، واتە: (٦٥) ساڵ تەمەنی بووە، (هەڵبەتە ئەم

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص ١٣١-٢٢٧، بە تێر و تەسەلیی لە بارەیەوە دواوە.

www.alibapir.com





(ئەفلُوطین)ە، جیایە لە (ئەفلاطون)، کە پێش زایین بووە و ئەمیان دوای زایین بووە)، ئنجا (ئەفلوطین) لە میسرِ ژیاوە، بەڵام بە ئەصڵ یۆنانیی بووە، هەندێك دەڵێن: لە لای میسرییەکان زانیارییەکەی وەرگرتوە و، یەکەمین کەس بووە کە بیردۆزەی هەڵڕژان (فیض)ی بۆ لێکدانەوەی بوون و گەردوون داناوە، کە ئەویش هەر دەڵێ: سەرەتای ئەم بوونە یەکە، کە خوایە و پێی دەگوترێ: یەك، یان خەیر، یان خوا (سبحانە وتعالی)، خوا یەکە و، ڕەهایە و، لێکدراو نیە و، نە جووڵاوە و نە وەستاوە و، نە لە کاتدایە و، نە لە شوێندایە و، خوا تەواوە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت، هەروەها گوتوویەتی: خوا بیری لە خۆی کردۆتەوە و، هەستی بە خۆی کردوە و، لە ئەنجامی ئەوەدا عەقڵ پەیدا بووە، ئنجا عەقڵ بریتی نیە لە خودی خوا، بەڵکو خوا هۆکار و بەدیهێنەری عەقڵە، کەواتە: عەقڵ پەیدا کراوە و خوا پەیداکەر و بەدیهێەریەتی، دوایی عەقڵیش بیری لە خۆی کردۆتەوە و بیری لە خواش کردۆتەوە.

کەواتە: عەقڵ هەم بیرکەرەوە (عاقل) و هەم بیرلێکراوە(معقول)یە، کەواتە: عەقڵ تاك(فَرْد) نیە، بەڵکو زیاتر لە یەکە، بەڵام خوا تاکە و یەکە، ئنجا ئەفلووطین گوتوویەتی: دوایی لە عەقڵەوە هەموو نەفسەکانی بەشەر و ژیاندار و ڕووەك و ...هتد، پەیدا بوون، هەروەها خڕۆکەکان و ئەستێرەکان و ....هتد!! کە بێگومان ئەوە جگە لە خەیاڵێك هیچی دیکە نیە[1].

---

(١) الموسوعة الميسَّرة، ص٥٤، هەروەها بڕوانە: (تأريخ الفلسفة اليونانية) يوسف كرم، ص٣١١ - ٣٢٢، کە بە درێژیی باسی فەلسەفە ئاڵۆز و ئەفسانەییەکەی ئەفلووطینی کردوە و باسی کردوە کە (فورفوريوس)ی قوتابیی کۆی بەرهەمەکانی کە پەنجاوچوار (٥٤) نامە بوون، کۆی کردوونەوە.





# باسی پێنجەم



# ئەهلی ئیسلام و فەلسەفە

## دەستپێك

سەرەتا دەڵێین: فەلسەفە بەرهەمی عەقڵی مرۆڤە، مرۆڤێك كە دەستی لە سەرچاوەی زووڵاڵی وەحیی و پەیامی خوا گیر نەبووە، مرۆڤ خوا وای خوڵقاندوە كە هەوڵبدات شتەكان بزانێ و دەركیان بكات، ئنجا كاتێك دەستی لە وەحیی گیرنابێ، پشت بە پێنج هەستەكانی دەبەستێ و، پشت بە عەقڵ و خەیاڵ و ئەندێشەی دەبەستێ، عەقڵی مرۆڤیش لەوە بچووكترە كە پەی بە نهێنییەكانی گەردوون و بوون و ژیان و مرۆڤ ببات، بۆیە -- وەك دوایی باسی دەكەین -- فەلسەفە لە دوای (٢٥٠٠) ساڵ هەوڵدان، وەك (ئەبو حەسەنی نەدویی) گوتوویەتی: عەرەب گوتەنی: (رَجَعَ بِخُفَّي حُنين) شتێكی وای لەگەڵ خۆی نەهێنایەوە.

ئێستاش با لە چوار (٤) بڕگەدا ئەم باسی پێنجەمە بخەینە ڕوو:

www.alibapir.com





## بڕگەی یەکەم: ئەهلی ئیسلام، ئیسلام بێ نیازی کردوون لە فەلسەفە:

ئایا ئیسلام مسوڵمانانی بێ نیاز کردوون لە بیرکردنەوە؟! نەخێر، بەڵام بێ نیازی کردوون لەوە کە بگەڕێن بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارانەدا:

١- ئەم گەردوونە خاوەنی کێیە؟

٢- مرۆڤ کێ دروستی کردوە؟

٣- مرۆڤ لە کوێوە هاتوە؟

٤- بۆچی هاتوە؟

٥- بۆ کوێ دەچێ؟

٦- سەرەنجام چییە؟

ئەو پرسیارە بنەڕەتییانە ئیسلام هاوکاری عەقڵی مرۆڤی کردوە و، وەڵامی ئەو پرسیارانەی خستۆتە بەر دەستی بە ئامادەیی، با تەماشا بکەین! ئێمە دە (١٠) خاڵمان هێناون کە چۆن ئیسلام مسوڵمانانی بێ نیاز کردوون، لە فەلسەفە:

### ١- خاوەندارێتیی خوا بۆ گەردوون:

پێویست ناکات بگەڕێی: دەبێ کێ خاوەنی گەردوون بێ؟ خوا (سبحانه وتعالى) وەڵامەکەی بە ئامادەیی خستۆتە بەردەستی مرۆڤ، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأعراف)دا خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾.

www.alibapir.com



هەر ئەم تاکە ئایەتە موبارەکە کاکڵی بوونناسیی ئیسلامیی دەخاتە ڕوو، ئەوەی کە پێی دەڵێن: (دنیا بینیی) و (جیهانبینیی) بەڵام من تێبینیم لەسەر ئەم دوو وشەیە هەیە و، پێم وایە ڕاست وایە: بگوترێ: (بوونناسیی)، چونکە (جیهان) و (دنیا) ئەوەن کە خوا دروستی کردوون، بەڵام بوون (وجود) بەدیهێنەری بوونیش دەگرێتەوە، کە خوایە (سبحانه وتعالى) و، گەردوون و ژیان و مرۆڤیش هەمووی دەگرێتەوە، وشەی (ontology) (معرفة الوجود)یش هەر ئەوە ماناکەیەتی[1].

واتە: بە دڵنیایی پەروەردگار و خاوەنی ئێوە ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژان، (واتە: بە شەش قۆناغ) هێناونە دی، دوایی چووە سەر بارەگای خۆی، شەوگار بەسەر ڕۆژگاردا دێنێ، بە خێرایی بە دوای دەکەوێ و، خۆر و مانگ و ئەستێرەکان ڕام کراون بە فەرمانی خوا، ئاگاداربن! بەدیهێنان تایبەتە بە خواوە و، فەرمان کردنیش (بەسەر مرۆڤەکاندا کە چی بکەن و چۆن بکەن؟) تایبەتە بە خواوە، بەرزیی و بەردەوامیی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.

## ٢- سیفەتەکانی خوا و کردەوەکانی خوا:

خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحشر.

---

(١) لە کتێبی چوارەمی مەوسووعەی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحی و واقیع دا، بە ناوونیشانی: (پایەکانی بیرکردنەوەی ئسلامیی) بە درێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە}.

www.alibapir.com





لەم دوو ئایەتە موبارەکەدا زۆرێك لە سیفەتەکانی خوا و، کردەوەکانی خوا دەرخراون و، پێویست ناکات بگەڕێین و خەیاڵ و ئەندێشە بەملاولامان دا بەرێ.

واتە: ئەو خوایە، کە جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، حوکمڕانی پاکی سەلامەتی دڵنیاکەر باڵادەستی زاڵی ملپێکەچکەری خۆ پێ گەورە: ﴿ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُ﴾، ئەو هەشتانە هەموویان ناوو سیفەتەکانی خوان، ﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾، پاك و بێگەردیی بۆ خوا لەوەی دەیکەنە هاوبەشی، ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ﴾، خوا بەدیهێنەرە، پەیداکەرە، وێنەکێشە، ﴿لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾، ناوە هەرە چاکەکانی هەن، ﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، خوا بە پاکدەگرێ، ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، ئەو (خوا) زاڵی کاربەجێیە.

### ٣- مشوورخۆریی و سەرپەرشتیاریی کردنی خوا بۆ گەردوون و بۆ مرۆڤ:

أ/ خوا لە سووڕەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿قُل لِّمَنِ ٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلۡ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ فَأَنَّىٰ تُسۡحَرُونَ ﴿٨٩﴾﴾.

واتە: بڵێ زەوی و ئەوانەی تێیدان هی کێن، ئەگەر دەزانن؟ بە دڵنیایی دەڵێن: هی خوان، بڵێ: ئایا بیرناکەنەوە! بڵێ کێ خاوەن و پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و خاوەن و پەروەردگاری بارەگای مەزنە؟ بە دڵنیایی دەڵێن: (هەمووی) هی خوایە، بڵێ: ئایا پارێزی لێ ناکەن! بڵێ: کێ موڵك و کۆنترۆڵی





هەموو شتێكی بە دەستە و، هەر ئەو خەڵك پەنا دەدات و، هیچ كەسی لێ پەنا نادرێ و، ناپارێزرێ، ئەگەر دەزانن؟ بە دڵنیایی دەڵێن: ئەو(دەستەڵات)ە، هەر هی خوایە، بڵێ: ئەدی بۆچی جادووتان لێ دەكرێ؟!

ب/ هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾.

واتە: ئایا جگە لە بەرنامەی خوا دەخوازن، لە حاڵێكدا هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە، چار و ناچار بۆ وی ملكەچە و، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە!!

ج/ هەروەها لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾﴾.

واتە: بڵێ: كێ لە ئاسمان و زەوییەوە بژیویتان پێ دەدات؟ یان كێ بیستنەكان و چاوەكانی بە دەستن و، كێ زیندوو لە مردوو و، مردوو لە زیندوو دەردێنێ و، كێ سەرپەرشتیی دەكات؟ دەڵێن: خوا، بڵێ: ئەدی بۆچی پارێزی لێناكەن، (واتە: بۆچی هاوبەشی بۆ پەیدا دەكەن، بۆچی ڕوو لە غەیری خوا دەكەن)؟!.

www.alibapir.com





## ٤- گەردوون بەبێ حیکمەت نەخوڵقێنراوە:

ئەمیش ڕاستییەکی دیکەیە لە بواری خواناسییدا، کە ئیسلام خستوویەتە بەر دەستی مرۆڤ:

أ/ خوا لە سووڕەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾﴾.

واتە: ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بێ حیکمەت و بە هەوەنتە دروست نەکردوە، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، سزای سەخت بۆ بێبڕوایان لە ئاگری دۆزەخ، (کە وا گومان دەبەن: ئەم گەردوون و کائیناتە بێ حیکمەت و بە پووچیی خوڵقێنراون).

ب/ هەروەها لە سووڕەتی (آل عمران)دا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾﴾.

واتە: بێگومان لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و جێگۆڕکێ و جیاوازیی شەو ڕۆژاندا، نیشانە هەن بۆ خاوەن عەقڵان، ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن بە پێوە و بە دانیشتنەوەو، لەسەر تەنیشتیان و بیردەکەنەوە لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی، سەرەنجام دەڵێن: پەروەردگارمان! ئەمەت بێ حیکمەت نەهێناوەتە دی، پاکیی بۆ تۆ، لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

ئاوا خوا (سبحانە وتعالی) زۆر بە ڕوونیی دەیخاتە ڕوو کە: حیکمەت و ئامانجێك لە پشت دروستکرانی گەردوونەوە هەیە.

www.alibapir.com



## ٥- مرۆڤ بە حیکمەت دروستکراوە:

ئیسلام دەڵێ: ئامانج و حیکمەتێك لە پشت وەدیهێنرانی مرۆڤەوە هەیە:

أ/ خوا لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾.

واتە: ئایا پێتان وایە ئێوەمان بە پووچ، (بە گاڵتە و بێ حیکمەت) هێناوەتە دی و بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە؟! بەرزیی بۆ خوای پادشای هەق..

ب/ هەروەها لە سوورەتی (القیامة)دا دەفەرموێ: ﴿ أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ ﴾.

واتە: ئایا ئینسان پێی وایە وێڵ دەکرێ؟ پشت گوێ دەخرێ و وازی لێ دەهێنرێ؟!

## ٦- ئامانج و حیکمەتی گەردوون و ژیان و ئینسان، تاقیکردنەوەی مرۆڤە:

ئەمیش ڕاستییەکی زۆر گرنگە لە بواری بوونناسییدا، ئیسلام خستوویەتە بەردەستی مرۆڤ، کە ئامانج و حیکمەتی گەردوون و ژیان و ئینسان، بریتیە لە تاقیکردنەوەی ئینسان:

أ/ خوا لە سوورەتی (هود)، لە ئایەتی (٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾.

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژان (واتە: بە شەش قۆناغ) هێناونە دی، بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقییتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترە؟

کەواتە: ئەم گەردوونە هەمووی شانۆیەکە هەڵخراوە، بۆ ئەوەی مرۆڤی تێدا تاقی بکرێتەوە.

ب/ هەروەها خوا لە سووڕەتی (الجاثیة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَلِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی و، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك سزا و پاداشتی بدرێتەوەو، ستەمیشیان لێ ناکرێ.

ج/ هەروەها خوا لە سووڕەتی (الملك)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾.

واتە: (خوا) ئەو زاتەیە کە ژیان و مردنی هێناونە دی، تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەتان باشترە!

## ٧- مرۆڤ لەلایەن خواوە ڕێزی لێگیراوەو، لەسەر زەوی بە خەلیفە دانراوەو، سپاردەی تایبەتیی خوای پێ سپێردراوە:

أ/ لە سووڕەتی (التین)دا خـــوا دەربارەی مرۆڤ فەرموویەتی: ﴿ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ ﴾.

واتە: بە دڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەدا خوڵقاندوە.

ب/ لە سووڕەتی (البقرة)ش دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ ﴿٣٠﴾ ﴾.




واتە: یاد بکەوە! کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: جێنشینێك دادەنێم لەسەر زەوی.

کەواتە: مرۆڤ جێنشینی خوایە، بەڵێ مەبەست پێی ئادەمە، بەڵام ئێمەش وەچەی ئادەمین و ئێمەش لەسەر زەوین و، لە ئایەتەکانی دیکەشدا، ئاماژە بەوە کراوە کە ئێمە هەمووومان جێنشینی خواین لەسەر زەوی، بۆ نموونە:

﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ...﴾ فاطر: ٣٩.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە گێڕاونی بە جێنشین لە زەوی دا...

ج/ لە سوورەتی (الأحزاب)دا خوا دەفەرمویَ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾﴾.

واتە: ئێمە سپاردەمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیبگرن و لێی ترسان، کەچی مرۆڤ هەڵیگرت.

کەواتە: مرۆڤ هەڵگری ئەمانەتێکە کە بە هەموو گەردوون هەڵنەگیراوە.

## ٨- هەرچی لە گەردووندایە، بۆ مرۆڤ ڕەخسێنراوە، بۆیشی ملکەچ کراوە:

کەواتە: (ئاو) و (با) و (گڵ) و (ئاگر) و (دار) و (بەرد) هەمووی دروستکراوی خوایە و، هەمووی بۆ مرۆڤ دەستەمۆ کراوە:

أ/ لە سوورەتی (لقمان)دا خوا دەفەرمویَ: ﴿أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴿٢٠﴾﴾.

واتە: ئایا نابینن کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی هێناوەتە دی و، چاکەکانی خۆی بە ئاشکراو پەنهان بەسەرتان دا ڕژاندوە!

ب/ هەروەها لە سوورەتی (الجاثیة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ ﴿١٣﴾ ﴾.

واتە: خوا لە لایەن خۆیەوە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی دەستەمۆ و ڕام و ملکەچ کردوە (کە لێی بەهرەمەند بن).

## ٩- خوا مرۆڤی بۆ بەندایەتیی خۆی دروستکردوە:

خوا لە سوورەتی (الذاریات)دا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾.

واتە: جینن و مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە هێناونە دی، کە بەندایەتییم بۆ بکەن.

خوا دەفەرموێ: خەڵکینە! تەنیا بۆ ئەوە دروستم کردوون کە بەندایەتییم بۆ بکەن و، بەندایەتیی بۆ هیچ شتێکی دیکە نەکەن، تەنیا خوا شایستەی ئەوەیە کە مرۆڤ بەندایەتیی بۆ بکات.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## ١٠- مرۆڤەكان هەموویان یەكسانن لە ڕووی ڕەچەڵەك و نەتەوەو.. هتدەوە و بەڕێزترینیان لەلای خوا، پارێزكارترینیانە:

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات.

واتە: ئەی خەڵكینە! ئێوەمان لە نێرو مێیەك، (واتە: ئادەم و حەووا) بەدی هێناوە و، گێڕاومانن بە چەند نەتەوەو هۆزێك، تاكو پێك ئاشنابن، بە دڵنیایی بەڕێزترینتان لە لای خوا پارێزكارترینتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

بەڵێ ئەمانە هێڵە گشتییەكانی (بووناسیی ئیسلامیی)ین، كە فەلسەفە بە درێژایی دوو هەزارو پێنج سەد (٢٥٠٠) ساڵ لەمەو پێش، بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا گەڕاوە و، بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕاستییانە گەڕاوە، كە خوا (سبحانه وتعالى) بە ئامادەیی خستوونیە بەر دەستی مرۆڤ، بەڵام بە داخەوە كە زانایانی ئیسلام، وەك پێویست - بە بۆ چوونی من - گرنگییان بە (بووناسیی ئیسلامیی) نەداوە، كە ئێمە كتێبی یەكەمی مەوسوعەی: (الإِسْلَامَ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَاب الله عَزَّوَجَلَّ)، لە ژێر ناوونیشانی: (الإِسْلَام: مَعْرِفَة صَّحِيحَة بالخَالِق وَالخَلْق) دا، مان، تایبەت كردوە بە ڕوونكردنەوە و شیكردنەوەی بووناسیی ئیسلامییەوە.

لە نوێترە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com







## ڕای زانایەکی ڕۆژهەڵاتناس لە بـــارەی بێنیازیی مسوڵمانانەوە لە فەلسەفە:

ئێستاش لە بارەی بێ نیازیی مسوڵمانانەوە لە فەلسەفە و، ئەوە: کە ئیسلام مسوڵمانانی لە فەلسەفە بێ نیاز کردوە، بە پەسندی دەزانم ڕای یەکێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان بێنم، بە ناوی: (البارون کارّادي فو) کە ڕۆژهەڵاتناسێکی فەڕەنسییە و، (د.محمد یوسف موسی) لە کتێبەکەی خۆی: (القُرْآنُ وَالفَلْسَفَة) دا[1]، قسەیەکی لێ نەقڵ دەکات لەو بارەوە، کە ئیسلام مسوڵمانانی بێ نیاز کردوە لە فەلسەفە و، گەڕان بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارە مەزنانەدا، کە وەك لە ڕابرِدوودا گوتمان: فەیلەسووفەکان زۆر پێیانەوە سەرقاڵ بوون، کە دیارە ئەو قسەکەی تەرجەمەی عەرەبی کردوە، دەڵێ:

(إِنَّ مُحَمَّداً وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَيْلَسُوفاً بالمَعْنَى الكَامِلِ، قَدْ وَاجَهَ كَثِيراً مِنَ المَسَائِلِ الفَلْسَفِيّة بحلُولٍ كَوَّنَت العَقِيدَة الإِسْلَامِيَّة، وَإِذاً فَلَمْ تَكُنِ الحَقِيقَةُ المُطْلَقَةُ هِيَ المُشْكِلَة الَّتِي كَانَ العَرَبُ يُحَاوِلُونَ حَلَّهَا، لأَنَّهُم عَرَفُوا هَذِهِ الحَقِيقَةَ فِي نَوَاحِيهَا الجَوْهَرِيَّة بوَاسِطَةَ الوَحِي الإِلهي، وَإِنَّمَا كَانَت غَايَتُهُم شَرْحَ هَذِهِ الحَقِيقَةِ وَالإِنْتِصَارَ لَهَا، وَوَضْعِ هَذِهِ الحَقِيقَة الَّتِي جَاءَ بِهَا الوَحِي، فِي أَسْلُوبٍ أَدِبِيٍ فِي قَالِبِ فَنِي).

واتە: موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بە مانای تەواوی وشەش فەیلەسووف نەبوو بێ، بەڵام ڕووبەڕووی زۆر لە پرسە فەلسەفییەکان بۆتەوە، بە چەند چارەسەرێك، کە سەرەنجام عەقیدەی ئیسلامییان لێ دروست بووە، بۆیە حەقیقەتی ڕەها ئەو گرفتە نەبووە کە عەرەبەکان (ئەو دەڵێ عەرەب و مەبەستی پێ مسوڵمانانە) هەوڵی چارەسەریان دابێت، چونکە ئەو ڕاستییە ڕەهایەیان لە ڕووە جەوهەرییەکەیەوە، بە هۆی وەحییەوە دەرك کردوە، بەڵام مەبەستی ئەوان (هی زانایانی ئیسلام) ئەوە بووە کە ئەو حەقیقەتە ڕوون بکەنەوە و پشت ئەستووری بکەن بە بەڵگە و، ئەو حەقیقەتەی کە وەحیی هێناویەتی، بیخەنە چوار چێوەیەکی هونەریی بە شێوازێکی ئەدەبیی.

---

(١) ص١١ و ١٢.

www.alibapir.com





ئنجا دوایی (مُحَمَّد يوسف موسى) بە ڕەحمەت بێ، هەر لە کتێبی: (القُرْآنُ وَالفَلْسَفَة)[١]دا، دەڵێ:

(وَهَكَذَا لَمْ يَتَّجه المُسْلِمُونَ الأَوَائِلُ إلى التفَلْسُفِ كَمَا أُثِرَ عَنِ اليُونَان، إِذْ وَجَدُوا فِي القُرْآنِ مَا يَجِبُ أَنْ يَعرِفُوهُ عَنِ اللهِ، وَالكَوْنِ، وَالإِنْسَان، وَمَا أَتْعَبَ الفَلاَسِفَةُ القُدَمَاءُ مِنَ اليُونَانِ وَغَيْرَ اليُونَانِ، أَنْفُسَهُم فِيهِ، فَلَمْ يَصِلوا إلى الحَقِّ إلاَّ فِي القَلِيلِ مِنْهُ).

واتە: هەر بەو شێوەیە مسوڵمانانی سەرەتا ڕوویان نەکردە فەلسەفە، وەك لە یۆنانییەکانەوە بە جێماوە، چونکە ئەوەی کە پێویست بوو بیزانن لە بارەی خواوە و، لە بارەی گەردوونەوە و، لە بارەی مرۆڤەوە و، ئەوەی کە فەیلەسووفە پێشینەکان لە یۆنان و جگە لە یۆنانییەکانیش، زۆر خۆیان پێوە ماندوو کرد و نەگەیشتنە هەق، مەگەر لە کەمێکیدا، قورئان بە ئامادەیی خستبوویە بەردەستیان.

لێرەدا تەنیا تێبینییەك دەخەینە ڕوو لە بارەی قسەکەی (البارون کارّادي فو) ڕۆژهەڵاتناسیی فەڕەنسیی یەوە، کە دەڵێ: موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ئەو پرسە فەلسەفییانەی دەهاتنە پێشی، چارەسەری بۆ دانان و، سەرەنجام (عەقیدەی ئیسلامیی) لەوە بەرهەم هات!

کە بێگومان ڕاستییەکەی ئەوەیە کە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) هیچی لە گیرفانی خۆی دەرنەهێناوە، بەڵکو ئەوە وەحیی خوای پەروەردگار بوو، بەڵام بە هەرحاڵ ئەو بەو تەعبیرە دایڕشتوە.

جارێکی دیکەش دووبارەی دەکەمەوە: کە بێگومان زانایانی ئیسلام، ئەگەر لە خەڵکی دیکە زیاتر عەقڵ و هۆشی خۆیان بەکارنەهێنا بێ، کەمتریان بەکارنەهێناوە، بۆ پەیبردن بە ڕاستییەکانی بوون و، وەڵامی ئەو پرسیارە بنەڕەتییانەی کە لە سروشت و خواڕسکی هەر مرۆڤێکدا هەن:

١- من کێم؟

٢- ئەم گەردوونە چیە؟

---

(١) ص١١ و ١٢.

www.alibapir.com



٣- لە کوێوە هاتووم؟

٤- بۆ کوێ دەچم؟

٥- بۆ چی هاتووم؟

٦- پێویستە چی بکەم؟

ئەو پرسیارە بنەڕەتییانەی کە وەك گوتمان: فەلسەفە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە سەری هەڵداوە و، فەلسەفە یانی: بیرکردنەوەی مرۆڤ بۆ پەیبردن بە ڕاستییەکان، بەڵام بۆیە زانایانی ئیسلام زۆر بە فەلسەفە ناودار نەبوو ون، چونکە وەڵامی ئەو پرسیارانەیان بە ئامادەیی لە وەحیی خوای پەروەردگاردا دەستکەوتوە، ئەو وەڵامە ڕاست و دروستەی، کە هەرگیز عەقڵی بەشەر پێی ناگات، لەبەرئەوەی ئەو پرسیارانە لەوە گەورەترن کە عەقڵ بتوانێ دەرکیان بکات، چونکە مرۆڤ وەك چۆن پێنج هەستەکانی سنووردارن، عەقڵیشی تا مەودایەك بڕ دەکات، بە تایبەت مامەڵە لەگەڵ نادیار و پەنهاندا:

١- خوا (سبحانه وتعالى) کێیە؟

٢- سیفەتەکان چین؟

٣- ڕۆژی دوایی چییە؟

٤- ڕووحیی مرۆڤ چۆنە؟

٥- فریشتەکان کێن و چۆنن؟

٦- جند کێن و چۆنن؟

٧- بەهەشت چۆنە؟

٨- دۆزەخ چۆنە؟

ئا ئەوانە لە ڕاستییدا لە مەودای عەقڵی مرۆڤدا نین، مەگەر وەحیی دەستی بگرێ و، ئاشنای بکات بە جیهانی ئەو دیو سروشت، بە نادیار و پەنهان و، وەڵامی ئەو پرسیارانەی بخاتە بەردەست.



## بڕگەی دووەم: زانایانی ئیسلام کەمتر وەك فەیلەسووف ناسراون، بەڵام بەرهەمی زۆریان بووە کە دەچێتە نێو بازنە و پێناسەی فەلسەفەوە:

چونکە فەلسەفە ئەگەر بریتی بێ، لە هەوڵی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان و، وەڵامی پرسیارە گەردوونییەکان (الأسئلة الكونية) زانایانی ئیسلام لە هەرسێك بواری:

١- عەقیدە. ٢- تەصەووف. ٣- بنچینەکانی فیقە (أصول الفقه)دا بەرهەمی زۆریان بووە:

### ١- لە بواری عەقیدەدا:

کە بە: (أصول الدين) و (عِلمُ التوحيد) و (عِلمُ الكَلاَم) و (الفقه الأكبر)یش ناودەبرێ، زانایانی ئیسلام بەرهەمی زۆریان بوو ون، کە ئێستا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین، بۆ وێنە:

١- (عبدالجبار الهمداني) کتێبێکی هەیە بە ناوی (المُغني) کە چەند بەرگێکە و بەرگێکیان بە ناوی: (النَّظَرُ والمَعَارِف)ە، لە حەفتا(٧٠) وردە بەش پێکهاتوە.

٢- (الباقلاني) کتێبی (التمهيد)ی داناوە.

٣- (أبو حامد الغزالي) کتێبی (تهافت الفلاسفة) و (المُنقِذ من الضلال)ی داناون.

٤- (فخر الدين الرازي) جگە لە (مفاتيح الغيب)ەکەی چەندان کتێبی دیکەی هەن، بە تایبەت (الإشاره فى أصول الدين).

٥- (عَضُدَ الدين الأِيجي) و کتێبە ناودارەکەی: (المَواقِف).

www.alibapir.com





٦- (إِبْنُ التيمية) و مەوسووعەکەی: (دَرءُ التَّعَارُضِ بَيْنَ العَقْلِ وَالنَّقْل).

٧- هەروەها (إِبْنُ رُشد)یش، جگە لە کتێبی: (تَهَافُت التَّهَافُت)، (مَناهِجُ الأدِلة) و (فَصْلُ المَقَال فِي مَا بَيْنَ الشَّرِيعَةِ وَالحِكْمَةِ مِنَ الإتِّصَال)یشی هەن، لەو بارەوە.

هەروەها گەلێك لە زانایانی دیکەش و، لەو بوارەدا زانایانی ئیسلام بەرهەمێکی زۆری فیکرییان هەیە کە دەچێتە نێو چوار چێوەو بازنەی فەلسەفە و کەلەپووری فەلسەفییەوە، وێڕای ئەوەی کە لە ژێر ناوونیشانی خودی فەلسەفەشدا - وەك دوایی ئاماژەی پێ دەکەین - ژمارەیەك لە زانایانمان هەن، کە ناوی فەیلەسووفیان بۆ بەکارهێنراوە.

## ٢- بــواری زانستی تەزکیە و صۆفیگەریی (علم التصوف):

لەو بوارەشدا دیسان زانایانی ئیسلام کەلەپوورێکی زۆریان بەجێهێشتوە، هەرچەندە بە داخەوە خڵتە و خاڵی زۆریشی ڕەگەڵ کەوتوە، بە تایبەت تەصەووفی فەلسەفیی هەر لە (إبن سينا)وە بگرە، هەتا سەرجەم ئەوانی دیکە بە تایبەت (إبن عربي) و تەنانەت (أبو حامد الغزالي)یش، لە هەندێك لە کتێبەکانی دا.

## ٣- بــواری بنچینەکانی فیقهـ (أصول الفقه):

لە بواری (أصول فقه)یشدا دیسان زانایان بەرهەمێکی زۆری فیکرییان بۆ بەجێهێشتووین و، تەنانەت بەشێك لە زانایان گوتوویانە: زانیاریی بنچینەکانی فیقهـ (علم أصول الفقه) بە فەلسەفەی ئیسلام و مسوڵمانان دادەنرێ و ئەو زانستە تایبەتە بە ئیسلامەوە و، لەو بوارەش دا کتێب و بەرهەمی زانایان هێندە زۆر و جۆرا و جۆرن، ئاماژە پێکردنیشیان زەحمەتە، بەڵام چەند نموونەیەکیان لێ باس دەکەین:

١- الرسالة، للشافعي.

٢- المستصفى، للغزالي.

٣- المحصول في علم الأصول، للرازي.

٤- الإحكام في أصول الأحكام، للآمدي.

٥- إعلام الموقعين عن رب العالمين، لابن القيم.

٦- الموافقات، للشاطبي.

٧- إرشاد الفحول في علم الأصول، للشوكاني.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## بڕگەی سێیەم: ناوی سێزده (١٣) له فەیلەسووفەكانی ئیسلام:

له فەیلەسووفه مسوڵمانەكان، ئەوانەی كه زۆر ناسراون، ژمارەیەكم لێ هێناون، كه سەرجەم سێزده (١٣) كەسن:

١- **(الكِنْدِي)**: كه له ساڵی (٨٠٠)ی زایینی دا له دایك بووه و، له ساڵی (٨٧٤) زایینی دا كۆچی دوایی كردوه و، به (أبو یوسف یعقوب بن إسحاق الكندي) مەشهور بووه و، لەسەر ڕێبازی (مُعتَزِلة) بووه و، به (فیلسوف العرب) ناسراوه، چەند كتێبێكی هەن، شایانی باسه كیندیی زۆریش پابەند بووه به قورئان و سوننەت و شەریعەتەوه، وەك هەندێكی دیكه له فەیلەسووفەكان، كه عەقڵیان پێش نەقڵ خستوه، تووشی ئەو جۆره هەڵانه نەبووه.

٢- **(محمد بن زكریا الرازي)**: كه له ساڵی (٨٦٤)ی زایینی دا له دایك بووه و، له ساڵی (٩٢٣)دا، كۆچی دوایی كردوه، كتێبێكی هەیه به ناوی (سِرُّ الأَسْرَار) ئەویش دیسان گرنگییدانی هەبووه به باس و خواسەكانی فەلسەفه.

٣- **(الفَارَابـــي)**: كه له (٨٧٠)ی زایینی دا له دایك بووه و له ساڵی (٩٥٠) دا، كۆچی دوایی كردوه و، كه ناوی: (أبو نصر بن محمد بن أوزلخ بن طرخان الفارابي)یەو، به (المُعلِّمُ الثاني) مامۆستای دووەم ناسراو بووه، واته: له دوای (ئەرەسطۆ)، ئەویان به مامۆستای فەلسەفه ناسیوه، كتێبێكی ناوداری هەیه، به ناوی: (المدینة الفَاضِلَة) باسی ئەوه دەكات كه كۆمەڵگا چۆن دەبێ بەڕێوەبچێ؟ كۆمەڵگایەكی نموونەیی.

٤- **(إبن سـینا)**: له ساڵی (٩٨٠)ی زایینی دا، له دایك بووه و، له (١٠٣٧) دا، كۆچی دوایی كردوه و نازناوی (الشیخُ الرئیس)ی هەبووه، كتێبێكی هەیه به ناوی: (الشفاء) و كتێبێكی دیكەی هەیه به ناوی: (الإشارات) و هاو كات پزیشكیش بووه، كتێبێكی هەیه به ناوی: (القانون) له (طب)دا و پیاوێكی زۆر ناودار بووه.

www.alibapir.com





٥- **(إبن بَاجَــه)**: کە لە ساڵی (١١٣٨)ی زایینیدا کۆچی دوایی کردوە، کتێبێکی هەیە بە ناوی (تَدْبيرُ المُتَوَحِّد) ئەمیش دیسان یەکێك بووە لە فەیلەسووفە مسوڵمانەکان.

٦- **(إبن طـفيل)**: کە لە ساڵی (١١٨٥)ی زایینی دا وەفاتی کردوە، کتێبکی ناوداری هەیە بە ناوی: (حي بن يقظان) کە بەسەرهاتێکی ڕەمزییە و، دەیەوێ بڵێ: ئەوەی شەریعەت هێناویەتی لەگەڵ ئەوەدا کە فیطرەت و عەقڵی سەلیم دەیخوازێ، پێکدەگەنەوە، قسەکەشی ڕاستە، بەڵام مەرج نیە هەرچی شەریعەت هێناویەتی، هەمووی لە عەقڵدا جێگای ببێتەوە.

٧- **(إبْنُ حَزْم الأَنْدَلُسِي)**: کە لە (٩٩٤)ی زایینی دا لە دایك بووە و، لە (١٠٦٤)دا، وەفاتی کردوە کتێبی زۆرن، بەڵام ئەوەی کە پەیوەستە بە بواری فیکرو فەلسەفەوە، کتێبە ناودارەکەی: (الفِصَلْ فِي المِلَلِ وَالأَهْوَاءِ وَالنِّحَل)ە.

٨- **(إبن مُسكَويه)**: کە لە ساڵی (١٠٣٠)ی زایینی دا کۆچی دوایی کردوە، بە دوو کتێبی زۆر ناسراوە، یەکەم: کتێبی (الأخلاق)، کتێبی دووەمی: (تَجَارب الأُمَمْ وَتعَاقب الهِمَمْ).

٩- **(أَبُو حَامِد الغَزَالِي)**: لە ساڵی (١٠٥٩)ی زایینی دا لە دایك بووە و، لە ساڵی (١١١١)ی زایینی، واتە: لە ساڵی (٥٠٥)ی کۆچیی دا وەفاتی کردوە و، کە کەمتر بە ناوی فەیلەسووف ناسراوە، بەڵام پێم وایە: پێش زۆر لە فەیلەسووفەکان کەوتۆتەوە، ئەگەرنا زیاتر بە زانا و شەرعزان ناسراوە.

هەڵبەتە غەززالیی بە: (حُجَّةُ الإِسْلَام) واتە: (بەڵگەی ئیسلام) ناسراوە و بە کتێبە ناودارەکەی لە بواری فەلسەفەدا: (تَهَافت الفَلاَسِفَة) ناسراوە، هەروەها کتێبێکی دیکەی هەیە لەو بارەوە: (المُنْقِذ مِنَ الضلال)، ئەگەرنا (أَبُو حَامِد الغزالي) کتێبی زۆرن، هەم لە ڕووی شەرعزانیی(فقه)، هەم لە ڕووی تەصەووف و ئەخلاق، هەم لە ڕووی فیکرو فەلسەفە، هەم لە ڕووی (أصول الفقه)ەوە.

١٠- **(إبن رُشد الحفيد)**: کە لە ساڵی (١١٢٦)ی زایینی دا لە دایك بووە و، لە ساڵی (١١٩٨)دا کۆچی دوایی کردوە، ئەویش لەو بوارەدا چەند کتێبێکی

www.alibapir.com





هەن بە تایبەت: (تَهافُت التَّهَافُت) کە دەیەوێ بەرپەرچی کتێبەکەی (أبو حامد الغزالي) بداتەوە، وشەی (تَهافُت) واتە: پووچەڵیی، ئنجا ئەو لە بەرپەرچدانەوەی (أبو حامد الغزالي)دا دەڵێ: (تَهَافُت التَّهَافُت) پووچەڵکردنەوەی پووچەڵکردنەوە، هەروەها کتێبێکی دیکەشی هەیە (فَصلُ المَقال فيما بين الشَّريعة والحكمة من الإتصال) و، کتێبێکی دیکەشی هەیە (مَناهِجُ الأدِلَّة في عقائد المِلَّة).

**١١- (إبن عربـــي):** هەرچەندە کەمتر بە ناوی فەیلەسووف ناسراوە، بەڵام زۆر باس و خواسی فەلسەفیی کردوون، لە ساڵی (١١٦٥)ی زایینی دا لە دایك بووە و، لە ساڵی (١٢٤٠)دا، کۆچی دوایی کردوە و، ئەو (إبن عربی)یە ئیشکالی زۆری لەسەر هەن، بە تایبەت لەسەر هەردوو کتێبەکە ناودارەکەی: ١- (الفتوحات المكية) و، ٢- (فصول الحِكَم) کە شتی زۆری وایان تێدایە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا تێکدەگیرێ و، شتی واشیان تێدایە کە موافیقی شەریعەتە، بە هەرحاڵ زانایان مشتومڕی زۆریان بووە لە بارەی (إبن عربي)یەوە، کە ئێمە ئێستا دەرفەتی ئەوەمان نیە زۆری لەسەر بدوێین، گرنگ ئەوەیە ئەویش باس و خواسی فەلسەفیی زۆری کردوە.

**١٢- (عبدالرحمن إبن خلدون):** کە لە ساڵی (١٣٣٦)ی زایینی دا لە دایك بووەو، لە ساڵی (١٤٠٦)ی زایینی دا کۆچی دوایی کردوە و، (إبن خَلدون) بە کتێبە ناودارەکەی (المُقَدِّمَة) ناسراوە و، ئەو کتێبەی بە (فەلسەفەی مێژوو) و (فەلسەفەی کۆمەڵناسیی) دادەنرێ و ئەورووپاییەکان وەك چۆن زۆر گرنگییان بە (إبن رُشد) داوە و کتێبەکانیان تەرجەمە کردوون، گرنگیی زۆریشیان بە (إبن خَلدون) داوە.

**١٣- (صدرالدين الشيرازي):** کە بە: (مُلاّ صدرا) ناسراوە و کتێبێکی ناوداری هەیە، بە ناوی: (الأسفار الأربعة).

ئەوانە ژمارەیەك بوون لە زانایانی ئیسلام، کە بە فەیلەسووف ناسراون، دیارە زۆری دیکەش هەن کە زۆر زەق و ناودارن، بەڵام ئەوانەمان وەك نموونە هێنایەوە.

www.alibapir.com







## پرسیارێك و وەڵامەكەی:

یەكێك بۆی هەیە بپرسێ: ئەدی باشە ئێوە نەتانگوت: ئیسلام مسوڵمانانی بێ نیاز كردوە لە فەلسەفە و بیركردنەوەی فەلسەفیی، بە هۆی ئەوەوە كە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی فەلسەفە بە دوایاندا دەگەڕێ، بە ئامادەیی خستوویەتە بەر دەستی مسوڵمانان، ئەدی چۆن ئەو زانایانە بەرهەمی فەلسەفییان هەبووە؟

وەڵامەكەی هەر ئەوەیە: كە لە ڕاستییدا بەشێك لەوانە، كەم و زۆر كەوتوونە ژێر كاریگەریی ئەوەی كە لەسەردەمی خۆیاندا باو بووە، وەك چۆن ئێستا خەڵكێك دەكەوێتە ژێر كاریگەریی سیكۆلاریزم و لیبرالیزم و، كاتی خۆی - لە سەدەی بیستەم دا - دەكەوتنە ژێر كاریگەریی كۆمۆنیزم و سۆسیالیزم و ماركسیزم، بەشەر بەشەرە ئەو شتانەی كە دەبنە باو، ئەو تەوژمە فیكریی و سیاسییانەی كە لە ڕۆژگاری ئەودا دەبن، كەسێ زۆر زۆر دامەزراو نەبێ، كەم و زۆر پێیان كار تێكراو دەبێ، ئنجا ئەوانەش دیارە كارتێكراوییان ڕێژەییە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەموو ئەوانە هەر لە چوار چێوە و لە بازنەی ئیسلام و ئوممەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بوون، هەرچەندە ڕەنگە هەندێ لە زانایانیش هەبن كە بە لای سەختیی و وشكیی و توندییدا دەشكێنەوە، هەندێك لەوانەیان لە بازنەی ئیسلام بردبێتە دەر، بەڵام هەموو ئەوانە خۆیان بە مسوڵمان داناوە و لە نێو كۆمەڵگای ئیسلامییدا بوون و، هەوڵیشیان داوە ئەوەی كە وەحیی خوا دەیفەرموێ، لەگەڵ ئەوەدا كە عەقڵی سەلیم دەیگەیەنێ، پێكەوەیان بگونجێنن، كە هەڵبەتە پێویستیش بە هەوڵی ئەوان ناكات و (عەقڵ و نەقڵ) پێكەوە گونجاون، مەگەر عەقڵەكە بە هەڵەدا چوو بێ، یاخود نەقڵەكە ڕاست و دروست نەبێ، بۆیە زانایان لە مێژە گوتوویانە: كە موستەحیلە نەقڵی ڕاست(صحیح)، لەگەڵ عەقڵی ساغ (صریح)دا، تێك بگیرێ، واتە: وەحیی خوا و، عەقڵێك كە پێكابێتی و بە هەڵەدا نەچوو بێ، هەمیشە تەواوكەری یەكدین و پێكەوە دەگونجێن، چونكە وەحیی، یاخود نەقڵ، یان شەرع، یانی: فەرمایشتی خوا و پێغەمبەرەكەی،

www.alibapir.com



ئنجا بێگومان عەقڵیش دروستکراوی خوایە، بۆیە ئەوەی کە عەقڵی سەلیم بەرهەمی دێنێ، لەگەڵ ئەوەدا کە شەرعی خوا، وەحیی خوا فەرموویەتی، بە تەئکید دەبێ پێکەوە گونجاوو تەبا بن، چونکە مەحاڵە گوتراوی خوا، لەگەڵ دروستکراوەکەی دا، دژ و ناکۆك بێ.

(إبن تيمية)ش کتێبێکی گەورەی دە (١٠) بەرگیی لەو بارەوە داناوە، بە ناوی: (دَرءُ التَّعَارض بَيْنَ العَقْلِ والنَّقْلِ)، (لابردنی تێکگیران لە نێوان عەقڵ و نەقڵدا).

هەروەها (إبن رُشد)یش کتێبێکی هەیە بە ناوی: (فَصْلُ المَقَال فِيمَا بَيْنَ الحِكْمَةِ وَالشَّرِيْعَةِ مِن الإتِصَال) واتە: (قسەی ڕوون لە بارەی پێکەوە پەیوەست بوونی شەریعەت و حیکمەتەوە)، مەبەستیشی لە حیکمەت، فەلسەفەیە، هەروەها زانایانی دیکەی ئیسلامیش، هەموویان باسی ئەوەیان کردوە، کە هەرگیز نەقڵی ڕاست و دروست لەگەڵ عەقڵی سەلیم دا تێك ناگیرێن و، ئەگەر تێکگیرانێك ڕوویدا، ئەوە: یان عەقڵەکە نەپێکاوە، یاخود نەقڵ و وەحیی و شەرعەکە گۆڕدراوەو، ئەوە نیە کە خوا (سبحانه وتعالى) ناردوویەتی.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵمانبن
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر





## بڕگەی چوارەم و كۆتایی: هەڵسەنگاندنی چەند زانایەك بـۆ فەلسـەفە:

لەم بڕگەی چوارەمەدا قسەی چەند زانایەك دێنین، داخۆ چۆن تەماشای فەلسەفەیان كردوەو هەڵیان سەنگاندوە:

### ١- (أبو حامد الغزالي):

كە لەو بوارەدا بە كتێبە ناودارەكەی: (تَهَافُتُ الفَلاَسِفَة) (پووچەڵیی فەیلەسووفەكان)، یان (هەڵوەشانەوەی بیرۆكەكانی فەیلەسووفەكان) ناسراوە.

ئنجا (أَبُو حَامِد) لەو كتێبەیدا، لە سێ شتاندا، قسەی فەیلەسووفەكان بە كوفر دادەنێ:

**یەكەم:** ئەوە كە هەندێك لە فەیلەسووفەكان گوتوویانە: بەڵێ، خوا بەدیهێنەری گەردوونە، بەڵام گەردوون بێ سەرەتایە، لەبەرئەوەی خوا لە ئەزەلدا سیفەتی دروستكردن و بەدیهێنان(خالق)ی هەبووە و، دەبێ بەدیهێنراو(مخلوق)یش بوو بێ لە ئەزەلەوە.

كە ئەوە دوایی قسەی زیاتری لەسەر دەكەین.

**دووەم:** ئەوە كە هەندێك لە فەیلەسووفەكان نكووڵییان كردوە لە زیندووبوونەوەی جەستەیی و گوتوویانە: بەڵێ، قیامەت هەیە، ڕۆژی دوایی هەیە، بەڵام ئەوە بە تەنیا بۆ ڕووحە و، نكووڵییان لەوە كردوە، كە مرۆڤ بە جەستە زیندوو بكرێتەوە، كە ئەوەش پێچەوانەی دەقی قوڕئانە و، لە چەندان ئایەتدا خوای پەروەردگار زیندووكرانەوەی جەستەكان باس دەكات، بۆ وێنە، دەفەرموێ:

www.alibapir.com





﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ٧﴾ الحج.

واتە: بە دڵنیایی خوا ئەوانەی ئەوەی لە گۆڕەکاندان زیندوویان دەکاتەوە.

کە بێگومان مەبەست جەستەکانن، ئەگەرنا ڕووح پێویستیی بە زیندوو کردنەوە ناکات و هەر زیندوویە و، جەستەکانیش لە گۆڕەکان (قبور)دان، نەك ڕووحەکان.

**سێیەم:** ئەوە کە نکووڵییان کردوە لەوەی خوای پەنهانزان وردەکارییەکان(جزئیات) بزانێ، یانی: زانیاریی خوا پەیوەست بێ بە وردەکارییەکانەوە، ئەویش بە بیانووی ئەوەوە کە خوای پەروەردگار بە پاك دەگرن و گوتوویانە: خوا لەوە مەزنترە ئەو شتە وردانە بزانێ، کێ چی گوت؟ کێ چی خوارد؟ کێ چی کرد؟ ئەو شتە بچووکانە، خوا زۆر لەوە مەزنترە کە زانیاریی بێسنووری، ئەو شتە بچووکانەی تێدابن!

کە بێگومان ئەوەش هەر نەزانییە، چونکە: خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩﴾ الأنعام.

واتە: کلیلەکانی پەنهان لەلای خوان، جگە لە وی کەس نایانزانێ و، هەرچی لە وشکانیی و دەریادایە، هەمووی دەزانێ و، هیچ گەڵایەك لە درەختێك ناکەوێتە خوار، مەگەر خوا دەیزانێ و، هیچ دەنکە تۆوێك نیە لە تاریکاییەکانی زەویدا و، هیچ تەڕێك نیە و، هیچ وشکێك نیە، مەگەر لە کتێبێکی ڕوون، (یان ڕوونکەرەوە)دا هەیە.

ئنجا خوا (سبحانە وتعالی) کە هەموو شتێك دەزانێ، بێگومان ئا ئەوە تەواویی شارەزایی و زانیاریی خوا ئەوە دەخوازێ، نەك لەبەرئەوەی خوا زۆر مەزنە و، زانیاریی خوا بێ سنوورە، شتی ورد نەزانێ!

www.alibapir.com





(أبو حامد الغزالي) دەڵێ: هەر کام لەو سێیانە کوفرن و، ئەو فەیلەسووفانەی ئەو جۆرە قەناعەتەیان هەبووە، تووشی کوفر بوون، بەڵام بێگومان بۆ بە کافر دانانی هەر کەسێك، دەبێ بنچینەی: هاتنە دی مەرجەکان و لاچوونی پەرچەکان (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) بچەسپێ، ئایا ئەو کەسە هەموو مەرجەکانی تێدا هاتوونە دی و، هەموو پەرچەکانی کە ڕێ دەگرن، لەوەی کە ئینسان بە کافر دابنرێ، لەبەر ئەوە وای گوتووە، لاچوون؟ ئنجا ئەو بڕیارەی بۆ دەدرێ، ئەوەش مەسەلەیەکی هەستیار و قووڵە.

یەکێك لە قسەکانی ئەبو حامیدی غەززالیی لە بەرپەرچدانەوەی هەندێ فەیلەسووفەکاندا:

کاتێك باسی ئەو بیرۆکەیەی (ئەفلوطین) دەکات، کە دەڵێ: خوا (سبحانه وتعالى) عەقڵی هێنایە دی، ئنجا عەقڵیش نەفسەکانی هێنانە دی.

کە هەندێکی دیکەیان هەبوون بڕوایان بە دە (١٠) عەقڵەکان و نۆ (٩) خڕۆکەکان (العقول العشرة والأفلاك التسعة) هەبووە، جا لەو بارەوە غەززالیی لە کتێبی: (تَهَافُتُ الفَلاَسِفَة)[١]دا دەڵێ:

(قُلْنَا مَا ذَكَرْتُمُوهُ تَحَكُّمَاتٌ، وَهِيَ عَلَى التحْقِيقِ ظُلُمَاتٌ فَوْقَ ظُلُمَات، لَوْ حَكَاهُ الإِنْسَانُ عَنْ مَنَامٍ رَآهُ لَاَسْتُدِلَّ عَلَى سُوءِ مِزَاجِهِ، أَوْ لَوْ ورَدَ جِنْسُهُ فِي الفِقْهِيات الَّتِي قُصَارَى المَطْلَبِ فِيهَا تَخْمِينَاتٌ، لَقِيلَ: إِنَّهَا تُرَّهَاتٌ لاَ تُفِيدُ غَلَبَاتِ الظُّنُون).

واتە: ئەوەی کە ئێوە باستان کرد {لە عەقڵەکان و خڕۆکەکان) بەو شێوەیەی کە لە قسەی هەندێك لە فەیلەسووفەکاندا هاتوە}، ئەوە هەر قسە کردنێکە و هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە و، بە دڵنیاییەوە ئەوە هەمووی تاریکایی لەسەر تاریکایین و، ئەگەر کەسێك لە خەو بە خەبەر هاتبا و گێڕابایەوە، ئەو جۆرە قسانەی دەکرانە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە میزاجی تێکچوەو خراپە، هەروەها ئەگەر ئەو جۆرە قسانە، لە کتێبە شەرعییەکان و بابەتە فیقهییەکاندا باسکرابانایە، کە ئەو پەڕی

---

(١) ص١١٥.

www.alibapir.com





لە بابەتە فیقهییەکاندا، ئەوەی کە دەویستریٚ، بریتیە لە وا دانان و گومانێکی زاڵ، دەگوترا: ئەو قسانە توڕڕەهاتن، (واتە: قسەی پووچن)[1] و، تەنانەت گومانی زاڵیش ناگەیەنن.

## ٢- (إبـن تيمـية):

یەکی دیکە لەو زانایانەی ئیسلام، کە لە بارەی هەڵسەنگاندنی فەلسەفەو فەیلەسووفەکانەوە، قسەیان کردوە، بریتیە لە (ابن تيمية) کە زۆر بە قووڵیی لەو بارەوە قسەی کردوە، بە تایبەت لە کتێبی: (دَرءُ التَّعارضِ بين العَقلِ وَالنَّقْل) و کتێبی: (مِنْهَاج السُّنَّة النَّبَوِيَّة)دا و، لەو بارەوەش کتێبێکی تایبەتی هەیە، بە ناوی: (نَقْضُ المَنْطِق)، (هەڵوەشاندنەوەی مەنتیق)، یانی: مەنتیقی ئەرِەستیی (منطق أرسطو).

(إبن تيمية) لە تەفسیری سوورەتی (الإخلاص)دائاوا بەرهەمی فەیلەسووفەکان هەڵدەسەنگێنیٚ، لە بواری خواناسیی و، پێغەمبەر ناسیی و، فریشتە ناسیی و، دوارِۆژ ناسیی دا، دەڵێ:

(وَأَمَّا مَعْرِفَةُ اللهِ تَعَالَى، فَحَظُّهُم يَعْنِي "اليُونَانِيين" مِنْهَا، مَبْخُوسٌ جِدًّاً، وَأَمَّا مَلاَئِكَتُهُ وَكُتُبُهُ وَرُسُلُهُ، فَلاَ يَعْرِفُونَ ذَلِكَ البَتَّة، وَلَمْ يَتَكَلَّمُوا فِيهِ، لاَ بنَفْيٍ وَلاَ بإِثْبَات، وَإِنَّمَا تَكَلَّمَ فِي ذَلِكَ مُتَأَخِّرُوهُم الدَّاخِلُونَ فِي المِلَل)[2].

واتە: ناسینی خوای بەرز لە لای (یۆنانییەکان)، (یان لەلای فەیلەسووفەکان کە زیاتر کارتێکراو بوون بە یۆنانییەکان)، بەشێکی زۆر کەمە، (واتە: زۆر بە کەمیی و بە ناتەواویی باسی خواناسییان کردوە) و دەربارەی باسی فریشتەکانی

---

(١) تُرّهات: جمع تُرَّه: الطريق الصغير المُتشعِّب عن الطريق الأعظم، والباطل، والقول الخالي من نفعٍ، (المعجم الوسيط، ص٨٥).

(٢) ص٥٧.

www.alibapir.com





خواو کتێبەکانی خواو پێغەمبەرانی خوا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت، ئەوە هەر هیچی لێ نازانن و قسەیان لەو بارەوە نەکردوە (نە لە بارەی فریشتەکان و، نە لە بارەی کتێبەکان، نە لە بارەی پێغەمبەرانەوە)، نە بە لابردن، نە بە چەسپاندن، بەڵام ئەوانەی دواییان کە هاتوونە نێو ئایینەکانەوە (واتە: چوونە نێو ئایینی جوولەکە، یان ئایینی نەصرانیی، یان ئایینی ئیسلامەوە) ئەوانە قسەیان کردوە، لەو بارەوە. (ئەویش بە هۆی کارتێکراوییانەوە بە بەرنامەکانی خوا).

## ٣- (إبـن خلــدون):

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو زانایانەی هەڵسەنگاندنی بۆ فەلسەفە کردوە، کە ئەمە دەقی هەندێك لە قسەکانیەتی لەو بارەوە:

(وَلاَ تَثِقنَّ بِمَا يَزْعُمُ لَكَ الفِكْرُ، مِنْ أَنَّهُ مُقتَدِرٌ عَلَى الإِحَاطَة بالكَائِنَاتِ وَأَسْبَابِهَا، وَالوُقُوفِ عَلَى تَفْصِيلِ الوُجُودِ كُلِّهِ، وَسَفِّه رَأْيهُ فِي ذَلِكَ، وَاعْلَم أَنَّ الوُجُودَ عِنْدَ كُلِّ مُدْرِكٍ فِي بَادِئِ رَأْيِه، مُنْحَصِرٌ فِي مَدَارِكِهِ لا يَعْدُوهَا، وَالأَمْرُ فِي نَفْسِهِ بِخِلاَفِ ذَلِكَ وَالحَقُّ مِنْ وَرَائِهِ. أَلاَ تَرَى الأَصَمَّ كَيْفَ يَنْحَصِرُ الوُجُودَ عِنْدَهُ فِي المَحْسُوسَاتِ الأَرْبَعِ وَالمَعْقُولاَتِ، وَيَسْقُطُ مِنَ الوُجُودِ عِنْدَهُ: صِنْفُ المَسْمُوعَاتِ! وَكَذَلِكَ الأَعْمَى أَيْضَاً يَسْقُطُ عِنْدَهُ: صِنْفُ المَرْئِيَّات! وَلَوْ سُئِلَ الحَيْوَانُ الأَعْجَمُ وَنَطَقَ، لَوَجَدْنَاهُ مُنْكِراً لِلْمَعْقُولاَتِ وَسَاقِطَةٌ لَدَيهِ بالكُلِّيَّة! فَإِذَا عَلِمْتَ هَذَا؛ فَلَعَلَّ هُنَاكَ ضَرْبَاً مِنَ الإِدْرَاكِ غَيْرَ مُدرَكَاتِنَا، لأَنَّ إِدْرَاكَاتِنَا مَخْلُوقَةٌ مُحْدَثَةٌ وَخَلْقُ اللهِ أَكْبَرٌ مِنْ خَلْقِ النَّاس... فَاتَّهِم إِدْرَاكَكَ وَمُدْرَكَاتِك فِي الحَصْرِ، وَاتَّبِعْ مَا أَمَرَكَ الشَّارِعُ بِهِ مِنْ إِعْتِقَادِكَ وَعَمَلِكَ، فَهُوَ أَحْرَصُ عَلَى سَعَادَتِكَ، وَآعمل بِمَا يَنْفَعُكَ، لأَنَّهُ مِنْ طَوْرٍ فَوْقَ إِدْرَاكِك، ومِن نِطَاقٍ أَوْسَعُ مِنْ نِطَاقِ عَقْلِكَ.

وَذَلِكَ لَيْسَ بِقَادِحٍ فِي العَقْلِ وَإِدْرَاكِهِ، بَلِ العَقْلُ مِيزَانٌ صَحِيحٌ، فَأَحْكَامُهُ يَقِينِيَّةٌ لاَ كَذِبَ بَيْنَهَا، غَيْرَ أَنَّكَ لاَ تَطْمَعْ أَنْ تَزِنَ بِهِ أُمُورَ التَّوْحِيدِ وَالآخِرَةِ، وَحَقِيقَة النُّبوَّةِ وَحَقَائِقَ الصِّفَاتَ الإِلهِية وَكُلَّ مَا وَرَاءَ طَورِهِ، فَإِنَّ ذَلِكَ طَمَعٌ فِي مَحَالٍ، وَمِثَالُ ذَلِكَ: رَجُلٌ رَأَى المِيْزَانَ الَّذِي يُوزَنُ بِهِ الذَّهَبُ، فَطَمَعَ أَن يَزِنَ بِه الجِبالَ! وَهَذَا لاَ يُدْرِكُ، وَهُوَ لاَ يَدُلُّ عَلَى

www.alibapir.com





أَنَّ المِيْزَانَ فِي أَحْكَامِهِ غَيرُ صَادِقٍ، لَكِن العَقْلَ قَد يَقِفُ عِنْدَهُ، وَلاَ يَتَعَدّى طَوْرَهُ، حَتَّى يَكُونَ لَهُ أَنْ يُحِيطَ باللهِ وَصِفَاتِهِ، فَإِنَّهُ ذرَّةٌ مِنْ ذَرَّاتِ الوُجُود..)[١].

واتە: هەرگیز متمانەت نەبێ بەوەی کە عەقڵ و هۆش گومان دەبات، کە بە توانایە لەسەر دەورەدان و پەیپێبردنی دروستکراوەکان و هۆکارەکانیان و، بە توانایە لەسەر ئەوەی کە وردەکارییەکانی بوون هەموویان بزانێ و، ڕایەکەی بە هەڵە دابنێ لەو بارەوە و، بزانە کە لە لای هەر کەسێك کە خاوەن هۆش و هەستە، لە سەرەتاوە (بوون) ئابڵووقە دەدرێ و، کورت هەڵدێ لەو شتانەدا کە ئەو دەیانزانێ، بەڵام (بوون) لە واقیعی خۆیدا بە شێوەیەکی دیکەیە و، حەق لە پشت ئەوەوەیە، (وێنە دێنێتەوە دەڵێ): تەماشا ناکەی بابای کەڕ (بوون) لە لای وی لە چوار هەست پێکراوەکاندا و لەو شتانەش دا کە بە عەقڵ دەیانزانێ، کورت هەڵاتوە و، لە لای وی جۆری بیستراوەکان بوونی نیە، {بابای کەڕ هیچ شتێك نابیستێ، تەنیا بینراوەکان و تام کراوەکان و، بۆنکراوەکان و، دەست لێدراوەکان دەزانێ} هەروەها، بابای کوێریش ئەویش جۆری بینراوەکان لە لای نامێنن، چونکە هەستی بینینی نیە تاکو پەی بە بینراوەکان بەرێ و، ئەگەر پرسیار کرابایە لە ئاژەڵێکی بێ زمان و قسەی کردبایە، دەمانبینی کە نکووڵیی دەکات لەو شتانەی کە بە عەقڵ دەناسرێن و، ئەوانە بە یەکجاریی لە لای وی هیچ حسابێکیان بۆ نەدەکرا! ئنجا ئەگەر ئەمەت زانی، بزانە کە ڕەنگە جۆرێك لە هەست کردن، جگە لەوەی کە ئێمە هەستی پێ دەکەین و، جۆرێك لەوەی کە ئێمە دەیزانین، هەبێ، چونکە زانینی ئێمە، پەیپێبردنی ئێمە، دروستکراوەو پەیداکراوە، بەڵام دروستکراوی خوا لە توانای خەڵك گەورەترە.

بۆیە پەیپێبردنی خۆت و زانراوەکانی خۆت، کە بوون (وجود) تێیان دا کورت هەڵبێ، ئەوە تۆمەتباریان بکە و بڕوایان پێ مەکە و، بە دوای ئەوە بکەوە کە شەرعدانەر پێت دەڵێ، چ لە ڕووی عەقیدەییەوە، چ لە ڕووی کردەوەییەوە، چونکە شەرعدانەر لەسەر بەختەوەریی تۆ، سوورترە لە خۆت و، لە تۆ زاناترە بەوەی کە سوودت پێ دەگەیەنێ، چونکە ئەوە {کە شەرعدانەر (خوا (سبحانە

---

(١) المُقَدِّمة، لابن خلدون، ص٣٢٢ و ٣٢٣.

www.alibapir.com





وتعالى ) ) دەیفەرموێ}: جۆرێکە لە پشت عەقڵی تۆوە و لە بازنەیەکی فراوانتر(لە عەقڵی تۆ شەرعدانەر دەیفەرموێ )، ئەمەش تانە نادات لە عەقڵ و لەو شتانە کە عەقڵ پەییان پێ دەبات، بەڵکو عەقڵ تەرازوویەکی ڕاستە و، یاساکانیشی جێی دڵنیایین، درۆیان تێدانیە، بەڵام تۆ بە تەما مەبە کە کاروباری خوا بەیەکگرتن و، ڕۆژی دوایی و، چیپەتی پێغەمبەرایەتیی و، حەقیقەتی سیفەتەکانی خوا، بە عەقڵ دەرك بکەی، هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە لە سەرووی ئاستی عەقڵەوەن، چونکە ئا ئەوە تەماع کردنە لە شتێکدا کە مەحاڵە، وێنەی ئەوەش وەك ئەوەیە: پیاوێك تەرازووێك ببینێ کە زێڕی پێ هەڵدەسەنگێنرێ، بەڵام تەماع بیگرێ کە بەو تەرازووە کە بۆ زێڕ هەڵسەنگاندن و کێشانی زێڕ دروست کراوە، چیایەکانی پێ هەڵسەنگێنێ ! کە بێگومان ئەوە شتێکە مەحاڵە و نایەتە دی، بەڵام ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو تەرازووەی زێڕی پێ دەکێشرێ، لە حوکمەکانیدا ناڕاستە، بۆیە عەقڵیش لە سنووری خۆیدا دەوەستێ و ناتوانێ لە سنووری بازنەی خۆی بەولاوەتر بچێ، تاکو دەوری خواو سیفەتەکانی خوا بدات، چونکە عەقڵ گەردێکە لە گەردەکانی بوون، کە خوا (سبحانە وتعالى ) هێناونیە دی.

### ٤- (ئیمیونول کانت): (Emmanuel Kant):

کە لە ساڵی (١٧٢٩)ی زایینی دا لە دایك بووە و لە ساڵی (١٨٠٤)دا، کۆچی دوایی کردوە، هەڵبەتە (کانت: Kant)، یەکێکە لە زانا نامسوڵمانەکان، بەڵام کتێبێکی هەیە بە ناوی: (ڕەخنەلێگرتنی عەقڵی ڕووت) کە بە زمانی عەرەبیی بە ناوونیشانی: (نَقدُ العَقلِ الخالِص) یان (نَقدُ العَقلِ المُجرَّد) وەرگێڕراوە، وا دیارە باش سنووری عەقڵی زانیوە، بۆیەش (محمد إقبال) لەو بارەوە لە کتێبەکەی خۆی (تَجديد الفكر الديني)دا، لەبارەی (کانت)ەوە دەڵێ: (إِنَّهُ هَدَمَ أَعْمَالَ المُتَنَوِّرِين وَحَوَّلَهَا إِلى كُومَةٍ مِنْ تُرَابٍ وَذَلِكَ فِي كِتَابِهِ الشَّهِير: نَقْدُ العَقْلِ الخَالِص)، واتە: کار و بەرهەمە فیکرییەکانی ڕۆشنبیرەکانی ڕووخاند و کردیە کۆگڵێك، ئەویش لە کتێبە ناودارەکەی: (ڕەخنەلێگرتنی عەقڵی ڕووت)دا.

www.alibapir.com





یانی: پێش (ئیمیونول کانت) زانایانی ڕۆژئاوایی زۆر موعجەب و سەرسام بوون بە عەقڵ، بە عەقڵی بەشەر و بە هەستەکانی، کە مرۆڤ هەموو شتێك دەزانێ و، هیچ شتێکی لەبەر عاسێ نابێ، بەڵام (کانت) لەو کتێبەیدا باسی کرد کە: نەخێر بەڵکو وەك چۆن مرۆڤ هەستەکانی سنووردارن، عەقڵیشی سنووردارە!.

## ٥- ( الشيخ أبو الحسن علي الحسن الندوي ):

ئەمیش لە کتێبە ناودارەکەی خۆی: (محاضراتٌ في الفكر والدعوة)دا[1]، چەند قسەیەکی گرنگیی لە بارەی هەڵسەنگاندنی فەلسەفەوە کردوون، کە پێشێ دەقە عەرەبییەکەی وەك خۆی دێنم، دواییش مانای دەکەم، دەڵێ:

(وَسَوْفَ لاَ يَكُونُ أَي اكْتِشَافِ عِلْمِي لأَي طَالِبٍ مُتَمَتّعٍ بالفِطْرَةِ السلِيمَةِ فِي تَأْرِيخِ العِلْمِ الإِنْسَانِيّ كُلِّهِ، أَبْعَثَ عَلَى الغَرَابَةِ مِنْ اكْتِشَافِ:

أَنَّ الفَلْسَفَةَ الَّتِي تَدَّعِي أَنَّهَا مُؤَسَّسَةٌ عَلَى العَقْلِ والَإِسْتِدْلاَلِ، وَعَلَى الأُصُولِ المَنْطِقيَّةِ، اسْتَمَرّت نَحْوَ أَلفَي سَنَةٍ وَخَمْسمِئَةِ سَنَة فِي البَحْثِ عَنْ قَضَايَا، لَمْ تَكُن لَدِيهَا أَيُّ مَعْلُومَاتٍ عَنْهَا، حَتَّى عَنْ مَبَادِئِهَا الأَوَّلِيَّة، وَظَلَّ النَّوابِغ وَالأَذْكِيَاءُ تَائِهِينَ إِلى هَذِهِ المدّةِ الطوِيلَةِ وَرَاءَ غَايَةٍ، لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُمْ مِنْ مَعَالِمِهَا شَيءٌ! إِنَّهُمْ بَحَثوا عَنْ ذَاتِ اللهِ وَمَاهِيتِهِ، وَعَنْ صِفَاتِهِ وَحَقِيقَتِهَا، وَعِلاَقَتِهَا بالذَّاتِ وَنِسبَتِها إِلَيْهَا، وَكَيْفِية ظُهُورِ هَذِهِ الصِّفَاتِ، وَصُدُورِ أَفْعَالِ اللهِ وَكَيْفِيَّتِهَا، وَحدُوثِ العَالَمِ وَقِدَمِه، وعَنِ الحَيَاةِ بَعْدَ المَوْتِ، وَعَن قَضَايَا أُخْرَى عَنِ الإِلَهِيَات وَمَا بَعْدَ الطَّبيعَة فِي ثِقَةٍ، وَقَطْعِيَّةٍ وَتَفْصِيل وَتَدْقِيق).

واتە: هیچ دۆزراوەیەکی زانیاریی بۆ هیچ بە دوای زانستدا گەڕاوێك، کە خاوەنی خوارِسکێکی سەلیم بێ، لە مێژووی زانیاریی مرۆڤدا، لە دۆزینەوەی ئەو ڕاستییە سەیرتر نیە کە: فەلسەفە کە لافی ئەوە لێدەدا: بنیات نراوە لەسەر

---

(١) ج٢، ص٢٧٥، و ص٢٧٨.

www.alibapir.com



عەقڵ و بەڵگە هێنانەوە و لەسەر بنچینە لۆژیکییەکان، ئەو فەلسەفەیە دوو هەزارو پێنج سەد (٢٥٠٠) ساڵ بەردەوام بوو لە هەوڵدان بۆ لێکۆڵینەوە لە هەندێك بابەت، کە هیچ زانیارییەکی لە بارەیانەوە نەبوو، تەنانەت لە بارەی پرەنسیپە سەرەتاییەکانیشی! تێگەیشتووان و زیرەکەکان ئەو هەموو ماوە زۆرە {دیارە ئەو لە فەلسەفەی یۆنانییەوە حیسابی کردوە، بەڵام من پێم وایە دەبێ لە پێش فەلسەفەی یۆنانییشەوە، حیساب بکرێ، چونکە پێشتر باسمان کرد کە پێنج هەزار (٥٠٠٠) ساڵ پێش زایین میسرییەکان ئەو مەسەلانەیان باسکردوون، هەروەها لە هیندو چین و ئێران و میزوپۆتامیاش، ئەو باس و خواسانە هەبوون}[1].

بە دوای مەبەستێکدا گەڕاون، کە هیچ نیشانەکانی گەیشتن بەو ئامانجەیان لەلا نەبووە، ئەوان لێیان کۆڵیوەتەوە: لە بارەی زاتی خوا و، چییەتی زاتی خوا و، سیفەتەکانی و حەقیقەتی سیفەتەکانی خوا و پەیوەندیی سیفەتەکان بە زاتی خواوە و شێوەی پێکەوە پەیوەست بوونیان و چۆنیەتی پەیدا بوونی سیفەتەکانی خوا و، چۆنیەتی سەرهەڵدانی کردەوەکانی خواوە، هەروەها پەیدابوونی گەردوون، یاخود دێرینیی و بێ سەرەتایی گەردوون، هەروەها کۆڵیویانەتەوە لە بارەی ژیانی دوای مەرگەوە و، کۆمەڵێك باس و بابەتی دیکە کە پەیوەندییان بە بواری خواناسییەوە و بە بواری ئەوی دیو سروشت و میتافیزیکاوە هەیە، ئەویش بە شێوەیەکی زۆر متمانە بەخۆ بوون و زۆر بە وردەکاریی و، زۆر بە نوختە خستنە سەر پیت (قسەیان کردوە لە بوارێکدا کە ئامرازی گەیشت بە ئامانجیان لەو بوارەدا پێ نەبووە).

قسەکەشی زۆر جوانە، لە ڕاستییدا هەموو کەلەپووری فەلسەفە بخوێنەوە، هەمووی تامی ئەوەندە نادات کە ئایەتێك لە قوڕئان ئاماژەی پێ دەکات، وەك پێشتریش چەند ئایەتێکمان لەو بارەوە لە قوڕئان بە نموونە هێنانەوە، بۆ هەموو

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست، یان ڕاستکردنەوەی بیرۆکەیەکی هەڵە.

ئەو باس و بابەتە گرنگانەی کە فەلسەفە بە دوایاندا وێڵ بووە و، وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی کە فەلسەفە ویستوویەتی وەڵامەکەیان پەیدا بکات، خوا (سبحانه وتعالی) بۆی خستوونیە دوو توێی چەند ئایەتێکەوە، هەروەها پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتەکانی خۆیدا، وەڵامی ئەو پرسیارانەی زۆر بە ئاسانیی و بە ئامادە کراویی خستۆتە بەر دەستمان.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر







# باسی شەشەم



## ئایا نەدەگونجا بوونی خوا (عزّ وجلّ) جێی مشت و مڕ نەبێ؟

ئەم پرسیارە دەکرێ: ئایا نەدەگونجا خوا (سبحانه وتعالی) کارێکی وا بکات، سەلمێنرانی بوونی، پێوستیی بەو هەموو مشت و مڕ و شەڕە قسە و تێکگیران و دەمبەدمەیەی نێوان خەڵك نەبێ، وەك چۆن هیچ کەس مشت و مڕ ناکات لە بارەی خۆرەوە، چونکە خۆر بە نێوەڕاستی ئاسمانەوەیە، هەروەها مانگ، ئەستێرەکان، با، باران، چیایەکان، ئایا نەدەگونجا بوونی خواش بەو شێوەیە بێ، بۆ ئەوەی ئەو هەموو سەر ئێشەیەی لە کۆڵ خەڵك بێتەوە؟

ئێمە وەڵامی ئەم پرسیارە، لە پێنج بڕگەدا دەدەینەوە:

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/علی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/علی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





**بڕگەی یەکەم: هەر کەس بەڕاستی گوێ لە دەنگی زگماك (فطرة) و، عەقڵ بگرێ و، ڕێزی زانست بگرێ و، سەرنجی وەحیی پارێزراوی خوا بدات، کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، هیچ دوو دڵیی و گومانێکی لەبارەی بوونی خواوە نابێ:**

کەواتە: وە نەبێ بوونی خوا (سبحانه وتعالى) لە لای هەموو کەس جێی مشت و مڕ بێ، بەڵکو هەر کەسێك:

١- گوێ لە زگماك (فطرة)ی خۆی بگرێ، لە ناخی خۆی.

٢- هەروەها گوێ لە حوکمی عەقڵ بگرێ.

٣- ڕێز لە زانست و بەرهەمی زانست بگرێ، کە زانست هەمووی بریتیە لەوە کە وەسفی دروستکراوەکانی خوا دەکات، ئەو ڕێك و پێکیی و وردەکاریی و سیستمکارییەی کە لە دروستکراوەکانی خوادا هەیە، زانست ئەوە دەردەخات.

٤- هەروەها هەرکەسێ گوێ لە دەنگی زوڵاڵی وەحیی بگرێ.

بێگومان لە بارەی بوونی خواوە (سبحانه وتعالى) دڵ لە دڵ دان و لەرەلەری نابێت، هەڵبەتە ئێمە لە بەشی دووەم: (بەڵگە درەوشاوەکانی ئیمان)دا، بە درێژیی باسی ئەوە دەکەین، کە چۆن هەر کام لە زگماك (فطرة) و عەقڵ و، زانست و، وەحیی، بەڵگەی سەلمێنەر و ڕوون و بێ چەند و چوون، لە بارەی بوونی خواوە (سبحانه وتعالى) دەخەنە بەردەستی مرۆڤ، مرۆڤێك کە لە هەق بگەڕێ.

لێرەدا بە چاکی دەزانم ئاماژە بکەم بە قسەیەکی (إبن قيم الجوزية) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبی (مدارج السالكين)دا[1]، قسەیەکی جوان دەکا، دەڵێ: (وَتَأَمَّلْ حَالَ العَالَمِ كُلِّهِ عُلويِّهِ وَسُفْلِيِّهِ بجَمِيعِ أَجْزَائِهِ، تَجِدْهُ شَاهِدَاً بِإِثْبَاتِ صَانِعِهِ، وَفَاطِرِهِ، وَمَلِكِهِ، فَإِنْكَار صَانِعُهُ وَجَحْدُهُ فِي العُقُولِ، وَالفِطَرِ، بِمَنْزِلة إِنْكَارِ العِلْمِ وَجَحْدِهِ، وَلاَ فَرْقَ بَيْنَهُمَا).

---

(١) ج١،ص٣٩٧.

واتە: سەرنجی هەموو گەردوون بدە، بە سەروویەوەو بە خوارووییەوە و، بە هەموو پێکهاتەکانیەوە، دەبینی کە شایەدیی دەدات لەسەر ئیسپاتی بەدیهێنەرو پەیداکەرەکەی و خاوەنەکەی، بۆیە نکوولّییکردن لە دروستکەرو بەدیهێنەری گەردوون و، دان پێنەهێنانی، لە عەقڵەکاندا و، لە خوارِسك و زگماکەکاندا، وەك نکوولّییکردنە لە هەر زانیارییەك، (زانیارییەك کە جێی دڵنیایی بێ)، هیچ جیاوازییان نیە.

واتە: کەسێك کە نکوولّیی دەکات لە: (٢ + ٢ = ٤)، یاخود لە: (هەموو لە بەشەکەی گەورەترە)، (الكل أكبر من جزئه)، یاخود لە: (دوو شتی پێچەوانە دژ بە یەك، پێکەوە کۆنابنەوە، وەك: بوون و نەبوون)، کەسێك کە نکوولّیی دەکات لەوانە، یان نکوولّیی دەکات لە بوونی خۆر، لەگەڵ ئەو کەسەی نکوولّیی دەکات لە بوونی خوا (سبحانە وتعالى)، وەك یەك و یەکسانن، واتە: نکوولّییکردن لە بوونی خوا عزوجل، هەروەك نکوولّییکردنە لەو شتانە کە عەقڵی سەلیم دەیانگەیەنێ، ئنجا چ لە ڕێی سەرەتا عەقڵییەکانەوە، دەرکی بکات، چ لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە دەرکی بکات، یان لە ڕێی پێنج هەستەکان و هەڵهێنجانی عەقڵەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



برگەی دووەم: حیکمەتی خوا لە دروستکردنی گەردوون و ژیان و مرۆڤدا، تاقیکردنەوەی مرۆڤە، کە لە سێ شوێناندا خوا (سبحانە وتعالی) بە ڕوون و ڕاشکاویی ئەوەی ڕاگەیاندوە:

١- لە سوورەتی (الكهف)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾.

واتە: ئێمە سەر زەویمان ڕازاندۆتەوە بۆ ئەوەی تاقییان بکەینەوە، کامیان کردەوەی باشترە!

٢- لە سوورەتی (هود)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا .. ﴿٧﴾ ﴾.

٣- لە سوورەتی (المُلك)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾.

کەواتە: ئەو ئامانج و حیکمەتە کە خوا (سبحانە وتعالی) ڕەچاوی کردوە لە دروستکردنی گەردوون و ژیان و مرۆڤدا: تاقیکردنەوەی مرۆڤە، بۆیە ناگونجێ خوای کاربەجێ کارێك بکات خەڵك ناچار بکات لەسەر بڕوا هێنان، چونکە ئەو کاتە ئەو حیکمەتە لە بەین دەچێ، ئنجا هەر وشەی بڕوا (إیمان) ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤ دەبێ لە حاڵەتێکدا بێ، بتوانێ نکووڵیی لەو شتە بکات، یاخود بڕوای پێ بێنێ، بۆ نموونە:

هیچ کەس ناڵێ: بڕوام بە بوونی خۆر هەیە، بۆچی؟ چونکە خۆر ئەوە دیارە و لەبەر چاویەتی، پێویست بەوە ناکات بڵێی بڕوام پێی هەیە، یان بڕوام پێی نیە، یان مانگ، یان چیایەکان، یان باران، بەڵکو دەڵێ: دەیبینم، هەستی پێ دەکەم،

www.alibapir.com







بۆیە وشەی ئیمان بۆ ئەو شتانە بەکاردێ، کە نادیار و پەنهان بن، بۆیەش خوا (سبحانە وتعالی ) لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)دا دەفەرمویٚ:

﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ .. ﴿٣﴾ ﴾.

واتە: ئەو کتێبە گومانی تێدا نیە، ڕێنماییکارە ڕێنیشاندەرە، بۆ پارێزکاران، ئەوانەی کە بڕوا دێنن بە پەنهان (نادیار).

کەواتە: ئەگەر خوای بێ هاوتا خۆی پێشانی ئێمە دابایە، لەم ژیانە دنیاییەدا، وەك چۆن لە ڕۆژی دواییدا ئیمانداران لە بەهەشتدا بە خزمەت خوا دەگەن و دەیبینن، بەو شێوەیە کە بەس خوا دەیزانێ و بۆ خوا شایستەیە، ئەگەرلە دنیاشدا ئاوا خوا خۆی پێشانی ئێمە دابووایە، ئەو کاتە حیکمەتی ژیانی دنیا تێ دەچوو و مرۆڤ تاقی نەدەکرایەوە، چونکە مرۆڤ بە شتێك تاقی دەکرێتەوە، کە بتوانێ دانی پێدا بێنێ، یاخود نکوولّیی لێ بکات.

**بڕگەی سێیەم: خوای کارزان (سبحانە وتعالی) بابەتی ئیمان پێهێنان یان ئیمان پێ نەهێنانی، والێکردوە کە لە ژێر ڕکێفی ویستی مرۆڤدا بێ و، مرۆڤ بە ویستی ئازادانەی خۆی بتوانێ ئیمان بێنێ، یان ئیمان نەهێنێ:**

وەك لە سوورەتی (الکهف)دا دەفەرمویٚ:

﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾.

واتە: بڵێ هەق لە پەروەردگارتانەوەیە کێ دەیەوێ با بڕوا بێنێ و، کێ دەیەوێ با بێبڕوا بێ، واتە: هەردووك لای لە تواناد هەن، ئنجا مرۆڤ ئەگەر لە توانایدا نەبووایە بێبڕوا بێ، مانایەك بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ نەدەما.

کەواتە: هەر مرۆڤێك دەتوانێ بڕوا بە خوا بێنێ و، گوێ بۆ دەنگی سروشت و عەقڵ و زانست و وەحیی بگرێ، هەروەك دەشتوانێ بڕوا نەهێنێ و، گوێ نەدا بە حوکمی هیچ کام لە زگماك و سروشت و ناخی خۆی و، عەقڵ و، زانست و، وەحیی و، نادیدەیان پێ بگرێ و گوێیان پێ نەدا، هەر بۆیەش بە کەڵکی تاقیکردنەوە هاتوە.

## بڕگەی چوارەم: ئیمان وەك زانایان لەسەری یەك دەنگن (كەم دەكات و زیاد دەكات) و یەك شتی چەسپاو نیە، بەڵكو گۆڕاوە:

ئیمان زیاد دەكات و كەم دەكات، وەك زانایان گوتوویانە: (الإِيْمَانُ يَزِيدُ وَيَنْقُص، يَزِيدُ بالطَّاعَة، وَيَنْقُصُ بالمَعْصِيَة)، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، جگە لە هەندێكی ڕیزپەڕ(شاذ)، ئەگەرنا هەموویان گوتوویانە: ئیمان كەم دەكات و زیاد دەكات، بە فەرمانبەریی زیاد دەكات و، بە گوناه و سەرپێچییش كەم دەكات، ئەمەش جارێكی دیكە ئیمان دەخاتەوە ژێر كۆنترۆڵی مرۆڤ، كۆنترۆڵی ویستی ئازادانەی مرۆڤ، كە ئیمانی خۆی خەم لێ بخواو گەشە پێ بدات، یاخود ئیهمالی بكات و، سەری بە فەتارەت بدات و، بیپووكێنێتەوە، تاكو لە بەین دەچێ.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - كوردي - English
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر



## بڕگەی پێنجەم: وێنەیەك بۆ كاریگەریی ویستی مرۆڤ لە ئیمان دا، بەباری ئەرێنیی و نەرێنیی دا:

لێرەدا دەمەوێ وێنەیەك بێنمەوە، كە لە كتێبی یەكەمی مەوسووعەی: (الإِسْلَامُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ الله)دا، هێناومەتەوە، ئەویش ئەوەیە:

كە مەسەلەی ئیمان هێنان و ئیمان نەهێنان و، خواناسیی و خوانەناسیی، دانهێنان بە بوونی خوادا و، دان پێدا نەهێنان و، نكووڵیلێكردنی، وەك ئەوە وایە كەسێك لەبەر پەنجەرەیەك دانیشتبێ، دیارە لە پەنجەرەكەوە دەرەوە دەبینیێ، ئنجا ئەگەر بیەوێت دیمەنەكانی كە لە دەرێن، لە پەنجەرەكەوە جوان بیانبینیێ، دەبێ هەم لە دیوی نێوەوە، خەم لە پەنجەرەكە بخوا و، تەم و مژ و تۆزو خۆڵی لێ بكاتەوە، هەم لە دیوی دەرەوەش، پەنجەرەكە پاك ڕابگرێ و خاوێنی بكاتەوەو مشت وماڵی بكات، بۆ ئەوەی شووشەكەی صاف بێ و، هیچ ئیشكال و گرفتێكی بۆ دروست نەبێ، لە دیتنی دیمەنەكانی كە لەو دیوی پەنجەرەكەوەن.

ئێمەش خوا (سبحانه وتعالى) لەم ژیانەدا وای داناوین: دەتوانین بەردەوام كار لەسەر خۆمان بكەین و، كارێك بكەین كە هەمیشە سیفەتەكانی خوا (سبحانه وتعالى) و دەستی خوا لە دەوروبەرماندا، لە خۆماندا، ببینین، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴿٥٣﴾ ﴾.

واتە: نیشانەكانی خۆمانیان لە ئاسۆیەكان و لە خودی خۆیشیان دا، پێشان دەدەین، بەڵێ دەتوانین چاك خەم لە ئیمانەكەمان بخۆین و، چاوی عەقڵ و دڵمان زیاتر بكەینەوە و، چەشمەندازێكی[1] ڕوون، بۆ دیتنی عەقڵ و دڵمان بڕەخسێنین، كە باش نیشانەكانی خوا ببینن، دەشتوانین بە پێچەوانەوە: وەك

---

(١) چەشمەنداز: ماوە (مسافة)یەك كە چاو تێیدا بڕ بكات و ببینێ.

کەسێك بین کە لەبەر پەنجەرەیەك دابنیشێ و ئەو پەنجەرەیە لە دیوی دەرێ، تۆز و خۆڵ و غوباری لێ بنیشێ و، لە دیوی نێوەوەش هەڵم و دووکەڵی لێ بنیشێ و، وای لێ بێ: ئەو کەسە وەك لە بەرانبەر دیوارێکدا دانیشتبێ، هیچ لە پشت پەنجەرەکەوە نەبینێ!

بەڵێ مرۆڤ خوای پەروەردگار لەبەر ئەوەی بۆ تاقیکردنەوە خوڵقاندوویەتی، دەتوانێ خۆی وا لێ بکات، باش باش نیشانەکانی خوا ببینێ و، سیفەتەکانی خوا کە لە دروستکراوەکانی خوادا دەدرەوشێنەوە، زۆر بە درەوشاوەیی بیانبینێ، هەروەها دەشتوانێ ئەو ڕاستییە مەزنە پشتگوێ بخات و، ئەو شتانە نادیدە بگرێ، وەك کاتی خۆی لە شیعرێکدا گوتوومە:

سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە      باش سەرنجی دە بزانە چی تیایە
لە ڕێی (کر)ەوە کردگار دەناسرێ      سـروشت کـرێکە کـردگاری خوایە

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


# باسی حەوتەم

## ڕێگای وەدەست هێنانی زانیاریی (زانستناسیی) (Epistemology)

سەرەتا دەڵێین: شتێکی ئاشکرایە کە هەر کەسێك بیەوێ بەرەو ئامانجێك بچێ، بەر لە هەموو شتێك پێویستە بە ڕێبازی گەیشتن بەو ئامانجە، ئاشنا بێ، دەبێ بزانێ چۆن بەرەو ئەو ئامانجە دەچێ! ئەگەرنا ئەو پەندەی بەسەردا دەچەسپێ، کە دەڵێ:

تَرْجُو النَّجَاةَ وَلَمْ تَسْلُكْ مَسَالِكَهَا      إِنَّ السَّفِينَةَ لاَ تَجْرِي عَلَى اليَبَسِ

بە تەمای ڕزگاریی و ڕێیەکانیشت نەگرتوون    بە دڵنیایی کەشتیی لەسەر وشکانیی ناڕوات

لێرەدا پێویستە ئەوە باس بکەم، کە ئێمە ستایش بۆ خوا، لە کتێبی دووەمی، یان لە بەرگی دووەمی مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا)دا، باسێکی فراوانمان کردوە لە ژێر ناوونیشانی: (ڕێگا و چۆنیەتی زانین و ناسین، یان زانستناسیی) بە تەفصیلْ و لە سەد و پەنجا (١٥٠) لاپەڕدا باسێکی فراوانمان لەو بارەوە کردوە، واتە: لە بارەی (ئیپستمۆلۆژیا Epistemology)، زانستناسیی (عِلمُ المعرفة)یەوە.

خوا پشتیوان بێ، ئەم باسە: (ڕێگای وەدەستهێنانی زانیاریی) لە حەوت (٧) بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

www.alibapir.com





## بڕگەی یەكەم: گرنگی زانستانسیی:

ئەم بابەتە نەك تەنیا لە لای زانایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵكو لە لای مرۆڤ بە گشتی، زۆر گرنگ و بە بایەخ بووە و، لە دێر زەمانەوە مرۆڤەكان زۆر كاریان لەسەر ئەوە كردوە، ئەوەیان لە مێشكدا هەبووە: كە خۆیان و بوونەوەر و دەوروبەر پەیپێ ببەن و، بزانن و بناسن و، بیریان لەوەش كردۆتەوە كە لە چ ڕێیەوەكەوە و چۆن و بە چ ئامڕازێك، بە چ ڕێبازو شێوازێك بەو ئامانجە بگەن؟! ئنجا (ئیپستمۆلۆژیا Epistemology): بریتیە لەو زانستەی كە لە سەرەتایەكانی شت ناسین، دەكۆڵێتەوە:

١- مرۆڤ چۆن شتان دەناسێ و پەییان پێ دەبات؟

٢- بنچینەكانی شت ناسین، چین؟

٣- سروشتی شت ناسینی مرۆڤ، چۆنە؟

٤- سەرچاوەی پەیپێبردنی بە زانراوەكان، چیە؟

٥- بەهای شت ناسینی مرۆڤ چەندە و، تاكو چ ئەندازەیەكە؟

٦- سنوورەكانی شتزانینی مرۆڤ، تا كوێن؟

٧- ناسەر و ناسراو (مُدرِكٌ وَ مُدرَك) پەیوەندییەكەیان چۆنە؟

٨- تا چ ئەندازەیەك ناسین و زانینی مرۆڤ، پڕ بە پێستی واقیعە؟

هەموو ئەو پرسیارانە، زانستناسیی (ئیپستمۆلۆژیا Epistemology)، ویستوویەتی وەڵامیان بۆ پەیدا بكات، دیارە ئەم زانیارییەش (ئیپستمۆلۆژیا، زانستناسیی) بە پێی پاشخانی فیكریی هەر كەسێك كە لەو مەسەلەیەی كۆڵیوەتەوە، جیاوازە لە هی ئەوانی دیكە، ئنجا لە ڕاستییدا زانینی: چۆنیەتی وەدەست هێنانی زانست، وەك بناغەیە بۆ لێكۆڵینەوە لە هەر مەسەلەیەك و، ئەویش دەبێتەوە بە وەڵامی ئەو هەشت پرسیارەی كە وروژاندمانن.

## بڕگەی دووەم: پێغەمبەران و زانستناسیی:

پێویستە بزانرێ کە پێغەمبەرانی خوا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، پێشرەوی مرۆڤایەتیی بوون، کە بوون بناسێنن: خوای بێ وێنە، گەردوون، مرۆڤ، ژیان، سەرەتا، سەرەنجام، مرۆڤ دەبێ لەم ژیانەدا چی بکات؟ چۆن بکات؟ چاکە چییە؟ خراپە چییە؟ پێغەمبەران لەو بارەوە سەرقافڵەی مرۆڤایەتیی بوون، هەڵبەتە دوایی باسی دەکەین کە بۆچی ئەو ڕۆڵەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وەك پێویست نەنرخێنراوە و، وەك پێویست قەدری نەگیراوە؟

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، سەرقافڵەی مرۆڤایەتیی بوون لە بواری شت ناسین و پەیپێبردنی نهێنییەکاندا، بریتیە لە واقیعی مێژووی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، کە هەم قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە و، هەم لە کتێبەکانی دیکەشدا کەم و زۆر شوێنەواریان ماوە، هەر لە نووحەوە کە بە بابی دووەمی مرۆڤایەتیی ناسراوە و، تێپەڕبە بە هەموو پێغەمبەرانی دیکەدا، وەك ئیدریس و شوعەیب و هوود و صالح و دوایی ئیبراهیم و لووط، ئنجا ئەییووب و یونووس، دواتر پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل: ئیسحاق و یەعقووب و یوسف و مووسا و داوود و سولەیمان و زەکەرییا و یەحیا و عیسا ئەوانی دیکە، هەروەها لەو لاوە: ئیسماعیل و نەوەکانی تاکو دەگاتە سەر پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلى الله علیه وسلم) و کاتێك تەماشای سیرەو ژیانیان دەکەی، دەبینی: هەمیشە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئەو ڕاستیییانەی کە ژیانی مرۆڤ پێویستیی پێیان بووە، بە ئامادەیی بە هۆی وەحیی خوای پەروەردگارەوە، خستوویانەتە بەر دەستی مرۆڤایەتیی.

وێڕای ئەوەی کە پێغەمبەران خۆشیان خاوەنی گەورەترین و ساغترین و چاکترین عەقڵ بوو ون و، ئەوە نەبووە کە تەنیا وەحیی خوا و پەیامی خوای پاك و بەرز بگەیەنن، بەڵکو وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرمووێ:

www.alibapir.com





﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴿١٢٤﴾ ﴾.

واتە: خوا زاناترە پەیامی خۆی لە کوێ دادەنێ! خوای کارزان، عاقڵترینی مرۆڤەکان و، پاکترینی مرۆڤەکان و، چاکترینیانی هەڵبژاردوون، بۆ گەیاندنی پەیامی خۆی، وەك دەفەرموێ:

﴿ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَىٰٓ ﴿٥٩﴾ ﴾ النمل.

واتە: بڵێ: ستایش بۆ خواو سڵاو لەو بەندانەی کە هەڵیبژاردوون، هەروەها دەفەرموێ:

﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِ.. ﴿٧٥﴾ ﴾ الحج.

واتە: خوا لە فریشتەکان و لە مرۆڤەکاندا، نوێنەر و ڕەوانە کراوانی خۆی هەڵدەبژێرێ.

بەڵێ بێگومان پێغەمبەران (علیهم السلام) خاوەنی گەورەترین عەقڵ بوون، وەك چۆن خاوەنی پاکترین و چاکترین زگماك (فطرة) و سروشت بوون و، خاوەنی بەرزترین ڕەوشت و ئاکار بوون، بۆیە خوا بە شایستەی ئەوەی زانیون: هەڵیان بژێرێ بۆ گەیاندنی پەیامەکەی، لە ئەسڵدا خاوەنی عەقڵێکی سەلیم و زگماك (فیطرة)ێکی پاك و ئاکارێکی پەسند بوون، ئنجا دوایی بە هۆی ئەو وەحییەی خواوە کە وەریان گرتوە و، بە هۆی ئەو نوور و هیدایەتەوە کە چۆتە نێو دڵ و دەروونیان، ئەوەندەی دیکە عەقڵەکەیان بەهێزتر بووە و زگماك (فیطرة)ەکەیان پاکتر بووە و، ڕەوشت و ئاکارەکەشیان پەسندتر و جوانتر بووە.

ئنجا ئەو ئایەتە موبارەکەش کە خوا لە سووڕەتی (البقرة)دا فەرموویەتی:

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: خوا هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کردن، بەڵگەیە لەسەر سەرمەشق بوون و سەرقافڵە بوونی پێغەمبەران لە بواری (بووناسیی)دا، هەر یەکەمین مرۆڤ، کە یەکەمین پێغەمبەری خواش بووە، کە ئادەمە، وەك لە موسنەدی

www.alibapir.com


ئیمام (أحمد)دا هاتوە، کە (أبو ذر) لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی پرسی: ئایا ئادەم پێغەمبەر بووە؟ فەرمووی: بەڵێ پێغەمبەر بوو[1]، یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی خوا صەڵات و سەلام لەسەر هەموویان بێ، کەواتە: ئادەم یەکەمین مرۆڤ و یەکەمین پێغەمبەرەو، خوا هەموو ناوەکانی فێر کردن، واتە: توانای ئەوەی دایە کە پەی بە شتەکان ببات و ناو لە شتەکان بنێ و، تەعبیر بکات لەوەی کە لە ناخی دایە، بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ مرۆڤەکان و لەگەڵ دەوروبەریدا.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - كوردي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: {عَنْ أَبِي ذَرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قُلْتَ: يَا رَسُول الله! أَي الأَنْبِيَاءِ كَان أَوَّلُ؟ قَالَ: آدَم، قُلْتُ: يَا رَسُول الله! وَنَبي كَان؟ قَالَ: نَعَمْ، نَبي مُكَلَّم} رواه أحمد: (٢٢٣٤٢)، والطبراني: (٧٨٧١)، قال الهيثمي: رجاله رجال الصحيح غير أحمد بن خليد، وهو ثقة، والحاكم: (٣٠٣٩)، وقال صحيح على شرط مسلم، وَصَحَّحَهُ الألبَانِي.

## بڕگەی سێیەم: سوكرات و ئەفلاطوون و ئەرەسطۆ و زانستناسیی:

ئەوەی مێژوو بۆی پاراستووین، ئەوەیە كە هەركام لە (سوكرات) و (ئەفلاطوون) و (ئەرەسطۆ) یەكەمین كەسانێك بوون كە لەو بارەوە (زانستناسیی) قسەی جیددییان كردوە، كە هەر كام لە (سوكرات) و (ئەفلاطوون) تەنیا پشتیان بە عەقڵ و حوكمەكانی عەقڵ بەستوە و، گرنگییەكی وایان بە پێنج هەستەكان نەداوە و متمانەیان پێیان نەبووە، بەڵام (ئەرەستۆ) وێڕای عەقڵ، گرنگیی بە پێنج هەستەكانیش داوە، كەم و زۆر.

هەڵبەتە لێرەدا (لەو قسەیەی ڕابرد) مەبەستمان ئەوە نیە كە پێش (سوكْرَاط) و (ئەفلاطوون) و (ئەرەسطۆ)، كەس لە میتۆد(منهج) و بەرنامەی گەیشتن بە شتەكان (زانستناسیی: ئیستمۆلۆژیا)ی نەكۆڵیبێتەوە، بەڵام ئەوەی كە بۆمان پارێزراوە، بەرهەمی ئەو سێ كەسەیە، هەڵبەتە (سوكرات) بەرهەمی ڕاستەوخۆی نیە، بەڵكو قسەكانی زیاتر بە هۆی دیالۆگ و وتووێژەوە، پێمان گەیشتوون، بەڵام كتێبەكانی ئەفلاطوون و ئەرەستۆ پارێزراون، ئەگەرنا وەك پێشتر گوتمان و دواتریش دێینەوە سەری، وێڕای یۆنانییەكان، خوا (سبحانە وتعالى) عەقڵی داوە بە هەموو مرۆڤەكان، ئەو مرۆڤانەی لە چین بوون، لە هیند بوون، لە ئێران بوون، لە میزۆپۆتامیا بوون لە نێوان دوو ڕووبارەكانی دیجلە و فوڕات، لە میسر بوون، لە ئەورووپا بوون، لە هەر شوێنێك بوون، خوا عەقڵی داوە بە مرۆڤی هەموو شوێنەكان و، هەمووشیان عەقڵی خۆیان بەكارهێناوە بۆ پەیپێبردنی شتەكان، بۆیە ناگونجێ بڵێین: تەنیا ئەوان لەو بارەوە قسەیان كردوە، بەڵام وەك گوتمان: ئەوەی مێژوو بۆی پاراستووین ئەوەیە كە زیاتر ئەوان قسەی ڕوون و جیدییان لەو بارەوە كردوە.

## بڕگەی چوارەم: زانایانی ئیسلام و زانستناسیی:

زانایانی ئیسلام لە بارەی میتۆدی شتزانین(منهج المعرفة)، واتە: (زانستناسیی ) یەوە، زۆر قسە و باسیان کردوە، کە دەتوانین ئاماژە بە هەندێکیان بدەین و، پێشتریش لەو بارەوە قسەمان کرد:

١)- **(عبدالجبار الهَمْدَانـي)** کتێبێکی هەیە بە ناوی: (المُغنِي)، چەند بەرگێکە، یەك بەرگی تەرخان کردوە بۆ زانستناسیی (علم المعرفة)، بە ناوونیشانی (النَّظرُ والمعارِف) سەرنجدان و زانستەکان، کە لە حەفتا (٧٠) وردە بەش پێك دێ و، دەتوانم بڵێم: ئەوەی (عبدالجبار الهمدانـي) لە (المُغنِي)یەکەی خۆیدا باسی کردوە، زۆرێك لە زانایانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات کە بە چەند سەدە لە دوای وی هاتوون، پێشیان کەوتۆتەوە.

٢)- **(الباقلانـي)** ئەویش کتێبێکی هەیە بە ناوی: (التمهید)، لەوێدا ئەویش باسی (زانستناسیی ) کردوە، کە مرۆڤ چۆن دەتوانێ پەی بە شتەکان ببات؟ عەقڵ تا چ ڕاددەیەك متمانەی پێ دەکرێ؟ پێنج هەستەکان تا چ ڕاددەیەك؟ هەروەها شت ناسینی دەروونیی و ناخ: ئیلهام و خەون، تا چ ڕاددەیەك پشتیان پێ دەبەسترێ؟

٣)- **(أبو حامد الغزالـي)** لە کتێبی: (المستصفی في علم الأصول)، - کە هەموو زانایان لە کتێبەکانی (أصول الفقه)ی خۆیاندا، کەم و زۆر باسی میتۆدی شتزانین و (زانستناسیی )یان کردوە - هەروەها لە کتێبی: (المُنقِذ من الضلال) و لە کتێبی: (إحیاء علوم الدین) و لە کتێبی: (تهافُت الفلاسِفة)دا، قسەی زۆری لەو بارەوە کردوون.

٤- **(فخرالدین الرازي)**یش وێڕای تەفسیرەکەی (مفاتیح الغیب) کۆمەڵێك کتێبی هەن لەو بارەوە، بە تایبەت: (الإشارە في أصول الدین).

٥)- (إبن رُشد)یش لەو بارەوە قسەی جیددیی کردوە، لە کتێبی: (تهافت التهافت) و کتێبی: (مناهج الأدلة في عقائد الملَّة)دا.

٦)- (إبن تيمية)یش کتێبێکی فراوانی لەو بارەوە نووسیوە: (دَرْءُ التعارض بين العقل والنقل)، هەروەها: (مِنهاج السنه النبوية) و (نقض المنطق).

٧)- (عضدالدين الإيجي)یش لە کتێبی: (المواقِف)دا، لێکۆڵینەوەی زۆری لەو بارەوە کردوە.

هەروەها زانایانی دیکەش کەم و زۆر لەو بارەوە قسەیان کردوە و، زانایانی ئیسلام ئەم بابەتی (زانستناسیی)یان نەك پشتگوێ نەخستوە، بەڵکو قسەی زۆر جیددیی و گرنگیان لە بارەیەوە کردوە، کە دوایی زانایانی ڕۆژئاوایی سوودی زۆریان لە بەرهەم و، کەلەپووری زانایانی ئیسلام، وەرگرت و لێی بەهرەمەند بوون و، چاویان بە واقیعی فیکریی خۆیان دا گێڕایەوە، ئەو بیرۆکانەی کە ماوەی چەند سەدەیەك بوو دەقیان پێوە گرتبوون، دوای ئەوەی کە کتێبی مسوڵمانان تەرجەمە کران بۆ زمانی ئەوان و، کۆنتاکت و پەیوەندیی لە نێوان ڕۆژئاوا و جیهانی ئیسلامییدا ڕوویدا، زانایانی ڕۆژئاوایی کەوتنە ژێر کاریگەریی کتێب و بەرهەمەکانی زانایانی ئیسلام، بە تایبەت لە ڕێی کتێبەکانی: (إبن رُشد)ەوە، هەروەها کتێبەکانی: (إبن سينا) و (إبن خلدون) و زانایانی دیکەش، کەم و زۆر.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com




## بڕگەی پێنجەم: ئایا شت زانین بۆ مرۆڤ مەیسەر دەبێ و، مرۆڤ دەتوانێ شتەکان بزانێ؟

لەو بارەوە ڕا جیایی زۆر بووە:

١- هەبووە کە لای نەرێنیی گرتوە و گوتوویەتی: مرۆڤ ناتوانێ هیچ شتێك بزانێ، وەك دوایی ئاماژەیان پێ دەکەین.

٢- هەروەها لای تێپەڕاندنیش هەبووە: کە گوتوویەتی: مرۆڤ دەتوانێ هەموو شتێك بزانێ و، بە پشت بەستن بە عەقڵ و بە پێنج هەستەکانی خۆی، مرۆڤ بێنیازە لە هەر سەرچاوەیەکی دیکە لە دەرەوەی خۆی! کە ئەوەش تێپەڕاندن بووە و ئەوەی پێشێش کورتهێنان بوو.

٣- ڕای ڕاست و هاوسەنگیش ئەوەیە کە مرۆڤ لە قەدەر خۆی، توانای پەیپێبردن و شتزانینی هەیە، بەڵام نەك بە ڕەهایی و، نەك چییەت و جەوهەری شتەکانیش بزانێ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ لە قەدەر خۆی، شت بزانێ و، خوا بایی ئەوەندە توانای بە مرۆڤ داوە، شتەکان بزانێ، کە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیای پەکی لەسەری کەوتوە، بەڵام مرۆڤ ناتوانێ بەڕەهایی شتەکان بزانێ و، ناتوانێ جەوهەرو چییەتی شتەکانیش بزانێ، چونکە تاقیکردنەوەی مرۆڤ لە ژیانی دنیایدا، پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوەو پێویستیی بەوە نیە.

بەڵێ بە گشتی لە سەرەتای مێژووی مرۆڤەوە، ئەو سێ ڕێڕەو و ڕەوتە هەبوون:

**ڕەوتی یەکەم:** ئەوە کە مرۆڤ دەتوانێ هەموو شتێك بزانێ، یانی: سەرسام بوون بە عەقڵ و تواناکانی مرۆڤ و هەستەوەرەکانی، کە ئەوە وەك گوتمان: تێپەڕاندن بووە.

**ڕەوتی دووەم:** بریتی بوو لە بێ متمانەیی بە عەقڵ و بە هەستەوەرەکان و بە توانای مرۆڤ، کە بتوانێ شت بزانێ و، ئەوەش کورت هێنان بووە، ئنجا

www.alibapir.com





ئەوانەی لە کورت هێناندا بوون، لە سەدەی چواری پێش زایین، تاکو سەدەی یەکی پێش زایین، هەبوون و چەند ناوێکیان لێ نراون[١]:

١- (سُفسطائیون)یان پێگوتوون.

٢- (عِنادیون)یان پێگوتوون.

٣- (عِنْدیون)یان پێگوتوون.

٤- هەروەها (شَكّاكون)یشیان پێگوتوون.

٥- (لا أدریون)یشیان پێگوتوون.

١- (سفسطائیون)، کۆمەڵێکی شەڕە قسەکەری چەواشەکار و سەرلێشێوێن بوون و، بازرگانییان بە زانستەوە کردوە و، گرنگییان بە هەق و چاکە نەداوە[٢].

٢- (عِنادیون) ئەوانە بوون کە نکوولّییان کردوە لە هەرشتێك و کۆمەڵێك بوون لە: (سوفْسَطائي)یەکان، یان ناوێکی دیکەی ئەوان بووە.

٣- (عِنْدیون) ئەوانە بوون کە گوتوویانە: هیچ زانیارییەك بوونی نیە کە لە دەرەوەی مرۆڤ بێ، بەڵکو هەر کەسە بە پێی خۆی شتەکان دەبینێ.

٤- (شکاکون)یش ئەوانە بوون کە تەنانەت لە بوونی خۆیشیاندا، دوو دڵ و بە گومان بوون.

٥- (لا أدریون) ئەوانە بوون کە گوتوویانە: ئێمە نازانین، یانی: نە نکوولّییان لە شتێك کردوە، نە ئیسپاتی شتێکیان کردوە.

(أبیقور)یش لە (سُفسطائي)ەکان بووە و (أبیقور) ساڵی (٣٤١)ی پ.ز دا لە دایك بووە و لە ساڵی (٢٧٠) پ.ز دا، کۆچی دوایی کردوە.

---

(١) بێگومان ئەو ناوانە لە زمانی عەرەبیدا وا هاتوون و، لە زمانەکانی دیکەدا، ناوونیشانی دیکە بەکارهاتوون.

(٢) (تأريخ الفلسفة اليونانية)، يوسف كرم، ص ٦٠-٦٣، وشەی(سفسطة)ش لە (سوفیسطوس)ەوە هاتوە، یانی: فێرکەر (مُعلِّم)ی زانست لە هەر بوارێك دا بێ.

شایانی باسیشە کە (سفسطائي)یەکان، وە نەبێ هەموو شتێکیان خراپ بوو بێ، بەڵکو یەکێك لە لێکۆڵەرەوان دەڵێ: زانیارییەکانی ڕێزمان و مەنتیق و زانیارییەکانی ڕەوانبێژیی، ئەوان بناغەدانەری بوو ون، لە نێو یۆنانییەکان دا.

**ڕەوتی سێیەم:** کە بریتی بووە لە حاڵەتێکی هاوسەنگ(متوازن) لە پشت پێبەستنی عەقڵ و هەستەوەرەکانی مرۆڤ لە پەیپێبردنی شتان دا، کە ئەم ڕەوتە بوونی کەمتر بووە و، لە ڕۆژئاواش دوای هاتنی مەسیح (علیە السلام)، ئەو ڕەوتە زاڵ بوو کە دەیگوت: لە هەموو بوارێك دا قسە و بڕیاری کۆتایی بۆ وەحییە، دیارە ئەو وەحییەی کە ئەوان مەبەستیان بووە، ئەوە بووە کە لە کتێبی پیرۆزی ئەواندایە، کە هەردووك پەیمانی کۆن و نوێ دەگرێتەوە، دواتر بە وردیی باسی هەر کام لە (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ) دەکەین، کە سەنەد و نێوەڕۆك و سروشتیان چۆنە؟! کە بێگومان هەردووکیان هەڵەو پەڵەی زۆریان تێدایە.

هەڵبەتە ئەوەش هۆکارێك بوو بۆ ئەوە، کە زانایان و شارەزایانی ئەورووپایی و ڕۆژئاوایی، بە هۆی ئەو دوو کتێبەوە کە ناویان لێناون: {کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدَّس)} سەرجەم ئایینەکانی خواو بەرنامەکانی خوایان لەبەر چاو بکەون، بە ئیسلامیشەوە، وەك لە باسی یەکەمی بەشی دووەمدا بە درێژیی لەوبارەوە دەدوێین.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## بڕگەی شەشەم: ڕەوتی زانستناسیی لە سەدەکانی نێوە ڕاستدا لە ئەورووپاو، سەرەتای سەرهەڵدانی زانستی ئەزموونکاریی:

ئەم بڕگەیە لە چوار خاڵاندا دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** دەتوانین زۆر بە دڵنیایی بڵێین: لە ماوەی دە(١٠) سەدەکانی نێوەڕاستدا (القرون الوسطى) کە لە ساڵی: (٥٠٠) تاکو (١٥٠٠) زایینیی و، هەندێکیش لە سەدەی شەشەمەوە، واتە: ساڵی: (٦٠٠) تاکو سەدەی شازدەیەم (١٦٠٠)ی زایینی، حیسابی دەکەن، ئەورووپا (ئەو کات ئەمریکا نەدۆزرابۆوە)، بە گشتیی لە ژێر کاریگەریی فیکرو فەلسەفەی چەند کەسایەتییەکدا بوو، کە پێشتریش ئاماژەمان بە هەندێکیان دا:

١- یەکێك لەوانە (سوکرات): (٤٦٩ - ٣٩٩) پ. ز، کە یەکەمین فەیلەسووفی یۆنانییە بە ڕێ و جێ قسەی کرد بێ و میتۆد و بەرنامەیەکی دانابێ بۆ بیرکردنەوە.

٢- ئنجا (ئەفلاطوون): (٤٢٨ - ٣٤٧) پ.ز، کە قوتابی (سوکرات) بووە، دیارە (سوکرات) هیچ کتێبی لە دوا بە جێ نەماون، تەنیا لە ڕێی ئەو دیالۆگ و وتوویژانەوە، کە لەگەڵ قوتابیەکانی دا کردوونی، بیر و ڕاو بۆچوونەکانیمان پێ گەیشتوون، بەڵام (ئەفلاطوون) کۆمەڵە کتێبێکی هەبوون، کتێبێکی زۆر ناوداری بریتیە لە (کۆماری ئەفلاتون) کە تێیدا باسی چۆنیەتی پێکهاتەی کۆمەڵگا و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا و دەوڵەت دەکات.

٣- (ئەرەسطۆ): (٣٨٤ - ٣٢٢) پ.ز، ئەرەستۆ کۆمەڵێك کتێبی زۆری هەن و بەدامەزرێنەری زانستی لۆژیك (مَنطق) دادەنرێ و لە زۆر بواران دا نووسین و بەرهەمی هەن.

www.alibapir.com


٤- (بەطلیمۆس): (٨٥ - ١٦٥) ز، (بەطلیمۆس)یش یۆنانیی بووە و، پسپۆڕ و شارەزای بواری جوگرافیا و گەردووناسیی بووە و، خاوەنی هەر کام لە کتێبی: (المجسطي) و (جغرافية بطليموس)ە[1].

٥- (ئۆقلیدس): کە لە ساڵی: (٣٠٠)ی پێش زایین دا مردوە، بەڵام ساڵی لە دایك بوونی دیار نیە، ئەویش لە ڕووی هەندەسەو ماتماتیك و جوگرافییاوە، شارەزا بووە[2].

٦- (ئەفلووطین): (٢٠٥ -٢٧٠) ز، کە پێشتریش باسمان کرد و خاوەنی بیردۆزەی فەلسەفیی هەڵڕژان (فيض)بووە.

٧- (قیددیس ئوغسطین): (٣٥٤ - ٤٣٠) ز، زیاتر لە دوو سەدوچل(٢٤٠) کتێبی هەبووە، بەڵام زۆربەیان فەوتاون[3].

٨- (تۆما ئەکوینی): (١٢٢٥ - ١٢٧٤)ز، کە کۆمەڵێك کتێبی زۆری هەن و، زۆر سەرگەرمی پێکەوە گونجاندنی عەقڵ و نەقڵ بووە[4].

٩- (جالینۆس): (١٣١ - ٢٠١)ز، کە پزیشکێکی ناوداری یۆنانیی بووە[5].

ئەمانە هەر کامیان بە دەوری خۆی گەورەترین کاریگەریی هەبووە لەسەر خەڵکی ڕۆژئاوا، لە ڕووی ڕەوتی بیر و فەلسەفەوە، بە تایبەت ئەڕەستۆ کاریگەرییەکی زۆری بووە و، تا ئێستاش ئەو کاریگەرییە بە خەڵکی ڕۆژئاوا و خەڵکی گەلێك لە شوێنەکانی دیکەشەوە، هەر ماوە، چونکە زانایانی مسوڵمانیش، - وەك پێشتریش ئاماژەیەکمان پێدا - هەر کام لە (کندي، فارابي، إبن سينا، إبن طفيل، إبن باجه، وإبن الرُّشد ...)، کتێبەکانی ئەوانەیان تەرجەمە

---

(١) المنجد في الأعلام، ص ١٢٨.

(٢) الموسوعة الميسرة، ص ٨٠.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص٧٨-٨٠.

(٤) هەمان سەرچاوە، ص١٥٨-١٦٢.

(٥) المنجد في الأعلام، ص١٩١، ط٢٩.

www.alibapir.com



کردوە بۆ عەرەبی و، لێکۆڵینەوە و شەرح و لێکدانەوەیان لەسەر کردوون و، دواتر ئەورووپاییەکان زۆر سوودیان بینیوە لە شەرح و لێکدانەوەی مسوڵمانەکان، لەسەر کتێبەکانی: (سوکرات)و (ئەفلاطوون) و (ئەرەسطۆ) و (ئەفلووطین) و ئەوانی دیکەش.

تەنانەت کەسایەتییەکی وەك (تۆما ئەکوینی) لە ساڵی (١٨٧٩)ز دا، (ڤاتیکان) واتە: ئەو شوێنەی کە مەرکەزی هەموو کڵێساکانی دنیایە، ئەوەی ڕاگەیاند: کە بیری (تۆما ئەکوینی) کڵێسا بە ڕەسمیی تەبەننیی دەکات، هەروەها لەلایەن کڵێسا و پیاوانێ کە سەرپەرشتیی ئایینی مەسیحیان دەکرد، زۆربەی بیرۆکەکانی ئەرەستۆ بە تایبەت و، هی سوکرات و ئەفلاطوون و ئەفلووطین و...هتدیش تاکو ڕادەییەك، تەبەننیی کرابوون و کرابوون بە بەشێك لە ئایین و، وەك کتێبی پیرۆزی خۆیان تەماشایان دەکردن.

**دووەم:** هەر کام لە: (تۆما ئەکوینی) و (قیدددیس ئوغسطین) کاری زۆریان لەسەر ئەوە کرد، کە ئایینی مەسیح (علیه السلام)، لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیی و ئەو بیر و بۆچوونانەی ئەو فەیلەسووفانەدا، کە ناومان هێنان، بگونجێنن و تەئویلکاریی زۆریان کردوە کە ئەگەر بە تۆبزییش بێ، پێکەوەیان بیگونجێنن، سەرەنجام ڕۆژئاوا تووشی حاڵەتێکی دۆگمایی بوو لە ڕووی فیکرییەوە، چونکە بیر و بۆچوونەکانی ئەو فەیلەسووفانە، دوو هەزار سێ هەزار (٢٠٠٠-٣٠٠٠) ساڵیان بەسەردا تێپەڕیبوو و، بیری مرۆڤیش بە کەڵکی کاتێك دێ و، بە کەڵکی کاتێکی دیکە نایەت، بەڵکو جاری وا هەیە هەر لە کاتی خۆشیدا هەر نەیپێکاوە.

**سێیەم:** ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا کە کڵێسا ئەو بیروبۆچوونانەی کردبوون بە بەشێك لە ئایین، هەر زانایەك قسەیەکی کردبایە، پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەو فەیلەسووف و بیرمەندانە بووایە، بە سەختیی دژایەتیی دەکرا و ئەوەش بوو بوو بە ئاستەنگ و کۆسپێك لە بەردەم بیرمەندان و لێکۆڵەرەواندا، بە تایبەت ئەوانەی کە پشتیان بە زانستی ئەزموونکاریی، دەبەست و پشتیان بە بەکارهێنانی عەقڵێکی

www.alibapir.com



ئازاد، دەبەست، کڵێسا زۆر بە توندیی بە گژیاندا دەچۆوە، ئنجا - وەك دواتریش باسی دەکەین لە باسی: (سەر گوزەشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ڕۆژئاواو لە ئەورووپادا) - کڵێسا دەزگایەکی دانا بە ناوی: (دادگاکانی پشکنین)[1]، هەر کەسێ شتێکی گوتبایە، نەك هەر پێچەوانەی کتێبی پیرۆز بێ، کە کتێبی پیرۆز (الكتاب المقدَّس)یش، دوای دەستکاریی کران و گۆڕان، شتی ئەفسانە و بە کەڵك نەهاتوو و لەگەڵ عەقڵ و زانستدا تێك گیراوی، زۆری تێخزێنرا، بەڵکو هەرکەسێ شتێکی گوتبایە، دژی بۆچوونەکانی: (سوقراط) و (ئەفلاتوون) و (ئەرەسطۆ) و (ئوقلیدس) و (بەطلیمۆس) و (جالینوس) و ئەوانەش بووایە، بە گژیدا دەچوونەوە و دژایەتییان دەکرد و، بە دەرچوو لە ئایین و، بە زەندیق تۆمەتباریان دەکرد و، سەرەنجام هەزاران کەس لەلایەن دادگاکانی پشکنینەوە، تۆمەتبار کران و هەندێکیان سووتێنران و، هەندێکیان ئیعدام کران و، هەندێکیان بە دڕندانەترین شێوە ئەشکەنجە دران!.

ئیدی ئەوە بارودۆخی فیکریی بوو لە ئەورووپادا بە گشتی، لە سەدەکانی نێوەڕاستدا {واتە: لەو دە (١٠) سەدەیەی کە لە (٥٠٠)ەوە تاکو (١٥٠٠)ی زایینی، یاخود لە (٦٠٠) تاکو (١٦٠٠) ز}، بەڵام بێگومان عەقڵی مرۆڤ ناگونجێ هەتا سەر کۆت و بەندی بخرێتە سەر، هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) لە وەسفی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ (١٥٧) ﴾.

---

(١) (محاكم التفتيش)، المنجد في الأعلام، ص١٧٤، ط٢٣، محكمة التفتيش: محكمة دينية مسيحيَّة أُنشئَت في القرن (١٣) لملاحقة الخارجين عن الدين.

www.alibapir.com





واتە: پێغەمبەری ڕەوانە کراوی نەخوێندەوار کە (خاوەن کتێبەکان) لە تەورات و ئینجیلدا لەلای خۆیان، ناوونیشانەکانی دەبینن، هاتبوو فەرمانی پێدەکردن بە هەرچی پەسندە و، ڕێگریی لێ دەکردن، لە هەرچی ناپەسندە و، هەرچی سوود بەخشە، بۆی حەڵاڵ دەکردن و، هەرچی زیانبەخشە لێی قەدەغە دەکردن و، ئەو بارە قورسەی کە لەسەر شانیان بوو، لایدەبرد و، ئەو کۆت و زنجیرەی کە لە دەست و گەردنیان ئاڵا بوو، دەیپساند.

بەڵێ لە ڕاستییدا ئەرکی پێغەمبەران ئەوە بووە، کە عەقڵی خەڵك ئازاد بکەن و، پێغەمبەران هەمیشە دژی تەقلید و لاسایی کردنەوەی کوێرانە بوون، بەڵام لە سەدەکانی نێوەڕاستدا لە لایەن ئایینی بە ناو مەسیحەوە و، لەلایەن دام و دەزگای کڵێساوە، کە بە حیساب بە وەکالەتی مەسیح، ئایینیان بەڕێوەدەبرد و لە جێی مەسیح دانیشتبوون، بە سەختیی و خەستیی دژایەتیی بیرکردنەوەی ئازاد دەکرا، دژایەتیی عەقڵ دەکرا، دژایەتیی زانست دەکرا، بەڵام سەرەنجام کەم و زۆر زانایانی بوێر پەیدا بوون، کە ئامادە نەبوون چیدیکە عەقڵ و هۆشیان کۆت و زنجیر بکرێ و، بە ناوی دینەوە و بە ناوی خواوە، ڕێیان لێ بگیرێ بیر بکەنەوە تاکو ڕاستییەکانی گەردوون بدۆزنەوە و، ئازادانە تەماشای خۆیان و دەوروبەر و بوونەوەر بکەن.

**چوارەم:** ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا کە کڵێسا فەزایەکی وای ڕەخساند بوو - کە باسمان کرد - زۆربەی ئەو زانایانە کە سەریان هەڵدەدا، بە شێوەیەك لە شێوەکان دژی ئایین و دژی کڵێسا بوون، هەشیان بوو ڕووی لە ئیلحاد دەکرد، هەشیان بوو بڕوای بە خوا هەبوو، بەڵام دژی ئایینی بە ناو مەسیح بوو، کە ئێستا ئاماژە بە ژمارەیەکیان کە هەژدە (١٨) کەسن، دەکەین:

١- (ڕوجیە بیکون/ ئینگلیز): (١٢١٤ - ١٢٩٤)ز، ئەم زانایە ڕەنگە لە ڕووی ڕیزبەندیی کاتییەوە، یەکەمین زانای ئەورووپایی بوو بێ، کە باسی زانیاریی ئەزموونکاریی و، باسی بەکارهێنانی پێنج هەستەکان و عەقڵی کرد، بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکانی سروشت، چەند کتێبێکی نووسیون، بەڵام گرنگترین





کتێبی: (الكتاب الأكبر)ە، (کتێبی گەورەتر)، کە من ئەو سەرچاوەیەی لێم وەرگرتوە، بە زمانی عەرەبییە، ئەگەرنا دەبێ ناوەکەی: (The Big book) بوو بێ[(١)].

٢- (ویلیام ئوکامیی/ ئینگلیز): (١٢٩٥ - ١٣٤٩) ز، کە ئەویش کۆمەڵێك کتێبی لە دوا بەجێ ماون، یەکێکیان: (المجموعة المَنطقية)، (کۆمەڵە پەڕاوێکی لۆژیکیی)، (ویلیام ئۆکامیی) مەشهوورە بە بیردۆزەکەی کە پێی دەگوترێ: (شَفرة أوكام) (جفرەی ئۆکام)، کە هەر شتێك مادام چارەسەری ئاسانی هەبێ، یاخود بۆ هەر پرسیارێك، هەتا وەڵامی ئاسان دەست بکەوێ، پێویست ناکات بچی بۆ چارەسەر و وەڵامێکی قورس، بۆ وێنە: ئێمە گەردوونێك دەبینین پێویستیی بە بەدیهێنەرێك هەیە، پێویست ناکات لەو وەڵامە ئاسانەوە، کە بە ئاسانیی بە دەستەوە دێ و، عەقڵ بە جوانیی دەرکی پێ دەکات، بچی بۆ وەڵامێکی یان ئەگەرێکیی دیکەی قورس و ئاڵۆز.[(٢)]

٣- (فرانسیس بیکون/ ئینگلیز): (١٥٦١ - ١٦٢٦)ز، ئەویش کۆمەڵە کتێبێکی هەن، یەکێك لە کتێبەکانی: (پێشکەوتنی زانست)، هەروەها کتێبێکی دیکە بە ناوی: (گەشە پێدانی زانستەکان)، کە بێگومان دوای ئەوەی ناوەکانیان تەرجەمەی عەرەبیی و کوردیی دەکرێن، وایان لێدێ[(٣)].

٤- (رینین دیکارت/ ئینگلیز): (١٥٩٦ - ١٦٥٠)ز، ئەویش کۆمەڵە کتێبێکی گرنگی لە دوا بەجێ ماون، یەکێك لەوانە: (مبادىء الفلسفة)، (سەرەتاکانی فەلسەفە)، کتێبێکی دیکەی: (التأمُّلات المِتافيزيكية)، (ڕامانە میتافیزیکییەکان)، واتە: ئەو دیو سروشتەکان، دیارە (دیکارت) دواتریش هەر باسی دەکەین، چونکە مێژوونووسانی ئەورووپا دەڵێن: فەیلەسووف و بیرمەندێك کە گەورەترین کاریگەریی هەبوو بێ لەسەر ڕەوتی بیر و فەلسەفە لە ئەورووپا،

---

(١) الموسوعة الميسَّرة، ص١٣٩، ١٤٠.

(٢) الموسوعة الميسَّرة، ص٦٧٣- ٦٧٥.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ١٤٠-١٤٢.







(دیكارت) بووە، قسەیەكی زۆر ناوداری هەیە، بە عەرەبی ئاوای لێ دێتەوە: (الفَلْسَفَةُ كُلُّهَا بِمَثَابَةِ شَجَرَةٍ: جُذُورُها المِتَافِيزيكا، وَجَذْعُهَا العِلْمُ الطَّبيعِي، وَأَغْصَانُهَا بَاقِي العُلُوم).

واتە: فەلسەفە هەمووی وەك درەختێك وایە، ڕەگ و ڕیشەكەی بریتیە لە میتافیزیكا، ئەو دیوی سروشت، قەدەكەیشی بریتیە لە زانستی سروشتیی و، لق و پۆپەكانیشی زانستەكانی دیكەن[١].

هەر كامێك لەو چوار زانایانەی باسمان كردن، بە شێوەیەك لە شێوەكان خواناس بوون، بە تایبەت (دیكارت)، ئەوانی دیكەش، هەر كامێكیان بە ئەندازەی خۆی.

٥- (دیفید هیوم/ ئوسكۆتلەندیی): (١٧١١ - ١٧٧٦)ز، ئەمەیان بە پێچەوانەی ئەوانەی پێشێ بابایەك بووە جگە لەوەی بە پێنج هەستەكان دەزانرێ، بڕوای بە هیچ شتێكی دیكە نەبووە، واتە: هەستگەراو ماددیی بووە و، چەند كتێبێكی لە دوا بەجێ ماون، یەكێكیان: (رسالة في الطبيعة البشرية)، (نامەیەك لە بارەی سروشتی مرۆڤەوە)، كتێبێكی دیكەی: (التأريخ الطبيعي للدين)، (مێژووی سروشتیی ئایین).[٢]

٦- (جون لوك/ ئینگلیز): (١٧٣٢ - ١٨٠٤)ز، ئەویش كاریگەریی زۆری بووە لە جووڵاندنی بیری مەند و وەستاو و دۆگمای ئەورووپادا، بە تایبەت كتێبێكی گرنگی نووسی بە ناوی: (مقالٌ في الفهم الإنساني)، (وتارێك لە بارەی تێگەیشتنی مرۆڤەوە)، ئەمیش تەنیا بڕوای بە زانستی ئەزموونكاریی (العلم التجربي) هەبووە و هەستگەرا بووە[٣].

٧- (ئیمونوئیل كانت/ ئەڵمانیی): (١٧٢٤ - ١٨٠٤)ز، ئەویش چەند كتێبێكی گرنگی لە دوا بەجێ ماون و یەكێك بووە، لەو زانایانەی كە بە حەقیقەت زانای زەبر دەست بوون، یەكێك لە كتێبەكانی: (نَقدُ العقل الخالص) یان (نَقدُ العقل

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٢٣٥-٢٤١.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ٦٥٥-٦٥٧.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٤٤٩-٥٠٠.

www.alibapir.com



المُجَرَّد)، (ڕەخنە گرتن لە عقڵی ڕووت)، کتێبێکی دیکەی هەیە بە ناوی: (نَقدُ العقل العملي)، (ڕەخنە لێ گرتنی عەقڵی کردەیی)، هەروەها کتێبێی دیکەی هەیە بە ناوی: (الدينُ في حدود العَقل فقط)، (ئایین تەنیا لە سنووری عەقڵدا)[1].

ئەمانە زۆریان - وەك پێشتر ئاماژەم پێدا و دووبارەی دەکەمەوە - لە کاردانەوەی کڵێسادا زۆرجار ڕەخنەیان لە ئایین گرتوە بە گشتیی و، ئەو ئایینەش کە لەبەر دەستی ئەواندا بووە و پێی ئاشنا بوون، هەردووك ئایینی: یەهودییەت و نەصرانییەت بوون و، کەمتر وا بووە بە ئیسلام ئاشنا بن، هەر کامیان هەر قسەیەکی کردوە لە بارەی ئایینەوە، لەبەر ڕۆشنایی شارەزاییان لە بارەی ئایینی شێوێندراوی مەسیح و ئایینی شێوێنراوی جوولەکەوە، بووە و، ئەگەر شتێکیشیان لە بارەی ئیسلامەوە پێ گەیشتبێ، دیارە لە ڕوانگەی دەمارگیرانەی زانایانی ئایینی نەصرانییەوە پێیان گەیشتوە و، ڕەنگە زۆر شتی ئیسلامییان سەروبن، یان بە هەڵگەڕاوەیی پێ گەیشتبێ.

٨- (جیرمی بنتام/ ئینگلیز): (١٧٤٨ - ١٨٣٢)ز، ئەویش کتێبێکی هەیە بە ناوی (مَدخَلٌ إلى مبادىء الأخلاقِ والتشريع)، (دەروازەیەك بۆ سەرەتایەکانی ڕەوشت و یاسادانان)، ئنجا ئەم (جیرمی بنتام)ە، ڕێڕەوێکی دانا بە ناوی (ڕێڕەوی سوود)، یان بەرژەوەندیی، کە مەبەستی ئەوە بووە، مرۆڤ پێویستە هەرچی زیاتر سوود ببینێ و چۆن قازانج بکات، وا بکات، واتە: شێوەیەك لە بیرکردنەوەی میکاڤیلیی هەبووە[2].

٩- (تۆماس هوبز/ ئینگلیز): (١٥٨٨ - ١٦٧٩)ز، ئەمیش زانایەکی ناوداره و کتێبێکی هەیە بە ناوی: (مبادىء القانون الطبيعي والسياسي)، (سەرەتایەکانی یاسای سروشتیی و سیاسیی)، (تۆماس هوبز)یش کارتێکراو بووە بە فەیلەسووفی ناودار (ئەبیقور): (٣٤١ - ٢٧٠)پ. ز[3].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٤٦١- ٤٦٩.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ١١٩-١٢٠.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٦٣٦-٦٣٨.

www.alibapir.com







١٠- (ئۆگست كونت/ فەڕەنسیی): (١٧٩٨ - ١٨٥٧)ز، ئەم (ئۆگست كونت)ە، دوای ئەوەی دژی ئایینی كڵێسا وەستاوەتەوە، هەوڵیداوە ئایینێكی سروشتیی دابنێ، زۆر ناودارە بەوە كە كتێبێكی شەش بەرگیی نووسی بە ناوی: (تعليم الدين الوضعي)، (فێركردنی ئایینی دانراو)، هەروەها كتێبێكی دیكەی هەیە بە ناوی: (دروسٌ في الفلسفه الوضعية)، (چەند وانەیەك لە بارەی فەلسەفەی دانراوەوە)، پاشان بڕیاری داوە كە كڵێسایەك دابنێ و خۆیشی بكات بە كاهینی گەورەی و، لقان بكاتەوە بۆ ئەو كڵێسایەی خۆی، كە لەوێدا لە جیاتی ئەو سرووت (طقوس) و بەرنامانەی كە پێشكەش كراون بۆ عیسا (عليه السلام)، یان بۆ خوا، یان بۆ (روح القدس)، پێشكەش بكرێن بۆ سروشت و، قاڵبێكی مەعنەویی بە بەر سروشتدا كردوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە كە ویستوویەتی ئایینەكەی ببێ بە ئەڵتەرناتیف و جێگرەوەیەك بۆ ئایینی مەسیح، بۆ ئەوەی دەربازیان بێ لە دام و دەزگای كڵێسا و، لەو هەمووە بیرەوەرییە تاڵانەی كە بە دەست ئایینی كڵێساو دادگاكانی پشكنینەوە، هەیانبوون!.[1]

١١- (جیمس ویلیام/ ئەمریكیی): (١٨٤٢ - ١٩١٠)ز، ئەویش زانایەكی دەروونزان بووە و چەندان كتێبی هەن، لەوانە: (مبادىء علم النفس)، (سەرەتاكانی دەروونزانیی)، كتێبێكی دیكەی هەیە بە ناوی: (البراگماتية)، (بڕاگماتیی) یش بە كەسێك دەڵێن، كە دەڵێ: چۆن لە دنیای واقیعدا و بە كردەوە بە ئامانج بگەی و سوود ببینی، دەبێ وابكەی، دەڵێن: فڵان كەس بڕاگماتییە، واتە: زۆر گوێ ناداتە بەهایەكان و ئاكارەكان و، تەماشا دەكات چۆنی بۆ قازانجە لە ئەرزی واقع، وا دەكات[2].

١٢- (جون ستیوارت میل/ ئینگلیز): (١٨٠٣ - ١٨٧٣)ز، ئەویش كتێبێكی هەیە بە ناوی: (مَذهَبُ المَنفَعة)، (ڕێڕەوی سوودگەرایی)، كتێبێكی دیكەی هەیە بە ناوی: (نِظام المَنطق)، (سیستمی لۆژیك)[3].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٤٧٤-٤٧٦.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ١٨٦-١٩٢.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٥٨٨-٥٩٠.

www.alibapir.com



ئەویش هەر لە شێوەی ئەوان بووە و، ئەوانە زیاتر لای ئیلحاد و بێ دینییان گرتوە.

١٣- (هربرت سبنسر/ ئینگلیز): (١٨٢٠ - ١٩٠٣)ز، ئەویش کتێبێکی دە (١٠) بەرگیی هەیە بە ناوی: (المبادیء الأولی)، (سەرەتا یەکەمەکان)، ئەویش بە هەمان شێوە جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە پێویستە بە نهێنییەکانی سروشت ئاشنا بین و، سەروکارمان زیاتر لەگەڵ مادده و دیاردە سروشتییەکاندا بێ و، زۆر باسی جیهانی پەنهان و لایەنی ڕووحیی و ئەو دیوی سروشت نەکەین[1].

هەڵبەتە دەگونجێ زۆی دیکەش باس بکرێن، بەڵام من ئەو سێزدە(١٣) کەسەم بە نموونە هێناونەوە، کە زۆرترین کاریگەرییان هەبووە، لەسەر ڕەوت و فیکریی فەلسەفە لە ئەورووپا، دیارە لە دوای سەدەکانی نێوەڕاستەوە و هەندێکیشیان دەکەونە نێو سەدەکانی نێوەڕاست.

پێنج(٥) زاناش لە ڕووی گەردوونناسییەوە و لە ڕووی زانستە سروشتییەکانەوە، کاریگەریی زۆریان بووە، کە ئەمانەن:

١٤- (کوپرنیکوس)ی پۆڵەندیی: (١٤٧٣ - ١٥٤٣)ز، کە یەکەمین کەس بوو لە ئەورووپا گوتی: زەوی خڕە و، ئەوە ڕاست نیە کە ئایینی مەسیحیی بە ناوی کتێبی پیرۆزەوە دەڵێ: زەوی وەك سینییەك وایە لەسەر ئاو دانراوە! هەروەها ئاسمانیش گومبەزێکی شین نیە ئەستێرەکانی تێ چەقێنرابن، بەڵکو زەوی خڕە و، باسی سووڕانەوەی زەوی کرد.

١٥- (گالیلۆ گالیلیی)ی ئیتاڵیی: (١٥٦٤ - ١٦٤٢)ز، ئەمیش بەوە ناسراو و ناودارە کە باسی سووڕانەوەی زەوی کردوە و، باسی خڕێتیی و هێلکەیی زەوی کرد و، لەسەر ئەوەش کڵێسا دادگایی کرد و، لەبەر ئەوە نەبووایە کە تەوبەی کرد و پەشێمان بووەوە، بە توندیی سزا دەدرا.

١٦- (جورِدانو برونو): (١٥٤٨ - ١٦٠٠)ز، ئەمیان یەکێك بوو لەوانەی کە لەلایەن کڵێساوە سووتێندرا، ماوەیەك سجن کرا و داوایان لێ کرد پەشێمان بێتەوە،

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٢٨٢-٢٨٤.

www.alibapir.com







بەڵام هەر لەسەر قسەکەی خۆی سوور بوو، وەك (گالیلۆ گالیلی) پەشێمان نەبۆوە و سووتاندیان، چیغێکیان تێوەر پێچا و نەوتیان پێدا کرد و سووتاندیان.

١٧- (یوهانس کپلر): (١٥٧١ - ١٦٣٠)ز، ئەویش بە هەمان شێوە بڕوای بە سووڕانەوەی زەوی هەبووە و، بە جۆرێك بیری کردۆتەوە، کە تێك گیراوە لەگەڵ بیروبۆچوونی کڵێسادا، لە بارەی گەردوون و خۆر و مانگ و زەوییەوە.

١٨- (ئیسحاق نیوتن): (١٦٢٤ - ١٧٢٧)ز، ئیسحاق نیوتن، نەك ئەوەی کە (گالیلۆ گالیلیی و کوپرنیکوس و کپلر و جیوردانو برونو) گوتیان: بەڵکو زۆر لەوەش واوەتر ڕۆیشت و، باسی خۆریشی کرد، کە خۆریش یەکێکە لە ئەستێرەکان، نەك چەقی گەردوون بێ، چونکە (گالیلۆ) و ئەوانی دیکە دەیانگوت: خۆر چەقی گەردوونە، نەك زەوی چەقی گەردوون بێ و، خۆر جگە لە زەوی، کۆمەڵێ خڕۆکەی دیکەشی بە دەورەدا دەخولێنەوە، بەڵام (ئیسحاق نیوتن)، کە بە بابی فیزیای کۆن (فیزیای کلاسیك)، دادەنرێ، گوتی: ئەسڵەن خۆریش یەکێکە لە ملیۆنان ئەستێرەی نێو کەهکەشانی کاکێشان! بە حەقیقەت نیوتن یەکجاریی تەصەووڕو بۆچوونی خەڵکی ئەورووپاو دواتر هی دنیاشی گۆڕی، لە بارەی گەردوونەوە، هەڵبەتە لێرەدا قسە لە ئەورووپاو ڕۆژئاوا دەکەین، ئەگەرنا زانایانی ئیسلام زۆر پێشتر ئەو ڕاستییانەیان بە هۆی قورئانەوە، زانیون، بۆ نموونە:

١- (إبن تيمية) لە: (مجموع الفتاوى)کەی خۆیدا دەڵێ: یەکدەنگیی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەیە کە زەوی خڕە[١].

٢- (الغزالي) لە کتێبی: (تهافُت الفلاسفة)دا، دەڵێ: بە بەڵگەی هەندەسیی و فەلەکیی سەلماوە، کە خۆر سەد و حەفتا (١٧٠)جار هێندەی زەوییە[٢].

---

(١) ص١٥، ط٤، تحقيق د. سليمان ، ١٩٦٦- ١٣٨٥ هـ.

(٢) ج٦، ص٥٨٧، ط١، ٢٠٠٤ م، الناشر: وزارة الشؤون الإسلامية والدعوة والإرشاد السعودية.

زانایانی ئیسلام لەبەر ئەوەی کە لە ڕووی قورئانەوە تەماشای گەردوونیان کردوە، بەر لەوەی زانستە سروشتییەکان لە ئەورووپا سەر هەڵبدەن، بیروبۆچوون و تێڕوانینێکی دیکەیان هەبووە، دەربارەی گەردوون و، ئەو بیروبۆچوونانەی کە لە لایەن کڵێساوە تەبەننیی کرابوون، کە هی دوو هەزار و پێنج سەد (٢٥٠٠) ساڵ پێش ئێستا بوون، زانایانی ئیسلام دەستی خۆیان و عەقڵی خۆیان بەوانە نەبەستبوو و ئازادانە بیریان دەکردەوە، چونکە لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە، تەماشای دنیا و گەردوونیان دەکرد.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## بڕگەی حەوتەم و کۆتایی: ڕوانگەی ئیسلام بۆ شت زانین (زانستناسیی - ئیپستمۆلۆژیا):

ئایا ئیسلام هەڵوێستی چۆنە لە بارەی زانستناسیی (ئیپستمۆلۆژیا)یەوە؟ لەو بارەوە کە ئایا مرۆڤ تا چ ڕاددەیەك دەتوانێ دەركی ڕاستییەکان بکات و شتەکان بزانێ؟

ئێمە لە پێنج (٥) خاڵان دا، ئەم بڕگەی حەوتەمە دەتوێژینەوە:

### خاڵی یەکەم: شت زانین بۆ مرۆڤ شتێکی ئاشکراو ڕوونە:

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە: ئەوە کە مرۆڤ دەتوانێ شت بزانێ و دەرکی ڕاستییەکان بکات و، نهێنییەکان بدۆزێتەوە، شتێکی سەلمێنراو و ڕوونە، زانایانی ئیسلام یەك تەعبیریان هەیە لە زۆربەی کتێبەکانی عەقیدەو عیلمی کەلامدا هەیە، دەڵێ: (حَقَائِقُ الأَشْيَاءِ ثَابتَةٌ وَالعِلْمُ بهَا مُتَحَقِقٌ خِلاَفَاً لِلسُوفسْطَائِيَّة)[1]، واتە: چییەتی شتەکان چەسپاوە و زانیاریی بە چییەتی شتەکان، شتێکی دەستەبەر کراوە، بە پێچەوانەی سۆفسطائییەکانەوە، هەڵبەتە زانایانی ئیسلام جگە لەمە نەدەگونجا بڵێن، چونکە با تەماشای ئەم ئایەتانە بکەین:

١- لە سوورەتی (العلق)دا، خوا فەرموویەتی: بسم الله الرحمن الرحيم:

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾.

---

(١) شرح العقائد النسفية، سعد الدين التفتازاني، تحقيق الأستاذ علي كمال، ص٢٦ و ٢٧.

www.alibapir.com



ئەم پێنج ئایەتە، یەکەمین ئایەتێك بوون کە دابەزینە سەر دڵی موبارەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، خوا دەفەرموێ: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەت کە وەدی هێناوە(چی وەدی هێناوە؟! هەموو شتێك، دوایی تایبەتی دەکاتەوە)، ئینسانی لە خوێنپارە هێناوەتە دی، بخوێنە و پەروەردگاریشت هەرە بەخشندەیە، (یەکێ لە مەصادیق[1] و نیشانەکانی بەخشندەیی خوا ئەوەیە کە) مرۆڤی بە قەڵەم فێرکردوە، (چی فێرکردوە؟!) شتێکی فێری مرۆڤ کردوە (بە هۆی خوێندن و نووسینەوە)[2] کە نەیدەزانی.

کەواتە: مرۆڤ دەتوانێ فێر بێ، خوا فێری دەکات، خوا هۆکارەکانی فێر بوون و زانستی بۆ ڕەخساندوون.

٢)- لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: (خوا) هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کردن.

هەموو ناوەکان واتە: توانای ناو لە شت نان و دەربڕینی بە ئادەم بەخشی، دیارە لە دوای ئادەمیشەوە بە وەچەکانی ئادەم و حەووا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، دایك و بابی مرۆڤایەتیی.

٣)- لە سوورەتی (محمد)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴿١٩﴾ ﴾.

واتە: بزانە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، واتە: مرۆڤ دەتوانێ پەی بە تاکێتیی (وَحدانية) و تەنیا پەرستراوێتیی خوا ببات.

٤)- لە سوورەتی (طه)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: پەروەردگارم زانیاریم بۆ زیاد بکە، یانی: زانیاریی شتێکی گونجاو (ممکن)ە و دەبێ مرۆڤ داوا لە پەروەردگاری بکات، بۆی زیاد بکات و زیاتری پێ بدرێ.

------------------------------

(١) (مصاديق) کۆی (مصداق)ە، کە بریتیە لە هاتنەدی شتێك لە دنیای واقیع دا، دەگوترێ: فلانە شت (مصداق)ی نیە، واتە: بوونی دەرەکیی.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە بۆ ڕوونترکردنەوەی مەبەستی ئایەتەکان.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش، فەرموویەتی: {طَلَبُ العِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسلِمٍ}، (أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهَ برقم: ٢٢٤، وَصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: بە دوای زانستدا گەڕان لەسەر هەموو مسوڵمانێك پێویستە.

پیر و گەنج، پیاو و ئافرەت، ورد و درشت، خوێندەوار و نەخوێندەوار، هەمووی لەسەری پێویستە زانابێ، شارەزا بێ، بەرچاو ڕوون بێ.

## خاڵی دووەم: خوا سەرچاوەی زانستە:

زانست لە کوێوە دێ؟ بێگومان لە خوای پەروەردگارەوە، چونکە بە دیهێنەری ئەم گەردوونە، دیزاینەری ئەم گەردوونە، خوایە(سبحانه وتعالى)، خوا ئەم گەردوونەی لە نەبوونەوە هێناوەتە دی و یاساکانی تێدا داناون و، هەموو شتێکی بە ڕێ و جێ دروستکردوە و، ڕێ و شوێنی بۆ داناوە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لەسەر زمانی مووسا (عليه السلام) لە وەڵامی فیرعەوندا، کە لێی دەپرسێ:

﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾ طه، پەروەردگاری ئێوە کێیە ئەی مووسا؟

فەرموویەتی: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه.

(مووسا) فەرمووی: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوە، دواییش ڕێنمایی کردوە.

واتە: فێری کردوە چۆن بە ڕێوەبچێ، (یانی: سیستمی بۆ داناوە)، ئنجا با تەماشای ئەم چەند ئایەتە بکەین:

١- ﴿ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ ﴾ البقرة.

واتە: (فریشتەکان) گوتیان: پاکیی بۆ تۆ، زانیارییمان نیە، مەگەر ئەوەی تۆ فێرمان بکەی، بەڕاستیی هەر تۆ زانای کارزانی.

www.alibapir.com







٢- خوا لە (آية الكرسي)دا، دەفەرمویَ: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۝٢٥٥﴾ البقرة.

واتە: مرۆڤەكان ناتوانن هیچ لە زانیاریی خوا بزانن، مەگەر ئەوەی خۆی بیەویَ، كەواتە: مرۆڤ هەرچی فێری دەبیَ، خوا ویستوویەتی مرۆڤ فێری بێت و بیزانیَ و، خوا ئەو توانایەی پێداوە.

٣- ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ۝٨٥﴾ الإسراء.

واتە: كەمێك نەبیَ زانیارییتان پیَ نەدراوە، یانی: لە چاو نهێنییەكانی نێو گەردوون، لە چاو نهێنییەكانی خودی خۆتان، لە چاو ئەو نهێنییانەی كە لە خۆتان و لە ئاسۆیەكاندا هەن، ئەو زانیارییەی كە پێتان دراوە، هەتا ژیانی مرۆڤ بە كۆتا دیَ، ئەندازەیەكی كەمە لە چاو ئەو هەموو نهێنییانەی نایانزانن، كەواتە: بەو ئەندازە زانیارییەی پێتانە، پیَ لە خۆتان بایی مەبن.

## خاڵی سێیەم: ڕێیەكانی وەدەستهێنانی زانست: بە گشتی، سیَ ڕێن: (پێنج هەستەكان، عەقڵ، وەحیی):

بەڕێـــزان!

ڕێیە گشتییەكانی وەدەستهێنانی زانست، سیَ ڕێن:

١- پێنج هەستەكان. ٢- عەقڵ. ٣- وەحیی، دوو ڕێی تایبەتییش هەن، كە بریتین لە: ٤- خورپە (إلهام). ٥- خەون (رؤيا)، بەڵام ڕێیە گشتییەكانی وەدەستهێنانی زانست، ئەو سیَ ڕێگایەن: ١- پێنج هەستەكان: هەستی دیتن و بیستن و تامكرد و بۆنكردن و دەست لیَ كوتان، ٢- عەقڵ. ٣- وەحیی یانی: پەیامێك كە لە خواوە دیَ.

ئنجا ئێمە سەرەتا باسی ڕێی یەكەم و دووەم: پێنج هەستەكان و، عەقڵ، دەكەین:

www.alibapir.com





## ١ و ٢: ڕێگای یەکەم و دووەم: پێنج هەستەکان و عەقڵ:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ النحل.

واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێنا، هیچتان نەدەزانی، بەڵام بیستن و دیتنەکان (واتە: گوێ و چاو) و عەقڵەکانی پێدان، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن.

واتە: ئەو هەستەوەرانە بەکار بێنن لە دۆزینەوەی نهێنییەکانی خۆتان و بوونەوەر و دەوروبەردا، ئنجا ئەوەش سوپاسکردنی خوایە، کە نیعمەتەکانی خوا، بەکاربێنی لە ڕەزامەندیی خوادا.

٢- هەروەها خوای کارزان دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: شتێك كە زانیارییت لە بارەیەوە نیە، شوێنی مەکەوە، چونکە بیستن و چاوەکان و عەقڵەکان، هەموو ئەوانە لێیان دەپرسرێتەوە. (چونکە ئەوانە ئامرازو هۆکاری بەدەستهێنانی زانستن).

٣- هەروەها خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ ﴾ عبس.

واتە: با مرۆڤ سەرنجی خواردنەکەی بدات، کەواتە: مرۆڤ بە هۆی سەرنجدان و تەماشا کردنی خۆراکەکەیەوە، فەرمانی خوا جێبەجێ دەکات.

٤- هەروەها خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ ﴾ الغاشية.

www.alibapir.com



واتە: ئایا سەرنجی حوشتریان نەداوە، چۆن دروست کراوە و، سەرنجی ئاسمانیان نەداوە، چۆن بەرز کراوەتەوە و، سەرنجی چیاکانیان نەداوە، چۆن چەقێنراون (داکوتێنراون) و، سەرنجی زەوییان نەداوە، چۆن پان ڕاخراوە؟! (لەگەڵ ئەوەشدا کە خڕ و هێلکەییە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە زۆر گەورەو زەبەلاحە، پان و ڕاخراو دێتە بەر چاو، بۆ ئەوەی مرۆڤ لەسەری بژی).

٥- هەروەها خوای زانا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الأنفال.

واتە: وەك ئەوانە مەبن کە گوتیان: بیستمان کەچی نەشیان بیست، واتە: هێزی بیستنیان بەکارنەهێنا بۆ دۆزینەوەی هەق.

٦- دیسان خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَـٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَـٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: بۆ دۆزەخ زۆرێك لە جینن و مرۆڤمان ئامادە کردوون، عەقڵیان هەیە، دڵیان هەیە پێی تێناگەن، چاویان هەیە پێی نابینن، گوێیان هەی پێی نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن، بەڵکو لە ئاژەڵیش خراپترن، ئەوانە بێئاگان. (چونکە عەقڵ و هەستەوەرەکانی خۆیان بەکارناهێنن، بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان).

هەڵبەتە بە هەڵە داچوونی پێنج هەستەکانیش، بیانووی پەك خستنیان نیە، بەڵێ ڕاستە پێنج هەستەکان بە هەڵەدا دەچن: چاو خۆر دەبینێ، وا دەزانێ بە قەد بێژینگێکە، بەڵام ملیۆنێك و سێ سەد (١٣٠٠٠٠٠) هەزار جار هێندەی زەوییە، مانگ دەبینێ وا دەزانێ گچکەیە، بەڵام قەبارەیەکی گەورەی هەیە.

هەروەها گوێ هەموو شتێك نابیستێ، یان شتێك دەبیستێ بە هەڵە.

دیسان هەستەکانی بۆنکردن و دەستلێکوتان و تامکردن، بە هەڵەدا دەچن، ئەوە ڕاستە، بەڵام بە هەڵەدا چوونی پێنج هەستەکان، بیانووی پەك خستنی

www.alibapir.com



پێنج هەستەکان نیە، چونکە بە هەڵە داچوونەکەیان جار جار، نیشانەی ئەوەیە کە بە زۆریی دەتوانن دەرکی ڕاستییەکان بکەن، بۆیە ئەوانەی بە بیانووی ئەوەی هەستەکان بە هەڵەدا دەچن، کە عەقڵگەرایەکانن، ئەوانەی بەس ئیعتیمادیان لەسەر عەقڵە، بەڵکو هەندێك لە (سوفسطائي)یەکان بڕوایان بە عەقڵیش نەبووە و گوتوویانە: باوەڕ و متمانە بە هیچ شتێك ناکرێ، نە بە عەقڵ و بە پێنج هەستەکان! بەڵێ، ئەوانە زۆر بە هەڵەدا چوون، چونکە ئەو هەموو ئایەتانەی خوا، فەرمان دەکەن بە مرۆڤەکان، کە عەقڵیان بەکاربێنن، چاویان بەکاربێنن، گوێیان بەکاربێنن، پێنج هەستەکان بەکاربێنن، لە مامەڵەیان لەگەڵ خۆیان و سروشت و بوونەوەر و دەوروبەردا، بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان و، بۆ هەڵهێنانی مەتەڵەکانی گەردوون و، پەیبردن بە یاساکانی خوا (سبحانه وتعالى) لە گەردووندا.

ئنجا لێرەدا پێویستە لە ڕاستییەکی گرنگ بێ ئاگا نەبین، ئەویش هاوکاریی نێوان عەقڵ و پێنج هەستەکانە و، ئەو زانیارییە جوزئییانەی کە پێنج هەستەکان کۆیان دەکەنەوە، ئەگەر بە هۆی عەقڵەوە نەبووایە، سوودێکیان لێ نەدەبینرا و وەك کەرەستەیەکی خاو وان، کە عەقڵ شتیان لێ دروست دەکات و ئەنجامگیرییان لێ دەکات، ئێستاش نموونەیەك دێنینەوە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان پێنج هەستەکان و عەقڵ، کە لەو بارەوە وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، هەم کورتهێنان هەبووە و هەم تێپەڕاندنیش هەبووە، بەڵام دوای ئاماژەیەکی کورت بە سێ ڕەوتی بە هەڵەدا چوو، لەو بوارەدا:

**ڕەوتی یەکەم:** هەستگەرایەکان (الحِسِّيون) ئەوانەی کە تەنیا پشتیان بە پێنج هەستەکان بەستوە، گوتوویانە: ئەوەی لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە دەرك نەکرێ، بڕوامان پێی نیە، واتە: تەنیا بڕوایان بە مادده و بە سروشت و ئەو دیاردانەی کە بەرهەست (مَحسوس)ن، هەبووە.

**ڕەوتی دووەم:** عەقڵگەرایەکان (العقلانيون) گوتوویانە: پێنج هەستەکان جێی پشت پێ بەستن نین و، بە هەڵەدا دەچن، لەبەر ئەوە ئێمە بەس ئیعتیمادمان لەسەر عەقڵە.

**ڕەوتی سێیەم:** کۆمەڵێکی دیکەش هەبوون کە بڕوایان بە هیچیان نەبووە و گوتوویانە: هەم عەقڵ بە هەڵەدا دەچێ، هەم پێنج هەستەکانیش بە هەڵەدا دەچن، لەبەر ئەوە هیچ کام لەوانە جێی پشت پێ بەستن نین، زۆرێك لە زانایانی کڵێسا ڕایان وابوو، ئنجا گوتوویانە: دەبێ بۆ زانینی هەموو شتێك تەنیا پشت بە کتێبی پیرۆز ببەستین، ئەو کتێبە پیرۆزەی کە گۆڕیبوویان و دەستکارییان کرد بوو، پڕیان کرد بوو لە ئەفسانە و شتی هەڵە و پەڵە.

ئێستاش با وێنەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی بە هەڵەداچوونی هەر کام لە هەستگەرایەکان و عەقڵگەرایەکان لەلایەك و، پێکان (إصابة)ی پێکەوە کۆکەرەوانی عەقڵ و ئەزموون، لەلایەکی دیکەوە بێنینەوە:

(فرانسیس بیکون) وێنەیەکی جوان لەو بارەوە دێنێتەوە، دەڵێ:

١- وێنەی هەستگەرایەکان: ئەوانەی کە تەنیا پشت بە پێنج هەستەکان دەبەستن، بۆ بەدەست هێنانی زانیاریی، وەك مێروولە وان، مێروولە تەنیا لە دەرەوەی خۆیەوە دانەوێڵە و خۆراك دێنێ و، کۆی دەکاتەوە و، دەیهێنێتە نێو شارەکەی و پەزمەندەی دەکات.

٢- وێنەی عەقڵگەرایەکان: ئەوانەش کە بەس پشت بە عەقڵ دەبەستن، بۆ دەرککردنی شتەکان، وەك جاڵجاڵۆکە وان، جاڵجاڵۆکە تەنیا لە لیکی خۆی دەزووەکە دروست دەکات و، شتەکە لە خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ، عەقڵگەرایەکانیش پشت بە دەرەوەی خۆیان نابەستن، بزانن لە دەرەوەیان چ باسە؟ هەر لە خودی خۆیاندا بیر دەکەنەوە!

٣- وێنەی ئەوانەش کە پشت بە عەقڵیش دەبەستن و، پشت بە پێنج هەستەکانیش دەبەستن: ئەوان وەك هەنگ وان، هەنگ هەم دەچێ شیلەی گوڵان دەمژێ و، هەم دوایی لە دەردراوی (إفراز)ی خۆیشی دەیخاتە سەر و، ئەو شیلەی گوڵانە دەگۆڕێ بۆ هەنگوینێکی خۆش.

بە ڕاستیی نموونە هێنانەوەکەیم زۆر پێ جوانە.

www.alibapir.com





بەڵێ: دەبێ مرۆڤ هەم پشت بە پێنج هەستەکان ببەستێ و، ئەو زانیارییانەی لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە دێن:

١- دیتراوەکان (مرئیات).

٢- بیستراوەکان (مسموعات).

٣- تامکراوەکان (مذوقات).

٤- بۆنکراوەکان (مشمومات).

٥- دەستلێکوتراوەکان (مَلموسات).

دەبێ ئەوانە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە کۆ بکاتەوە، کە ئەوانە هەموویان زانیاریی بچووك بچووکن، بەڵام تەنیا بەوەندە مەداری ساز نابێ و، دەبێ ئەوانە وەك کەرەستەیەکی خاو بخاتە بەردەستی عەقڵ، عەقڵیش کۆیان بکاتەوە و ئەنجامگیرییان لێ بکات، ڕاست وەك هەنگەکە کە شیلەی گوڵەکان دەمژێ، بەڵام خۆیشی دەستکاریی ئەو شیلەیە دەکات و، سەرەنجام هەنگوینێکی نایابمان بۆ بەرهەم دێنی، کە خوا لە بارەیەوە دەفەرموێ:

﴿فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۞٦٩﴾ النحل.

ئنجا ئەوەی (فرانسیس بیکۆن) گوتوویەتی، پێش وی لە قورئاندا خوای پەروەردگار باسیکردوە، وەك دەفەرموێ:

﴿وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ۞٧٨﴾ النحل.

واتە: خوا لە سکی دایکتان دەریهێنان، هیچ شتێکتان نەدەزانی، بەڵام بیستن و دیتن و عەقڵی پێدان، بەڵکو سوپاسگوزاربن.

دیارە خوای زانا و توانا لە پێنج هەستەکان تەنیا باسی بیستن و دیتنی کردوە، لەبەر ئەوەی گرنگترین هەستن لە پێنج هەستەوەرەکان و، باسی تامکردن و بۆنکردن و دەستلێکوتانی نەکردوە، چونکە ئەوەی کە مرۆڤ زیاتر زانیاریی





پێ بەدەست دێنێ، ئەو دوو هەستە سەرەکییەن: (بیستن و دیتن)، دوایی باسی عەقڵیشیی کردوە.

هەروەها خوای بەرزی مەزن لە سوورەتی (الإسراء)دا کە دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴿٣٦﴾ ﴾.

واتە: شتێك کە زانیارییت لەبارەیەوە نیە، شوێنی مەکەوە، یانی: بە نەزانیی بە نێو مەکەوە، چونکە:

﴿ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾.

واتە: هەر کام لە بیستن و چاوەکان و عەقڵەکان، لێیان دەپرسرێتەوە: کە ئایا خاوەنەکەیان بەکاریهێناون بۆ بەدەست هێنانی زانیاریی، یان بەکاری نەهێناون و پەکی خستوون؟!

واتە: لە ئیسلامدا ئەو دووانە هەستەوەرەکان(ئەزموونکاریی) و عەقڵ، بە دژ و نەیاری یەکدی دانەنراون، بەڵکو بە هاوکاری یەکدی دانراون.

## ڕێگای سێیەم: وەحیی:

سەرەتا با تەماشا ئەو چەند ئایەتە بکەین:

١- خوا(سبحانه وتعالی) لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾.

www.alibapir.com



(خوا ڕووو لە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دەكات) دەفەرمویٚ: ئێمە سروشمان بۆ تۆ كرد، (وەحییمان بۆ تۆ نارد، پەیامێكی پەنهان) وەك چۆن بۆ نووح و پێغەمبەرانی دوای نووحیشمان نارد، هەروەها سروشمان كرد بۆ ئیبراهیم و ئیسحاق و ئیسماعیل و یەعقووب و ئەسباط و، عیسا و ئەییوب و یونس و هاڕوون و سولەیمان و زەبووریشمان بە داوود دا و، پێغەمبەرانێك كە پێشتر بەسەرهاتیانمان بۆت گێڕاوەتەوە و، پێغەمبەرانێكیش كە بەسەرهاتیانمان بۆت نەگێڕاوەتەوە و، خوا بە دواندن مووسای دواندوە، ئەوانە پێغەمبەرانێكی دڵخۆشكەر و ترسێنەرن، (بۆچی خوا ناردوونی؟!): ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾، تاكو خەڵك لە دوای پێغەمبەران، بەڵگەی لەسەر خوا نەبیٚ، ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾، خواش زاڵی كارزانە.

واتە: ئەگەر خوا پێغەمبەرانی (علیهم السلام) نەناردبان و، وەحیی و پەیامی تایبەتیی بۆ نەناردبان و، ئەو سەرچاوەی سێیەمەشی نەختبایە گەڵ ئەو دوو سەرچاوەی پێشیٚ: زانیاریی پێنج هەستەكان و، زانیارییەك كە بە عەقڵ دەستەبەر دەكریٚ، ئەگەر لە ڕێی وەحیی خۆشییەوە زانیاریی تایبەتیی نەناردبایە، مرۆڤەكان بەڵگە و بیانوویان دەبوو كە خوا نەناسن، خوا نەپەرستن، بەڵام لە دوای هاتنی وەحیی، مرۆڤ هیچ بەڵگە و بیانوویەكی نامێنیٚ.

٢- هەروەها خوای میهرەبان لە سووڕەتی (الأنعام)دا، دەفەرمویٚ: ﴿اتَّبِعْ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾﴾.

واتە: ئەوەی كە لە پەروەردگارتەوە بۆت سروش كراوە، شوێنی بكەوە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە و، پشت لە هاوبەش دانەرەكان بكە.

٣- هەروەها لە سووڕەتی: (الشُّعراء)دا، خوا دەفەرمویٚ: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾﴾.

واتە: (ئەم قورئانە) گیانی پیرۆز دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، تاكو لە هۆشیاركەرەوان بی، بە زمانێكی عەرەبی ڕۆشن.

www.alibapir.com







٤- هەروەها لە سوورەتی (الحشر)دا، خوا فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ ﴾.

واتە: ئەو خوا كەسێكە جگە لەوی هیچ پەرستراوێك نیە، زانای پەنهان و ئاشكرایە، هەر ئەو بە بەزەیی میهرەبانە.

یانی: لە بەزەیی و میهرەبانیی خۆیەوە، مرۆڤی پشتگوێ نەخستوە و وێڵ نەكردوە، كە تەنیا حەواڵەی پێنج هەستەكانی و حەواڵەی عەقڵی خۆی بكات، چونكە خوا زانیویەتی، نە پێنج هەستەكان و نە عەقڵیش، بە تەواویی ناتوانن ڕێ بە مرۆڤ دەربكەن و، بە ئامانجی بگەیەنن و، نهێنییەكانی ژیان و گەردوونی پێ بناسێنن.

## خاڵی چوارەم: هەنگاوەكانی وەدەستهێنانی زانست لە بارەی خواوە (سبحانه وتعالی):

بــەڕێـــزان!

هەنگاوەكانی وەدەست هێنانی زانست لە بارەی خوای بەرز و مەزنەوە، بە گشتیی سێن:

### ١- هەنگاوی یەكەم: كاری پێنج هەستەكان:

كە تەنیا لە جوغزی مادده و دیاردە بەرهەستەكانیدا توانایان هەیە، زانیارییە جوزئییەكان: وێنەكان و دەنگەكان و بۆنەكان و تامەكان و دەست لێكوتراوەكان (المبصرَات، والمرئيات، والمسموعات، والمشمومات، والمذوقات، والملموسات) ئەوانە كۆدەكەنەوە، وەك كەرەستەیەكی خاو دەیخەنە بەر دەستی عەقڵ، بەڵام بێگومان بە پێنج هەستەكان گەڕان بە دوای جگە لە شتە ماددییەكاندا، هەڵەیەكی زۆر

www.alibapir.com



کوشتندەیە و، بناغەی گیرۆدەبوونی هەموو ئەوانەیە کە بە هەڵەدا چوون، کە ویستوویانە بە تۆڕو شەداوی پێنج هەستەکان، شتێك بگرن کە لە توانایدا نیە.

ئایا بە تۆڕی ماسیی گرتن، تیشکی خۆر، یان هەوا دەگیرێ؟ بێگومان نەخێر، بەڵێ پێنج هەستەوەرەکان ڕاوچییەك نین، کە جگە لە دیاردە ماددییەکان، هیچ نێچیرێکی دیکە بگرن، بۆ وێنە: تۆ کەسێك لە بەرانبەرتە، هەر تەماشای بکەی بە عەقڵ دەزانی داخۆ دەیناسی یان نایناسی؟ ئنجا پاش ناسینی، ئایا دۆستە، یان ئاشنایە و کێیەو کێ نیە؟ ئنجا ئەگەر لە نیزیکەوە بیناسی داخۆ چ خواردنێکی پێ خۆشە؟ هەروەها ئایا تۆی خۆش دەوێ، یان نا؟ ئنجا ئایا دەیەوێ چی بکات و چۆن بکات؟ .. هتد، کە بێگومان ئەو شتانەی تۆ لە بارەی ئەو کەسەوە کە لە بەرانبەرتە، دەیانزانی، هیچ کام لەو زانیارییانە، لەو زانراوانە، بەرهەست نین (بینراو، یان بیستراو، یان تامکراو، یان بۆنکراو، یان دەستلێکوتراو، نین)، بەڵکو بەس بە عەقڵ، ئەو زانیارییانە لەو کەسەی بەرانبەرتدا، دەرك دەکەی، کەواتە: پێنج هەستەکان تۆڕ و شەداوێکن، تەنیا نێچیری لە قەدەر خۆیان پێ دەگیرێ، کە ئەویش بریتین لە: وێنەکان و، دەنگەکان و، تامەکان و، بۆنەکان و، دەست لێکوتراوەکان (ملموسات)، واتە: قەبارەی شتەکان: ساردیی و گەرمیی، زبریی و لووسیی، ڕەقیی و نەرمیی....هتد.

## ٢- هەنگاوی دووەم: کاری عەقڵ:

کاری عەقڵیش ئەوەیە کە:

**یەکەم:** بە هۆی بەڵگە نەویستە خوارِسکەکان (البديهيات الفطرية) یان بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان (البديهيات العقلية)ەوە، کە چەند یاسایەکن خوا بە هەموو مرۆڤەکانی داون و، مرۆڤەکان تێیاندا یەکسانن.

**دووەم:** هەروەها بە هۆی ئەو زانیارییە جوزئییانەوە، کە لە پێنج هەستەکانەوە وەری گرتوون: وێنەکان و دەنگەکان و تامەکان و بۆنەکان و لەمس کراوەکان،

www.alibapir.com


بەڵێ، عەقڵ دوای پێکەوە ئاوێتەکردنی یاسا بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان و زانیارییە جوزئییەکان، دەست دەکات بە شیکردنەوەو ئەنجامگیریی و هەڵهێنجانی چەند یاسایەکی عەقڵیی.

بەڵێ عەقڵ چەند یاسایەکی خوارسك و زگماکی تێدان، کە لە دەرەوەی خۆی فێریان نەبووە، بەڵکو کە خوا (سبحانه وتعالی) مرۆڤی دروست کردوە و عەقڵی پێداوە، ئەو یاسایانەشی تێدا داناون، بۆ وێنە:

١- هەموو لە بەشێکی گەورەترە (الكل أكبر من جزئه).

٢- دوو شتی دژو پێچەوانەی یەکدی، ناتوانن لە یەك کاتدا و لە یەك شوێندا بن، (عدم اجتماع النَّقيضين)، بۆ وێنە: شتێك ڕەش بێ و، سپی بێ، لە یەك کاتدا، ساردیش بێ و، گەرمیش بێ، یاخود هەبێ و، نەبێ.

٣- دوو کۆ دوو یەکسانە بە چوار (٢+٢=٤).

٤- زۆر لە کەم زیاترە (الكثير أكثر من القليل)، بۆ وێنە: منداڵێك یەك دانە سێوی بدەیە و، یەکی دیکەیان دە(١٠)دانەی بدەیە، دەڵێ: بۆچی هی من تەنیا یەکە؟! دەزانێ هی وی کەمە و، هی ئەوی دیکە زۆرە، ئەوانە چەند یاسایەکی بەڵگە نەویستن، واتە: خوارسکن، زگماکن، خوا لە عەقڵ و هۆشی مرۆڤدا دایناون، نەك لە ڕووی ئەزموونەوە پێیان گەیشتبێ.

عەقڵ بە هۆی ئەو یاسا بەڵگە نەویستە خوارسکانەوە و، بە هۆی ئەو زانیارییە جوزئییانەوە، کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە پێی گەیشتوون و، بۆی کۆکراونەوە و وەك کەرەستەیەکی خاو خراونە بەر دەستی، چەندان یاسا هەڵدەهێنجێ، کە هەر کامێکیان بەڵگەیەکی پتەوە، بۆ سەلماندنی بوونی خوا عزو جل، کە ئێمە لێرەدا حەوت(٧)یانمان هێناون:

**یاسای یەکەم:** ئەم گەردوونەی دەیبینین لە جۆری بوون گونجاو (ممكن الوجود)ە، واتە: دەگونجا نەبێ، هەروەك گونجاویشە هەبێ، ئەگەر سەرنجی گەردوون (كون) بدەی بۆت دەردەکەوێ کە دەگونجا هەبێ و دەشگونجا نەبێ،

www.alibapir.com



کەواتە: دەبێ زاتێك بوونی بەسەر نەبوونی دا زاڵ کردبێ و، دەبێ بەدیهێنەرێك لە پشتیەوە بێت، کە خوایە (سبحانە وتعالی)، چونکە بوون (وجود) بە ڕەهایی، عەقڵ تەنیا سێ حاڵەتانی بۆ ڕەچاو دەکات:

١- بوون پێویست (واجب الوجود)، ئەوەیە کە نەگونجێ نەبێ، کە تەنیا خوای بەدیهێنەرە.

٢- بوون مەحاڵ (مستحیل الوجود)، ئەوەیە کە نەگونجێ هەبێ، وەك هاوبەش بۆ خوا.

٣- بوون گونجاو (ممکن الوجود)، ئەوەیە کە بوون و نەبوونی گونجاو بن، کە گەردوونە.

**یاسای دووەم:** یاسای هۆکاریی (قانون السببیَّة): هەموو پەیدابوویێك پەیداکەرێکی هەیە، ئەمەش یاسایەکی عەقڵییە، منداڵێکی گچکە کە جارێ هێشتا نەهاتۆتە نێو ژیان و ئەزموونی پەیدا نەکردوە، لە ڕێی پێنج هەستەکانی و لە ڕێی عەقڵییەوە، گوێی ڕاکێشە، یان زللەیەکی لێبدە، تەماشات دەکات و، پێی سەیرە بۆچی وای لێ دەکەی؟! دەزانێ ئەو گوێ ڕاکێشانە، ئەو زللەیە، هۆکارێکی لە پشتە، کە تۆی.

بەڵێ یاسای هۆکاریی، یاسایەکی عەقڵییە، دیارە عەقڵ هەڵیدەهێنجێ لە زانیارییە جوزئییەکانەوە و لە یاسا خوارِسکەکانەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە یاسایەکی عەقڵییە.

**یاسای سێیەم:** مەحاڵ بوونی زاڵبوونی لایەکی شتێك بەسەر لایەکەی دیکەیدا، بە بێ زاڵکەر (إستحالة ترجیح أحد طرفي شيئ بلا مرجِّح)، بۆ وێنە: تەرازوویەك ناگونجێ لایەکیان داکەوێ بەسەر لایەکیاندا، مەگەر شتێك بخرێتە ئەولایەوە کە داکەوتوە، ئەم واقیعەش کە دەیبینین، دەگونجا نەبێ، ئایا چ شتێك وای لێکرد کە ببێ؟ هەڵبەتە ئەم یاسایە لە هی یەکەمەوە نیزیکە، بەڵام جیاوازییشیان هەیە.

www.alibapir.com





**یاسای چوارەم:** نەداری شتێك پێی نابەخشرێ (فَاقِدُ الشَّيء لا يُعْطِيهِ)، واتە: کەسێك بۆ خۆی شتێکی نەبێ، ناتوانێ بیبەخشێ، کەسێك سێوی پێ نەبن، ناتوانێ سێوان بدات بە خەڵکی.

ئنجا ئەم گەردوونە کە دەیبینین، زانایانی فیزیا و کیمیا، - وەك دوایی بە وردیی باسی دەکەین - دەڵێن: لە ماددە پێکهاتوە و، بچووکترین یەکەی ماددەش، بریتییە لە گەردیلە، گەردیلەش لە سێ بەشی سەرەکیی پێك دێ و، هەر کام لەو سێ بەشانەش لە شتی بچووکتر پێك دێن، ئنجا دەپرسین: لە ماددەدا ژیان (حیاة) نیە، عەقڵ نیە، ویست نیە، زانست نیە، ئەدی ئەو حاڵەتانە لە کوێوە هاتنە نێو ماددە؟

ڕوونتر دەڵێین:

١- لە کوێوە شتانێك لە ماددە پەیدا بوون کە گەشەکردنیان هەبێ، کە ڕووەکن.

٢- شتانێك پەیدا بوون کە ویستی جووڵانیان هەبێ، کە ئاژەڵەکان و زیندەوەرەکانن.

٣- شتانێك پەیدا بوون، کە عەقڵ و هۆشیان هەبێ، کە مرۆڤەکانن؟ واتە: ئەو شتانەی کە جیان لە ماددە، لە کوێوە هێنرانە نێو ماددە؟! چونکە نەداری شتێك، ئەو شتەی نیەتی، پێی نابەخشرێ، ماددەش خۆی ئەوانەی نیە؟ کەواتە: لە دەرەوەی خۆیەوە ئەو شتانەی پێ دراون، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

**یاسای پێنجەم:** هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە، ئێمە هەرچی سەرنجی بدەین: لە خۆمان، لە دەوروبەرمان، لە گەردووندا، هەمووی سیستەم(نظام) و ڕێکخستنی تێدا دەبینین، ئنجا دەپرسین: کێ ڕێکی خست؟! کێ ئەو حاڵەتە سیستماتیك و ڕێك و پێکییەی پێدا؟! خۆی نیەتی و ڕێکخراویش بەبێ ڕێکخەر نابێ(لانِظامَ بدون مُنظِّم)، مرۆڤێك لە بیابانێك شوێن پێیەك دەبینێ، بە پێی جۆری شوێن پێیەکە، ئەگەر هی مرۆڤ بێ، دەڵێ: مرۆڤێك لێرەوە هاتوە، ئەگەر پێڵاوی لە پێ بێ دەڵێ: پێڵاوی لە پێ بووە، ئەگەر پێخواس بووبێ، دەڵێ: پێخواس بووە، ئەگەر پێیەکان گچکە بن، دەڵێ: منداڵ بووە،

www.alibapir.com





ئەگەر شوێن پێی ئاژەڵێك بوو بێ، ئنجا گورگە، چەقەڵە، کەمتیارە، ورچە، شێرە، دەڵێ: فلان ئاژەڵە بووە، واتە: شوێن پێیەکی سادە، مرۆڤ ناچار دەکات کە بڵێ: کەسێك بەجێی هێشتوە، ئەدی ئەم گەردوونە ڕێك و پێکە، ناچارمان ناکات بڵێین: کەسێك ڕێکی خستوە؟!

**یاسای شەشەم:** مشوورلێخواردن بەڵگەی بوونی مشوورخۆرە(التدبیر یدلُّ علی وجود مُدبِّرٍ)، ئێمە هەم لە خۆماندا کە تێدەفکرین، هەم لە گەردووندا کە تەماشا دەکەین، هەست دەکەین تەگبیر کراوە و مشوورخوراوە، وەك زانایانی ئیسلام وێنەیەکی جوان دێننەوە، دەڵێن: هیچ بەردێکت بینیوە، بەردێکی خڕ، بە قەدەر کاڵەکێك بێ، چوار کانی و سەرچاوەی تێدابن، ئاوی هەر کام لەو کانی و سەرچاوانە، تامێکی جیاواز لەوی دیکەی هەبێ و، گونجاویش بێ لەگەڵ ئەو ئەرکەدا کە پێی سپێردراوە؟! شتی وا نیە.

بەڵام ئەوە کەللە سەری مرۆڤە:

١- ئاوی زاری مرۆڤ شیرینە، پێویستیش بوو شیرین بێ، بۆ ئەوەی ئەو پاروەی دەیجوێ، یارمەتی بدات بیجوێ و پاشانیش بتوانێ قووتی بدات و لە دەمی خۆشی بێ.

٢- فرمێسکی چاو سوێرە، چونکە(چاو) زیاتر لە ماددەیەکی چەوریی و بەز دروست بووە و، دەبێ بەردەوام لە نێوەندێکی سوێردا بێت، بۆ ئەوەی بەکتریا تێیدا گەشە نەکات، تاکو ئەو چاوە و ئەو ماددە چەورییەی کە چاوی لێ دروست بووە، بۆگەن نەکات.

٣- ئاوی نێو (گوێ ) تاڵە، چونکە دەنگەکان دێن و دەڕۆن، ناگونجێ بوەستن، خوا پێڵووی بۆ چاو دروست کردوە، دەتوانی چاو بنووقێنی و دوایی چاوت بکەیەوە و، ئەو دیمەنەی لەبەر چاوە، هەر لەبەر چاوتە، بەڵام دەنگەکان دێن و دەڕۆن، ئنجا لەبەر ئەوەی ناگونجێ گوێ دەروازەی هەبێ و، دەبێ هەموو دەمێ کراوە بێ، ئنجا کە دەبێ هەموو دەمێ کراوە بێ، خوا ماددەیەکی تاڵی لە گوێدا داناوە، هەر زیندەوەرێك بچێتە نێوی، دەیکوژێ.

٤- ئاوی نێو لووت مزرە، لەبەر ئەوەی تۆ زیاتر لە ڕێی لووتەوە هەناسە هەڵدەمژی، بە تایبەتی لە كاتی خەوتندا، ئنجا ئەو ئاوە، ئەو ماددە لینجییەی كە لە نێو لووتدا هەیە، مزرە، تاكو تۆ جاروبار حاڵەتی پژمینت هەبێ و، ئەو ماددە لینجە ئەو تۆز و غوبارو شتانە كە نابێ بچنە نێو سییەكانەوە، دەیانگرێتەوە و، لە ئەنجامی ئەوەدا چڵم پەیدا دەبێ، بۆیە دەبووایە ماددەیەكی بەو شێوەیە لە لووت دا هەبێ.

**یاسای حەوتەم:** جێبەجێ كردنی داخوازیی دروستكراوەكان، بەڵگەی هەبوونی جێبەجێ كارێكە، بەڵگەی هەبوونی بەدەمەوە هاتووییەكە، وەڵام دەرەوەیەكە، بۆ وێنە: مرۆڤ و ژیانداران تێنوویان دەبێ، خوا ئاوی خوڵقاندوە، پێویستییان بە تیشكی خۆرە، خوا تیشكی خۆری خوڵقاندوە، ئارەزووویان بۆ ڤیتامینەكان و، پرۆتین و، كاربۆهیدرات و، كالیسیۆم و هتد دەچێت، خوای میهرەبانیش هەموو ئەوانەی بۆ خوڵقاندوون!.

ئنجا جێبەجێ كردنی داخوازییەكانی دروستكراوەكان، بەڵگەیە لەسەر هەبوونی كەسێك، كە ئەو داخوازییانەی جێبەجێ كردوون، كە خوای بەخشەر و بە بەزەییە.

### ٣- هەنگاوی سێیەم:

دوای ئەوەی بە هۆی پێنج هەستەكان (الحواس الخمس) و، بە هۆی عەقڵەوە، هەنگاوی یەكەم و دووەم نران و، عەقڵ بە هۆی بەڵگە نەویستەكانی خۆی و ئەو زانیارییە جوزئییانەوە، كە لە ڕێی پێنج هەستەكانەوە كۆی كردوونەوە، ئەو یاسایانە - كە ئێمە ئاماژەمان بە حەوتیان دا - ئەو بەڵگە و یاسایانە دروست دەكات لەسەر بوونی خواو، خواناسیی، لێرەدا عەقڵ دەوەستێ و چیدیكە بڕ ناكات: ئایا ئەو خوایە كێیە؟ سیفەتەكانی چین؟ دەبێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بكەین؟ بە چی لێمان ڕازی دەبێ و، بە چی لێمان توورە دەبێ؟ بۆچی ئێمەی هێناوەتە ئێرە؟ لە كوێوە هێناوینی؟ بۆ چی هێناوینی؟ بۆ كوێ دەچین؟ دەبێ

چی بکەین؟ چۆن بکەین؟ ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتییمان، چۆن ڕێکبخەین؟

عەقڵ سەری لەوانە دەرناچێ، مەگەر چەند شتێکی کەمی سادە، بەڵام ئەوەی وەڵامی ڕوون و بێ چەند و چوونی هەموو ئەو پرسیارانەی پێیە، تەنیا وەحییە، بۆیە لێرەوە عەقڵ خۆی تەسلیمی پەیامی خوا (وەحیی)ت، دەکات و وەحیی دەستی عەقڵ دەگرێ و، بە ئەو دیو سروشت (میتافیزیکا) و بە جیهانی پەنهان ئاشنای دەکات.

ئنجا لێرەدا دەڵێین:

وەك چۆن هۆکاریی بە هەڵەدا چوونی هەستگەرایەکان (الحسيُون) و ئەزموونگەرایەکان (التَجربيون) ئەوە بووە کە ویستوویانە: پێنج هەستەوەرەکان لە مەیدانێکدا بەکاربێنن، کە هی ئەوان نیە، هۆی بە هەڵەدا چوونیان ئەوە بوو، بە هەمان شێوەش عەقڵگەرایەکان (العقلانيون)یش، کاتێك ویستوویانە بە عەقڵ لەو دیوی سروشت (ماوراء الطبيعة) تێبگەن! بە هەڵەدا چوون، کە زەقترین نموونەیان فەیلەسووفەکانن، بە تایبەتی یۆنانییەکان کە پێشتر ئاماژەمان پێیاندا.

بەڵێ، فەیلەسووفەکان بەگشتی، عاقڵ بوون و، بیر تیژبوون و، ورد بوون و، دەرکی زۆر شتیان کردوە، کە لە پێش ئەواندا ڕەنگە خەڵك دەرکی بەو شتانە نەکرد بێ، بەڵام کە هاتوونە سەر باسی ئەم گەردوونە، ئایا چۆن پەیدابووە؟! ئەوانەی کە تۆزێ عەقڵیان سەلیم بوو بێ، دانیان بە بەدیهێنەرایەتیی خوادا هێناوە، بە تایبەت هەرسێك فەیلەسووفە گەورەکەی یۆنان (سوکرات) و (ئەفلاطوون) و (ئەرەسطۆ) و قوتابییەکانی دواییان، هەروەها (ئەفلوطین) و زۆری دیکەش لە زانایانی یۆنانی و غەیری یۆنانییش.

بەڵام کە هاتوونە سەر ئەوە کە ئایا: ئەو خوایە (سبحانه وتعالى)، ئەو سەرچاوەیەی کە ئەم گەردوونەی هێناوەتە دی، دەبێ کێ بێ و، چۆن بێ و، چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟! بە هەڵەدا چوون، بۆ وێنە:

www.alibapir.com





(ئەرِەسطۆ) کە رِەنگە لەو دووانەی پێش خۆی: (سوکرِات) و (ئەفلاطوون) یش وردتر بوو بێ و، زیاتر بەرهەمی ئەو بە ئێمە گەیشتوە، کاتێ وێنای خوامان بۆ دەکات، دەڵێ: خوا وەك کەسێك چۆن سەعاتێك قورِمیش دەکا و لێی دەگەرِێ، گەردوونی دروست کردوەو، وەکاری خستوە و بەرهەڵدای کردوە، چونکە خوا لەوە گەورەترە کە بیر لە غەیری خۆی بکاتەوە و، مشوور لە غەیری خۆی بخوات، خوا زۆر بەرز و مەزنە، گوێ ناداتە ئەو وردەکارییانە، کە ئایا مرۆڤ چۆن دەژیێ و چی لێدێ و...هتد؟! ئەوەی لە هەموویان عاقڵتر بووە، ئاوای گوتوە!.

لە کۆتایی ئەم خاڵی چوارەمەش (هەنگاوەکانی ناسینی خوا)دا دەڵێین:

پێویستە بۆ هەر شتێك لە شوێنی خۆیدا و، بە شێوازی خۆی بۆی بگەرِێین: لە نێو جیهانی ماددەو دیاردە سروشتییەکانیدا، بە پێنج هەستەکان دەگەرِێین و، بۆ شتە عەقڵییەکان، بە عەقڵ دەگەرِێین، بەڵام بۆ شتە رِووحییەکان و پەنهانەکان، دەبێ بە چرای وەحیی بۆیان بگەرِێین، ئەگەرنا: بە چرای پێنج هەستەکان و بە چرای عەقڵ {عەقڵیش کەرەستە خاوەکەی، کە لەبەر دەستی دایە، هەر ئەوەیە کە لە رِێی پێنج هەستەکانەوە پێی گەیشتوە}، هەروەها بە چرای خەیاڵ و بە چرای یاسا بەڵگە نەویستەکانیش، کە هەردووکیان لە عەقڵ دا هەن، بەو چرایانە ناتوانین ئەو دیوی ماددە ببینین، چونکە هەر چۆن بێ، پێنج هەستەکان و عەقڵ و خەیاڵەکەی و یاسا بەڵگەنەویستەکان (القوانین البدهیة)ی تەنیا لە بازنە و چوار چێوەی ئەم گەردوون و جیهان و سروشتەدا، دەتوانن بێن و بچن و کار بکەن و، بۆ بازدان بۆ ئەو دیوی سروشت، بۆ بازدان بۆ جیهانی پەنهان و نادیار، مرۆڤ دەبێ پەنا بەرێتە بەر هۆکارێکی دی، دەبێ ئامرازێکی دیکەی پێ بێ، بۆ دیتنی ئەو دیوی سروشت، ئەگەرنا خۆی لە بەرانبەر ئەو دیوی سروشتدا، دەستە پاچەیە.

هەڵبەتە کەسێکیش کە بە شێوازی خۆی و، لە رِێی خۆیەوە و بە ئامرازی خۆی، بۆ شتێك نەگەرِێ، بە دەستی خاڵیی دەگەرِێتەوە، بۆ وێنە: کەسێ بیەوێ: رِووح بە پێنج هەستەکان ببینێ، هیچ نابینێ، نەك رِووح، بەڵکو هیچ

کام لە: هێزی کێشندە، هێزی موگناتیسیی، تیشکی ژێر سوور، تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، نەك هەر ئەوەش، بەڵکو هەموو ئەو چەمکانە: خۆشەویستیی، دادگەریی، جوانیی، ئەو سیفەتانەی کە لە مرۆڤەکاندا هەن و، لە شتەکاندا هەن، هیچ کام لەوانەش نابینیێ، یان هەستیان پێ ناکات، بە پێنج هەستەکانی، بۆیە ناچارە دەبێ پەنا بەرێتە بەر عەقڵ.

کەواتە: ئەو شتانەش کە لە سەرووی عەقڵەوەن و، لە سنووری جیهانی پەنهان دان، دەبێ لە جیهانی خۆیان دا، بۆیان بگەڕێ، ئەگەرنا بە دەستی خاڵیی دەگەڕێتەوە، ئەو کاتەش: (عَدَمُ العِلمِ لا يَستَلزِمُ عِلمَ العَدَمِ)، زانیاریی نەبوون بە شتێك، بەڵگەی نەبوونی ئەو شتە نیە و، نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو شتە بوونی نیە، کوێرێك کە خۆر نابینێ، ئایا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خۆر نیە؟ کەڕێك کە هیچ دەنگێك نابیستێ، بەڵگەیە کە هیچ دەنگێك نیە؟ بە تەئکید نەخێر، ئنجا زانایانی ئیسلام لەو بارەوە، زۆر شتیان گوتوە و، پێشتریش ئاماژەمان بە هەندێك لە زانایان و هەندێك لە کتێبەکانیان کرد، لەو بارەوە بنچینەیەکیان داناوە، دەڵێ:

(إنْ كُنْتَ ناقِلاً فالصحَّةُ أو مُدَّعِياً فالدَّلِيلُ):

واتە: ئەگەر تۆ شتێك نەقڵ دەکەی لە کەسێکەوە، دەبێ سەنەدەکەی ڕاست بێ و، ئەگەر ئیددیعایەك دەکەی، دەبێ بەڵگە بێنیەوە، دیارە ئیددیعایەکەش کە دەیکەی، بە پێی دەعوایەکەت دەبێ بەڵگە بێنیەوە، بۆ وێنە: کە دەڵێی: ئەو ئاوە گەرمە، دەبێ بەڵگەت هەبێ، یان دەڵێی: ئەو شتە بوونی هەیە، دەبێ بەڵگەت هەبێ، دەڵێی: ئەو شتە بوونی نیە، دەبێ بەڵگەت هەبێ، هەر شتە بە پێی خۆی.

بەڕێزان!

ئەوانە سێ ڕێیە گشتییەکەی وەدەستهێنانی زانست بوون و، خوا یار بێ لە خاڵی پێنجەم و کۆتاییش دا دوو ڕێیە تایبەتییەکەی وەدەستهێنانی زانست: خورپە(إلهام) و خەون(رؤيا) دەتوێژینەوە.

www.alibapir.com





## خاڵی پێنجەم: خورپە و خەون، دوو ڕێی تایبەتیی[1] زانست:

هەڵبەتە ئەم دوو ڕێیە تایبەت نین بە ئەهلی ئیسلام و بە مسوڵمانانەوە، چونکە مرۆڤەکان بە گشتیی بەهرەمەندن لەوەی شتیان بخرێتە نێو دڵ، چونکە ئەگەر لەلایەن خواو فریشتەکانەوە، شتی باشیان نەخرێتە نێو دڵ، لەلایەن شەیتانەکانەوە، خوتخوتەو خەیاڵی خراپیان دەخرێتە نێو دڵ، بە دەقی ئایەت، وەك خوا دەفەرمویٚ:

﴿ شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ ﴿١١٢﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: شەیتانەکانی جند و مرۆڤ، هەندێکیان قسەی فریودەرو جوان بۆ هەندێکیان دەنێرن.

هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ ﴿١٢١﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: شەیتانەکان وەحیی دەنێرن بۆ دۆستەکانی خۆیان (کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانن)، تاکو شەڕە قسەتان لەگەڵدا بکەن.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەش بەسەرهاتێکی هەیە[2]:

---

(١) شایانی باسە وشەی (تایبەتیی - خاص) لێرەدا لە بەرانبەر وشەی (گشتیی - عام) دایە، مەبەستمان ئەوەیە کە سیٚ ڕێیەکانی: ١- پێنج هەستەکان(ئەزموونکاریی)، ٢- عەقڵ، ٣- وەحیی، ڕێی گشتیی وەدەستهێنانی زانستن، بۆ هەموو لایەك و، ئەو زانیاریی و زانستەی لەو سیٚ ڕێیەوە دەستگیر دەبیٚ، دەگونجیٚ بگوازرێتەوە بۆ خەڵکی بە گشتیی، بەڵام ئەوەی لە ڕێی ئیلهام و خەونەوە دەستگیر دەبیٚ، ئەزموونێکی شەخسیی و تایبەتییە و، ناگونجیٚ بدرێتە خەڵکی دیکە، مەگەر بۆیان بگێڕرێتەوە.

(٢) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٢ ص١٥٥، أخرجه أبوداود: ٢٨١٩، والترمذي: ٣٠٦٩، والطبراني في الكبير: ١٢٢٩٥ وغيرهم، وهو صحيح لغيره.

جوولەکە و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە مسوڵمانانیان دەگوت: ئەو ئاژەڵەی کە خۆتان سەری دەبڕن، گۆشتەکەی بە حەڵاڵ دەزانن، بەڵام ئەوەی خوا دەیمرێنێ (مردار)، بە حەڵاڵی نازانن، ئنجا خوا عزوجل دەفەرموێ: ئەوە شەیتانەکان ئەو بەڵگەیان فێری هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان کردوە، کە بەڵگەیەکی بێ بنەمایە، چونکە ئەوەش کە مرۆڤ سەری دەبڕێ، هەر بە مۆڵەتی خوا ژیان لە جەستەی دەچێتە دەرێ، بەڵام ئەوەی کە مردار دەبێ، خوێنەکە هەر لە لاشەی دایە، بۆیە خوا قەدەغەی کردوە، چونکە زیانی لێ دەدات و، لەبەر ئەوە کە زیان بەخشە، قەدەغەیە، بەڵام ئەوی دیکە، خوێنەکەی لێ دەچێتە دەر و، ئەوەی کە زیان بەخشە بۆ مرۆڤ، لە لاشەی ئاژەڵە سەربڕاوەکە چۆتە دەرێ.

هەروەها بەنسبەت خەونیشەوە کە مرۆڤەکان دەگونجێ بە گشتیی لێی بەهرەمەند بن، چ مسوڵمان بن، چ نامسوڵمان، وێڕای واقیع، بەڵگەی نەقڵییش هەن، کە دوایی ئاماژەیەکیان پێ دەکەین.

ئێستاش با لە سێ (بەند)ان دا، باسی ئەو دوو ڕێیە تایبەتییەی وەدەستهێنانی زانست: (خورپە و خەون) بکەین:

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## بەندی یەکەم: پێناسەی ئیلهام و خەون:



**یەکەم:** پێناسەی: خورپە (الإلهام) و پێنج وشەی دیکەی واتا نیزیکیی:

وشەی (إلهام) کە بە کوردیی(خورپە) و (خرانە نێو دڵ)ی، پێدەگوترێ چەند وشەیەکی دیکەی واتا نیزیکیشی هەن، کە هەندێك لە زانایان بە هاوواتا (مُرادِف)یانی دەزانن، ئنجا ئێمە سەروتیشك دەخەینە سەر چەمك و واتای هەر کام لە (إلهام) و هەر پێنج وشەکەی دیکەش: (١- الحَدْس، ٢- الکشف، ٣- الذوق، ٤- البصیرة، ٥- العلم اللَّدنِّي):

**١- (الإِلْهَــــام):** (هُوَ النفْثُ فِي الرُّوعِ، وَالإِيْقَاع فِي القَلْبِ مِنَ العِلْمِ، غَيْرُ القَائِمِ عَلَى الإِسْتِدْلاَلِ وَالنَّظَر)[١]، واتە: (إِلْهَام) بریتیە لەوەی کە شتێکت بخرێتە نێو دڵ، بخرێتە نێو هۆش، زانیارییەك کە لەسەر بەڵگە هێنانەوە بنیات نەنرابێ.

**٢- (الحَــدْس):** (سُرْعَةُ انْتِقَالِ الذِّهْنِ مِنَ المَبَادِي و إِلى المَطَالِب)[٢]، واتە: (حَدْس) بریتیە لەوە کە بە خێرایی زەین لە سەرەتایەکانەوە بچێ بۆ ئەو شتانەی کە بە دوایاندا دەگەڕێ.

**٣- (الکَشْــف):** (هُوَ الإطِّلاعُ عَلَى مَا وَرَاءَ الحِجَابِ، مِنَ المَعَانِي الغَيْبِيَّةِ وَالأُمُور الحَقِيقِيَّةِ، وَجُوداً أَو شُهُوداً)[٣]، واتە: (کَشْف): بریتیە لە ئاگادار بوون لەو شتانەی کە لە پشت پەردەوەن، لە مانا نادیارەکان و لە کاروبارە ڕاستەقینەکان، وەك بوونیان، یان بینینیان.

**٤- (الــذَوْقُ):** (هُوَ نُورٌ عِرْفَانِيٌ يَقْذِفُهُ الحَقُّ بِتَجَلّيهِ فِي قُلُوبِ أَولِيَائِهِ، يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الحَقِّ وَالبَاطِلِ، مِنْ غَيرِ أَنْ يَنْقُلوا ذَلِكَ مِنْ كِتَاب)[٤]، واتە: (ذَوْق) بریتیە لە

---

(١) مُعجَم مصطلحات الصوفية، ص٢٣.

(٢) التعريفات، للجرجاني، ص٨٣.

(٣) التعريفات، ص٨٣.

(٤) التعريفات، ص١٧.

www.alibapir.com



ڕووناکییەکی زانستیی کە خوا دەیدرەوشێنێتەوە و دەیخاتە نێو دڵی دۆستەکانی خۆی، کە هەق و ناهەقی پێ لێك جیا دەکەنەوە، بەبێ ئەوەی کە لە کتێبێکەوە نەقڵی بکەن.

٥- **(البَصِيرَة)**: (هِيَ المَلَكَةُ الَّتِي تَرَى حَقَائِقَ الأَشْيَاءِ، وَ بَوَاطِنَهَا، كَمَا يَرَى البَصَرُ ظَوَاهِرَ الأَشْيَاءِ المَادِيَةِ)[1]، واتە: (بَصِيرَة) بریتیە لەو هێزەی کە ڕاستیی شتەکان دەبینێ و، دیوی پەنهانیان دەبینێ، وەك چۆن چاو ڕواڵەتی شتە مادییەکان دەبینێ.

٦- **(العِلمُ اللَّدُنِّي)**: واتە: زانیارییەك کە خوا بە تایبەت داویەتی، وەك لە سووڕەتی (الكَهف)دا هاتوە، خوا دەفەرموێ:

﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾﴾.

واتە: (مووسا و غوڵامەکەی)بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان بینی، کە لەلای خۆمانەوە بەزەییەکی تایبەتمان پێدا بوو و زانیارییەکی تایبەتمان فێرکرد بوو.

**دووەم:** پێناسەی خەون (الرؤيا):

ئاشکرایە خەون: ئەوەیە کە ئینسان لە کاتی خەوتندا دەیبینێ، یان دەیبیستێ، یان پەی پێ دەبات بە شێوەیەك لە شێوەکان.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) مُعجَم مصطلحات الصوفية، ص٢٣.

www.alibapir.com







## بەندی دووەم: بەڵگەكانی ئیعتیبارپێكردنی خورپە:

بەڵگە لەو بارەوە زۆرن، بەڵام ئێمە سێیان بە نموونە دێنینەوە:

١- ئەم ئایەتە موبارەكە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأنفال.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر پارێز لە خوا بكەن، جیاكەرەوە (فُرقان)تان پێ دەبەخشێ.

لە پێناسەی (فُرقان)یش دا، گوتراوە: (آلةٌ يُفْرَقُ بِهَا بين الحَقِّ وَالبَاطِل)، واتە: ئامرازێكە هەق و ناهەق، (یان حەڵاڵ و حەرام، یان چاك و خراپ، یان ڕاست و چەوت)ی، پێ لێك جیادەكرێنەوە.

٢- ئەو ئایەتە موبارەكەی كە پێشتر هێنامان: ﴿ فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ﴿٦٥﴾ ﴾ الكهف.

واتە: بەندەیەكمانیان لێهەڵكەوت، كە لەلایەن خۆمانەوە، بە تایبەت زانیارییمان فێر كرد بوو.

كەواتە: زانیارییەكی تایبەت هەیە، كە دەگونجێ مرۆڤ فێری ببێ لە خواوە (سبحانه وتعالى).

٣- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە دەفەرموێ: {«قَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهُمْ»، قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: تَفْسِيرُ مُحَدَّثُونَ: مُلْهَمُونَ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٣٥٧)، عَنْ عَائِشَةَ).

www.alibapir.com





واتە: لە كۆمەڵگاكانی پێش ئێوەدا كەسانێك هەبوون دەدوێنران، (یاخود شتیان دەخرایە نێو دڵ)، ئنجا ئەگەر كەسێك لە ئۆممەتی من هەبێ، عومەری كوڕی خەتتابە.

(مُحَدَّث) یانی: (مُلْهَم) خورپە بۆ كراو، كەسێك كە خوا ڕاستەوخۆ زانیارییەكی دەخاتە نێو دڵەوە.

(إبن حجر العسقلاني) لە بارەی متمانە كردنەوە بە ئیلهام، دەڵێ: (فَثَبتَ بهذا: أنَّ الإلهامَ حَقٌّ، وإنَّهُ وحيٌ باطنٌ، وإنـمـا حُرِمَهُ العاصي لاستيلاءِ وحي الشيطانِ عَلَيهِ)[1].

دوای چەند قسەیەك دەڵێ: بەمەی كە گوتمان چەسپا كە ئیلهام هەقە و، بریتیە لە سروش و ئاگادار كردنەوەیەكی دەروونیی، وەحییەكی دەروونیی، بابای گوناهباریش بۆیە لێی بێ بەشە، چونكە وەسوەسە و وەحیی شەیتان بەسەریدا زاڵ بووە.

هەروەها گوتوویەتی: (وَالَّذِي عَلَيْهِ الجُمهُورُ أنَّهُ: لاَ يَجُوزُ العَمَلُ بِهِ "أي: بالإِلْهَامِ" إلاَّ عِنْدَ فَقد الحُجَجِ كُلّها مِن باب المُباح)[2]. واتە: ئەوەی كە زۆربەی زانایانی لەسەرینی، ئەوەیە: كە دروست نیە كار بە ئیلهام بكرێ، مەگەر هیچ كام لە بەڵگەكان نەبن (وەك: قوڕئان و سوننەت و ئیجماع و قیاس)، ئنجا لە بازنەی موباحیشدا بێ، ئەو كاتە دەگونجێ كاری پێ بكرێ.

هەروەها (إبن حجر)، دەڵێ: (قَد يكونُ مِنَ اللهِ، وقَد يكونُ مِنَ الشيطانِ، وَقَد يَكونُ مِنَ النَّفْس)[3]، واتە: خورپە (إلهام) ئەوەی كە دەخرێتە نێو دڵ، دەگونجێ لە خواوە بێ و، دەگونجێ لە شەیتانەوە بێ، (كە ئەو كاتە پێی دەگوترێ: وەسوەسە)، دەشگونجێ لە نەفسەوە بێ.

(إبن السمعاني) وردتر باس دەكات، كە (إبن حجر) قسەكانی ویش نەقڵ دەكات:

---

(١) فَتحُ الباري، ج١٤، ص٤١٧.

(٢) هەمان بەرگ و لاپەڕەی پێشوو.

(٣) هەمان سەرچاوە.

(وإنكارُ الإلهامُ مَردُودٌ، ولكن التمييزَ بينَ الحَقِّ وَالباطِل في ذلكَ أنَّ: كل ما استقامَ على الشَّرِيعَةِ المُحَمَّديةِ، ولَم يكن في الكِتابِ والسُنةِ، ما يَردُّهُ، فهو مقبولٌ، وإلاّ فَمَردُودٌ، يَقَعُ مِن حَديثِ نَفسِهِ، وَوسوسَةِ الشيطانِ ... ولا نَزْعُم أنه حجة شرعية، وإنّما هو نور يختصُّ الله به من يشاء من عباده، فَإِنْ وَافَقَ الشَّرْع، كَانَ الشرع هُوَ الحُجَّة)[١].

واتە: نکوولّیی کردن لە (إلهام) شتێکی ڕەتکراوەیە، بەڵام هەق و ناهەق لێك جیاکردنەوە لە بواری ئیلهامدا ئەوەیە کە: هەرچی لەگەڵ شەریعەتی موحەممەدییدا بگونجێ (ئەو شەریعەتەی موحەممەد هێناویەتی) و، لە قورئان و سوننەتدا شتێك نەبێ ڕەتی بکاتەوە، ئەوە پەسندە، ئەگەرنا ناپەسندە و، یان لە دەروونی خۆیەوە هەڵقولاوە، یاخود لە وەسوەسەی شەیتانەوەیە، پێشمان وا نیە کە ئیلهام بەڵگەی شەرعییە، بەڵکو ڕۆشناییەکە خوا دەیدات بە هەرکەس لە بەندەکانی کەبیەوێ و، ئەگەر بە پێی شەرع بوو، ئەو کاتە شەرع بەڵگەیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) فَتحُ الباري، ج١٤، ص٤١٨.

www.alibapir.com





## بەندی سێیەم: بەڵگەکانی ئیعتیبارپێکردنی خەون[1]:

بە نسبەت خەونیشەوە خوا (سبحانه وتعالى) لە زۆر ئایەتاندا ئاماژەی پێداوە، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (الفتح)دا، دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۝٢٧﴾.

واتە: بەدڵنیاییی خوا خەونی پێغەمبەرەکەی خۆی هێنایە دی.

٢- هەروەها لە سوورەتی (الصافات)دا، کە ئیبراهیم خەون دەبینێ بە ئیسماعیلی کوڕیەوە، دەفەرموێ: ﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۝١٠٢﴾.

واتە: (ئیبراهیم) گوتی: ئەی کوڕیژگەم! من لە خەونمدا دەمبینی کە تۆم سەردەبڕی، بزانە داخۆ چی دەڵێی؟!

٣- هەروەها لە سوورەتی (یوسف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّى رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ ۝٤﴾.

واتە: ئەی بابە! من لە خەونمدا مانگ و خۆرو یازدە ئەستێرەم دەبینین: کڕنووشیان بۆ دەبردم.

٤- هەروەها خەونی پادشای میسر، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۝٤٣﴾ یوسف.

---

(١) ستایش بۆ خوا ئێمە لە بەرگی یازدە (١١)ی (تەفسیری قورئانی بەرز و بە پێز)دا، کە تەرخانکراوە بۆ تەفسیری سوورەتی (یوسف) باسێکی تێر و تەسەلمان لە بارەی خەونەوە کردوە.

www.alibapir.com



واتە: پادشا گوتی: من لە خەودا دیتم كە: حەوت ڕەشە وڵاخی لەڕ، حەوتی قەڵەویان دەخواردن و، حەوت گوڵە دانەوێڵەی وشك، حەوتی سەوزیان دەخواردن.

٥- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش، فەرموویەتی: {إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ}، (أَخْرَجَهُ البَزَّار برقم: (٢٨٠٥) وَغَيْرِه)، واتە: بێگومان لە موژدەدەرەكان و دڵخۆشكەرەكانی پێغەمبەرایەتیی، تەنیا خەونی باش ماوە.

٦- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ}، (أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٠٤٦٠)، وَأَحْمَد برقم: (١٢٠٥٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٥٩٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٤)، وَالتِّرمِذِيّ فِي "الشمائل" برقم: (٤١٥)، عَنْ أَنَسٍ).

واتە: خەونی ئیماندار بەشێكە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی.

٧- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەونمان بۆ پۆلێن دەكات بۆ سێ جۆر: {... والرُّؤْيَا ثَلاَثٌ: فَالرُّؤْيَا الصَّالِحَةِ بُشْرَى من الله، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَرُؤْيَا مِما يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسَهُ}، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٥٩٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٠١٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٧٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ).

واتە: خەون سێ جۆرە: خەونێك كە لە خواوەیە، ئەوە ڕێك و ڕاست دێتە دی، هەروەها خەونێكی دڵ تەنگكەر كە ئەوە لە شەیتانەوەیە، جۆرە خەونێكیش ئەوەیە كە مرۆڤ لە كاتی بێدارییدا بە خەیاڵیدا دێ، (لە خەونیش دا دەیبینێتەوە).

كەواتە: بە پێی ئەو ئایەت و فەرموودانە، خەونی ڕاست و چاك، متمانەی پێدەكرێ، ئنجا با لەو بارەوە ئەو قسەیەی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، ببێنین، كە دەڵێ: {رُؤْيَا الأَنْبِيَاءِ وَحْيٌ}، (أخرجه البخاري برقم: (٨٢١))، واتە: خەونی پێغەمبەران وەحییە.

بەڵام بێگومان خەونی غەیری پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە وەحیی دانانرێ و، تەنیا بە دڵخۆشكەر (مُبشِّرة) دادەنرێ و، لە ئاستی خورپە (إِلهام) دایە.

(وَيُؤْخَذُ مِنَ هَذَا، مَا تَقَدَّم التَّنْبيه عَلَيْهِ: أَنَّ النَّائِمَ لَوْ رَأَى النَّبيّ (صلى الله عليه وسلم) يَأمرهُ بشيءٍ، هَلْ يَجِبُ عَلَيْهِ امْتِثَالُهُ، وَلاَ بُدّ، أَوْ لاَ بُدّ أَنْ يَعْرِضُهُ عَلَى الشَّرْعِ الظَّاهِر؟ فَالثَّانِي هُوَ المعْتَمد)[1].

(پێشیٚ باسی خەون دەكات، دوایی دەڵێ:) لەوەوە كە ڕابردو، لەبارەیەوە ئاگادارییمان پێشكەش كرد، وەردەگیرێ كە بابای نوستوو، ئەگەر لە خەونیدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی بینی، فەرمانی بە شتێك پێ دەكرد، ئایا دەبێ فەرمانەكەی جێ بەجێ بكات بە حەتمیی، یان دەبێ ئەوەی كە لە خەوندا بینیویەتی (لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی بیستوە) ڕاینوێنێ لەسەر شەرع، داخۆ لەگەڵی دەگونجێ یان نا؟! دووەمیان ڕاستە.

یانی: مرۆڤی مسوڵمان هەر كات خەونێكی شایستەی دی، دەبێ ڕاینوێنێ لەسەر شەرع، ئەگەر لەگەڵی گونجا، ئنجا جێ بەجێی بكات، ئەگەرنا ئیعتیباری پێ ناكرێ، چونكە دەگونجێ ئەو كەسە بە هەڵدا چووبێ و، بە شێوەیەك لە شێوەكان لێی تێكەڵ بوو بێ، تەنانەت بینینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش، ئەوە ڕای زۆربەی زانایانە[2].

لێرەشدا كۆتاییمان هێنا بە باسی حەوتەم و، كۆتاییشمان بە بەشی یەكەم هێنا لە پێنج بەشەكەی بابەتی فراوانی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد).




---

(١) فَتحُ الباري، ج١٤، ص٤١٨.

(٢) هەرچەندە زۆر بە دووری دەزانم، خەونێك بە پێغەمبەری خوا (محمد)ەوە (صلى الله عليه وسلم) ببینرێ، شتی هەڵە و ناشەرعیی تێكەڵ ببێ.



## بـــەرایی

سەرەتا دەڵێین: بەڵگەکانی ئیسپاتی بوونی خوا، ناژمێردرێن و لە ژمارە نایەن، ئەم قسەیەش لە چوار خاڵدا ڕوون دەکەینەوە، کە چۆن بەڵگەکانی ئیسپاتی بوونی خوا (سبحانه وتعالى) لە ژمارە نایەن و، ناگونجێ هەموویان سەرژمێر بکرێن؟

**یەك:** وەك دواتر باسی دەکەین، هەر دروستکراو (مخلوق)ێك، بۆ پەیدابوونی پەکی لەسەر بەدیهێنەر (خالق) کەوتوە، واتە: هیچ شتێك کە پەیدا کرابێ و دروستکرابێ، بەبێ بەدیهێنەرو دروستکەر، ناگونجێ پەیدا بووبێ، هیچ شتێك لە خۆوە پەیدا نابێ.

ئنجا لەبەر ئەوەی کە دروستکراوەکان لە ژمارە نایەن و ناژمێردرێن و، هەر کامێکیشیان بەڵگەیە لەسەر بوونی خوای بەدیهێنەر، کەواتە: بەڵگەکانی بوونی خوا، نەژمێردراون.

شایانی باسە، ژمارەی سەرجەم تەنۆلکەکان (جُسَیمات)ی گەردوون، هەر گەردیلەیەك لە سێ بەشی سەرەکیی پێك دێ: (ئەلیکترۆن، پرۆتۆن، نیوترۆن)، ئنجا زانایانی فیزیا دەڵێن:

تەنۆلکەکانی گەردوون هەموویان، بە دە توان هەشتا (١٠ ^٨٠) مەزەندە دەکرێن، واتە: ژمارە: یەك(١) هەشتا(٨٠) سفری لە پێشەوە بێت، واتە: سەد ملیۆن تریلیۆن تریلیۆن تریلیۆن تریلیۆن تریلیۆن تریلیۆن!

(١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠
٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)

www.alibapir.com



هەڵبەتە زانایانی فیزیا بە مەزەندە وا دەڵێن، ڕەنگە هەندێکیشیان هەبێ بڵێن: نەخێر، دە توان سەدە ($10^{100}$)، یان یەکێکی دیکەیان بڵێ: دە توان حەفتایە ($10^{70}$)، یان لە هەندێ سەرچاواندا دەڵێ: نەك ژمارەی تەنۆلکەکانی گەردوون بەوەندە مەزەندە دەکرێ، بەڵکو ئەوە ژمارەی گەردیلەکانە، چونکە گەردیلە(ذرة) سێ پێکهاتەی سەرەکیی هەن، ئەگەرنا وەك دوایی باسی دەکەین، پێکهاتەی دیکەشی هەن، بەهەرحاڵ ڕاجیایی لەو مەسەلانەدا دەبێ.

گرنگ ئەوەیە کە بەلای کەمەوە، ئەوەندە دانراوە، کە ژمارەی تەنۆلکەکانی گەردوون، ئەگەر ژمارەی گەردیلەکانیش نەبێ، بە دە توان هەشتا ($10^{80}$) مەزەندە دەکرێ.

ئنجا سەرجەم پێکهاتەکانی ئەو تەنۆلکانەش، واتە: ئەو شتانەی کە ئەو تەنۆلکانە پێکیان دێنن، لە گەردیلە، گەرد، دوایی پێکهاتەکانی دیکە، تا دوایی، ئەوانیش هەر خوا (سبحانه وتعالى) ژمارەیان دەزانێ.

ئەمە لە زۆر لە سەرچاوەکاندا باس کراوە[1].

**دوو:** تێکڕای دروستکراوەکان سیستماتیك (مُنَظم)ن و، یاسادار(مُقَنّن)ن، ئنجا دیارە سیستم و یاساش پەکی لەسەر ڕێکخەرو یاسادانەر کەوتوە و، هەرگیز ڕێك و پێکیی بەبێ ڕێکخەر و، یاسا بەبێ یاسادانەر و، دیزاین بەبێ دیزاینەر، ناگونجێ پەیدا ببن.

ئنجا پێویستە بگوترێ: کە سەرجەم ئەو بەڵگە لە ژمارە نەهاتووانە، لە فەرموودەی خوادا لەسەر زمانی مووسا (علیه السلام) باسکراون، کە وەڵامی فیرعەون دەداتەوە، کاتێ فیرعەون لێی دەپرسێ:

---

(١) بۆ وێنە کتێبەکەی: (Sir Antony Flew) بەناوی: (There is a God)، واتە خوایەك هەیە، کە (عمرو شریف) وەری گێڕاوە بە ناوونیشانی (رحلة عقل) ص٨٢)، هەڵبەتە تەرجەمەی کوردیش کراوە بە ناوونیشانی: (گەشتی عەقڵ)، هەروەها (شموع النهار)ی: (عبدالله بن صالح العُجَیری)، ص١٩٤.

www.alibapir.com





﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾﴾ طه.

واتە: (فیرعەون) گوتی: پەروەردگاری ئێوە کێیە ئەی موسا؟

﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾﴾ طه.

(مووسا (علیه السلام)) فەرمووی: پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە، کە بوونی بە هەموو شتێك داوە، دوایی ڕێنماییشی کردوە، (ڕێکی خستوە و وای لێ کردوە، کە بەڕێوە بچێت).

ئەمە هەردووك یاسایەکەی ئاماژە پێداون، هەم یاسای هۆکاریی: (پەیداکراو بەبێ پەیداکەر نابێ)، هەم: یاسای سیستم (النظام): (ڕێکخراو، بەبێ ڕێکخەرێك نابێ)، هەردووکیان ئاماژەیان پێدراوە، لەو دوو ئایەتە موبارەکەدا.

**سێ:** هەر کام لە عەقڵ و فیطرەت و وەحیی، بە چەندان جۆر شایەدیی لەسەر بوونی خوا دەدەن، وەك دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

**چوار:** پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، کە فەرموویانە: ئایا لە(بوونی)خوادا دوو دڵیی هەیە؟! وەك لە سوورەتی (إبراهیم)دا هاتوە:

﴿قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ﴿١٠﴾﴾.

واتە: پێغەمبەرەکانیان فەرموویان: ئایا لە بوونی خوادا دوو دڵیی هەیە، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی؟!

ئەمە پرسیار کردنێکی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: ناگونجێ لە بوونی خوادا گومان و دوو دڵیی هەبێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پێچەوانەی خوارسك و عەقڵی ساغ و سەلیمە، نکووڵیی لە بوونی خوا بکرێ و، بوونی خوا یەکێکە لە شتە ڕوون و بێ چەندو چوون و بەڵگە نەویستەکان، بۆیە خوا لە سوورەتی (إبراهیم)دا لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە وەڵامی نەیارەکانیاندا، کە تۆمەتباریان دەکەن، بەوەی کە ئێوە لەلایەن خواوە ڕەوان نەکراون و، پێیان دەڵێن: بڕوامان بەوە نیە کە ئێوە هێناوتانە، ئەوانیش دەڵێن:

www.alibapir.com







﴿أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ۝١٠﴾.

واتە: ئایا لە بوونی خوادا، لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی خوادا، لە پەرستراوێتیی خوادا گومان و دوودڵیی هەیە؟!

واتە: عەقڵی سەلیم و فیطرەت و خوارِسکی ساغ و سەلیم، دەزانێ کە ئەوە شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە.

ئنجا لە سەرەتای سوورەتی (العلق)دا، کە یەکەمین پێنج ئایەتێك بوون خوای زانا دایبەزاندوون، خوا (سبحانە وتعالی)، ئاوا دەست پێ دەکات:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ۝٥﴾ العلق.

ئنجا کە خوا (سبحانە وتعالی) دوای: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ (بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە)، یەکسەر دەفەرموێ: بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەت کە (هەموو شتێکی) وەدیهێناوە، مرۆڤی لە خوێنپارە دروستکردوە، بخوێنە و پەروەردگاریشت هەرە بەخشندەیە، ئەو کەسەی بە قەڵەم (زانیاریی) فێر(ی مرۆڤ) کردوە، ئەوەی کە نەیدەزانی فێری کردوە.

ئنجا بێگومان: ئەگەر پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) و، ئەو مرۆڤایەتییەی کە پێغەمبەر محمد (صلی الله علیه وسلم) وەك کۆتا پێغەمبەرو نوێنەرو ڕەوانەکراوی خوا بۆ لای دەنێردرێ، پێویستیی بە ئیسپاتی بوونی خوای پەروەردگار ببووایە، دیارە خوا (سبحانە وتعالی) بە بەڵگە هێنانەوە لەسەر بوونی خۆی، دەستی پێ دەکرد، بەڵام خوا (سبحانە وتعالی) کە خۆی مرۆڤەکانی خوڵقاندوون، دەزانێ کە بوونی خوا و، خواناسیی، شتێکە لە عەقڵی هەموو مرۆڤەکاندا دانراوە و، لە فیطرەت و زگماکیاندا جێگیر کراوە، بۆیە بەوە دەست پێدەکات، دەفەرموێ: بخوێنە بە ناوی پەروەردگارت، نەك (جیبریل) بفەرموێ: بۆ زانیارییت! من لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووم و، پەروەردگاری تۆ بوونی هەیە.

www.alibapir.com





دیارە پێشتریش ئەم قسەیەمان لە (إبن قيم الجوزية)ەوە هێنا، کە قسەیەکی زۆر نەستەق و بە پێزە، لە کتێبی (المدارج السالکين)دا، دەڵێ:

(وَتَأَمَّلْ حَالَ العَالَمِ كُلِّهِ، عُلويِّهِ وَسُفليِّهِ بجَمِيعِ أَجْزَائِهِ، تَجِدْهُ شَاهِدَاً بِإِثْبَاتِ صَانِعِهِ، وَفَاطِرِهِ، وَمَلِكِهِ، فَإِنْكَار صَانِعُهُ وَجَحْدُهُ فِي العُقُولِ، وَالفِطرِ، بِمَنْزِلة إِنْكَارِ العِلْمِ وَجَحْدِهِ، وَلاَ فَرْقَ بَيْنَهُمَا)[١].

واتە: سەرنجی هەموو گەردوون بدە، بە سەرووییەوەو بە خوارووییەوە و، بە هەموو پێکهاتەکانیەوە، دەیبینی کە شایەدیی دەدات لەسەر ئیسپاتی بەدیهێنەرو پەیداکەرەکەی و خاوەنەکەی، بۆیە نکوولێیکردن لە دروستکەرو بەدیهێنەری گەردوون و، دان پێنەهێنانی لە عەقڵەکاندا و، لە خوارِسك و زگماکەکاندا، وەك نکوولێیکردنە لە هەر زانیارییەك، (زانیارییەك کە جێی دڵنیایی بێ)، هیچ جیاوازییان نیە.

بەڵکو لە ڕاستیی دا - وەك پێشتریش گوتمان - بڕوابوون بە خوا (سبحانە وتعالى) و، خواناسیی، بناغەو سەرچاوەی هەموو زانستەکانە و، بەبێ دانهێنان بەو ڕاستییەدا، هیچ شتێك جێی خۆی ناگرێ و، هیچ زانیارییەك جێگای متمانە نابێ.

بۆیەش هەندێك لە زانا ڕۆژئاوایی و ئەوڕووپاییەکان - یەکێ لەوانە (دیکارت)[٢] - گوتوویانە: ئێمە بەوە دەزانین ئەم گەردوونە هەیە، کە خوا دەفەرموێ: هەیە! ئەگەرنا کێ دەڵێ: ئەم گەردوونە خەون و خەیاڵ نیە، بەڵام مادام خوای خاوەنی ئەم گەردوونە، دەفەرموێ: حەقیقەتی هەیە و ئێوە هەن، ئێمە لەوەوە دڵنیاین کە خۆمان و گەردوون و دەوروبەرمان بوونیان هەیە.

---

(١) ج١، ص٢٩٧.

(٢) دیکارت، رینیە: ١٥٩٦-١٦٥٠م، فيلسوف ورياضيٌّ وفيزيائيٌّ فرنسيٌّ، (الموسوعة الميسَّرة)، ص ٢٣٥.

www.alibapir.com







## باسی یەکەم



# زگماك (فطرة) شایەدی بوونی خوایە

## دەستپێك

بەڕێـــــزان!

ئەم باسە لە حەوت بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەك:** پێناسەی (فطرة)، زگماك، خواڕسك.

**بڕگەی دوو:** چوار هەست و سیفەتە ڕووحییە بنەڕەتییە خواڕسکەکانی مرۆڤ.

**بڕگەی سێ:** نیشانەو تایبەتمەندییەکانی هەستە ڕووحییە خواڕسکەکان.

**بڕگەی چوار:** ڕیشەکانی خواڕسك بوونی خواناسیی لە مرۆڤدا.

**بڕگەی پێنج:** پەرچەکانی ڕێی فیطرەت لە بواری خواناسیی دا.

**بڕگەی شەش:** چۆنیەتی مشت وماڵکرانی دڵ و دەروونی مرۆڤ و، لاچوونی ژەنگ و ژارەکەی.

**بڕگەی حەوت:** چەند قسەیەکی نەستەقی هەندێ لە زانایان لە بارەی شایەدیی دانی خواڕسك (فطرة)ەوە، لەسەر بوونی خوا.

www.alibapir.com



## برگەی یەك: پێناسەی (فطرة)، زگماك، خوارسك:

وەك پێشتریش گوتمان: وشەی (فطرة) وشەیەكی عەرەبییە و، لە كوردییدا هەم وشەی زگماكی بۆ بەكاردێ، هەم خوارسكی بۆ بەكاردێ، وشەی (فطرة) یش لە فەرهەنگەكانی زمانی عەرەبییدا، بەم جۆرە مانا كراوە:

١- (راغب الأصفهاني)، گوتوویەتی: (أَصْلُ الفَطْرِ: الشَقّ طُوْلاً، يُقَالُ: فَطَرَ فُلَانٌ كَذَا فَطْرَاً، وَفَطَرَ اللهُ الخَلْقَ، وَهُوَ إِيْجَادُهُ الشيءَ وَإِبْدَاعُهُ عَلَى هَيْئَةٍ مُتَرَشِّحَةٍ لِفعلٍ مِنَ الأَفْعَال، فَقَولُهُ تَعَالَى: ﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَا﴾ الروم(٣٠)، إِشَارَةٌ مِنْهُ تَعَالى إِلى مَا فَطَرَ، أَي: أَبْدَعَ وَرَكَّزَ فِي النَّاسِ مِنْ مَعْرِفَتِهِ تَعَالى، وَفِطْرَةُ الله: هِيَ مَا رَكَّزَ فِيهِ مِنْ قُوَّتِهِ عَلَى مَعْرِفَةِ الإِيْمَانِ)[1].

واتە: (الفَطر) لە ئەسڵی زماندا بە مانای لەتكردنی شتێك بە باری درێژییدا، دەگوترێ: (فَطَرَ فُلَانٌ كَذَا فَطْرَاً)، فڵانكەس فڵان شتەی شەق كرد، (فَطرَ اللهُ الخَلْقَ)، ئەوە كە خوا دروستكراوەكانی (فَطر) كردوون، بریتیە لە دروستكردنیان و، داهێنانیان بە شێوەیەك، كە بگونجێ كارێكیان پێ بكرێت.

{بۆ وێنە: خوا خۆری بە جۆرێك دروستكردوە، كە ئەو ئەركەی پێ سپێردراوە، ئەنجامی بدا، هەروەها زەوی و مانگ و باو و باران و هەموو دروستكراوەكان}، بۆیە كە خوا دەفەرموێ:

﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَا﴾ الروم(٣٠).

(ئەو خوارسكەی خەڵكی لەسەر سروشتاندوە)، ئاماژەیە لە خوای بەرزەوە بۆ ئەوە كە خەڵكی وەدی هێناوە و پاشان ناسینی خوای بەرزی لە دڵ و دەروونیاندا داناوە، (فَطرَه الله)ش، بریتیە لەوەی كە خوا هێزی ناسینی ئیمان و، خواناسیی لە مرڤەكاندا داناوە.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٣٩٩،ط٢٠١٢م، المكتبة العصرية.

www.alibapir.com



٢- خاوەنی (المعجم الوسيط)یش، گوتوویەتی: (الفِطْرَةُ: الخِلْقَةُ الَّتِي يَكُونُ عَلَيْهَا كُلّ مَوجُودٍ أَوَّلَ خَلْقِهِ، وَالطَّبِيعَةُ السلِيمَةُ لَمْ تُشَبْ بِمَعِيبٍ وَفِي التَّنْزِيلِ العَزِيز: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾ الروم(٣٠)، وَالفِطْرَةُ السَّلِيمَةُ فِي إِصْطلاحِ الفَلاَسِفَةِ: إِسْتِعْدَاد لإِصَابَةِ الحُكْمِ وَالتمِييز بَيْنَ الحَقِّ وَالبَاطِل)[1].

واتە: (فِطرَة) بریتیە لەو حاڵەتەی کە هەر دروستکراوێك لە سەرەتاوە لەسەری دروستکراوە و، بریتیە لەو سروشتە ساغەی کە کەم و کوڕیی تێکەڵ نەبووە، ئنجا لە دابەزێنراوی خوای زاڵدا، کە دەفەرموێ:

﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾ الروم(٣٠).

واتە: ئەو سروشتەی کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، هەروەها فیطرەتی سەلیم، خوارسکی ساغ لە زاراوی فەیلەسووفەکاندا، بریتیە لەو ئامادەییەی کە مرۆڤ هەیەتی بۆ ئەوەی هەق و ناهەق لێك جیابکاتەوە و هەق بپێکێ.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) المعجم الوسيط، ص ١٩٤.

## بڕگەی دوو: چوار هەست و سیفەتە ڕووحییە بنەڕەتییە خوارِسکەکانی مرۆڤ:

زانایانی دەروونناس، دەڵێن: هەموو مرۆڤێك چوار هەستی ڕووحیی خوارِسکی هەن، کە لەگەڵ سروشتیدا تێك هەڵشێلراون، هەر کەسێك لە خۆیەوە ڕامێنی، - ئەگەر زانایانی دەروونناسیش وایان نەگوتبایە - دەزانێ کە چوار هەست و پاڵنەری ڕووحیی بنەڕەتیی هەن، کە لەگەڵ جەوهەرو چییەتی ئەودا، ئاوێتە و تێکەڵ کراون، کە بریتین لە:

١- **زانستخوازیی:** کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ، پرسیار بکات و لێبکۆڵێتەوە و بپشکنێ.

٢- **خێرخوازیی:** کە خۆشویستن و سۆزی باب و دایك بۆ ڕۆڵە، یان ڕۆڵە بۆ باب و دایك، یا هی ئاژەڵ بۆ بەچکە، هی بەچکەکان بۆ دایك و بابیان، پاشان چاکەکاریی و یارمەتیدانی خەڵك، ئەمە هەموویان لە سیفەتی خێرخوازییەوە سەرچاوە دەگرن.

٣- **جوانیی خوازیی:** کە مەسەلەی خۆڕازاندنەوە لە ڕووی جەستەیی، لە ڕووی ئاکاریی و مەعنەویی و، حەز کردن بەوە کە ئینسان لە دەوروبەرو ژینگەیەکی جواندا بێ و، لە خانووبەرەیەکی جواندا بێ، هەروەها ئەوە کە کەیفی بە جوانیی دێت کە لە ئاسماندا هەیە، لە شەوگاردا ئەستێرەکان دەبریسکێن، مانگ کە وەشۆق دەکەوێ، بە تایبەتی لە شەوانی بەدردا، هەروەها دیمەنە سەرنجڕاکێشەکانی سروشت، هەستی جوانیی خوازیی لە مرۆڤدا، پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ، کە لەززەت لەوانە بکات و، هەوڵ بۆ پەیدا کردنی جوانیی بدات.

٤- **خواناسیی:** ئەمیش هەموو جۆرەکانی پەرستن و بە گەورەگرتن، دەگرێتەوە، چ جێگای خۆیان بگرن، کە بریتیە لەو پەرستنانەی بۆ خوا (سبحانه وتعالى)، تاکە پەرستراوی شایستەی پەرستران، ئەنجام دەدرێن، چ جێگای خۆیان نەگرن،

www.alibapir.com



وەك هەموو ئەو بە گەورە گرتن و بە مەزن گرتن و بە بەرز گرتن و، ئەو پەرستشانەی کە بۆ غەیری خوا ئەنجام دەدرێن، چ بۆ بت و صەنەمەکان، چ بۆ مانگ و خۆر، چ بۆ ڕژێمێکی طاغووتیی، چ بۆ حیزبێك، یان بۆ شەخصێك، لە هەر بەرگێکدا بێ و لە هەر شێوەیەکدا بێ، هەر کەسێك و هەر شتێك جگە لە خوا، وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، ئەوە بە پەرستراو لە قەڵەمدراوە، ئنجا هەموو شێوەکانی پەرستن، لەو هەستی خواناسییەوە دێن، بەڵام وەك گوتمان: ئەگەر ئینسان پەرستشەکان بۆ غەیری خوا ئەنجام بدات، مانای وایە ئەو هەستەی لایداوە لە ڕێڕەوی سروشتیی و ئاسایی خۆی.

ئنجا بێگومان:

١- هەست و سیفەتی یەکەم: (زانستخوازیی)، پاڵنەرو سەرچاوەی زانست و شارەزایی و گەڕان و پشکنینی مرۆڤ و هەوڵدانیەتی، بۆ پەیبردن بە نهێنییەکانی خۆیی و دەوروبەری و گەردوون.

٢- هەست و سیفەتی دووەمیان: (خێرخوازیی)یش، کانگاو پاڵنەری ڕەوشت و بەها بەرزەکان و، داینەمۆی بەرەو بەرزیی و چاکیی و تەواویی چوونی مرۆڤ و، هاوکاریی و دەستگرۆیی کردنیەتی بۆ خەڵك، بە شێوەی ماددیی و مەعنەویی.

٣- هەستی سێیەمیشیان: (جوانیی خوازیی) سەرچاوەی سەرجەم خۆڕازاندنەوەکان و، جۆرەکانی هونەرە بە گشتیی، بە چەمك و واتای فراوانی، هەروەها هاندەری مرۆڤە بۆ ئەوەی خۆیی و ژیانی و دەوروبەری، جوان بکات و حەزی بە جوانیی بێ.

٤- هەستی چوارەمیشیان: (خواناسیی) کانگاو سەرچاوەی پەرستشەکانی مرۆڤە، ئنجا چ مرۆڤ جێی خۆیانیان پێ بگرێ و، لە شوێنی خۆیدا ئەنجامیان بدات بۆ خوا، چ تێیاندا تووشی لادان ببێ، وەك هەموو ئەوانەی جگە لە خوا (سبحانه وتعالی)، دەپەرستن.

www.alibapir.com





## بڕگەی سێ: نیشانەو تایبەتمەندییەکانی هەستە ڕووحییە خوارسکەکان:

ئێمە چۆن بزانین: ئەو چوار هەستە مەعنەوییە هەن؟! دەڵێین: چوار نیشانەیان هەن بە گشتیی، ڕەنگە بگونجێ نیشانەی زیاتریشیان لێ بدۆزرێنەوە:

١- گشتیی و هەمە لایەنن و، هەموو مرۆڤەکان پشك و بەشیان لەو چوار هەستەدا هەیە: (زانستخوازیی، خێرخوازیی، جوانیی خوازیی، خواناسیی).

٢- مرۆڤ بۆ خۆی هەستیان پێ دەکات و، پێویستیی بەوە نیە کە فێری بکرێن، واتە: لە زاتی خۆیدا، هەموو مرۆڤێك هەر کە لە دایك دەبێ، هەستیان پێ دەکات، منداڵێکی گچکە تەماشا بکە! جارێ نەچۆتە قوتابخانە، هیچ شتێك فێر نەبووە، حەزی بە جوانیی دێ و، حەزی بەوە دێ، شتەکان بزانێ، دەپرسێ: ئەو شتە بۆچی وایە؟ ئەوە بۆچی وانیە؟ منداڵ بە زۆریی وایە، یارییەك و گەمەیەکی وێبدە، هەوڵدەدا هەڵیوەشێنێ، بزانێ چی تێدایە! پاشان منداڵێکی بچووك، شتێك دەکات، ئەگەر تۆ ئافەرینێکت لێکرد، دەستخۆشییەکت لێکرد، پێی خۆشە، بەڵام ئەگەر سەرزەنشتت کرد، پێی ناخۆشە و، ڕەنگە جارێکی دیکە ئەو شتە دووبارە نەکاتەوە، واتە: ئەو هەستانە خوارسکن لە مرۆڤدا و، پێویستیی بەوە نیە، فێری بکرێن.

٣- ئەو هەستانە دەگونجێ کپ و خەفە بکرێن، بەڵام وەك ژیلەمۆی بن خۆڵەمێش، هەردەمێنن، ئەگەرنا دەگونجێ، کپ بکرێن، بۆ وێنە: کاتی خۆی لە (یەکێتی سۆڤیەت) و (چین)دا کە دوو دەوڵەتی زلهێزی دنیا بوون، بە ڕەسمیی ئیلحادو خوانەناسییان تەبەننیی کردبوو، خەڵکیان ناچار کردبوو کە لە جیاتی خوا حوکمڕانەکانی خۆیان بپەرستن، ئەوەی کە مسوڵمانان بۆ خوای دەکەن، خەڵکی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، وای لێکرابوو، کە بۆ لینینی بکەن و بۆ ستالینی بکەن! هەروەها ئەوەی کە مسوڵمانان بۆ خوا دەیکەن، شێوەی

www.alibapir.com





ئەوە خەڵکی چین، ناچار کرا بوو کە بۆ (ماوتسی تونگ)ی بکات! هەروەها ئێستاش بۆ (کیم جونگ ئون) لە کۆریای باکوور! بەڵێ هەموو ئەو حیزب و ڕژێم و دەوڵەتانەی کە ئیلحاد تەبەننیی دەکەن، زیاتر مەبەستیان ئەوەیە کە زەمینە خۆش بکرێ بۆ پەرستنی ئەو سەرکردانەی خۆیان، جا چ بە زیندوویی، چ بە مردوویی، ئێستاش لەگەڵدا بێ، تەرمەکەی لینین لە کۆشکی (کرملین) دا، دانراوەو، خەڵك بە بۆنەی جۆرا و جۆرەوە لە کاتانی دیارییکراودا، دەچن بە مەزنگرتنی بۆ دەنوێنن، ئەوەش هەر پەرستنە!

کەواتە: ئەو هەستانە، چ هەستی خواناسیی، چ هەستەکانی دیکە، دەگونجێ کپ و خەفە بکرێن، بەڵام وەك ژیلەمۆی بن خۆڵەمێش، هەردەمێنن، هەر کە دەرفەتیان لێ هەڵکەوت، جارێکی دیکە سەرهەڵدەدەنەوە.

٤- ئەو هەستە مەعنەوییانە ئەگەر هەل و مەرجی گەشەکردنیان بۆ نەڕەخسێ، مەرج نیە گەشە بکەن بە کردەوە، بەڵام بێگومان بە حاڵەتی ئامادەیی (بالقوة) هەردەبن، ئەمەش فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە بارەی خواناسییەوە ئاماژەی پێ کردوە، کە دەفەرموێ: {مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟}، (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيّ برقم: ١٢٩٢، وَمُسْلِم: برقم: ٦٩٢٦، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة).

واتە: هەموو منداڵێك لەسەر خوارِسکی خواناسیی (زگماکی خواناسیی) لە دایك دەبێ، بەڵام دوایی باب و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەصرانیی، یان دەیکەنە مەجووسیی، هەروەك چۆن بەچکەی ئاژەڵ کە لە دایك دەبێ تێر و تەواوە، ئایا هیچی دەبینن گوێی بڕا بێ، (نوقصانیەکی تێیدا پەیدا بووبێ)؟!

کە مەبەست پێی دەوروبەرو ژینگەیە، نەك تەنیا باب و دایك، بەڵکو: ڕەفیقی خراپ، مامۆستا، قوتابخانە، ڕژێم، دەیگۆڕن، چی لێ دەکەن؟ (يهَوِّدَانِهِ): دەیکەن بە جوولەکە، ئەگەر ژینگەکەی، یاخود دایك و بابەکە، یان دەوروبەرەکە،

www.alibapir.com



جوولەكە بن، یان (ینَصِّرَانِهِ): دەیكەنە نەصرانیی، یان (یمَجِّسَانِهِ): دەیكەنە مەجووسیی (لە ڕیوایەتێكی دیكەدا هاتوە: (أو یُشَرِّكانه)یان دەیكەنە هاوبەش بۆ خوا دانەر).

دوایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وێنەیەك دێنێتەوە، دەفەرمویَ: وەك چۆن بەچكە ئاژەڵ كە لە دایك دەبیَ، تێرو تەواوە، ئایا دەبینی هیچیان گوێیان شەق كرا بیَ، ئەوە دوایی مرۆڤن، گوێی شەق دەكەن و، نیشانەی دەكەن، یان نیشانەیەكی دیكەی لە جەستەدا پەیدا دەكەن، بەڵام كە لە دایك دەبیَ، بە تێرو پڕیی و بە ڕێك و پێكیی، لە دایك دەبیَ.

هەڵبەتە پێویستە بشزانین كە غەریزەكان (الغرائز) جیان لەو چوار هەستە ڕووحییە، جیاوازییەكەشیان ئەوەیە، كە غەریزەكان زیاتر پەیوەستن بە لایەنی جەستەییەوە، غەریزەكان وەك:

١- غەریزەی جینسیی (سێكس).
٢- غەریزەی شت هەبوون (تملُّك).
٣- غەریزەی نیشتیمان پەروەریی.
٤- غەریزەی بەرگریی لە خۆكردن.
٥- غەریزەی شت خواردن و خواردنەوە.
٦- غەریزەی حەز كردن بە خەو و ئیسراحەت.

ئەوانە هەموویان پەیوەندییان بە جەستەوە هەیە، بەڵام ئەو چوارەی گوتمان، پەیوەندییان بە ناخ و ڕووحی مرۆڤەوە هەیە.





## بڕگەی چوار: ڕیشەکانی خوارِسك بوونی خواناسیی، لە مرۆڤدا:

ئایا ڕەگ و ڕیشەکانی خوارِسك بوونی خواناسیی لە مرۆڤدا، لە دەروونیدا، لە ماهیەت و ڕووحییدا، چی و چین؟!

دەڵێین: هەست و هاندەری خواناسیی و، خواپەرستیی لە ناخ و خوارِسك و زگماکی مرۆڤدا، چەندان ڕەگ و ڕیشەی هەن، بەڵام من پێم وایە، هەڵبەتە بە بەهرە وەرگرتنیش لەو لێکۆڵینەوانەی کە زانایانی دەروونناس لەو بارەوە کردوویانن، کە ئەو پێنجەیان لە هەموویان بەهێزترن، یاخود دیارترو بەرچاوترن:

### ١)- تینوویەتیی و عەوداڵیی دروستکراو بۆ دروستکەر (إشتِيَاقُ المَخلوق للخَالق):

کە ئەم ئایەتە بە پێزەی قورئان ئاماژەی پێکردوە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤٤ ﴾ الإسراء.

(خوا باسی خۆی دەکات، دەفەرموێ:) حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەر کەس کە تێیاندا هەیە، خوا بە پاك دەگرن و، هیچ شتێك نیە، مەگەر بە بەپاکگرتنەوە ستایشی (خوا) دەکات، یان بە ستایشکردنیەوە بە پاکی دەگرێ، (بە پاکگرتن واتە: نەفی کەم و کوڕیی لێ دەکات)، ستایشی دەکات، (واتە هەرچی سیفەتی باشە بۆی بڕیار دەدا)، بەڵام ئێوە لە بە پاکگرتنی ئەوان بۆ خوا و، لە ستایشکردنی ئەوان بۆ خوا، تێناگەن، بێگومان خوا زۆر هێدیی و مەندە و، زۆریش لێبوردەیە.

www.alibapir.com





ئەگەرنا ئەو مرۆڤانەی کە وەك ماددەی بێ ژیان و ڕووەك و ئاژەڵانیش، هەڵوێستی ئەرێنییان نیە بەرانبەر بە خوای خۆیان و، بە پاکی ناگرن و، ستایشی ناکەن و، بەندایەتیی بۆ ناکەن، دەبوو سزایان بدات، بەڵام خوا زۆر هێدیی و مەندە و، زۆریش لێبوردەیە.

### ٢)- خۆشەویستیی و ڕێزو سام کردن و سەرسام بوونی مرۆڤ، بەرانبەر بە تەواویی و جوانیی و پایەبەرزیی (کمال و جمال و جلال)ی خوای تاك و تەنیا:

مرۆڤ لە ناخیەوە حەز بە تەواویی و، بە جوانیی و، بە پایەبەرزیی و، بە پاکیی و چاکیی دەکات، ئنجا خوای بەرزو مەزن (سبحانه وتعالى) لە لووتکەی هەموو ئەوانەدایە، خوا لە لووتکەی تەواویی (کمال) و، لە لووتکەی جوانیی (جمال) و، لە لووتکەی شکۆداریی و پایە بەرزیی (جلال)دایە، بۆیە ئەو خۆشەویستییە و، ئەو سەرسامبوونە و، ئەو شەیدایییەی مرۆڤ بۆ خوا هەیەتی، بۆ هیچ شتێك نیەتی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ .. ﴾ البقرة (١٦٥).

واتە: لە خەڵکی هەیە هاوبەشان بۆ خوا دادەنێن، وەك خۆشەویستییەك کە بۆ خوا هەیە، ئاوا خۆشیان دەوێن، بەڵام ئەوانەی بڕوادارن خۆشەویستییان بۆ خوا زیاترە، لە خۆشەویستیی ئەوان بۆ پەرستراوەکانیان...

بەڵێ: هیچ خۆشەویستییەك، هیچ سەرسامبوونێك، هیچ هۆگرییەك، هیچ شەیدایییەك، لە دەروونی مرۆڤدا، ناگاتە خۆشەویستیی و شەیدایی و هۆگریی و سەرسامبوونی بەرانبەر بە خوا (سبحانه وتعالى)، ئەگەر بەڕاستیی خوا بناسێ.

www.alibapir.com



ئەو چەند ئایەتەش هەر ئاماژە بەوە دەکەن: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٧﴾ الروم.

واتە: خوا ئەو زاتەیە، کە دروستکراوەکان وەدی دێنێ، دواییش دەیانگێڕێتەوە و، گێڕانەوەشیانی لەلا ئاسانترە، (واتە: دوای ئەوەی کە دروستیان دەکات و دوایی دەیانفەوتێنێ، دووبارە پەیدایان دەکاتەوە و پەیداکردنەوەکەشیانی لەلا ئاسانترە)، سیفەتی هەرە بەرزیش لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر هی خوایە، (هەموو سیفەتە بەرزەکان، هەموو چاکیی و پاکیی و تەواوییەکان، تەنیا هی خوان، بە مانای تەواوی وشە)، خوا زاڵی کارزانە.

هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ٧٨﴾ الرحمن.

واتە: ناوی پەروەردگاری خاوەن شکۆو خاوەن ڕێزگرتنت، بەرزو گەورەو بەپێزە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش، لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: {إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الجَمَالَ}، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٧٥)، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ)، خوا جوانەو جوانییشی خۆشدەوێ.

ئنجا لەبەر ئەوەی کە هەر کام لەو سێیە: (كَمَال، جَمَال، جَلَال) بە مانای تەواوی وشە، تەنیا لە خوای پەروەردگاردا هەن، بۆیە ئەو خۆشەویستیی و ڕێزو سەرسام بوون و شەیداییەی مرۆڤ بۆ خوا هەیەتی، بەرانبەر بە هیچ شتێکی دیکە، نایبێ، ئەگەر بەڕاستیی خوا بناسێ.

www.alibapir.com





### ٣)- چاكیی و چاكەكاریی:

بۆ نموونە: هیچ كام لە ئێمە (حاتم الطائي)مان نەبینیوە و، لە سەخاوەتیشی بەهرەمەند نەبووین، بەڵام لە دوورەوە خۆشماندەوێ.

هەروەها لە كوردەواریی خۆشماندا باسی (حەمە ئاغای كۆیی) و، باسی (حەمە قدۆی موصلّ) دەكرێ، دەڵێن: پیاوی سەخیی و نانبدە بوو ون، خۆشماندەوێن، با نەشمان بینیبن و، لێشیان بەهرەمەند نەبووبین.

یان باسی ئازایەتیی (خالیدی كوڕی وەلید) و (عەلی كوڕی ئەبی طالیب) خوا لێیان ڕازی بێ، دەكرێ و لەبەر ئازایەتییەكەیان، خۆشمان دەوێن.

هەروەها مرۆڤ هەموو ئەو كەسانەی كە چاكییەكیان تێدایە و، هەموو ئەو شتانەی كە چاكیی و جوانییەكیان تێدایە، بەلای خۆیدا كێشی دەكەن، خۆشی دەوێن و پێیان سەرسام دەبێ، ئاشكراشە هەرچی چاكییە، بێگومان هەمووی لە خوای پەروەردگاردا هەیە.

بۆ وێنە: ئەگەر باسی كەرەم و سەخاوەت بكەین و، باسی چاكەكاریی و خێرخوازیی بكەین، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ النحل.

هەرچی چاكە هەیە لە ئێوەدا، هەرچی نیعمەت هەیە، هەرچی خێرو خۆشیی هەیە، هەمووی لە خواوەیە، دواییش ئەگەر زیان و ئازارێكتان پێ گەیشت، هەر پەنا بۆ لای وی دەبەن.

هەروەها لە سووڕەتی (لقمان) ئایەتی (٢٠)دا، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَـٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَـٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَـٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ ﴾.

www.alibapir.com





واتە: ئایا سەرنج نادەن، نابینن! کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی دەستەمۆو ڕام کردوە و، چاکەکانی خۆی بە ڕواڵەت و بە پەنهان، بەسەر ئێوەدا ڕشتوە، ........

ئنجا زاتێك سەرچاوەی هەموو چاکەکان و، هەموو نیعمەت و هەموو خێرو خۆشییەکان بێ، دیارە مرۆڤ ئەو زاتەی خۆشدەوێ، ئەوەش ڕیشەی سێیەمی خوناسییە لە خوارِسکی مرۆڤدا.

### ٤- شەیدا بوونی مرۆڤ بۆ هەرمانەوەو بێ نیازیی و پلەو پایەو سەلامەتیی:

مرۆڤ لە ناخەوە حەزی لە چوار شتە:

أ/ مانەوە، هەرمان (الخلُود).

ب/ بێ نیازیی (الغِنَى).

ج/ پایە بەرزیی (العُلُو).

د/ سەلامەتیی (السَّلاَمَة).

هەر بۆیە ئیبلیس کاتێك دەیەوێ ئادەم و حەووا (سەلامی خوایان لێ بێ) فریو بدات، لەو داخوازییە ڕیشەییانەوە بۆیان دەچێ، دەزانێ: ئادەم و حەووا کە باب و دایکی مرۆڤانن، حەزیان لە مانەوەیە، حەزیان لە هەبوونی موڵکی فراوانە، حەزیان لە بەرزییە، حەزیان لە سەلامەتییە، بۆیە لەوێوە بۆیان دەچێ.

وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ٢٠ ﴾.

www.alibapir.com



واتە: شەیتان خوتخوتەی بۆ کردن، تاکو ئەو عەیب و عارەی کە لێیان پەنهان بووە، بە هۆی بەرو پۆشاکیانەوە، بۆیان دەربخات و، پێیگوتن: پەروەردگارتان قەدەغەی نەکردوون لەم درەختە، (کە لێی بخۆن)، مەگەر لەبەر ئەوە کە ببن، بە دوو فریشتە، یاخود بۆ هەمیشە بمێننەوە.

هەروەها خوای کارزان لە سوورەتی (طه)دا، فەرموویەتی: ﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾﴾.

واتە: ئیبلیس گوتی: ئەی ئادەم! درەختێکت پێشان بدەم، کە ئەگەر لێی بخۆی، هەرماو ببی و، موڵك و هەبوونێکت دەست بکەوێ، کە هەرگیز لەبن نەیەت.

بەڵێ ئیبلیس لەو ڕێیەوە بۆ ئادەم و حەووا چوو و زەفەریشی پێ بردن.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە هیچ کام لەم داخوازییانە، بە جگە لە خوا (سبحانه وتعالى)، جێبەجێ ناکرێن، ئایا کێ دەتوانێ ژیانێکی هەمیشەییت پێ بدات؟ کێ دەتوانێ تۆ بێ نیاز بکات؟ کێ دەتوانێ بەرزیی و سەلامەتیی و بەختەوەریی یەکجارییت پێ بدات؟ تەنیا خوا (سبحانه وتعالى).

ئاخر ئەگەر خوا نەبێ و ڕۆژی دوایی نەبێ، ئەم ژیانی گۆی زەوییە، هەر هیچ نیە، زوو دەبڕێتەوە و کۆتایی پێ دێ، ئینسان دەبێتە بەردی بن گۆمێ، هەموو ئەو خولیاو ئاواتانە، هەموو ئەو نیازو مەبەستانە کە لە دڵیدا هەن هەرمانەوە(خلود) و، بێ نیازیی و، بەرزیی و، خێرو خۆشیی و سەلامەتیی، هەموو ئەوانە لەگەڵ خۆی دەباتە بن گڵ، ئنجا وەك خوا دەفەرموێ:

﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ﴿١٠﴾﴾ فاطر.

واتە: هەر کەسێ عیززەتی دەوێ، عیززەت واتە: بەرزیی، سەرکەوتن، باڵا دەستیی، ئەوە عیززەت و بەرزیی و سەرکەوتن و باڵادەستیی، هەمووی لەلای خوای بەرزەوەیە، (کەواتە: لەوی داوا بکەن).

www.alibapir.com







ئنجا مرۆڤیش بەو پاڵنەرەوە، کە حەزی لە مانەوەیە، حەزی لە بێنیازییە، حەزی لە بەرزییە، حەزی لە سەلامەتییە و، ئەوانەش تەنیا لە لای خوا (سبحانه وتعالى) هەن و، تەنیا بە خوا دەستەبەر دەکرێن، بۆیە ئەوەش هاندەرێکی دیکەی ئیمان و خواناسیی و خواپەرستییەتی.

## ٥- حەزکردنی مرۆڤ و عەوداڵبوونی بۆ فەرمانبەریی و پەرستنی خوا (سبحانه وتعالى):

ئەمیش یەکی دیکەیە لە ڕیشەکانی خواناسیی لە مرۆڤدا، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە کە مرۆڤ عەوداڵە بۆ فەرمانبەریی بۆ خوا؟! بەڵگەمان ئەوەیە کە مرۆڤ هەرگیز نەیتوانیوە و ناتوانێ بەبێ پەرستراو (معبود) بژی، ئنجا ئەگەر پەرستراوی ڕاستەقینەی پەرستبێ، کە خوایە، ئەوە باشە، ئەگەرنا ئەو بۆشاییەی بە شتێکی دیکە پڕکردۆتەوە، وەك پێشتر ئاماژەماندا بە کۆمەڵگا مولحیدەکانی وەك: چینی ڕابردوو و، یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و، کۆریای باکووری ئێستا، هەروەها لە هەر شوێنێکی دیکە، کە بیرۆکەی ئیلحاد ڕەواجی هەیە، چ لە ئاستی حیزب و گرووپ، چ ڕژێم و دەوڵەت، سەرنجی خەڵکەکە بدەن! شتێك هەر دەپەرستن لە جیاتی خوا! هەر نەبێ ئارەزوو (هوى)ی خۆیان دەپەرستن، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ...﴾ الجاثية: ٢٣.

واتە: ئایا سەرنجی ئەو کەسەت نەداوە کە ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی! ئەگەرنا سەرۆکەکەیان دەپەرستن، ڕژێمەکەیان دەپەرستن، هەندێك بەهای دیکە دەپەرستن، شتێك هەر دەپەرستن.

ئەگەر وەك هیندۆسەکانیش مانگاو مشك و مار، یان وەك بووذاییەکان و خەڵکەکەی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ماری کوبڕاو، پەیکەری بووذاو، شتی

دیکەش نەپەرستن، حەتمەن پەرستراوێکی هاوچەرخ دەپەرستن، لە جیاتی خوا (سبحانه وتعالى)، هەر بۆیەش خوا لەسەر زمانی بەندەکانی فەرموویەتی: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥﴾ الفاتحة.

پێشیَ بە ناوی خوا دەست پێ دەکەن، ئنجا ستایشی خوا و، مەدح و سەنای خوا و، ڕاگەیاندنی پایە بەرزیی خوا، دوایی دەڵێن: هەر تۆ دەپەرستین و پشت هەر بە تۆ دەبەستین.

هەر بۆیەش پانتایی باس و خواسی خوا (سبحانه وتعالى)، لە نێو کەلەپووری فیکریی و ڕووحیی و فەلسەفیی بەشەردا، لە هەموو دنیادا و، لە سەرجەم مێژووی بەشەردا، فراوانترین پانتایی هەیە، ئەوەندەی باس و خواسی خوا (سبحانه وتعالى)، کراوە، چ ئەوانەی پەرستوویانەو دۆستی بوون، چ ئەوانەی نەیاری بوون، هێندە باسی هیچ شتێکی دیکە نەکراوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خواناسیی، شتێکی ڕیشەدارە لە زگماك و خوارسکی مرۆڤدا.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر




## بڕگەی پێنج: پەرچەکانی ڕێی فیطرەت لە بواری خواناسیی دا:

وەك باسمان كرد: خواناسیی شتێكی ڕیشەدارو ڕۆچوویە لە ناخ و فیطرەت و خوارسكیی مرۆڤدا و، باسی پێنج لەو ڕیشەو بنجانەمان كرد كە لە دەروون و ناخی مرۆڤدا دانراون و، پاڵی پێوە دەنێن كە خوا بناسێ و بیپەرستێ، بەڵام ئایا ئەو فیطرەتی خواناسیی و خواپەرستییە، هیچ پەرچ و ڕێگر و لەمپەری نایەنە ڕێ؟!

یەكێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە مرۆڤ مادام ئاوا بۆ خوا تینوو و شەیدایە، چ شتێك وای لێ دەكات كە نەیناسێ و لێی دوور بێ و پشتی تێ بكات؟

لە وەڵامدا دەڵێین: دڵ و دەروونی مرۆڤ وەك ئاوێنەیە، ئاوێنە، ئەگەر سپی و ساف بێ، كاتێك كە لە بەرانبەر خۆتدا ڕایدەگری، خۆتی تێدا دەبینی، بەڵام ئەگەر ئاوێنەكە شكا بێ، یاخود تۆزو خۆڵی لێ نیشتبێ، یان پەڵەی چەوریی پێوە بێ، بە تەئكید ئەو كاتە وێنەیەكی شكاو، یان وێنەیەكی تلْخ و گۆڕاو، پێشان دەدا، خوارسك و فیطرەتی مرۆڤیش بە هەمان شێوە، ئەگەر فیطرەتەكە ساغ بێ، دیارە ئەو كاتە ئەو هەستە قووڵەی خواناسیی و خواپەرستیی، زۆر جوان لەو فیطرەتە ساغ و سەلیمەدا دەردەكەوێ.

بەڵام ئەگەر فیطرەتەكە تێكچووبێ، گۆڕدرابێ، دەستكاریی كرابێ، ئەو كاتە ئەو هەستە و هەستەكانی دیكەش، مەرج نیە بەو شێوەیە بێنە دی، ئەوانیش دەشێوێنرێن.

ئەو هۆكارانەش كە دەبنە پەرچی ڕێی زگماك (فطرة) لە بواری خواناسییدا، دەتوانین بڵێین: گرنگترینیان ئەم پێنجەن:

## ١)- شوێنكەوتنی ئارەزوو:

بە دوای ئارەزوو كەوتن و بوونە كۆیلەو دیلی غەریزە جەستەییەكان، زۆر جار چەشمەندازی مرۆڤ لێڵ دەكات و مرۆڤ بە لاڕێدا دەبات، وەك خوای زاناو شارەزا (سبحانە وتعالى) لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية.

(خوا (سبحانە وتعالى) ڕێك وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە، دەفەرموێ): ئایا سەرنجی ئەو كەسە نادەی كە ئارەزووی خۆی كردۆتە پەرستراوی خۆی و، دوای ئەوەی كە زانیارییشی هەبوو، خوا گومڕای كرد، (چونكە كاری بە زانیارییەكەی نەكرد) و، مۆری بەسەر دڵ و گوێیەوە نا و، پەردەشی بەسەر چاوی هەڵكێشا، ئایا لە دوای خوا، كێ ڕێنمایی دەكا، (كێ دەتوانێ بیخاتە سەر ڕاستە ڕێ)، بۆچی بیر ناكەنەوە، دوایی (دوای ئەوەی كە گومڕا بوون چی دەڵێن؟!) بێ بڕوایەكان گوتیان: ژیان هەر ئەم ژیانی دنیایەمانە، دەمرین و دەژین و، تەنیا ڕۆژگار دەمانفەوتێنێ.

(واتە: نە خوا ئێمەی دروستكردوە، نە ئەویش ئێمە دەمرێنێ و نە زیندووشمان دەكاتەوە).

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية.

هیچ زانیارییەكیان لەو بارەوە نیە، بەس گومان دەبەن.

بەڵێ هەرگیز ئیلحاد ناتوانێ خۆی پشت ئەستوور بكا بە بەڵگەیەكی زانستیی، هەمیشە گومان و دوو دڵییەو، دڵە ڕاوكەو نادڵنیاییەو، نا بەرچاو ڕوونییە.

www.alibapir.com





پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە خوای پەروەردگارەوە دەگێڕێتەوە، کە خوا فەرموویەتی: {خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ، وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ}، (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٣٨٦) عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ الْمُجَاشِعِيّ).

واتە: بەندەکانی خۆمم پاك و چاك دروست کردوون، بەڵام شەیتانەکان هاتنە لایان و لە خشتەیان بردن و لە ئایینەکەیان لایاندان.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە: {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ عَنِ النَّبِيّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «حُبُّكَ الشَّيْءَ يُعْمِي وَيُصِمُّ»}، (أخرجه أحمد برقم: (٢١٧٤٠)، وأبو داود برقم: (٥١٣٠)، والبيهقي في "شعب الإيمان" برقم: (٤١١)، وَحَسَّنَهُ إِبْنُ حَجَر العَسْقَلَانِي وَالحَافِظ العِرَاقي، وضعفه الألباني، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح موقوفاً).

واتە: خۆشەویستیی بۆ شتێك، کوێرت دەکات و کەڕت دەکات، یانی: ئەو ئامرازانەی کە دەتوانی شتیان پێ دەرك بکەی، لێت تێك دەدا، لە ئەنجامی زاڵ بوونی هەست و سۆزی هەڵە بەسەرتدا.

## ٢- لە کارخستن و بەکارنەهێنانی عەقڵ و گوێ و چاو، بە مەبەستی دۆزینەوەی هەق:

وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾﴾.

واتە: بە دڵنیاییی زۆرێك لە جند و مرۆڤمان ئامادە کردوون بۆ دۆزەخ (بۆچی خوا بۆ دۆزەخی ئامادەی کردوون؟!) چونکە دڵیان هەن پێیان تێناگەن و، چاویان هەن، پێیان نابینن و، گوێیان هەن، پێیان نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن، بەڵکو گومڕاترن لە ئاژەڵ، ئەوانە بێ ئاگان.

www.alibapir.com







کەواتە: لە کارخستن و پەکخستنی عەقڵ و چاوو گوێ، وا لە مرۆڤ دەکات، کە خوا نەناسێ و لە ڕێی خواناسیی هەتڵە ببێ.

## ٣- دڵنەخۆش کەوتن بە هۆی شوبهەو شەهوەتەوە:

دڵ بە هۆی گومان و ئارەزووەوە نەخۆش دەبێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ .. ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کتێبی دابەزاندۆتە سەر تۆ، لە نێو ئەو کتێبەدا ئایەتانێك هەن (کە زۆربەی هەرە زۆری ئایەتەکانن) مانا ڕۆشنن و، هەندێك ئایەتیشی تێدا هەن، مانای وێکچوویان هەن، (واتە: مانایەکەیان ڕوون نیە، یاخود زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن)، ئنجا ئەوانەی کە دڵیان لادانی تێدایە، بە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون، کە مانای وێکچوویان هەیە (زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن، یان چەند واتایەکی وێکچوویان هەن، لە جیاتی ئەوەی کە ئایەتە مەحکەم و مانا ڕۆشنەکان بکەنە بناغە، بە دوای ئایەتە مانا وێکچووەکان دەکەون و، لە ئەنجامدا سەریان لێ دەشێوێ)، ئەو کارەش بە مەبەستی سەرلێشێواندن و مانا گۆڕین، دەکەن.

## ٤- ژەنگ هەڵێنان و دڵ مۆرکران بە هۆی لادان و تاوان و خەسڵەتە پیسەکانەوە:

دڵی مرۆڤ، وەك چۆن ئاوێنەیەك کە تۆزو خۆڵی لێ دەنیشێ، یان پەڵەی دەکەوێتە سەرێ، یان کە دەشکێ، ئەو وێنەیەی کە پێشانی دەدا، بە شکاویی و بە ناڕێکیی پێشانی دەدا، دڵ و دەروونی مرۆڤ و فیطرەت و ناخی مرۆڤیش هەروایە.

www.alibapir.com







لەو بارەوەش ئایەتی قورئانی بە پێز زۆرن، بۆ وێنە:

١- خوا فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُو الْجَحِيمِ ﴿١٦﴾﴾ المطففين.

واتە: سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ کەسانێك کە بەدرۆ دانەرن، ئەوانەی کە ڕۆژی سزاو پاداشت بەدرۆ دادەنێن، هیچ کەسیش ئەو ڕۆژە بەدرۆ دانانێ، جگە لە دەستدرێژیی کارێکی، (یان سنوورشکێنێکی) تاوانبار، ئەوانەی کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێنەوە، دەڵێن: ئەوە ئەفسانەی پێشینانە، نەخێر، بەڵکو دڵیان ژەنگی هێناوە، بە هۆی ئەو کردەوانەوە کە ئەنجامیان داون، (بە هۆی کردەوە خراپەکانیانەوە، دڵیان کەمرەو ژەنگی گرتوە)، با وازبێنن، ئەوان لەو ڕۆژەدا لە پەروەردگاریان پەردەپۆش دەکرێن، دوایی دەخرێنە نێو کڵپەی دۆزەخەوە.

هەڵبەتە پەروەردگار پەردەپۆش ناکرێ و، خۆیان دەخرێنە پشت پەردەوە، چونکە لە دنیادا ئەوانە ئەو خوارسك و زگماکە پاکەی خوا پێی داون، بە چڵك و چەپەری تاوان دایانپۆشیوە و کەمرەی گوناهانی لەسەر نیشتوە، وەك ئاوێنەکە کە ئەگەر تۆزو خۆڵی لەسەر بنیشێ، دوایی هیچ شتێك پێشان نادات، ئەوانەش فیطرەت و زگماکی خۆیان ئاوا تێکداوە، بۆیە لە دوارۆژیشدا لە پەروەردگاریان پەردە پۆش دەکرێن، لە دنیادا بە چاوی عەقڵ و دڵ خوایان نەبینیوە، بۆیە لە دوا ڕۆژیشدا لە بینینی خوا، لە دیداریی خوا بە چاوی سەر، بێ بەش دەکرێن.

٢- هەروەها خوا (سبحانه وتعالی) لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾﴾ المائدة.

واتە: بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی بێبڕوایان ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

www.alibapir.com







٣- لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرمویَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾.

واتە: بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی ستەمکاران ناخاتە سەر ڕاستە ڕیَ.

٤-لە سوورەتی (المنافقون)دا دەفەرمویَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ٦﴾.

واتە: بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی لادەران، لاڕیَبووان، ناخاتە سەر ڕاستە ڕیَ.

٥- لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرمویَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ٢٨﴾.

واتە: بە دڵنیایی خوا هەر کەسیَ کە زیَدەڕۆییکەری بە درۆدانەر بیَ، نایخاتە سەر ڕاستە ڕیَ.

٦- لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرمویَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ٣﴾.

واتە: بە دڵنیایی خوا هەر کەسیَ کە درۆزن بیَ و، سپڵەو ناسپاس بیَ، نایخاتە سەر ڕاستە ڕیَ.

٧- لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرمویَ: ﴿ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ٣٥﴾.

واتە: ئەوانەی کە مشت و مڕ دەکەن لەبارەی ئایەتەکانی خواوە، بیَ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبیَ، ئەوە گەورەترین گوناهە ئەنجامی دەدەن لە لای خوا و، لەلای ئەوانەش کە بڕوادارن، ئاوا بەو شیَوەیە خوا دڵی هەر کەسیَکی خۆ بەزلگری مل بە خەڵك کەچکەرو ستەمکار، مۆر دەکات و، بیَ بەشی دەکات لە هیدایەتی خۆی.

www.alibapir.com





دیاره وشەی (هدایة) لەو ئایەتانە و هاو وێنەکانیاندا: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾﴾ المائدة.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾﴾ المائدة.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾﴾ المنافقون.

یانی: نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، نەك ڕێیان پیشان نادات، چونکە خوا ئەگەر ڕێی ڕاست، پیشانی مرۆڤەکان نەدا، ئەوە ستەمە:

﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾﴾ فصلت.

نا، خوا ڕێی پیشانداون، بەڵام نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، واتە: ئەوان کە ئەو هیدایەت و ڕێپیشاندانەی خوا قبووڵ ناکەن و، بە دەم هیدایەتی خواوە ناچن، دوایی بەپێی سیستمێك کە خوا دایناوە، خۆیان بێ بەش دەکەن، لەوەی کە بگەنە ئامانج و مەنزڵ و، بکەونە سەر ڕاستە شەقام، وەك خوا دەفەرمویٚ:

﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ .. ﴿١٧﴾﴾ فصلت.

واتە: گەلی ثەموودمان ڕێنمایی کردبوو، (واتە: ڕێمان پیشان دابوون)، بەڵام کوێریيان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، بۆیە سەرەنجام لەوە کە خوا بیانگەیەنێتە مراد و مەنزڵ و، ڕاستەڕێیان بکات، خۆیان بێ بەش کرد.

### ٥- هەق نەویستن و، ڕق لێ بوونەوەی خواو پێغەمبەرەکەی و شەریعەتەکەی:

ئەمیش هۆکارێکی زۆر گەورەیە، لە ڕێی خواناسیی دا و، کەسانێك شەیتان وا کڵاوی لەسەر ناون، وا لە خشتەی بردوون، کە لە دەروونییانەوە ڕقیان لە خوایە و، ڕقیان لە پێغەمبەرەکەیەتی (صلى الله عليه وسلم) و ڕقیان لە شەریعەت و بەرنامەکەیەتی.

www.alibapir.com



من لەو جۆرە کەسانەم بینیوە، کەسی وام بینیوە گوتوویەتی: من ڕقم لە خوایە، ڕەخنەم لێی هەیە! گوتوومە: ڕەخنەی چیت لێ هەیە؟! گوتوویەتی: ئاخر منی بۆچی دروست کردوە؟ نەدەبوو دروستی کردبام.

ئنجا هەیە دەڵێ: من ڕقم لە موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم)، دەزانم کە پێغەمبەری خوایە، بەڵام ڕقم لێیەتی.

هەروەها کەسی وا هەیە دەڵێ: ڕقم لە ئیسلام و لە شەریعەتە، چونکە ئەو شەریعەتە کۆمەڵێك یاسای تێدان، کە پێیان دەگوترێ: قەدەغەکان (المحرَّمات)، ئەو قەدەغانە ڕێگا دەگرن لەوەی ئەو ئارەزووەکانی خۆی بە شێوەی ناشەرعیی تێر بکات، بۆیە ڕقی لەو شەریعەتەیە کە ڕێی تێر کردنی غەریزەو ئارەزووە ناشەرعییەکانی لێ دەگرێ.

قالۆنچە، کە تەرس و ڕیخ و شیاکە خڕ دەکاتەوە، دەیکاتە تۆپ و پێش خۆی دەدا، دەڵێن: قالۆنچە ئەگەر بۆنی گوڵە باغ و عەتری بۆ بێ، گێژ دەبێ، بەڵام حەز بە بۆنی تەرس و ڕیخ دەکات، هەندێ کەس وا میزاجی ڕووحیی تێکچووە، کە حەز بە کوفر دەکات، حەز بە گوناهو تاوان دەکات، حەز بە دوور لە خوایی دەکات.

کەواتە: ئەوەش یەکێکە لە پەرچەکان، بۆیە خوا لە سووڕەتی (النمل)دا ئاماژەی پێ دەکات، دەفەرموێ:

﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ١٤﴾.

(خوا باسی فیرعەون و دارو دەستەکەی دەکات، دەفەرموێ:) ئەو نیشانەو بەڵگانەی کە مووسا (عليه السلام) هێنا بوونی، نکووڵییان لێکرد، ((جحد) بریتیە لەوەی کە تۆ شتێك بزانی هەقە، بەڵام دانی پێدانەنێی)، دانیان پێدا نەهێنا، هەرچەندە لە دەروونیشیاندا دڵنیا بوون کە ڕاستن، ﴿ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗا ١٤﴾، چاویان لە ستەم و زۆر و خۆ بەرزکردنەوە بوو.

www.alibapir.com







مووسا (علیه السلام) دەیگوت: گەلی (بەنی ئیسرائیل)یش وەك ئێوە مرۆڤن، بەشەرن، مەیانچەوسێننەوە، بەڵام ئەوان حەزیان لەوە بوو زوڵمیان لێ بكەن، حەزیان لەوە بوو خۆیان بەسەردا فەرز بكەن، حەزیان لەوە بوو سۆغرەو بێگاریان پێ بكەن، حەزیان لێ بوو بیانكەنە كۆیلە، وەك فیرعەون دەڵێ:

﴿ فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: ئایا بڕوا بە دوو كەسان بێنین، كە وەك ئێمەن و، گەلەكەشیان كۆیلەی ئێمەیە، یانی: ملكەچی ئێمەن و زەلیل و داماون لەبەر دەستی ئێمەدا، چۆن بڕوایان پێ دێنین!

فیرعەون و دارو دەستەكەی حەزیان لەوە بوو (بەنو ئیسرائیل) بە كۆیلەیی بمێننەوەو سۆغرەو بێگاریان پێ بكەن، بۆیە ڕەتیان كردەوە كە بڕوا بە نیشانەكان و بەڵگەكانی مووسا (علیه السلام) بێنن، هەرچەندە لە دەروونیشیاندا دڵنیا بوون ئەو نیشانانە كە مووسا (علیه السلام) پێشانیان دەدا، بەڵگەو موعجیزەن، بەڵام بەرژەوەندییان لەوەدا بوو، كە بەدوای مووسا (علیه السلام) نەكەون، تاكو بەرژەوەندییە ناشەرعییەكانیان لێ تێكنەچن.

هەروەها خوا لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي فَكَذَّبۡتَ بِهَا وَٱسۡتَكۡبَرۡتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ ﴾ الزمر.

خوا (سبحانە وتعالى) لەگەڵ كەسێك كە لە قیامەتدا دەیدوێنێ و، خۆزگە دەخوازێ كاتێك ئایەتەكانی خوای بۆ دەهاتن، خوا هیدایەتی دابایە، دەفەرموێ: با، نیشانەكانی منت بۆ هاتن، بەڵام بە درۆت دانان و، خۆشت بە زلگرت و سەرەنجام لە بێبڕوایان بووی.

واتە: پەكت نەكەوتبوو لەسەر ئەوە كە نیشانەكانی منت بۆ بێن و، هیدایەتی منت بۆ بێت، بۆت هات، بەڵام تۆ خۆ بەزلگر بووی و بەرژەوەندییت لەوەدا بوو، كە ملكەچ نەكەی بۆ هیدایەت و شەریعەتی خوا، چونكە ئەو ڕاوە ناشەرعییەی كە بەهۆی لادان لە شەریعەتەوە بۆت دەكرا، شەریعەت دەستی دەگرتی!

ئێستاش زۆر لە حوكمڕانە زۆردارەكانی ئەم ڕۆژگارەش، لە هەرێمی كوردستان، لە عێراق، لە هەموو دنیادا، ئەوەی وایان لێ دەكات دژی ئیسلام و تەوژمی ئیسلامیی و شەریعەتی ئیسلامیی بن، هەر ئەوەیە كە ئەگەر ئیسلام حوكمڕان و بێ و دەسەڵاتی هەبێ، ڕێ نادات ئەو خۆی و خزم و حیزبەكەی بكاتە ملیاردێر، خزم و حیزب پڕ بكات و، خەڵك و جەماوەریش قڕ بكات، شەریعەت پێی دەڵێ: (مِنْ أَيْنَ لَكَ هَذَا؟)، ئەوەت لە كوێ بوو؟ ئایا میراتی بابتە بۆت بەجێماوە؟ یان موڵك و ماڵی خەڵكە، دەستت بەسەردا گرتوە؟! وەرە بیهێنەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەوت، وەرە نابێ تۆش لە خەڵكی دیكە زیاترت هەبێ، تۆش هەر بە ئەندازەی خەڵك بەشت بە خێرو نیعمەتەكانی خواوە هەیە! ئنجا بابای وا چۆن ملكەچ دەكات بۆ ئەو شەریعەتە؟!

كەواتە: دەبێ لێرەوە بگەڕێین بۆ شیكردنەوەو هۆكار دۆینەوە (تحلیل)ی هەڵوێستی ئەوانە كە نەیارو دژی شەریعەتی خوای پەروەردگارن.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
عەلی باپیر/AliBapir
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر




## بڕگەی شەش: چۆنیەتی مشت وماڵكرانی دڵ و دەروونی مرۆڤ و، لاچوونی ژەنگ و ژارەكەی:

وەك چۆن مرۆڤ دەگونجێ زگماك و خواڕسكەكەی، ناخ و دەروونەكەی، چڵك و چەپەری گوناهو تاوانان دایپۆشێ، وەك دەفەرموێ:

﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ﴿١٠﴾ ﴾ الشمس.

واتە: (خوا) گوناح كردن و پارێزكردنی فێری مرۆڤ كردوە، (وای لێ كردوە بتوانێ گوناهیش بكاو پارێزیش بكات)، ئنجا بە دڵنیایی كەسێك دەروونی خۆی پاك كردبێتەوەو، چاكی كردبێ، سەرفرازە و، هەر كەسێك خواڕسك و ناخ و دەروونی خۆی شاردبێتەوە، لە بن چڵك و چەپەری گوناهو تاواناندا، ئەوە بەدبەختەو ماڵوێرانە.

یانی: وەك چۆن مرۆڤ دەتوانێ فیطرەتی خۆی تێكبدا و خراپی بكات و، بیخاتە ژێر چڵك و چەپەری گوناهەوە، دەشتوانێ پاكی ڕابگرێ.

ئنجا ئایا دوای ئەوە كە مرۆڤ فیطرەتەكەی تێكدەچێ، چۆن دەتوانێ خۆی مشت و ماڵ بكاتەوە، جارێكی دیكە دڵ و دەروونی خۆی پاك بكاتەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: سێ هۆكاری سەرەكیی هەن بۆ مشت و ماڵكردنی دڵ و دەروون:

**یەكەمین هـــۆكار:** كە لەو بارەوە، خوا ئاماژەی پێداوە، ئەوەیە كە لە كاتی بەڵاو گرفتاریی و لێ قەومان و لە تەنگانەدا، هەموو مرۆڤێك مسوڵمان و نامسوڵمان، بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، خوا (سبحانە وتعالى) لە چەندان شوێن لە قورئاندا، ئەوەی ئاماژە پێداوە و، ئەمەش بەڵگەیەكی زۆر پتەوە لەسەر ئەوە كە خواناسیی، شتێكی ڕۆچوویە لە خواڕسك و زگماكی مرۆڤدا، بۆ وێنە:

www.alibapir.com





١- دەفەرمویَ: ﴿ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ لقمان.

واتە: کاتێك کە شەپۆلێك (وەك سێبەرێك) دەوری دان، دایپۆشین (لە نێو کەشتیی و بەلەمدا)، زۆر بە ساغیی و دڵسۆزانە، زۆر خۆ یەکلاکەرەوانە، لە خوا دەپاڕێنەوە و ملکەچیی خۆیانی بۆ یەکلا دەکەنەوە، کە دەربازیان بکات، ئنجا کاتێك کە دەربازی کردن، هەیانە دووبارە تووشی ستەم و خراپە دەبێتەوە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرمویَ: ﴿ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ تَدْعُونَهُ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَانَا مِنْ هَٰذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ اللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: (خوا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویَ:) بڵێ: (لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان بپرسە) کێ لە تاریکاییەکانی وشکانیی و دەریا دەربازتان دەکات، (واتە: لەو بەڵاو گرفتارییانەی کە وەك تاریکایی شەوە زەنگ وان، بەسەرتان دێن)، کاتێك لێی دەپاڕێنەوە بە لاڵانەوەو کڕووزانەوەو بە پەنهانیی دەڵێن: ئەگەر خوا لەم تەنگانەیە دەربازمان بکات، لە شوکرانە بژێران و سوپاسگوزاران دەبین؟ بڵێ: هەر خوا لەو تاریکاییانەی بەڵاو گرفتارییەکانی دەریاو وشکانیی دەربازتان دەکات و، لە هەموو خەمێکی دیکەش، کەچی دوای ئەوەش ئێوە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن.

٣- هەروەها خوای دەرووکەرەوە لە سوورەتی (یونس)یشدا، دەفەرمویَ: ﴿ هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ حَتَّىٰ إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّا أَنجَاهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰ أَنفُسِكُم مَّتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ يونس.

www.alibapir.com





واتە: خوا ئەو کەسەیە، کە ئێوە لە وشکانیی و دەریادا دەڕوێنێ، (واتە: هۆکارەکانی هاتوچۆی دەریاو وشکانیی بۆ ڕەخساندوون)، هەتا کاتێك کە دەچنە نێو کەشتییانەوە، کەشتییەکان بە بایەکی هێمن ئێوە دەڕوێنن و، ئێوەش دڵخۆش دەبن، کت و پڕ بایەکی بەهێز، گەردەلوولێك دێت و، لە هەموو لایەکەوە شەپۆل دەوریان دەدا و، گومانیان وا دەبێ کە تازە تێچوون، ئابڵووقە دران، لەو کاتەدا زۆر بە ساغ کردنەوەی ملکەچییانەوە بۆ خوا، لە خوا دەپاڕێنەوە: ئەگەر لەمە دەربازمان بکەی، لە سوپاسگوزاران دەبین، کەچی کاتێك دەربازیان دەکات، جارێکی دیکە لەسەر زەوی دەست دەکەنەوە بە دەستدرێژیی و سنوورشکێنیی.

کەواتە: مرۆڤ لە کاتی تەنگانەو ناڕەحەتییەکاندا، ئەو فیطرەت و خوارسکە کە خەواندوویەتی، یاخود بێ هۆشی کردوە، یان وەبن چڵکی گوناهانی خستوە، ئەو فیطرەتە بێدار دەبێتەوەو سەر دەردێنێ، ئنجا هی وا هەیە دوای ئەوەی لە تەنگاناندا فیطرەت و خوارسك و ناخی بێدار بۆتەوە، جارێکی دیکە خۆی ناخەوێنێتەوە و، هەیشە: وەك خوا ئاماژەی پێداوە، جارێکی دیکە، دەگەڕێتەوە سەر بێبڕوایی و خراپەکاریی خۆی.

٤- هەروەها ئایەتی (٥٧)ی سوورەتی (یونس)یش ئاماژە بەوە دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾﴾.

واتە: ئەی خەڵکینە! بە دڵنیایی لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگاریی و شیفا، (واتە: چارەسەری ئەوەی لە سینەکانتان دایە)، بۆتان هات، هەروەها ڕێنمایی و، بەزەیی بۆ بڕواداران.

کەواتە: یەکەمین هۆکار بۆ مشت وماڵ کرانی دڵ و دەروونی مرۆڤ و، لاچوونی ژەنگ و ژارەکەی، ئەوەیە کە ئەو کاتانەی مرۆڤ تێیاندا بەڵادار دەبێ، ئەو ناڕەحەتیی و گرفتارییانەی وەك هەل و دەرفەتێك بقۆزێتەوە: تووشی نەخۆشیی دەبێ، تووشی گرتن دێ، تووشی ناڕەحەتیی دێ، تووشی ئازارێك دێ و، فیطرەتی بێدار دەبێتەوە، ئەوە وەك هەل و دەرفەتێ بقۆزێتەوە.

**دووەمین هـــۆكار:** ئەوەیە كە كار لەسەر خۆی بكا، نەفسی خۆی تەزكیە بكات، دەبێ ئینسان لەگەڵ خۆیدا كار بكات و، كار لەسەر دڵ و دەروونی خۆی بكات: سیفەتە خراپەكانی لێ بژار بكات و، بە سیفەتە چاكەكان بیڕازێنێتەوە، خوای كارزان فەرموویەتی:

﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ١٥ ﴾ الأعلى.

واتە: بە دڵنیایی ئەو كەسە سەرفرازە، كە خۆی پاك و چاك دەكات و، ناوی پەروەردگاری یاد دەكات و، نوێژ دەكات.

**سێیەمین هـــۆكار:** ئەوەیە كە ئینسان گوێ بگرێ بۆ ئامۆژگاریی خوا ئەو قورئانەی كە خوا ناردوویەتی، وەك ئامۆژگاریی و، وەك شیفاو چارەسەر بۆ ئەوەی لە دەروونیدا هەیە و، وەك ڕێنمایی و، ڕەحمەت، لێی بەهرەمەند بێ.

با لەوبارەوە ئاماژە بە دوو فەرموودەی پێغەمبەری خوا موحەممەد (صلى الله علیه وسلم) بكەین:

١- پێغەمبەریش (صلى الله علیه وسلم) ئاماژە بەوە دەكات كە ئینسان كاتێك گوناهی كرد، دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و لێی پەشێمان بێتەوە، نەك لەسەری بەردەوام بێ، وەك دەفەرموێ: {إِنَّ العَبْدَ إِذَا أَذْنَبَ كَانَتْ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ فِي قَلْبِهِ، فَإِنْ تَابَ منها وَنَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ، صُقِلَ قَلْبُهُ، فَإِنْ زَادَ زَادَتْ، فَذَلِكَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَهُ اللهُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤ ﴾ المطففين}، (أَخْرَجَهُ ابن ماجه برقم: (٤٢٤٤)، قال الشيخ الألباني: حسن).

واتە: بەندە (مرۆڤ) كە گوناهێكی كرد، خاڵێكی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ، ئەگەر لێی گەڕایەوە و وازی لێ هێنا و داوای لێبوردنی كرد، دڵ و دەروونی سپی دەبێتەوە، (وەك پێشێ)، بەڵام ئەگەر گوناهەكانی زیاد كردن، خاڵە ڕەشەكانیش زیاد دەكەن، ئەوەش ئەو كەمڕە بەستنەیە كە خوای بەرز لە كتێبەكەی دا باسی فەرموە:

﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤ ﴾ المطففين.

www.alibapir.com





واتە: بەڵكو ئەوەی كە وەدەستی دێنن (لە گوناهو تاوانەكان)، ژەنگی لەسەر دڵیان پەیدا كردوە، (دڵیان كەمڕەی گوناهو تاوانی لەسەر نیشتوە).

٢- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) هەر لەو بارەوە، كە دەبێ ئینسان ئاگاداری دڵ و دەروونی خۆی بێ و، پاكی ڕابگرێ، دەفەرموێ: {إِنَّ هَذِهِ القُلُوبَ تَصْدَأُ كَمَا يَصْدَأُ الحَدِيدُ، إِذَا أَصَابَهُ المَاءُ، قِيلَ: يَا رَسُولَ الله! وَمَا جِلاَؤُهَا؟ قَالَ: كَثْرَةِ ذِكْرِ المَوْتِ وَتِلاَوَة القُرْآن}، (أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي في "الشُّعب" برقم: (٢٠١٤)، وَضَعَّفَهُ الأَلْبَانِي)، واتە: ئەم دڵانە ژەنگ دێنن، وەك چۆن ئاسن ژەنگ دەگرێ، كاتێك كە ئاوی پێ دەكەوێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! بەچی سپی دەبێتەوە، ژەنگەكەی لا دەچێ؟ فەرمووی: بە زۆر یادی مردن كردن و، خوێندنەوەی قوڕئان (یان گوێ لێ گرتنی).

بە پێی ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم): بە هۆی گوناهو تاوان و، خوتخوتەی شەیتانەوە، ئینسان دڵ و دەروونی چڵكن و پیس و پۆخەڵ دەبێ و، هەڵبەتە دڵ و دەروونی پیس و پۆخەڵ و چڵكنیش، ناتوانێ لە خوای پاك و تاك نیزیك بێ!

كەواتە: مشت و ماڵ كردنی دڵ و دەروونی مرۆڤ و لاچوونی ژەنگ و ژارەكەی بەوە دەبێ، كە ئینسان بەهرە وەربگرێ لەو بەڵایانەی كە بەسەری دێن و، بەهرە وەربگرێ لە قوڕئان و، بەهرە وەربگرێ لە تەوبەكردن و گەڕانەوە و، بەهرە وەربگرێ لە یادی مردن، پاشان ئاگای لەخۆ بێ و هەر كاتێك زانی كە شەیتان دنەی دەدا بۆ خراپە، یادی خوا بكات، وەك لە سووڕەتی (الأعراف)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەی پارێز دەكەن، هەر كاتێك هەستی شەیتانیان گەیشتێ، خوایان وەبیر دێتەوە، یەكسەر بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە، (پەی بە پیلان و فێڵەكەی شەیتان دەبەن و، لە زەرەرو زیانی سەلامەت دەبن).

www.alibapir.com





## بڕگەی حەوت و کۆتایی: چەند قسەیەکی نەستەقی هەندێ لە زانایان لە بارەی شایەدیی دانی خوارِسك (فطرة)ەوە، لەسەر بوونی خوا:

**١)- (أحمد بن عطاءالله الأسكندري):** گوتوویەتی:

**أ/** (كَيْفَ يُشْرِقُ قَلْبٌ صُوَرِ الأَكْوَانِ مُنْطَبِعَة فِي مرآتِهِ، أَمْ كَيْفَ يَرْحَلُ إِلى اللهِ وَهُوَ مُكَبَّلٌ بشهَوَاتِهِ، أَمْ كَيْفَ يَطْمَعُ أَنْ يَدْخُلُ حَضْرَةَ اللهِ، وَهُوَ لَمْ يَتَطَهَّرُ مِنْ جِنَابَةِ غَفلاَتِهِ، أَمْ كَيْفَ يَرْجُوا أَنْ يَفْهَمَ دَقَائِقَ الأَسْرَارِ، وَهُوَ لَمْ يَتُبْ مِنْ هَفَوَاتِهِ)[١].

واتە: دڵێك چۆن ڕۆشن دەبێتەوە، کە وێنەی دروستکراوەکان هەمیشە لە ئاوێنەکەیدا هەبێ! (واتە: دڵی هەمیشە پەیوەست بێ، بە دنیاوە و دیل و کۆیلەی دروستکراوەکان بێ)، یان چۆن دەتوانێ بەرەو خوا بڕوا، لە کاتێکدا کە بە ئارەزووەکانی کەلەبچە کراوە! یان چۆن دەتوانێ بچێتە خزمەت خوا، لە کاتێکدا، کە لە لەش پیسیی بێ ئاگاییەکان خۆی پاك نەکردۆتەوە! یان چۆن دەتوانێ لە وردەکارییەکانی نهێنییەکان تێ بگات، کە جارێ لە وردە گوناهەکان نەگەڕاوەتەوە! (نەك لە گوناهە درشتەکان، دەبێ لە گوناهە وردەکانیش بگەڕێتەوە، ئنجا لە وردە نهێنییەکان تێ دەگات).

**ب/** (إِلَهِي! كَيْفَ يُسْتَدَلُّ عَلَيْكَ بِمَا هُوَ فِي وجُودِهِ مُفْتَقِرٌ إِلَيْكَ! أَيَكُونَ لِغَيْرِكَ مِنَ الظهُورِ مَا لَيْسَ، لَكَ حَتَّى يَكُونَ هُو المُظْهِرُ لَكَ؟ مَتَّى غِبْتَ، حَتَّى تَحْتَاجَ إِلى دَلِيلٍ عَلَيْكَ! وَمَتَّى بَعُدْتَ، حَتَّى تَكُون الآثَار هِي الَّتي تُوصِلُ إِلَيْكَ؟ عَمِيَتْ عَيْنٌ لا تَرَاكَ عَلَيْهَا رَقِيباً، وَخَسِرَت صَفْقَة عَبْدٍ، لَمْ يَجْعَل لَهُ مِنْ حُبِّكَ نَصِيْبَاً)[٢].

واتە: ئەی خوایە! چۆن بەڵگە لەسەر بوونی تۆ دەهێنرێتەوە بە شتێك، کە بۆ بوونی پێویستیی بە تۆیە، (نکووڵیی لەوە دەکات کە ئێمە گەردوون بکەینە

---

(١) (إيقاظ الهِمَم في شرح الحِكَم، ج٢، ص٤٧١).

(٢) (إيقاظ الهمم في شرح الحِكَم، ج٤٧١ - ٥٤٧).

www.alibapir.com



بەڵگە لەسەر بوونی خوا، ئەم گەردوونە پێویستیی بە خوایە، ئنجا چۆن ئەوەی کە پێویستیی بە خوایە، دەکرێتە بەڵگە لەسەر بوونی خوا؟)، ئایا دەبێ جگە لە تۆ هێندە ئاشکرا بێ، کە تۆ هێندە ئاشکرا نەبی، تا ئەو تۆ ئاشکرا بکات! تۆ کەی پەنهان بووی، تاکو پەکت لەسەر ڕێنماییەك کەوتبێ، بۆ لای تۆ ڕێنماییمان بکات! یان تۆ کەنگێ دوور بووی، تاکو شوێنەوارەکان ئێمە بگەیەننە لای تۆ؟ ئەو چاوە کوێر بێ، کە هەمیشە تۆ بەسەر خۆیەوە چاودێر نابینێ و، ئەو مرۆڤە هەر لە زیان و زەرەردا بێ، کە پشك و بەشی لە خۆشەویستیی تۆدا نیە.

٢)- (**مەولەویی تاوگۆزیی**)یش، شاعیر و عاریف و خواناس، ئەم چوارینەیەم لێ هێناوەتەوە، یان ئەو هەشت دێڕە شیعرە، دەڵێ[1]:

| | |
|---|---|
| مِمَّنْ بِــهِ لِمَنْ عَلَيْهِ يَسْتَدِل | مَسَافَة لاَ تَسْتَظِل لا تُسْتَزَل |
| عَلَيْـكَ بالحَـرَكَةِ السَّـرِيعَــة | مِنْ ذِي لِذِي المَرْتَبَة الرَّفِيعَة |
| وَاخْتَرْ مِنَ الصَّفَّيـن أَي صَفِّ | شِـئْتَ فَفِــيهِ فَكْرًاَ أَو صَفِّ |
| فَاحْفَظْ تَفَهَّم ثُمَّ انظُر صَدِّق | عِلْمَا فَعَيْنَاً ثُمَّ حَــقًّا حَقِّــق |

واتە: لە کەسێك کە خوا دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی گەردوون، (ممن به)، واتە: ئەو کەسەی کە خوا بە بەڵگە دێنێتەوە، لەسەر ئەوەی کە ئەم گەردوونە هەیە، هەتا دەگاتە کەسێك کە گەردوون دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خوا (سبحانە وتعالى)، ماوەیەکی زۆر هەیە، بۆیە ڕامەوەستەو مەچۆ سێبەران و با نەخلیسکێنرێی.

زۆر بە خێرایی برۆ، لەم پلەیەوە (کە تۆ گەردوون بکەیە بەڵگە، لەسەر بوونی خوا)، بۆ ئەو پایە بەرزە (کە خوا بکەیە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە گەردوون هەیە).

---

(١) الوسيلة في شرح الفضيلة، ص٧٢، نووسینی مامۆستا مەلا (عەبدولکەریمی مودەڕریس)ە، چاپی یەکەم، ساڵی: ١٩٧٣ز.

www.alibapir.com



(ئەم قسەیەی مەولەویی: هەندێك لە زانایانی ڕۆژئاوایی و، هەندێك لە فەیلەسووفەکانیش، کردوویانە و گوتوویانە: ئەسڵەن ئێمە بەڵگەمان لەسەر ئەوە، کە ئەم گەردوونە، هەیە و، ئەم دەوروبەر و دروستکراوانە هەن، ئەوەیە کە خوا هەیە، چونکە خوا دەفەرمویٚ: من دروستم کردوون، ئەگەرنا متمانەمان بە بوونیان نەدەبوو).

دوایی مەولەویی دەڵێ:

(وَاخْتَرْ مِنَ الصفين أَي صَفٍّ شِئْتَ فَفِيهِ فكّراً أَو صَفٍّ).

واتە: لە دوو ڕیزەکان، یان لە دوو کۆمەڵەکان، هەر کامیان هەڵدەبژێری، هەڵبژێرە، هەر کامێکیانت دەویٚ، هەڵبژێرە:

١- یان بیر بکەوە و بە بیرکردنەوەی خۆت و، بە تێوە ڕامانت لە بوونەوەر، لە گەردوون، خوا بناسە.

٢- یاخود دەروونی خۆت پاکبکەوە و، ئاوێنەی دڵت پاك بکەوە، بۆ ئەوەی خوای پەرەوەردگاری تێدا تەجاللا بکات و بدرەوشێتەوە.

(فَاحْفَظْ تَفَهَّم ثُمَّ انْظُر صَدِّق عِلْمَا فَعَيْنَاً ثُمَّ حَقَّا حَقِّق).

واتە: بەڵگەکان لەبەر بکەو تێیان بگە، پاشان سەرنج بدەو بە ڕاست بزانە، پێشیٚ (علم اليقين)ت دەست دەکەویٚ، دوایی (عين اليقين)، دواییش دەگەیە (حق اليقين).

چونکە زانایان دەڵێن: زانین سیٚ پلەی هەن:

(١- علم اليقين. ٢- عين اليقين. ٣- حق اليقين).

١- زانیارییەکی جێی دڵنیایی.

٢- زانیارییەك وەك بە چاو شتەکە ببینی.

٣- زانیارییەك وەك بە دەست، شتەکە دەست لیٚ بدەی.

www.alibapir.com







بۆ وێنە:

ئەگەر باسی هەنگوین بکەین، کەسێك کە هەنگوینی نەبینیبێ، بە سێ قۆناغان بە هەنگوین ئاشنا دەبێ:

**قۆناغی یەکەم:** بۆی باسی هەنگوین بکرێ، کە خواردنێکی زۆر بە سوود و خۆشە و ئاوایە و، هەنگ بەو شێوەیە دروستی دەکات و، تامەکەی ئاوایە و... هتد، تاکو تەواو زانیاریی لە بارەیەوە پەیدا دەبێ، ئەوە پێی دەگوترێ: زانیاریی دڵنیا بوون (علم اليقين).

**قۆناغی دووەم:** ئەوەیە کە شانە هەنگوینێکی پێشان بدەن، یان پوورە هەنگێك و خەڵیفە هەنگێکی پێشان بدەن، (صندوقی شانە هەنگوینەکە) و، بڵێن: ئەوەتا هەنگوین! ئەوەش دیتنی دڵنیا بوون (عين اليقين)ە.

**قۆناغی سێیەم:** ئەوەیە کە لەو هەنگوینە بچێژێ، ئەوەش ئەو پەڕی دڵنیایی (حق اليقين)ە.

ئنجا مەولەویی دەڵێ: (عِلْمَا فَعَيْنَاً ثُمَّ حَقًّا حَقِّقْ)، پێشێ زانیاریی جێی دڵنیایی(علم اليقين)ت، هەبێ، دوایی بگە بە (عين اليقين)، پاشان بگە بە (حق اليقين).

٣)- (**إبن البنا السرقسطي**)یش لەو بارەوە، گوتوویەتی:

| | |
|---|---|
| والقوم في هذا على فرقين | وحكمهم فيه على ضربين |
| ففرقة طريقهم مَبْنيَّة | على العقائد وحسن النية |
| قالوا فإن النفس كالمرآة | ينطبع الماضي بها والآتي |
| وَإِنَّما يعوقها أشياء | ترك المحاذاة أو الصِّداء |
| قالوا وإن العين قد تغور | وإنما يُخرجها الحفير |
| وأجمعوا أن علاج الأصل | أقرب للبئر معاً والنَّيْل |
| فما إليه أبداً نُشير | هو علاج النفس والتَّطهير |

www.alibapir.com





وهــــذه طريقـــة الإشراق كانت وتبقى ما الوجود باقي
وفـــرقـــة قـــالوا بأن العـلما من خارجٍ بالإكتساب أســـما
وشرطوا العلوم فـــي اصطلاحه إذ لاغنىً للباب عن مفتاحه
فليس للطامع فيـــه مطمـع ما لم تكُنْ فيه علوم أربـــع
وهي علوم الذات والصـــفات والفـقـه والحـديث والآلات
وهـــذه طريقـــة البـرهـــان وهـي لكـل حـازمٍ يقـظان[1].

هەر بە کورتیی مانایان دەکەین، ئەگەرنا ئەو شیعرانە، شەرح و لێکدانەوەی زۆریان دەوێ و، لە کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان)دا، بە درێژیی شەرحی ئەو شیعرانەمان کردوە.

دەڵێ: کۆمەڵی خواناسان لە بواری خواناسییەوە، دوو بەشن و، حوکمەکەیان دوو جۆرە:

**کۆمــەڵی یەکــەم:**

کۆمەڵێکیان ڕێبازەکەیان لەسەر عەقیدەی پاك و نیەتی چاك، واتە دڵ و دەروونی پاك، بنیات ناوە.

گوتوویانە: نەفس وەك ئاوێنە وایە، ڕابردوو و داهاتووی تێدا ڕەنگ دەداتەوە، بەڵام ئەوەی کە ڕێ لە نەفس و فیطرەت دەگرێ، خوا بناسێ و شتەکانی تێدا ببینرێن، چەند شتێکن:

کە دووانیان سەرەکیین:

أ- یان ئەوەتا ڕووبەڕووی نیە.

ب- یاخود ژەنگ، گرتوویەتی. (واتە: یان کەسەکە ڕوو لە خوا ناکات، یان بە گوناهان ژەنگی لەسەر دڵ پەیدا بووە).

---

(١) الفتوحات الإلهية شرح المباحث الأصلية، ج١، ص ١٢١ تا ١٢٥، على هامش "إيقاظ الهمم في شرح الحكم"، للعارف بالله أحمد بن محمد بن عجيبة.

هەروەها گوتوویانە: سەرچاوەش جاری وایە، ئاوەكەی ڕۆ دەچێ، بەڵام دوایی بیر هەڵكەن، ئاوەكە دەردەهێنێتەوە، (واتە: مرۆڤ ئەگەر زۆر لەگەڵ خۆی دا خەریك بێ و فیطرەتی خۆی پاك بكاتەوە، خواناسیی لە ناخییدا هەیە).

هەروەها شارەزایان هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، كە چارەسەركردنی ئەسڵەكە، باشترە لەوەی كە بیرێكی دیكە لێ بدرێت و ئاوی لێ دەربهێندرێ.

بۆیە ئەوەی كە ئێمە، بە چاكی دەزانین بۆ خواناسیی، ئەوەیە كە نەفسەكە چارەسەر بكرێ و پاك بكرێتەوە.

ئەمەش پێی دەگوترێ: ڕێبازی درەوشاندنەوەی دڵ و دەروون، كە هەر هەبووە و هەتا بوون (وجود) بمێنێ، ئەویش بەردەوام دەبێ.

## كۆمەڵی دووەم:

كۆمەڵێكی دیكەش گوتوویانە: وا باشە زانیاریی لە دەرەوەڕا بهێنرێ، (واتە: تەماشای گەردوون و دەوروبەر بكرێ، بۆ خواناسیی)، بەڵام بۆ ئەوەش چەند مەرجێكیان داناون، چونكە هیچ دەرگایەك بەبێ كلیل ناكرێتەوە و، گوتوویانە: هیچ كەسێكی ئومێدەوار ناتوانێ بە ئامانج بگات لەو ڕێیەدا، مەگەر چوار جۆرە زانیاریی هەبن:

ئەوانیش:

١- زانیاریی بە خوای پەروەردگارو بە صیفەتەكانی.

٢- زانیاریی و شارەزایی بە شەرع.

٣- زانیاریی بە فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

٤- زانیاریی بە ئامرازەكان، (واتە: ئەو ئامرازانەی كە پێیان لە قورئان و سوننەت دەگات)، ئەمەش پێی دەگوترێ: ڕێگای بەڵگە هێنانەوە(برهان)، ئەویش بۆ هەر كەسێكی وریای بێداری خەمخواردوویە.

www.alibapir.com





٤)- **(رینــە دیكــارت):** قسەیەكی هەیە، پێی دەگوترێ: (كوجیتو)، تەرجەمە عەرەبییەكەی: (أَنَا أُفَكِّر إِذَاً أَنَا مَوجُود)، واتە: (من بیر دەكەمەوە، لەبەر ئەوە دەزانم كە هەم)، بەو قسەیە ناسراوە.

لەو بارەشەوە كە ئێمە قسەی لێ دەكەین، قسەیەكی نەستەق و قووڵ و جوانی هەیە، دەڵێ:

كاتێك تەماشا دەكەم، هەست دەكەم بە هەبوونی بوونێك، كە لەو پەڕی تەواوییدایە، دوایی بیردەكەمەوە: ئایا دەبێ ئەو هەستەم، ئەو هەستكردنەم بەو بوونە تەواوە، لە كوێوە هاتبێ؟ تەماشای خۆم دەكەم، دەكەومە گومانەوە، خۆم نوقسانیی و ناتەواوییم هەیە، كەواتە: ناگونجێ ئەو هەستكردنە بەو بوونە تەواوە، لە منەوە هاتبێ، چونكە خۆم ناتەواوم و ناتەواو (ناقص)یش، تەواو (كامل)ی لێوە نایەت! ئایا ئەو هەستە لە دەوروبەرمەوە هاتوە؟! تەماشای شتەكانی دەوروبەریشم دەكەم، ئەوانیش بە هەمان شێوە، هەر ناتەواون و ناڕێك و پێكییان تێدا هەیە، كەواتە: نابێ لەوانیشەوە هاتبێ.

كەواتە: ئەو هەستەی من بەرانبەر بە بوونێكی تێرو تەواو، كە ئەو پەڕی زانیاریی و، ئەو پەڕی حیكمەت و، ئەو پەڕی دەسەڵات و، ئەو پەڕی هەموو سیفەتێكی باشی هەیە، لە خودی بوونی ڕەها و ڕاستەقینەوە، هاتوە، كە خوای پەروەردگارە.

واتە: لێرەدا (دیكارت) وەك ئەو عاریفانەی هەر خودی خوا (سبحانه وتعالى) دەكەنە بەڵگە لەسەر بوونی، نەك لە دەرەوەی خۆی، بەڵگە بۆ ئیسپاتی بوونی، بێننەوە، بیر دەكاتەوە.

www.alibapir.com









## باسی دووەم



## عەقڵ شایەدیی بۆ بوونی خوا دەدات

**یاسای یەکەم:** سروشتی بوون (طبيعة الوجود).

**یاسای دووەم:** هەموو پەیدابوویەك پەیداکەرێکی هەیە (لِكُلِّ حَادِثٍ مُحْدِث).

**یاسای سێیەم:** هەر شتێك بوون و نەبوونی یەکسان بن، بەبێ زاڵکەرێك لایەکیان زاڵ نابێ (يَسْتَحِيلُ الترْجِيحُ بَيْنَ طرَفَيْنِ مُتَسَاوِيين بلا مُرجِّح).

**یاسای چوارەم:** نەداری شتێك، ئەو شتەی پێ نابەخشرێ: (فَاقِدُ الشّيءِ لاَ يُعْطِيهِ).

**یاسای پێنجەم:** هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە (لِكُلِّ نظامٍ مُنظِّمٌ).

**یاسای شەشەم:** مشوورخۆریی و سەرپەرشتیاریی، بەڵگەی هەبوونی مشوورخۆرو سەرپەرشتیارە.

**یاسای حەوتەم:** وەڵامدانەوەی سەرجەم داخوازییەکانی دروستکراوەکان، بەڵگەی هەبوونی وەڵامدەرەوەیەکە.

www.alibapir.com



## دەســتپێك

بەڕێـــزان!

بێگومان شایەدیی دانی عەقڵ، - کە بە کوردیی (ژیریی) و (هۆش) و (زەین)ی بۆ بەکاردێنن - شایەدیی دانی عەقڵ لەسەر بوونی خوا (سبحانە وتعالی)، لە میانی چەند یاسایەکی عەقڵیی دایە، کە زانایان زۆر لەو بارەوە قسەیان کردوە و، لێکۆڵینەوەی زۆریان لەو بارەوە کردوە.

ئنجا بەندە بە بەهرە وەرگرتن لە بەرهەمی زانایان، چ هی پێشێ، چ هی دوایی، چ هی زانا مسوڵمانەکان، چ هی نا مسوڵمانەکان، ئەو بابەتەم زۆر توێژیوەتەوە و، لە تەتەڵەو بێژینگم داوە و، سەرەنجام خوا پشتیوان بێ، هەوڵدەدەم لەبەر ڕۆشنایی حەوت (٧) یاسای عەقڵییدا، باسی چۆنیەتی شایەدیی دانی عەقڵ بکەم، لەسەر بوونی خوا (سبحانە وتعالی)، کە دیارە لە کتێب و سەرچاوەکانی دیکەدا، نەمبینیوە، ئاوا بەو شێوەیە ئەو حەوت (٧) یاسایە عەقڵییە، بە یەکەوە و لە پاڵ یەکدا باس بکرێن، لە بواری چۆنیەتی شایەدیی دانی عەقڵ دا، لەسەر بوونی خوا (سبحانە وتعالی).

خواش پشتیوان بێ لە بەشی سێیەمدا، بە ناوونیشانی: (سەرگوزشتەی ئیلحادو هۆکارە ڕاستەقینەکانی)، ئێمە لەوێدا هەر کام لەو گومانانەی، وەك: ١- ئەزەلیی بوونی ماددە و گەردوون، ٢- بە ڕێککەوت دروست بوونی ماددەو گەردوون، ٣- هەروەها ئەو قسەیەی کە دەڵێ: ئەگەر هەموو شتێك بەدیهێنەرێکی هەیە، ئەدی بەدیهێنەری خوا کێیە؟ هەروەها چەندان شوبهەو گومانی دیکە، لە بەشی سێیەم دا پووچەڵ دەکەینەوە و، لێرە ناچینە سەروکاری ئەو باسانە.

www.alibapir.com





لێرەدا تەنیا ئەو یاسا عەقڵییانەی کە عەقڵ بە هۆیانەوە، شایەدیی دەدا لەسەر بوونی خوا (سبحانه وتعالى)، دەخەینە ڕوو:



## یاسای یەکەم: سروشتی بوون (طبيعة الوجود):

کاتێك مرۆڤ بە عەقڵ لە بوون (وجود)ەوە ڕادەمێنێ، دەبینێ کە ناگونجێ لە سێ جۆران بەدەر بێ، یانی: موتڵەقی بوون، دەبێ یەکێ لەو سێ جۆرانە بێ:

١-بوون پێویست (واجب الوجود)، ئەویش ئەوەیە کە پێویستە هەبێ و ناگونجێ نەبێ.

٢- بوون گونجاو (ممكن الوجود)، کە دەگونجێ هەشبێ و نەشبێ، واتە: نە (بوونی) پێویستە، نە نەبوونی.

٣- بوون مەحاڵ (مستحيل الوجود)، یان (محال الوجود)، کە ناگونجێ هەبێ و، هەر دەبێ نەبێ.

بە گشتیی، کە بە شێوەیەکی عەقڵیی تەماشای بوون دەکەین، ئاوا دێتە بەرچاو، لەو سێ حاڵە بەدەر نیە.

ئنجا کاتێك تەماشای گەردوون دەکەین، خۆمان، دەوروبەرمان، گەردوون بە سەروو خوارییەوە، واتە: بە ئاسمان و زەوییەوە، دەبینین، گەردوون لە جۆری: بوون گونجاو (ممكن الوجود)ە.

چونکە دەگونجا نەبێ، هەر شتێ بگرە، دەگونجا نەبێ، خۆت وەك مرۆڤ، ڕووەکێك، ئاژەڵێك، ئاسمان، زەوی، چیا، هەرچی دەیبینی، ئەگەر نەشبووایە، هیچ نەدەقەوما، کەواتە: بوونەکەی گونجاوە، یانی: لە جۆری بوون گونجاو(ممكن الوجود)ە، واتە: دەشگونجا هەبێ و دەشگونجا نەبێ.

ئنجا هەر کام لە دروستکراوەکان بگری، نەبوون (عَدَم)ی پێشکەوتوە، واتە: کاتێك بووە، نەبووە، هەرچی کە هەیە نەبوون(عَدم)ی پێشکەوتوە، بە تایبەت کە

ئێستا بیردۆزەی تەقینەوەی مەزن، پەیدا بووە، كە لە ڕاستییدا ئەو تەعبیرە بە بۆچوونی من تەعبیرێكی نارێكە: (Big bang) تەقینەوەی گەورە، چونكە ئەو حاڵەتەی كە ئەم گەردوونەی پێ پەیدا بووە، بریتی نەبووە لەم تەقینەوە، تەقینەوە (إنفجار) ئاماژەیەكی تێدایە بۆ شتێكی بێ سەروبەر، یان شتێك كت و پڕ قەومابێ، بەڵام ئەم گەردوونە بە شێوەیەكی زۆر پڕ وردەكاریی و سیستماتیك، دروستكراوە، كە هەر لە زانیاریی بێ سنووری خوا دەوەشێتەوە، بەو شێوەیە دروستی بكات، كەواتە: وشەی تەقینەوە، گونجاو نیە.



وێنەی (١) Bing Bang Theory

بەڵام بە هەرحاڵ وەك زاراوەیەك وا هاتوە، بەڵێ هەرچی كە هەیە و ئێمە دەیبینین - یان نایبینین - هەمووی نەبوونی پێشكەوتوە، بە تایبەت كە ئێستا كە ئەو بیردۆزەی تەقینەوەی گەورە (Big bang)، پەیدا بووە، جاران هەر زانا خواناسەكان دەیانگوت: ئەم گەردوونە لە نەبوونەوە هاتوە، بەڵام ئێستا مولحیدەكانیش دەڵێن: كاتێك بووە، گەردوون نەبووە، بۆ وێنە دەڵێن: سێزدە ملیارو حەوت سەد ملیۆن (١٣،٧٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، یان ئەو پەڕەكەی پازدە ملیار (١٥،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، هیچ شتێك نەبووە، نە كات هەبووە، نە شوێن هەبووە، نە گەردوون هەبووە، نە زەوی هەبووە، نە ئاسمان هەبووە، هیچ شتێك نەبووە.

www.alibapir.com



کەواتە: ئەم گەردوونە، ئەم دەوروبەرە بە ماددەکەیەوە، بە پێکهاتەکانی ماددەوە، هەمووی لە جۆری بوون گونجاو(ممكن الوجود)ە، واتە: بوونەکەی خودیی (ذاتي)نیە و، بوونێکی ڕاستەقینەی نیە، بەڵکو بوونێکە پێی دراوە.

ئنجا ئەو بوونە کە بەو گەردوونە دراوە، ناگونجێ لە نەبوونەوە پێیدرابێ، چونکە وەك گوتمان: بوون سێ جۆرە: یان بوونەکەی پێویستە، یاخود مەحاڵە، یاخود گونجاوە.

ئەدی ئایا ئەو بوون گونجاو (ممكن الوجود)ە، لە کوێ پەیدا بووە؟! ناگونجێ بڵێی: لە نەبوونەوە هاتووە، چونکە نەبوو(عَدَم) هیچ نیە، کەواتە: دەبێ ئەم بوونە، ئەم گەردوونە کە لە جۆری بوون گونجاو(ممكن الوجود)ە، لە بوونێکەوە هاتبێ کە بوونەکەی پێویستە، یانی: نەدەگونجا نەبێ و، بوونەکەشی بوونێکی خودیی(ذاتي)یە و، کاتیی(مُؤَقَّت)نیە، کە نەبوونی پێشکەوتبێ، یان نەبوونی بەسەردا بێ، هەروەها بوونەکەی خوازراو (مُستعار)یش نیە، هی خۆی نەبووبێ، بوون پێویست (واجب الوجود)، واتە: بوونەکەی زاتییە و هی خۆیەتی، نەبوون(عدم)ی پێشنەکەوتوە و، نەبوونیشی بەسەردا نایەت، بەڵام بوون گونجاو (ممكن الوجود) نەبوونیشی پێشکەوتوە و، نەبوونیشی بەسەردا دێ و، بوونەکەشی بەردەوام نیە، بەڵکو خوازراو و کاتییە و لە خۆیەوە نیە، ئنجا ئەو بوون پێویستەش، تەنیا دەبێ خوا بێ (سبحانە وتعالى).

بە کورتیی: کە تۆ بە عەقڵ تەماشا دەکەی: دەبینی جگە لە خوا (سبحانە وتعالى)، هەموو شتەکانی دیکە بوونەکەیان خوازراو (مستعار)ە و، وەرگیراوە و، هی خۆیان نیە، هەروەها بوونەکەیان کاتییە، وەك لەم دوو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (طه)دا هاتوە، کە فیرعەون لە مووسا(علیە السلام) دەپرسێ:

﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾.

واتە: ئەی مووسا! پەروەردگاری ئێوە، خاوەنی ئێوە، بەدیهێنەری ئێوە، کێیە؟

﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾.

www.alibapir.com



مووسا (علیه السلام) فەرمووی: پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە کە بوونی بەهەموو شتێك داوە، دوایی ڕێنماییشی کردوە، واتە: ڕێکیخستوە و سیستماتیکی کردوە.

کەواتە: یەکەمین سیفەتی خوا، یەکەمین تایبەتمەندیی خوا، ئەوەیە کە بەدیهێنەر(خالق)ە، واتە: پەیداکەر و بوون بەخشەرە:

﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ﴿٥٠﴾ ﴾.

بوونی بە هەموو شتێك داوە، هەموو شتێکی هێناوەتە دی، بەڵام خۆی بوونەکەی، بوونێکی زاتییە و لە خۆیەوەیەتی و، بوونێکی خوازراو نیە، لە شوێنێکی دیکە وەریگرتبێ.

هەڵبەتە ئەو مەسەلانە، دەمەوێ زۆر بە کورتیی و بە ڕوونیی، باسیان بکەم، بە جۆرێك کە هەموو خوێنەرانی بەڕێز، یاخود زۆربەی هەرە زۆریان، چاك لێیان تێ بگەن، ئەگەرنا ئەمانە لە کتێبەکانی فیکر و فەلسەفەو، عەقیدە و (علم الکلام)دا، بە شێوازو تەعبیری قورس و ئاڵۆز داڕێژراون، بەڵام من هەوڵدەدەم زۆر شییان بکەمەوە و ئاسانیان بکەم، بۆ لێ تێگەیشتن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معکم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
عەلی باپیر/AliBapir
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com




## یاسای دووەم: هەموو پەیدابوویەك پەیدا‌كەرێكی هەیە (لِكُلِّ حَـادِثٍ مُـحْـدِثٌ):

(هەر شتێك پەیدا بوو بێ، دەبێ پەیداكەرێكی هەبێ)، ئەوەش یاسایەكی عەقڵییە، ئەم یاسایە بە یاسای هۆكاریی (قانون السَّبَبيَّة)یەش، تەعبیری لێ دەكرێ، پوختەكەشی ئەوەیە: كە بە سەرنجدانی گەردوون و پێكهاتەكانی گەردوون (كَون)، دڵنیا دەبین كە لە نەبوون(عَدَم)ەوە پەیدابوون، چونكە هەر كام لە پێكهاتەكانی گەردوون بگری، نەبوون (عَدَم) پێش بوونی كەوتوە، بۆ وێنە: تەماشای خۆت بكە! كاتێك بووە، نەبووی، هەروەها باب و دایكت، كاتێك بووە نەبوون و .. هتد.



وێنەی (٢) گـەردوون

ئنجا وەك گوتم، ئێستا فیزیای نوێ، گەردووناسیی نوێ، بۆ هەموو گەردوون، خاڵێكی سفرو دەستپێكیی داناوە، كە پێش ئەوە، نەبووە، هەرچەندە جۆرێك لە ڕاجیایی هەیە لە تەقدیر كردن و بە مەزەندە گرتنی ئەو كاتەدا:

١) هەندێك دەڵێن: سێزدە ملیارو حەوت سەد ملیۆن (١٣٧٠٠٠٠٠،٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش.

www.alibapir.com



٢) هەندێك دەڵێن: چواردە ملیار (١٤٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ.

٣) هەندێك دەڵێن: پازدە ملیار (١٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ساڵ.

٤) هەندێك دەڵێن: دە ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ساڵ.

کە ئەوە بەشێك لە ڕاجیایی بە مەزەندە گرتنی زانایانی پسپۆڕی ئەو بوارەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە پێش ئەو پازدە ملیار (١٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە، یان ئەو سێزدە ملیارو حەوت سەد ملیۆن (١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە، هیچ شتێك بوونی نەبووە.

ئنجا هەر شتێك لە نەبوونەوە پەیدا بووبێ، دەبێ پەیداکەرێکی هەبێ، دەبێ وەدیهێنەرێکی هەبێ، کە بوونی پێدابێ، چونکە یاسایەکی بەڵگە نەویستی عەقڵییە، کە: (بوون لە نەبوونەوە پەیدانابێ، مەگەر بەدیهێنەرێك وەدی بێنێ).

ئنجا با تەماشا بکەین، بۆ تەفسیری پەیدا بوونی، هەر پەیدابوو(حادث)ێك کە نەبووەو پەیدا بووە، سێ ئەگەر (إحتمال)ی هەن:

١)- ئەگەری یەکەم: کە بەدیهێنەرێك دروستیکردبێ.

٢)- ئەگەری دووەم: کە ئەو وەدیهێنراوە، شتێکی دیکە، وەدی هێنابێ و، ئەویش شتێکی دیکەو، ئەویش شتێکی دیکەو، ئاوا وەك زنجیرەی بێ کۆتایی (التسلسل اللاَّنِهَائِي) بڕوات!

٣)- ئەگەری سێیەم: ئەوەیە کە هەر کام لە دروستکراوەکان یەکدییان دروست کردبێ: (ئەلیف)، (با)ی دروستکرد بێ، (با)ش (ئەلیف)ی دروستکرد بێ، ئەمەش لە زانستی لۆژیك (منطق)دا، (دَوْر)ی پێدەگوترێ.

بێگومان ئەگەر بە عەقڵ تەماشا بکەین: ئەگەری دووەم و سێیەم، هیچ عەقڵێك قبووڵیان ناکات، واتە: ناگونجێ زنجیرەی بێ کۆتایی، بێ: ئەم شتە ئەوەی پێشێ دروستیکردوە و، ئەوەی پێشێش ئەوی دیکە و، ئەوی دیکەش ئەوی دیکە، تاکو دەڕوات! چونکە زنجیرەی بێ کۆتایی (التسلسل اللاَّنِهَائِي)

www.alibapir.com



مەحاڵی عەقڵییە و، هیچ شتێك ناگونجێ بێ کۆتایی بەردەوام بێ، بەرەو قووڵایی ڕابردوو و، سەرەتایەکی نەبێ، ئەگەر باسی خوا بکرێ، دەڵێین: خوا پەیدا بوو(مُحْدَثْ) نیە، تاکو پێویستیی بە پەیداکەر (مُحْدِث) هەبێ، بەڵکو خوا بوونەکەی هەر بووە، بەڵام ئەو شتانەی کە لە نەبوونەوە هاتوون، دەبێ پەیداکەرێکیان هەبێ و، دەبێ زنجیرەی پەیدابوونیان لە شوێنێك بوەستێ و، ناگونجێ بە قووڵایی ڕابردوودا، بێ کۆتایی بڕوات، ئەوە هەر وەهم و خەیاڵ دروستی دەکات، ئەگەرنا لە ڕاستییدا شتێکی نەگونجاو و دژی عەقڵە.

بۆ ڕوونکردنەوەی مەحاڵ بوونی (زنجیرەی بێ کۆتایی)، هەم زانا ڕۆژئاواییەکان، هەم زانا مسوڵمانەکانیش، ئەم وێنەیان هێناوەتەوە:

ئەگەر سەربازێك فەرمانی پێکرابێ تەقە لە کەسێك بکات، بەڵام ئەو سەربازە پێویستیی بەوە بێ، کە لە کەسێکی سەرووی خۆیەوە فەرمان وەربگرێ، ئەویش پێویست بەوە بکات، لە کەسێکی سەرووی خۆیەوە، ئەویش پێویست بکات لە سەرووی خۆیەوە، هەروا بڕوا، ئەگەر نەگاتە کەسێك و لەوێ بوەستێ، مانای وایە: ئەو سەربازە هەرگیز ئەو تەقەیە ناکات، چونکە ناوەستێ لە شوێنێك و زنجیرەیەکی بێ کۆتایی یە!

کەواتە: ئەوە مەحاڵە، مەحاڵێکی عەقڵییە.

هەروەها ئەوەش کە هەر کام لە شتەکان، یەکدییان دروست کردبێ، (ئەلیف)، (با)ی دروست کردبێ، (با)ش (ئەلیف)ی دروست کردبێ، ئاسمان، زەوی دروست کردبێ و، زەوی ئاسمانی دروست کردبێ، ئەوەش هەر مەحاڵە، چونکە ناگونجێ شتێك لە یەك کاتدا، پەیداکەریش و پەیداکراویش بێ، خالیقیش بێ و مەخلووقیش بێ.

کەواتە: هەر ئەو ئەگەرەیان مەنتیقییەو عەقڵ قبووڵی دەکات، کە: دەبێ هەر پەیدابوویەك بەدیهێنەرێکی هەبێ و، ئەو بەدیهێنەرەش بوونەکەی لە خۆیەوە بێت، بوونێکی بێ سەرەتای هەبێ و، بوونێکی خودیی هەبێ و خوازراو نەبێ و، بوونێك بێ، نەبوونی بەسەردا نەیەت، کە ئەویش خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارە.

www.alibapir.com





بۆ وە نیزیك خستنەوە لە عەقڵ، دەتوانین، وێنەیەك بێنینەوە:

ژمارەی هەزار (١٠٠٠)، ئەگەر لە سفری یەكەم، سفری دەیان، بپرسی: ئەو بەها ژمارەییەت لە كوێ هێناوە؟ دەڵێ: لە سفری سەدان بپرسە (سفری دووەم)، ئەگەر لە سفری سەدانیش (سفری دووەم)، بپرسی: ئەو بەها ژمارەییەت لە كوێ هێناوە؟ دەڵێ: لە سفری هەزاران (سفری سێیەم)، بپرسە، ئنجا ئەگەر لە سفری سێیەمیش بپرسی: ئەو بەهایەت لە كوێ هێناوە؟ دەڵێ: لەو ژمارەی یەك (١)ە، بپرسە، كە لە پشتمەوە وەستاوە.

ئنجا ئەگەر لە یەكە (١)ە كەش بپرسی: ئەو بەها ژمارەییە (القیمة العددیة) ت، لە كوێ هێناوە؟ دەڵێ: هی خۆمە، بە بەڵگەی ئەوە كە سفرەكان لابەرە، یەك (١) هەر یەكە، سفرەكان لەلای ڕاستی دابنێ، نرخ بە هەموویان دەدا، ئەگەر سێ(٣) سفر بن، دەیانكاتە هەزار (١٠٠٠) و، ئەگەر شەش سفر بن دەیانكاتە ملیۆن (١،٠٠٠،٠٠٠) و...هتد، ئنجا سفرەكان بە بەڵگەی ئەوە دەزانین كە بەهایەكەیان هی خۆیان نیە، یەك (١)ەكە لابەرە، هەموویان سفر(هیچ) دەمێننەوە؟!

﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٠﴾ ﴾ النحل.

(سیفەتی هەرە بەرز تەنیا هی خوایە)، سفرەكان وەك دروستكراوەكانن و، خواش(سبحانه وتعالى) وەك ژمارە یەكەكەیە، كە بوونی بە هەموویان داوە، ئەگەر خوا نەبووایە، دروستكراوەكان هیچیان نەدەبوون، چونكە بوونەكەیان هی خۆیان نیە، بەڵكو پێیان بەخشراوە لەلایەن خواوە:

﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ﴾ طه: ٥٠.

ئنجا ئێستا هەر كام لە بیرۆكەی بێ سەرەتا بوونی ماددەو گەردوون (أَزَلِية المَادَّة وَالكَوْن)، - كە پێشتر گوتمان: لە بەشی سێیەمدا، لە باسێكی سەربەخۆدا هەڵیاندەوەشێنینەوە - وێڕای ئەوە كە دژی عەقڵ و یاسا بەڵگە نەویستەكاننی، زانیاریی فیزیاش كردوونی بە دوو ئەفسانەی مەحاڵ، چونكە زانیاریی

www.alibapir.com



گەردووناسیی و فیزیای ئێستا، ڕایگەیاندوە و هەموو زانایانیش لەسەری پێك هاتوون، کە پێش: (Big bang) تەقینەوەی مەزن (الإنفجار الكبير)، نە مادده بوونی هەبووە و نە گەردوونیش (پێشتریش گوتم: من تێبینیم لەسەر ئەو تەعبیرە هەیە، چونکە ئەو ڕووداوەی کە ئەم گەردوونە سیستماتیك و پڕ وردەکاریی و ڕێکخراوەی لێ کەوتۆتەوە، ناگونجێ بە تەقینەوە تەعبیری لێ بکرێ)، بەڵێ: دوای ئەو ڕووداوەی ناوی لێنراوە: (تەقینەوەی گەورە)، هەم مادده پەیدا بووە، هەم گەردوونیش پەیدا بووە و، پێشێ هیچیان نەبوون، بە مەزەندەش، ئەو ڕووداوە سێزدە ملیارو حەوت سەد ملیۆن (١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش، ڕوویداوە، ئنجا لە دوای ڕوودانی ئەو گۆڕانکارییە، ئەو ڕووداوە ناوازەیە، هەر کام لە کات و شوێن و مادده (الزمان و المكان والمادة)، هەر لەو کاتەوە و، پێکەوە پەیدابوون.

هەڵبەتە وەك پێشتر باسم کرد، لەبارەی مێژووی ئەو ڕووداوە گەورەوە: (Bing bang) تەقینەوەی مەزن، زانایان ڕا جیاییان هەیە، بۆ وێنە:

١)- (ستیفن هوکینگ) لە کتێبی: (مێژوویەکی زۆر کورتتری کات)، (تأريخ أكثر إيجازاً للزمن)دا، کە دیارە تەرجەمە عەرەبییەکەی وایە،[1]، دەڵێ: سێزدە ملیارو حەوت سەد ملیۆن (١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، بووە.

٢)- بەڵام هەر کام لە کتێبی: (إستكشافات ومقدمة في علم الفلك) کە هی (توماس ت آرني) و، وەرگێڕدراوی (د.محمود أحمد المصري، وسعيد محمد الأسعد)ە[2]، دەڵێ: پازدە ملیار (١٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر، ئەو تەقینەوەیە ڕوویداوە.

٣)- هەروەها کتێبی: (الفيزياء ووجود الخالق)ی، (د.جعفر شيخ إدريس)[3]، ئەویش بە هەمان شێوە دەڵێ: پازدە ملیار (١٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر، ئەو ڕووداوە ڕوویداوە.

---

(١) تأريخ أكثر إيجازا للزمن، ستيفن هوكينج، و ليونرد ملونيدوف، ص١٧٧.

(٢) ص٧١٢.

(٣) ص٨٨.

www.alibapir.com



کەواتە: ئەوەی ناویان لێناوە تەقینەوەی گەورە، ڕێگریی دەکات لەوە کە باسی زنجیرەی بێ کۆتایی بکەین و، مەسەلەی (دَوْر)یش، واتە: هەر کامێك لە شتەکان یەکدییان خوڵقاند بێت و، هەرکامیان پەیداکەری ئەوی دیکە بێ! شتێکی ئەفسانەیی یە و هیچ عەقڵێك قبووڵی ناکات.

هەروەها یاسای دووەمی دینامیکای گەرمییش:

(the second of termo dinamic)، ئەمیش ڕێ لە: (ئەزەلیی بوونی گەردوون)، دەگرێ، چونکە: بەپێی (یاسای دووەمی دینامیکای گەرمیی)، بەردەوام گەرمایی و تیشك لە تەنە گەرمەکانەوە بۆ تەنە ساردەکان دەچێ، تاکو یەکسان دەبن و، هەر کات یەکسان بوون، ئەو پرۆسەیە دەوەستێ و، ئەو کاتە ئەو هێزی کێشکردن و خولانەوەیان لە بەیندا نامێنێ، ئەو کاتەش چ کۆمەڵەی خۆر، چ سەرجەم ئەستێرەو کەهکەشانەکانی دیکە، ئەگەر گریمان: تاکو ئەو کاتە کە تەنە گەرمەکان، گەرماییەکەیان لەگەڵ تەنە ساردەکاندا یەکسان دەبێ، بەردەوام بن، بەحەتمیی کۆتاییان پێ دێ.

واتە: کۆتایی هاتنی گەردوون، شتێکی حەتمییە، بە پێی ئەو یاسا فیزیاییە، چۆنیەتی بەڵگە بوونی ئەو یاسایەش لەسەر ئەزەلیی نەبوونی مادده و گەردوون، ئاوایە:

(خۆر) دەوری پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە دروست بووە، ئنجا ئەگەر گەردوون ئەزەلیی بووایە، دەبوو لە مێژ بووایە، گەرمیی و تیشکەکەی تەواو بووایە، چونکە بە مەزەندە دەڵێن: پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵە خۆر دروست بووە و تیشك دەدا و، ڕەنگە بایی پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی دیکەشی مابێ، کە دیارە تیشك و وزەی خۆریش، ئەنجام و بەرهەمی ئەو تەقینەوەیەیە کە لە نێو خۆردا ڕوودەدا، کە بریتیە لەوەی گازی هیدرۆجین دەگۆڕێ بۆ هیلیۆم.

ئنجا زانایان دەڵێن: ئێستا تەمەنی خۆر پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی بە بەرەوە ماوە، کەواتە: نەك ئەزەلیی، بەڵکو ئەگەر دە ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)

www.alibapir.com



ساڵ لەمەو پێشیش خۆر دروست ببووایە، دەبوو ئێستا پێنج ملیار ساڵ بووایە تیشکەکەی تەواو ببووایە، کەواتە: لە دوای (یاسای دووەمی دینامیکای گەرمیی) هەر ناگونجێ باسی هەربوویەتیی ماددەو گەردوون بکرێ.

**بـــا بۆ زیاتر ڕوون بوونەوە، بە دوو شێوەی دیکەش، ئەم یاسایە، پەیداکراو بێ پەیداکەر نابێ**

چونکە بەڕاستی ئەمە بەهێزترین یاسای عەقڵییە لەسەر بوونی خوا (سبحانە وتعالى)، لەلای هەندێك لە زانایان، ئەگەرنا هەندێکی دیکەیان یاسایەکانی دیکە، کە دوایی باسیان دەکەین، بە بەهێزتر دەزانن و، لە ڕاستییدا هەمووشیان بەهێزترینن.

**شێوەی یەکەمی داڕشتنی ئەو یاسا عەقڵییە:**

ئەم شێوەیان لە شەش (٦) خاڵ دا دادەڕێژین:

**١)**- لە دەوروبەرو بوونەوەردا، ڕووداو و گۆڕانکاریی بەردەوام هەن، باران دەبارێ، گوڵ دەپشکون، منداڵ لە دایك دەبن، مرۆڤەکان گەشە دەکەن، دوایی دەمرن، با هەڵدەکات، شت گۆڕانی بەسەردا دێ، چوار کەشەکانی ساڵ دەگۆڕێن، ساڵ دێن و دەچن، ئێمە دەزانین ئەمساڵ جیایە لە پار و، ساڵی دادێ، جیا دەبێ لە ئەمساڵ، بەردەوام گۆڕانکاریی هەیە.

ئنجا ئێستا ئاشکرا بووە کە (کوارکەکان)، کە شەش (٦) یاخود، هەشت (٨) جۆرن، بەپێی کتێبی: (إستكشافات ومقدمة في العلم الفلك)[1]، دەڵێ، کوارکەکان (تەنۆلکەکان - الجُسَيمات) پێکهاتەکانی گەردیلە پێك دێنن، یانی: هەر پڕۆتۆنێك لە سێ کوارك پێك دێ و، هەر نیۆترۆنێك لە سێ کوارك پێك دێ، دیارە ئەلیکترۆنەکانیش بە دەوری ئەو نێوکەدا، کە لە پڕۆتۆن و نیۆترۆن پێك دێ، دەخولێنەوە.

---

(١) ص٧٠٤.

ئنجا گەردیلەکانیش بەشۆکەکان (الجُزَيئات) (molecules) پێك دێنن، یانی: هەر بەشۆلکە (جُزيئ - molecul)یەك، لە چەند گەردیلەیەك پێك دێ و، هەر گەردیلەیەکیش لە سێ بەشی سەرەکیی پێك دێ: پرۆتۆن و نیۆترۆن لە نێوکدا و، ئەلیکترۆن لە دەرەوە، ئنجا هەر کام لە پرۆتۆن و نیۆترۆنیش، یەکی لە سێ کوارك پێك دێن، بەڵکو وردەکاریی دیکەش هەیە، بە هەرحاڵ، دوایی بەشۆلکەکان، (مۆلکۆلەکان)یش، توخمەکان (عناصر) پێك دێنن و، پاشان لە توخمەکانیش، لێکدراوەکان (مُرَكَّبات) پێك دێن، دوایی لەوانیش جەستە و تەنە بینراوەکان (الأَجْسَامُ المُشَاهَدَة) پێك دێن.

ئنجا کەهکەشانەکان (مجرات) لە ئەستێرەکان (نجوم) پێك دێن و، گەلە کەهکەشانەکان (الحشود المجرية)ش لە کەهکەشانەکان پێك دێن و، ئەوانیش لە گازە سەرەتاییەکان (الغازات الأولية) بە تایبەتی هیدرۆجین و هیلیۆم، پێك دێن، کە زانایان دەڵێن: (٪٧٤)ی یان (٪٧٥)ی ماددەی گەردوون، هیدرۆجینە و، (٪٢٤)یشی هیلیۆمە، هەڵبەتە تێکڕای ئەمانەش هەم کاتی پەیدابوون و، هەم کاتی لە بەین چوونیان هەیە.

٢)- ئنجا دەپرسین: ئایا ئەو شتانەی کە باسمان کردن، هەر لە کوارکەکانەوە، تاکو گەلە کەهکەشانەکان، کێ پەیدایان دەکات و، کێ لە بەینیان دەبات؟! ئایا لە نەبوونەوە هاتوون؟! ناگونجێ، چونکە عەقڵ ڕەفزی دەکات، لە نەبوون (عدم) بوون (وجود) پەیدا بێت، ناگونجێ ئایا لە کاتێکدا کە تۆ هیچ پارەت لە گیرفاندا نیە، دەتوانی بە سەفتە پارە بدەی بە خەڵکی؟ بە تەئکید نەخێر، کەواتە: دەبێ هۆکارێك ئەو دروستکراوانەی پەیدا کردبن!

٣)- ئەو هۆکارە کە ئەو دیاردەو دیمەنانەی پەیداکردوون، ئەو دروستکراوانەی پەیدا کردوون، ناگونجێ خودی خۆیان بێ، چونکە مەحاڵە هیچ شتێك خۆی پەیدا بکات، کەواتە: دەبێ هۆکارێکی دەرەوەی خۆیان بێ و، لە سەرچاوەیەکی دەرەوەی خۆیانەوە هاتبن.

www.alibapir.com



٤)- ئەگەر ئەو هۆكارە دەرەكییەش، وەك شتە پەیداكراوەكان، هەر پەیداكراو (حادث) بێ، وەك دیاردە سروشتییەكان كە دەیانبینین، ئەوە دیسان ئەویش پێویستیی بە هۆكارێك هەیە، هەروەها هۆكارەكەش پێویستیی بە هۆكارێك هەیەو، هەتا دوایی، بەڵام بێگومان زنجیرەی بێ كۆتایی (التسلسل اللاَّنِهَائِي) مەحاڵێكی عەقڵییە، كەواتە: دەبێ هۆكاری پەیدابوونی پەیداكراوەكان، پەیداكراو (حادث) نەبێ.

٥)- واتە: دەبێ ئەو هۆكارە ئەزەلیی بێ و، خاوەنی بوونێكی خودی بەردەوام بێت، دەبێ بێ سەرەتا بێ و، بوونەكەشی بوونێكی زاتیی بێ و هی خۆی بێ و، بوونەكەشی بوونێكی بەردەوام بێ، نە نەبوونی پێشكەوتبێ، نە نەبوونیشی بەسەردا بێ.

٦)- ئەویش ناگونجێ بێجگە لە خوای بەدیهێنەری خاوەن بوونی ڕاستەقینە و، بوون بەخشەر بە هەموو بوونەوەرەكان، هیچ شتێكی دیكە بێ.

ئنجا شایانی باسە كە قورئانیش ئەو بەڵگەیەی باس كردوە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الطور)دا دەفەرموێ:

﴿ أَمْ خُلِقُواْ مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾،

واتە: ئایا بەبێ پەیداكەر پەیدا كراون؟ بەبێ بەدیهێنەر وەدی هێنراون؟ یاخود خۆیان بەدیهێنەرن؟ لێرەدا خوا (سبحانه وتعالى) سێ (٣) ئەگەران دەخاتە ڕوو:

١)- یان دەبێ خوا پەیدای كردبن، كە هەر ئەو ئەگەرە، عەقڵ و مەنتیق دەیگرێتەوە.

٢)- یان دەبێ بەبێ بەدیهێنەر، وەدی هێنرابن.

بەڵام بەدیهێنراو بێ بەدیهێنەر نابێ.

٣)- یان دەبێ خۆیان، خۆیان بەدی هێنابێ.

بەڵام شتێك نەبێ، چۆن خۆی بەدی دێنێ؟

www.alibapir.com



کەواتە: هەق هەر ئەوەیە کە خوا(سبحانه وتعالی) وەدی هێناون، هەڵبەتە خوا(سبحانه وتعالی) هەردوو ئەگەرە، نا مەنتیقییەکان باس دەکات:

﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الطور.

یانی: ئەگەر خوا بەدیهێنەر نەبێ، یان دەبێ بەبێ بەدیهێنەر دروست بووبن، یان دەبێ خۆیان، خۆیان بەدی هێنابێ، کە بێگومان هەردووکیان هەر غەڵەتن، کەواتە: هەر خوا بەدیهێنەرە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الطور.

یانی: مەسەلە هەر خۆشیان نیە، ئەدی ئاسمانەکان و زەوی؟ وەك (مارکس) لە کتێبێکیدا باس دەکات، دەڵێ: من لە باب و دایکمەوە هاتووم، باب و دایکیشم لە نەنك و باپیرەوە هاتوون، ئەوانیش لە هی پێشتر و...هتد، دەڵێ: ئنجا ئەگەر یەکێ بپرسێ: ئەدی ئەو مرۆڤەی سەرەتا لە کوێوە هاتوە؟ دەڵێ: ئەوە هەر نایەوێ بگاتە هەقێ و دەیەوێ عینادیی بکات[1]!

ئێمەش دەڵێین: مەسەلە عینادیی نیە، ئاخر عەقڵ پێت دەڵێ: دەستم بگرە، بمبە سەر ئەو سەرچاوەیەی کە یەکەم مرۆڤی لێوە هاتوە، چونکە ئێستا تەمەنی مرۆڤ لەسەر زەوی، هەندێکیان بە ملیۆنێك ساڵ و، هەندێك بە پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) ساڵ، مەزەندەی دەکەن، ئەسڵەن هەر تەمەنی ژیان (حیاة)، هەندێکیان بە چوار ملیارو هەشت سەد ملیۆن (٤٨٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ، مەزەندەی دەکەن، کەواتە: پێش ئەو ماوەیە، هەر خودی ژیانیش نەبووە، چ جای مرۆڤ!

خوا (سبحانه وتعالی) دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الطور، یان ئایا ئاسمانەکان و زەوییان دروستکردوون؟

---

(١) بڕوانە: (الفيزياء ووجود الخالق)، أ. د جعفر شيخ إدريس، ص١٠٧، ١٠٨، کە ئەویش لە کتێبەکەی مارکس: (نووسینە سەرەتایەکان - الكتابات المبكرة) ص٣٥٦، ٣٥٧، وەریگرتووە دەقی قسەکانی مارکسی بە ئینگلیزیی هێناوە.

www.alibapir.com







﴿بَل لَّا يُوقِنُونَ ٣٦﴾ الطور، بەڵكو زانیارییەكی دڵنیاكەریان نیە.

(یقین) زانیارییەكە كە بتگەیەنێتە ئاستێك كە لێی بوەستی، چونكە (يَقَنَ المَاءُ أَي: رَكَدَ وَثَبَتَ)، (يَقِين) واتە: وەستان، زانیاریی ئەگەر زانیاریی بێ، ئینسان دڵنیا دەكات[1]، خوا دەفەرمویٚ: ئەوانە زانیارییەكی دڵنیاكەریان نیە، لە گێژاوی گومان و بیرو بۆچوون و ئەگەرە بێهێزەكاندا دەخولێنەوە.

**شێوەی دووەمی داڕشتنی ئەو یــاســا عەقڵییە:**

ئێمە جارێكی دیكەش ئەم یاسایە بە شێوەیەكی دیكە دادەڕێژین، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە موبارەكەدا كە خوا (سبحانه وتعالى) فەرمووی:

﴿أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ٣٥﴾ الطور.

ئایا بەبیٚ بەدیهێنەر پەیداكراون، یان خۆیان، بەدیهێنەرن؟ كە هەردووكیان مەحاڵی عەقڵیین، دەگونجیٚ ئەم یاسایە لە دە (١٠) هەنگاودا داڕێژین:

**١)** هەنگاوی یەكەم: تۆ دەزانی كە پەیدا بووی و، پاش نەبوون، پەیدا كراوی، هەر كامێك لە ئێمە، تەماشای خۆی بكات، دەزانیٚ كاتێك بووە، نەبووە، بۆ وێنە: من لە دایك بووی مانگی حەوت (٧)ی ساڵی (١٩٦١ز)م، واتە: پێش ئەوە من نەبووم، بەڵیٚ پێش ئەوە نۆ (٩) مانگ لە سكی دایكم دا بووم، بەڵام پێشتر بوونم نەبووە، هەر كامێك لە ئێمە دەزانیٚ كە كاتێك بووە، نەبووە، بوونت نەبووە، نە بە شێوەی كۆرپە هەبووی، نە بە شێوەی نوتفە هەبووی، كاتێك بووە، بە هیچ شێوەیەك بوونت نەبووە.

**٢)** ئنجا تۆ یان دەبیٚ بەبیٚ هۆكارێك لە نەبوونەوە پەیدا بوویی، یان هۆكارێك پەیدای كرد بن، واتە: یان دەبیٚ لە نەبوونەوە هاتبی، هەر لە خۆڕا، یان دەبیٚ بەدیهێنەرێك تۆی بەدی هێنابیٚ.

---

(١) اليقين: هو سكون الفهم مع ثبات الحكم. مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٥٧١، ط ٢٠١٢م المكتبة العصرية.

www.alibapir.com



**٣)** مەحاڵە لە خۆتەوە لە نەبوون پەیدا بووبی، چونکە بەبێ پەیداکەر، هیچ شتێك پەیدا نابێ.

**٤)** کەواتە: دەبێ شتێك تۆی پەیدا کردبێ، هەروەها خۆت و هەر شتێکی دیکەش بگری، دەبێ شتێك لە پشت پەیدابوونتانەوە هەبێ.

**٥)** ئنجا ئەو بەدیهێنەرە، یان دەبێ بۆخۆت بی، یان جگە لە خۆت بێ.

**٦)** مەحاڵە بۆخۆت بی، چونکە بۆ خۆت نەبووی، تاکو خۆت دروست بکەی.

**٧)** کەواتە: پەیداکەری تۆ، دەبێ جگە لە خۆت بێ و لە دەرەوەی خۆت بێ.

**٨)** ئنجا ئەو پەیداکەر و بەدیهێنەرە، یان دەبێ وەك خۆت بێ و، پێویستیی بە پەیداکەرێك هەبێ پەیدای بکات، یان وەك تۆ نەبێ، لەو دوو حاڵە بەدەر نیە، ئەوەی کە تۆی پەیدا کردوە یان دەبێ ئەویش پێویستیی بە پەیداکەرێك هەبێ، یان دەبێ پێویستیی پێ نەبێ.

**٩)** ناگونجێ وەك تۆ بێ و پێویستیی بە پەیداکەر هەبێ، چونکە هەرچی لەبارەی تۆوە گوترا، لەبارەی ئەویشەوە دووبارە دەگوترێتەوە.

**١٠)** کۆتاییی کەواتە: دەبێ ئەوەی تۆی پەیدا کردوە، بەدیهێنەرێکی بێ نیازی خاوەن بوونی زاتیی، بەردەوام بێ، ئەویش تەنیا خوایە (سبحانه وتعالی)[١].

---

(١) بڕوانە: (الفيزياء ووجود الخالق)، (د.جعفر شيخ إدريس)، ص(٤٨ - ٥٤).





**یاسای سێیەم: هەر شتێك بوون و نەبوونی یەكسان بن، بەبێ زاڵكەرێك لایەكیان زاڵ نابێ (يَسْتَحِيلُ الترْجِيحُ بَيْنَ طرَفَيْنِ مُتَسَاوِيين بلا مُرجِّح):**

پوختەی ئەم یاسا عەقڵییە بەم شێوەیەیە:

ئەم گەردوونە لە جۆری بوون گونجاو (ممكن الوجود)ە، بە بەڵگەی ئەوە كە دەگونجا نەبێ و، بە بەڵگەی ئەوەش كە نەبوونی پێشكەوتوە، كەواتە: دەبێ هێزێكی دەرەوەی خۆی، بوونی بەسەر نەبوونیدا زاڵ كردبێ، ئەویش دەبێ زاتێك بێ، بوونێكی پێویستی هەبێ، ئەگەرنا هەمان ئیشكال بۆ ویش دێتەوە پێش، كە ئەویش خوای بەدیهێنەرە.

بۆ ئەوەی ئاسانتر لێی تێ بگەین، با وێنەیەك بێنینەوە:

ئەگەر تەرازوویەك بێنینە بەرچاوی خۆمان، دوو لای هەن، دوو تا تەرازووی یەكسان، ئەو تەرازووە، ئەگەر لایەكیان پارسەنگێك، قورساییەكی نەخرێتە نێو، دیارە دوو لایەكەی هەر بە یەكسانیی دەمێننەوە، كاتێك لایەكیان دادەكەوێ، دیارە ئەو لایەیان، شتێكی دیكەی خراوەتە نێو، بۆیە لە حاڵەتی یەكسانیی لەگەڵ لایەكەی بەرانبەری دا، گواستوویەتەوە بۆ حاڵەتی داكەوتن.

ئەم گەردوونەش كاتی خۆی بوون و نەبوونی یەكسان بوو ون، بە بەڵگەی ئەوە كە:

**یەكەم:** نەبوون (عَدَم)ی پێشكەوتوە.

**دووەم:** ئەگەر ئەم گەردوونە و هەموو پێكهاتەكانی، هەر كامێكیان بگری، نەشبوونایە، هیچ نەدەبوو، بەڵام ئێستا ئێمە دەبینین هەم گەردوون بە گشتیی پەیدابووە و، هەم هەر كام لە پێكهاتەكانیشی پەیدابوون.

بەڵێ گەردوون بە گشتیی و، پێکهاتەکانی یەك بە یەکیان، لە جۆری بوون گونجاو (ممکن الوجود)ن، واتە: بوون و نەبوونیان یەکسان بووە، ئەدی کێ بوونی بەسەر نەبوونیاندا زاڵ کردن؟ دەبێ زاتێك بێ، ئنجا ئەو زاتەش کە بوونی گەردوون و، پێکهاتەکانی گەردوونی بەسەر نەبوونیاندا زاڵ کردوە، دەبێ لە جۆری (بوون گونجاو) نەبێ، واتە: لەو جۆرە نەبێ کە بوون و نەبوونی یەکسان بن، بەڵکو دەبێ لە جۆری بوون پێویست (واجب الوجود)بێ، واتە: نەبوون (عَدَم) پێش بوونی نەکەوتبێ و، بوونەکەی خوازراو نەبێ و، هی خۆی بێ و زاتیی بێ، هەروەها بوونەکەشی بەردەوام بێ، ئەویش تەنیا خوای بەرزو بێ وێنەیە (سبحانە وتعالی).

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معکم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر



## یاسای چوارەم: نەداری شتێك، ئەو شتەی پێ نابەخشرێ: (فَاقِـدُ الشّيءِ لاَ يُعْطِـيهِ):

ئایا کەسێك پارەی نەبێ، دەتوانێ پارە بە خەڵکی بدات؟ یان کەسێك زانیاریی نەبێ، دەتوانێ زانیاریی فێری خەڵك بکات؟ یان کەسێك هەر کەل و پەلێکی پێویست، کە خەڵك داوای لێ دەکات، ئەگەر نەیبێ، دەتوانێ بە خەڵك ببەخشێ؟ بە تەئکید نەخێر.

ئنجا دەپرسین: ئایا ئەو شتانەی لە دەوروبەرو گەردووندا هەن، لە کوێوە هاتوون؟! لە کوێوە بە ماددەی بێ ژیان و بێ هەست و شعورو بێ ویست، بەخشراون؟!

چونکە ماددە، کە وەك ئێستا باسی دەکەین: نە ویستی هەیە، نە ژیانی هەیە، نە هێزی دیتنی هەیە، نە هێزی بیستنی هەیە، نە گەشەکردنی هەیە، نە هەستکردنی هەیە، هیچ کام لەوانەی نیە، بەڵام ئێمە دەبینین هەر لەو ماددەیە، لە دەوروبەرماندا زۆر شت دروستکراوە، خۆمان هەین، ژیانداران هەن بە هەموو جۆرەکانیەوە: هەوایی و ئاویی و خاکیی، پاشان ڕووەکان هەن، کە ئەوانە هەموویان ژیانیان تێدایە، هەڵبەتە سادەترین قۆناغی ژیان لە ڕووەکدایە، ئەویش بە هەموو جۆرەکانیەوە، پاشان ژیانێکی گەشە سەندووتر لە ئاژەڵاندا هەیە، ئەویش هەر لە (ئەمیبا)وە - کە ژیاندارێکی یەك خانەییە - بگرە تاکو دەگاتە مرۆڤ، بەرەو پێشچووترین شێوەی ژیانیش لە مرۆڤدا هەیە، کە ژیانێکی تایبەتە، چونکە مرۆڤ خاوەنی ڕووحە و، ڕووحیش تایبەتە بە مرۆڤەوە، هەرچەندە زۆر کەس وادەزانێ کە ڕووح لە هەموو ژیاندارێك دا هەیە، نەخێر، بەڵکو هەموو ژیاندارێك زیندووە و ژیانی تێدایە، بەڵام تەنیا مرۆڤ خاوەنی ڕووحە، خوای پەروەردگار تەنیا بۆ مرۆڤ باسی ڕووحی کردوە.

ئنجا دەپرسین: کە ئایا ئەو حاڵەتانە: حاڵەتی گەشەکردن، حاڵەتی هەست، حاڵەتی ویست، حاڵەتی دیتن، حاڵەتی بیستن، ئەو حاڵەتانەی کە بە تایبەت

www.alibapir.com





لە مرۆڤدان، پاشان لە ژیانداراندا هەن، لە کوێوە هاتوون؟! چونکە هی خودی ماددە نین، ئەدی لە کوێوە بە ماددە دراون؟! بە تەئکید دەبێ لە خواوە (سبحانە وتعالى)، کە خاوەنی ئەسڵیی ئەو سیفەتانەیە، خاوەنی ژیانە، خاوەنی دیتنە، خاوەنی بیستنە، خاوەنی ویستە، خاوەنی زانیارییە، تا کۆتایی، دەبێ کەسێك کە ئەو سیفەتانەی هەن، ئەو سیفەتانەی دابن بەو کائینانە، بەو زیندەوەرانە کە لە ماددە دروست بوون.

ئنجا با تۆزێ سەرنجی قسەی شارەزایانی بواری فیزیاو کیمیا بدەین، داخۆ چۆنمان ماددە پێ دەناسێنن؟

کاتی خۆی فەیلەسووفە یۆنانییەکان گوتوویانە: ماددە، دواجار لە شتێکی زۆر ورد پێك دێ، کە پێی دەگوترێت: ئەتۆم (Atom)، کە ئێستا گەردیلەی پێ دەڵێین (ذرة)، واتە: ئەو بەشەی کە بەش ناکرێ، (الجزء الذي لا يتجزء)، ئەو کات وایان زانیوە، هەڵبەتە مەبەستیشیان پێ ئەو گەردیلەیە نەبووە، کە دوایی دۆزراوەتەوە، کە ئێستا باسی دەکەین، چۆنە؟ بەڵام گرنگ ئەوەیە کەسێکی سادەش تەماشای ماددە بکات، دەزانێ کە یەکەی بنەڕەتیی ماددە، بریتیە لەو شتە، کە شتێکی بێ ژیانە، بێ ئیرادەیە و، هەستەکانی دیتن و بیستن و ...هتدی، هیچیان نین.

### مــاددە (Matter) چییە؟!

کتێبی: (إستكشافات ومقدمة في العلم الفلك)[1]، هەروەها کتێبی: (الموسوعة العلمية الشاملة)[2]، بە وردیی باسی گەردیلەیان کردوە، یەکەمیان لە ژێر ناوونیشانی: (البنية الذرية)دا و، ئەوی دیکە، لە ژێر ناوونیشانی: (بنية الذرات)دا، خولاصەی قسەی هەردووکیان دێنم، کە دیارە لە سەرجەم

---

(١) ص ١٣٥ - ١٣٧.

(٢) ص ٢٤ - ٢٥.

www.alibapir.com






وێنەی (٣) گەردیلـــە

سەرچاوەکانی کتێبەکانی فیزیاو کیمیاشدا، بەڵکو زۆرجار لەو کتێبانەدا کە باسی زیندەوەرزانییش دەکەن، باسێك لە گەردیلەو پێکهاتەکانی دەکەن.

**گەردیلە و ماددە لە حەوت کورتە خاڵ:**

**١)** دەڵێین: سادەترین وەسف بۆ گەردیلە (ذرة - atom)، ئەوەیە کە یەکەیەکی تێرو تەواوە، کە بە میکرۆسکۆب نابینرێ، میکرۆسکۆبی وا هەیە، حەوتسەد، هەشت سەد هەزار (٧٠٠،٠٠٠-٨٠٠،٠٠٠) جار شت گەورە دەکات، ئنجا زۆر لە خوار ئەوەوەیە کە گەردیلە ببینێ!.

**٢)** گەردیلە لە دوو بەشی سەرەکیی پێکدێ:

**أ/** نێوك (نواة)، (Nucleus)، ئنجا نێوکیش لە دوو جۆر تەنۆلکە پێکدێ، کە بریتین لە: پڕۆتۆن (proton) و نیۆترۆن (Neutron).

**ب/** ئەلیکترۆن (Electron)، کە بەدەوری نێوك دا دەخولێتەوە.

www.alibapir.com



بۆ وێنە: گەردیلەیەکی هیدرۆجین، لە نێوکەکەی دا پرۆتۆنێك و نیۆترۆنێك و، لە سوورگەکەشیدا، ئەلیکترۆنێك هەیە، ئەوە سادەترین جۆری ماددەیە، لە دوای هیلیۆم دێ، ئنجا توخمەکانی دی.

٣) پرۆتۆن و نیۆترۆنەکان، لەوەدا کە نیوەی تیرەیان یەکسانە، وێك دەچن، نیوەی تیرەی پرۆتۆن یان نیۆترۆن، دەکاتە = (١/ دە هەزار تریلیۆن - ١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)م، واتە: مەترێك بکە: (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) بەش، ئنجا بەشێکی نیوەی تیرەی (نصف قطر)ی پرۆتۆن، یان نیۆترۆنە.

٤) بارستایی پرۆتۆن یان نیۆترۆن، نیزیکە لە دە توان سالب بیست و حەوت ($١٠^{-٢٧}$) جارانی (١،٦٧)ی کیلۆ غرام، واتە: (١،٦٧)کلغم، ئەگەر بیکەی بە ژمارەیەك، کە یەکێك دابنێی و بیست و حەوت سفری لە پێشەوە بێ، ئنجا یەك لەسەر ئەو ژمارەیە، بریتیە لە بارستایی پرۆتۆن یان نیۆترۆن (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ە.

بەڵام جیاوازییەکەیان هەر ئەوەیە کە پرۆتۆن بارگەی کارەبایی گەرم (موجب - +)ی هەیە، بەڵام نیۆترۆن، هیچ بارگەیەکی نیە، نە سالیب، نە موجیب، بەڵکو بێ لایەنە، هەروەك ناوەکەشی ئەوە دەگەیەنێ.

٥) بارستایی و قەبارەی ئەلیکترۆن، زۆر زۆر گچکەترە لە هی پرۆتۆن و نیۆترۆن، چونکە بارستایی (کتلة)ی ئەلیکترۆن، دەکاتە: دە توان سالب سی و یەك جاران (٩،١)کغم ($١٠^{-٣١}$ × ٩،١)ی کیلۆغرامێك، ئەوەندە گچکەیە.

واتە: نۆ(٩) کیلۆگرام و ١/١٠ی کیلۆگرامێك دابەش بکەی بۆ ژمارەیەك لە بەشی بچووك، کە سی و یەك(٣١) سفری لە پێشەوە بێ، ئنجا یەکێك لەو بەشانە، بریتیە لە بارستایی و قورسایی ئەلیکترۆن: (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ ٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠).

ئنجا بارستایی (کتلة)ی پرۆتۆن، هەزارو هەشت سەدو سی و شەش (١٨٣٦) جار لە بارستایی ئەلیکترۆن گەورەترە، واتە: پرۆتۆنێك هەزارو هەشت سەدو

www.alibapir.com



سی و شەش (١٨٣٦) هێندەی ئەلیکترۆنێکە، هەڵبەتە ئەلیکترۆن بارگەیەکی کارەبایی سالیب (-)ی هەیە.

بۆیەش ئەلیکترۆن بە دەوری نێوك (پرۆتۆن و نیوترون)دا، دەخولێتەوە، - کە پرۆتۆنەکە بارگەی موجیبی هەیە و نیوترۆنیش بێ بارگەیە - چونکە ئەلیکترۆن بارگەی سالیب (سارد)ی هەیە، بەڵام پرۆتۆن بارگەی گەرمی هەیە، ئیدی پرۆتۆنەکە ڕایدەکێشێ و، ئەلیکترۆنەکەش پاڵی پێوە دەنێ، لە ئەنجامی ئەوەدا دەخولێتەوە.

بە هۆی ئەوەشەوە ئەلیکترۆن لەو سوورگەیەدا دەمێنێتەوە، کە لەلایەکەوە پرۆتۆن ڕایدەکێشێ بە خۆیەوەی بنووسێنێ و، لەلایەکیشەوە ئەلیکترۆن پاڵی پێوە دەنێ، کە پێوەی نەنوسێ و، سەرەنجام لەو سوورگەیەدا دەمێنێتەوە و دەرناچێ.

هەروەك چۆن خڕۆکەکان بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە، ئایا چ شتێك وا دەکا زەوی بەدەوری خۆردا بخولێتەوە؟! هەروەها ئەو هەشت خڕۆکەی دیکە، کە بە هەموویان کۆمەڵەی خۆر پێك دێنن: ١- مەرریخ، ٢- زوحەل، ٣- موشتەری، ٤- عەططارد، ٥- زوهرە، ٦- ئۆرانوس، ٧- نبتۆن، ٨- بلۆتۆن؟! بێگومان هۆکاری خولانەوەیان ئەوەیە کە خۆر دەیانکێشێ بەلای خۆیدا و، ئەوانیش پاڵی پێوە دەنێن، سەرەنجام بە دەوری سوورگەی خۆردا، دەسووڕێنەوە.

٦) ئنجا با زیاتر سەرنجی گەردیلە بدەین، داخۆ قەبارە و بارستایی و کێشەکەی چەندە؟!

قەبارەی گەردیلەو تەنۆلکەکانی چۆنن؟! ئەگەر بمانەوێ گەردیلەکانی نێو سەری دەبووسێك، ببینین، کە زۆر بچووکە، دەبێ چی بکەین؟!

پێویستە سەری ئەو دەبووسە هێندەی قەبارەی خڕۆکەی زەوی لێ بکەین، کە تیرەی زەوی دوازدە هەزار (١٢،٠٠٠) کیلۆ مەتر زیاترە.

ئنجا لەو حاڵەتەشدا قەبارەی گەردیلە لە قەبارەی تۆپێکیی پێی بچووك گەورەتر نابێ، کەواتە: گەردیلە زۆر زۆر گچکەیە، بەڵام ئەگەر بمانەوێ نێوك

www.alibapir.com





(نواة)ی گەردیلە ببینین، دەبێ تۆپی پێ یەكەی پێشێ، هێندەی قەبارەی یاریگا (ملعب)ێكی گەورەی تۆپی پێ لێ بكەین، ئنجا لەو كاتەشدا قەبارەی نێوكی گەردیلە، لە قەبارەی تۆزو گەردێكی وردیلە، كە بە عاستەم دەبیندرێ، تێناپەڕێ!

چونكە قەبارەی نێوكی گەردیلە، بەشێكە لە دە ملیار (١٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) بەشی قەبارەی گەردیلە، یانی: گەردیلە بۆ خۆی چەندە! نێوكەكەی بریتیە لە یەك لەسەر دە ملیار (١/١٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)ی گەردیلە، كەچی وێڕای ئەوەش، لە (٩٩،٥٪)ی بارستایی (كتلة)ی گەردیلە، نێوكەكەی پێكیی دێنێ، كە هێندەش گچكەیە.

ئەمە لە زۆربەی كتێبەكانی فیزیاداو، لەو سەرچاوانەش كە ئاماژەم پێدان، باسكراوە[١].

كتێبی (الفلك العام)[٢]، دەڵێ: گەردیلەیەك لە ڕووی پانتایی (مساحة) و ڕووبەرەوە، بریتیە لە: یەك لەسەر سەد ملیۆن (١/١٠٠،٠٠٠،٠٠٠)ی (سم)ێك، یانی: سانتیمەترێك بكەیە سەد ملیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠) بەش، یەك بەشی بریتیە لە پانتایی گەردیلەیەك، ئنجا لە ڕووی كێشەوە، غرامێك بكەی بە یەك ملیۆن ملیار ملیار بەش، یەك بەشیان قورسایی گەردیلەیە، واتە دە توان بیست و چوار ($١٠^{٢٤}$)، یانی: ژمارەی دە(١٠) بیست و چوار(٢٤) سفری هەبێ، غرامێك بكەی بە ئەوەندە بەشەوە، ئنجا یەك بەشیان بریتیە لە قورسایی گەردیلە!

**٧)** پێكهاتنی توخمەكان (العناصر): هەڵبەتە ئێمە جارێ هەر باسی ئەوە دەكەین، كە ئایا ئەو حاڵەتانەی: ژیان و عەقڵ و هۆش و ویست و بیستن و دیتن و...هتد، دەگونجێ لە مادده پەیدا ببن؟ لەوەوە كە ڕابرد پێكهاتەی وردی مادده و، یەكەی دروستبوونیمان باسكرد، دوایی ئەو گەردیلانە توخمەكان (عناصر) پێك دێنن:

---

(١) هەروەها بڕوانە: (عيادة الملحدين، أسئلة حائرة وأجوبة شافية)، د. هيثم طلعت، ص٢٧.

(٢) ص١٧٦.

www.alibapir.com







بۆ وێنە[1]:

ئاسن و هیدرۆجین، دوو وێنەی چاكن بۆ ئەوە كە پێیان دەگوترێ: توخمە كیمیاییەكان (العناصر الكیمیائیة)، توخمی كیمیاییش بریتیە لە ماددەیەك كە لە چەند گەردیلەیەكی دیاریكراو پێك دێ، ئەو گەردیلانەش دیارە نێوكەكەیان نیۆترۆن و پرۆتۆنە و، دەرەوەیان ئەلیكترۆنە لە خولگەكەدا دەخولێتەوە، بۆ وێنە:

توخمی هیدرۆجین لە چەند گەردیلەیەك پێك دێ، كە هەر كام لە گەردیلەكان یەك پرۆتۆنی لە نێوكەكەی دا هەیە و، یەك ئەلیكترۆنیش لە سورگەكەیدا هەیە.

بەڵام هیلیۆم لە چەند گەردیلەیەك پێك دێ، كە هەر كام لەو گەردیلانە، دوو پرۆتۆنیان لە نێوك دا هەیە و، دوو ئەلیكترۆنیش لە خولگەكەیاندا.

هەروەها كاربۆن لە چەند گەردیلەیەك پێك دێ، كە هەر كام لەو گەردیلانە، شەش (٦) پرۆتۆنی هەیە و، شەش (٦) ئەلیكترۆنیشی هەیە.

ئۆكسجین، واتە: توخمی ئۆكسجین، لە چەند گەردیلەیەك پێك دێ، كە هەر كام لەو گەردیلانە هەشت (٨) پرۆتۆنی هەیە، دیارە لەگەڵ هەشت (٨) نیۆترۆن، جاری واشە ژمارەی نیۆترۆنەكانیش جیایە، هەشت ئەلیكترۆنیش بە دەوری دا دەخولێنەوە.

هەروەها بەو شێوەیە، شێوەی هەر توخمێك، بەپێی ئەو پرۆتۆنانەی كە لە نێوكەكەی دا هەیە، دیاریی دەكرێ، بەڵام تایبەتمەندییە كیمیاییەكانی، ژمارەی ئەلیكترۆنەكان دیاریی دەكات، كە بە دەوری نێوكەكەیدا دەخولێنەوە و، هەمیشە ژمارە ئەلیكترۆنەكان یەكسان دەبێ لەگەڵ ژمارەی پرۆتۆنەكان دا، بەڵام ئەوەش مانای وا نیە كە هەر گەردیلەیەك، ژمارەیەكی یەكسان لە بارگە كارەباییە، موجیب و سالیبەكانی تێدایە، بەڵكو ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە هەر

---

(١) بڕوانە: (الموسوعة العلمیة الشاملة)، ص٣١، هەروەها بڕوانە: (إستكشافات ومقدمة في علم الفلك)، ص١٣٥-١٣٧.

www.alibapir.com



گەردیلەیەك، ژمارەیەكی یەكسان لە بارگە ساردو گەرمەكانی تێدایە و، ئەوەش وای كردوە كە ئەو گەردیلەیە بتوانێ پێك بێت و بەردەوام بێ.

بۆ وێنە: چەند توخمێك لە ڕووی گەردوونناسییەوە، بە گرنگ دانراون و پێیان دەگوترێ: توخمە گەردوونییە گرنگەكان (العناصر الفلكية المهمة) كە ئەمانەن:

١) (هیدرۆجین): یەك (١) پرۆتۆن لە نێوكەكەیدا هەیە، بەڵام نیۆترۆنی تێدا نیە، دیارە ئەلیكترۆنێكیش لە خولگەكەیدا دەخولێتەوە.

٢) (هیلیۆم): دوو (٢) پرۆتۆن، لەگەڵ دوو نیۆترۆن.

٣) (كاربۆن) شەش (٦) پرۆتۆن و شەش نیۆترۆن.

٤) (نایترۆجین) حەوت (٧) پرۆتۆن و حەوت نیۆترۆن.

٥) (ئۆكسجین) هەشت (٨) پرۆتۆن و هەشت نیۆترۆن.

٦) (سیلیكۆن) چواردە (١٤) پرۆتۆن و چواردە نیۆترۆن.

٧) (ئاسن) بیست و شەش (٢٦) پرۆتۆن و سی (٣٠) نیۆترۆن.

دیارە هەر كارمێك لەوانە چەند پرۆتۆنی هەبن، ئەوەندە ئەلیكترۆنەش لە خولگەكەیدا دەخولێنەوە.

ئنجا ئێستا زانایان نزیكەی سەدو نۆ (١٠٩) توخمیان لە سروشتدا دۆزیوەتەوە، هەشتاو نۆ (٨٩)یان خواكردن، ئەوانی دیكەش مرۆڤ توانیویەتی كە لە لێكدانی توخمەكانی دیكە، یان بە كەم كردنی گەردەكانیان، دروستیان بكات، یەكەمین كەسیش كە توخمەكانی لە سروشتدا دۆزینەوە، زانای كیمیای ناوداری ڕووسیی: (مندلییف) بوو، كە لەساڵی (١٨٣٤)ز دا، لە دایك بووە، لە (١٩٠٧)دا، مردوە و، ئەویش ئەو ڕیزبەندییەی توخمەكانی دانا.

ئنجا شایانی باسە فیزیای ئێستا دەڵێ: پرۆتۆن و نیۆترۆن و ئەلیكترۆن، لە نێو گەردیلەدا تەنیا سێ تەنۆلكە(جُسَیم)ن، سێ تەنۆلكەی بنچینەیین، لە نێو دوو سەد تەنۆلكەی خوار گەردیلەدا، كە تاكو ئێستا زانراون، بۆ وێنە: (كاون،

گاون، ئیبسیلۆن، باریۆن، لامدا)، ئنجا لە نێو نێوکی گەردیلەشدا، هەر کام لە پرۆتۆن و نیۆترۆنەکان، یەکی لە سێ کوارك (٣/١) پێك دێن، کە ئەوانیش (کوارکەکان) هەمیشە سێ سێ پێکەوەن و، بە هۆی هەندێ تەنۆلکەی گچکە، کە (غۆلۆنات)یان پێ دەگوترێ، پێکەوە دەلکێن[1].

بەڵێ بەڕێزان! ئەوەی گوتمان، ئەوە پێناسەی مادده (matter) بوو، ئەو ماددەیەی کە تێکڕای دیاردە سروشتییە بەرهەستەکانی لێ دروست بوون.

ئنجا لێرەدا دەپرسین: ئایا ئەو سیفەت و حاڵەتانەی لە دروستکراوەکاندا و، لە دیاردە سروشتییەکاندا هەن، بە تایبەت:

١- ژیان (حیاة).

٢- هەست (شعور).

٣- ویست (إرادة).

٤- گەشەکردن (النمو).

٥- بەرگریی لە خۆ کردن.

٦- فیداکاریی.

٧- خۆشەویستیی.

ئایا ئەوانە هیچیان لە ماددەدا هەن؟! بە تەئکید نەخێر، نە لە گەردیلەدا، نە لە پێکهاتە وردەکانیدا، نە لە توخمەکان دا، ئەو شتانە نین. ئەدی لە کوێوە هاتوون بۆ نێو جیهانی ماددە؟! بێگومان دەبێ لە سەرچاوەیەکی دیکەی غەیری ماددەوە بە ماددە درابن، کە ئەو سەرچاوەیە خۆی خاوەنیان بێت و، شێوەی ئەو سیفەتانەی هەبێت، یانی:

١- خوا خاوەنی ژیانە، ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ البقرة(٢٥٥).

خوا، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، زیندووی سەرپەرشتییکارە.

---

(١) الموسوعة العلمية الشاملة، ص٢٥.





خوا خاوەنی ژیانە و ژیانیشی بە ڕووەك و بە ژیانداران و بە مرۆڤیش بەخشیوە.

٢- هەروەها خوا خاوەنی ویستە و ویستی بەوان بەخشیوە.

٣- خوا خاوەنی سیفەتی توانایيە و تواناشی بە دروستکراوەکانی داوە.

٤- خوا خاوەنی سیفەتی زانیارییە و، ئەو سیفەتەشی بەوانە بەخشیوە.

٥- خوا خاوەنی سیفەتی بەزەییە و، سیفەتی بەزەییشی بە ژیانداران و بەمرۆڤ، بەڵکو بە ڕووەکیش بەخشیوە.

کەواتە: سروشت (طبيعة)ێك، کە بەو شێوە دڵگیرە دەیبینین، دەبێ کەسێك سروشتاندبی و طەبعی کردبێ، چونکە وشەی (طبيعة) لەسەر کێشی (فعيلة)ە، بەڵام بە مانای (مفعولة)یە، کەواتە: دەبێ ئەم طەبیعەتە، کەسێك هەبێ، ئەو طەبعە جوانەی کردبێ و، بەو شێوەیە هێنابیە دی.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## یاسای پێنجەم: هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە (لِكُلِّ نظامٍ مُنظِّمٌ):

بەڵێ: هەر کاتێ یاسامان بینی، دەبێ یاسادانەریش لە زیهنماندا ئامادەبێ، ئەگەر بمانەوێ پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیك نە جووڵێینەوە.

عەقڵ و لۆژیك ناچارمان دەکەن کە لە هەر شتێك و، لە هەر شوێنێکدا، ڕێك و پێکیی و سیستممان بینی، پاڵی بدەینە لای ڕێکخەرێك.

لە دێر زەمانەوە دەگێڕنەوە: لە کاتێك دا عەرەبێکی حوشتر لەوەڕێن عەبایەکەی ڕاخستوەو نوێژی لەسەر بکات، چەند فەیلەسووفێك بەلایدا دەچن، دەڵێن: با بچین تۆزێك پێی ڕابوێرین، دیارە دەبێ مولحید بووبن، لێی دەپرسن: ئەوە چی دەکەی؟

دەڵێ: نوێژ دەکەم.

دەڵێ: بۆ کێ؟

دەڵێن: بۆ خوا.

ئنجا بەڵگەت چییە لەسەر بوونی خوا و، کێ دەڵێ خوا هەیە؟

ئەویش زۆر بە سادەیی، وەڵامیان دەداتەوە، چونکە ڕێی بەرەو خوا چوون، وەك ئەهلی عیرفان و تەصەووف دەڵێن، عاریفە گەورەکان، دەڵێن: (الطرق إلى الله بقدر أنفاس الخلائق)، ڕێیەکان بەرەو خوا، بە قەدەر هەناسەی دروستکراوەکانن، واتە: ڕێ بەرەو خوا، زۆر زۆرن، بەڵێ ئینسان تاکو زاناتر بێ، وردەکاریی و قووڵبوونەوەی زیاتر بەکاردێنێ، لە ناسینی خوادا، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾ فاطر(٢٨).

واتە: بەڕاستیی تەنیا زانایان چاك سام و هەیبەت و قەدرو حورمەتی خوای پەروەردگار دەزانن، بەڵام ئەوە مانای وا نیە کە خەڵکی دیکەی سادەش،

www.alibapir.com



ناتوانێ خوای خۆی بناسێ، چونکە خوا(سبحانه وتعالى) ڕێی ناسینی خۆی زۆر کردوون، هەر ڕێیەك نیەو دوو ڕێ نین و، سێ ڕێ نین، وەك لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێدا.

ئنجا ئەو شوانە عەرەبە دەڵێ: (البَعْرَةُ تَدُلُّ عَلَى البَعِيرِ، وَالخُطْوَةُ تَدلُّ عَلَى المَسِيرِ، فَسَمَاءٌ ذَاتُ أَبْرَاج، وَأَرْضٌ ذَاتُ فجَاج، وَبَحْر ذُو أَمْوَاج، أَلا تَدلُّ عَلَى العَلِيم القَدِير؟!).

واتە: قشپل بەڵگەیە لەسەر حوشتر، (قشپل بەبێ حوشتر پەیدا نابێ) و، شوێن پێ بەڵگەیە لەسەر پێڕۆ، (دەبێ پێڕۆیەك بەوێدا هاتبێ، ئنجا ئەو شوێن پێیە دروست دەبێ)، ئەدی ئایا ئاسمانێکی خاوەن ئەستێرە و، زەوییەکی خاوەن شیوو دۆڵ و، دەریایەکی خاوەن شەپۆل، بەڵگە نیە بۆ بوونی خوایەکی زانای توانا؟!

قسەکەی زۆر بە جێیە.

ئنجا ئێمە دەپرسین: ئایا گەردوون و دەوروبەرمان، ڕێك و پێکیی تێدایە، تاکو ناچار بین بۆی بە دوای ڕێکخەرێکدا بگەڕێین؟

ئایا ئێمە دیزاین (تصمِّيم)ێك لە خۆمان و لە دەوروبەرو لە گەردووندا دەبینین، تاکو ناچار بین، بڵێین: دیزاینەر (مُصمِّم)ێك ڕێکی خستوەو، دیزاینی کردوەو، بەو شێوەیە سیستماتیکە دروستیکردوە؟! دەڵێین بەڵێ.

هەر لە گەردیلەو خانەکانەوە (الذرات والخلايا)وە بگرە، تاکو کەهکەشانەکان، دوایی تاکو دەگاتە ئینسان، هەر هەمووی نەك هەر یاسادارو سیستماتیك (مُقنَّن ومَنَظم)ە، بەڵکو لە ئەوپەڕی وردەکاریی و ڕێك و پێکییدایە و، ئەگەر بمانەوێ تەنیا ئاماژەشی پێ بکەین، زۆر زۆری دەوێ، بەڵام ناچارین چەند کورتە، ئاماژەیەکی خێرا بکەین:

www.alibapir.com





## پازدە (١٥) کورتە ئاماژە بە هەبوونی ڕێك و پێكیی (نظام) لە گەردوون دا:

### ا- فراوانبوونی گەردوون:

فراوانبوونی گەردوون (توسُّع الكون) ئێستا بۆتە ڕاستییەکی فیزیایی سەلمێندراو، بەڵام هەزارو چوار سەدو ئەوەندە ساڵ لەمەو پێش، فەرمایشتی بێ هەڵەو پەڵەی خوا، ئاماژەی پێداوە، کە لە سووڕەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ۝٤٧ ﴾.

واتە: ئاسمانمان (گەردوونمان) بەهێز دروستکردوە و، ئێمە فراوان کەریشینی، (یانی: بەردەوام فراوانی دەکەین).

ئنجا یەکێك لە زانا هەرە ناوداره فیزیازانەکانی ئەم ڕۆژگارە، کە (ستیفن هاوکینگ)ە و ماوەیەك لەمەوپێش کۆچی دوایی کرد، لە کتێبی: (مێژوویەکی کورتی کات)دا، - کە ئەو کتێبەی بە ئینگلیزیی نووسیوە و خۆی ئینگلیزە، بەڵام کە تەرجەمەی عەرەبیی کراوە، ئەم ناوونیشانەیان بۆ داناوە: (موجز تأريخ الزمن)، (مێژوویەکی کورتی کات)، دەڵێ: (إِنَّ سُرْعَةَ تَوَسّع الكَون، سُرْعَة حَرِجَة جِدًّا، إِلى دَرَجَةِ أنها لو كَانَت فِي الثَّانِيَة الأُوْلى مِن ظُهُورِ الكَوْنِ، أَقَلَّ مِنْ جُزْءِ مِنْ مِلِيون فِي مليار جزء (١/١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) لأنهَار الكَون عَلَى نَفْسِه، قَبْلَ أن يصل إلى وَضْعِه الحَالِي)[1].

واتە: خێرایی فراوانبوونی گەردوون، خێراییەکی زۆر وردە، بە ئەندازەیەك کە ئەگەر لە چرکەی یەکەمی دەرکەوتنی گەردووندا، ئەو فراوانبوونەی گەردوون، کەمتر بووایە لە بەشێك لەسەر ملیۆن ملیار بەش: (١/١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)،

---

(١) ص١٢١.

www.alibapir.com



(دەشتوانین بڵێین: لە هەزار تریلیۆن بەش، یانی: ئەگەر ئەو فراوانبوونەی گەردوون، لە یەك بەش لەسەر هەزار تریلیۆن بەش كەمتر بووایە)، ئەوە گەردوون بەسەر خۆیدا دەڕووخا، بەر لەوەی بگاتە ئەم حاڵەتەی ئێستایی.

یانی: دەبوو هەر بەو شێوەیە بێ و خێرایی فراوانبوونی گەردوون، نەدەبوو لەوەی ئێستا نە خێراتر بێ، نە سستر بێ، بە ئەندازەی یەك لەسەر هەزار تریلیۆن (١/٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،١) بەش[1].

## ٢- هاوسەنگیی نێوان بارستایی (كتلة)ی نیۆترۆن و ئەلیكترۆن:

بارستایی ئەلیكترۆن بە ئەندازەی (٢،٠٪)، (١٠٠٠/٢)ی بارستایی نیۆترۆنە و، ئەو بارستاییە، دەبوو تۆزقاڵێك لەوە زیاترو كەمتر نەبێ، بۆ ئەوەی گەردیلە دروست بێ و ئەگەر بارستایی ئەلیكترۆن، لەوە تۆزقاڵێك زیاتر بووایە، یان تۆزقاڵێك كەمتر بووایە، نەدەگونجا گەردیلە دروست ببێ.

## ٣- هاوسەنگیی نێوان بارستایی پڕۆتۆن و ئەلیكترۆن، كە بارستایی پڕۆتۆن لەوەی ئێستا، زیاتر نیە:

ئەگەر هاتباو بارستایی پڕۆتۆن بە (٢،٠٪) قورستر بووایە، لەوەی كە ئێستا هەیە، ئەو كاتە پڕۆتۆن هەمووی هەڵدەوەشایەوە و دەبوو بە نیۆترۆن و، پڕۆتۆن نەیدەتوانی، ئەلیكترۆنەكان - كە بە دەوری نێوكدا دەخولێنەوە - نەیدەتووانی بە خۆیانەوە ڕابگرێ و، ئەو كاتەش گەردیلە هەڵدەوەشایەوە، كۆتایی پێ دەهات.

---

(١) ئەم زانیارییانە لە كۆمەڵێك سەرچاوە وەردەگرم، ئنجا كە جار جار تەنیا ئاماژە بە یەكێكیان دەكەم، لەبەرئەوەیە، كە ئەو زانیارییانە لە زۆربەی كتێبەكاندا هەن، بۆ وێنە:

١- كتێبی: (الكون بين القرآن والعلم)، ص (٦٠).

٢- هەروەها كتێبی: (عبادة الملحِدين)، ص (٢٣-٢٦).

٣- هەروەها كتێبی: (السماء)ی ( د. زغلول النجار )، ص(٤٤١ - ٤٤٢).

www.alibapir.com





## ٤- هاوسەنگیی نێوان بارستایی پڕۆتۆن و ئەلیکترۆن، کە بارستایی پڕۆتۆن لە هی ئێستای کەمتر نیە:

ئەگەر ڕێژەی نێوان بارستایی پڕۆتۆن و بارستایی ئەلیکترۆن، لەوەی کە ئێستا هەیە، کەمتر بووایە، هەرگیز ئەستێرەکان دروست نەدەبوون و، ئەگەر تۆزێك زیاتریش بووایە لەوەی کە ئێستا هەیە، ئەو کاتە هەرگیز ئەو سیستمە جیفرەییانەی کە لە خانەکاندا هەن، لە خانەی زیندەوەرەکاندا هەن، کە بە (DNA) تەعبیر دەکرێن، ئەوانە دروست نەدەبوون، چونکە ئەو سیستمە جیفرەییانە، پشتیان بە هاوسەنگیی گەردیلەکانی کاربۆن بەستوە، کە بنچینە نایترۆجینەکان پێك دێنن، لە سیستمی جیفرەیی خانەکاندا.

ئنجا گەردیلەکانی کاربۆنیش پێویستییان بە هاوسەنگیی نێوان بارستایی پڕۆتۆن و بارستایی ئەلیکترۆن هەیە و، بۆ ئەوەی کاربۆن ببێتە گەردیلەیەکی سەقامگیر، دەبوو ڕێژەکە ئاوا بێ، ئەگەرنا یەك زیندەوەریش پەیدا نەدەبوو و، نەك هەر نەدەگونجا مرۆڤ دروست ببێ، بەڵکو هیچ زیندەوەرێك، تەنانەت ئەمیبایەکیش، کە ژیانداریکی یەك خانەییە، دروست نەدەبوو.

## ٥- ڕێژەی هاوسەنگیی گۆڕانی بارستایی هیدرۆجین بۆ وزە:

کاتێك دوو گەردیلەی هیدرۆجین یەك دەگرن و یەك گەردیلەی هیلیۆم پێك دێنن، لە (٠،٧٪)(٧/١٠٠)ی بارستایی هیدرۆجینەکە دەگۆڕێ بۆ وزە، ئنجا ئەو پڕۆسەیە کە لە ئەنجامی ئەوەدا، ئەو وزەیەی کە لە خۆرەوە دێ، دەستمان دەکەوێ، لە جیاتی ئەوەی، ئەوەی دەبێتە وزە، لە (٠،٧٪)بێ، ئەگەر (٠،٦٪) بووایە، ئەو کاتە پڕۆتۆن لەگەڵ نیۆترۆندا لە نێوکدا پێکەوە نەدەبوون و گەردوون تەنیا هیدرۆجین دەبوو و، توخمەکانی دیکە هیچیان پەیدا نەدەبوون، نە هیلۆم، نە کاربۆن و، نە ئاسن و .. هتد.

هەروەها ئەگەر ئەو بارستاییەی کە لە ئەنجامی یەکگرتنی دوو گەردیلەی هیدرۆجینەوە، بۆتە وزە، کە بریتیە (٠،٧٪)، ئەگەر لە جیاتی (٠،٧٪)، (٠،٨٪)

www.alibapir.com





(١٠٠٠/٨) بووایە، ئەو کاتە یەکگرتنی گەردیلەکانی هیدرۆجین، هێندە خێرا دەبوو، زۆر بە خێرایی هەرچی هیدرۆجینە لە گەردووندا، نەدەما، کە زانایان دەڵێن: بە ئەندازەی ڕێژەی (٧٤٪ - ٧٥٪)ی ماددەی گەردوون، هیدرۆجینە، ئەوی دیکەشی زۆربەی هێلیۆمە و، هەندێ لە توخمەکانی دیکەش.

ئەو کاتەش بە تەئکید ژیان دروست نەبوو، کەواتە: دەبووایە ئەو ڕێژەیە لە نێوان (٠،٦٪) و (٠،٨٪)دا بێ، کە بریتیە لە (٠،٧٪).

## ٦)- هاوسەنگیی نێوان ڕێژەی هێزی کەهرۆموگناتیسیی و هێزی کێشندە:

ڕێژەی نێوان هێزی کەهرۆموگناتیسیی و هێزی کێشندە، بریتیە لە یەك لەسەر دە توان چل (١٠/١ ^٤٠^)، واتە: ژمارەی دە (١٠) چل سفری بۆ دابنێ، یەك لەسەر ئەو ژمارەیە، بریتیە لە هێزی کێشندە و، ژمارە زۆرەکەش بریتیە لە هێزی کەهرۆموگناتیسیی، یانی: هێزی کەهرۆموگناتیسیی زۆر زۆر زۆر بەهێزترە، لە هێزی کێشندە، کە ئەو هەموو کەهکەشان و ئەستێرەو خڕۆکانەی پێکەوە بەستوون، کەچی کەهرۆموگناتیسیی، لە چاو وی، بریتیە لە ژمارەیەك چل (٤٠) سفری هەبێ، ئنجا یەك بەشی ئەو ژمارەیە بریتیە لە هێزی کێشندە (قوە الجازبیە)، کە جیاوازییەکەیان زۆر زۆرە و لە خەیاڵدا جێگای نابێتەوە.

هەروەها جیاوازیی نێوان هێزی نێوکیی بەهێز (القوة النووية القوية) و هێزی کێشندە، دیسان جیاوازییەکی زۆر گەورەیە: زەوی کە ئێستا مرۆڤ بە هێزی کێشندە بەخۆوە دەنووسێنێ، کە بۆ هەر($سم^2$) کیلۆگرامێك کێشی پەیدا دەبێ، ئەگەر زەوی بەهێزی نێوکیی بەهێز (القوة النووية القوية) ئێمەی بەخۆوە لکاندبایە، ئەو کاتە کێشی مرۆڤ لەسەر زەوی بە قەدەر سەد ملیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ئەستێرە قورس دەبوو، یانی: سەد ملیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ئەستێرە قورساییان چەندە، یەك مرۆڤ لەسەر زەوی هێندە قورس دەبوو.

www.alibapir.com



شایانی باسە: گەردوونناسان و فیزیك زانەكان دەڵێن: چوار هێزی سەرەكیی هەن لە گەردووندا:

١- هێزی كێشكردن (قوة الجاذبية).

٢- هێزی كەهرۆموگناتیسی (القوه الكهرومغناطيسية).

٣- هێزی نێوكیی بێ هێز (القوة النووية الضعيفة).

٤- هێزی نێوكیی بەهێز (القوة النووية القوية).

ئەمەش كورتە پێناسەیەكی هەركام لەو چوار هێزە:

**١- هێزی كێشندە (قوة الجاذبية):** بێهێزترینی ئەو چوار هێزەیە، ئەو هێزی كێشندەیەی كە بە هۆی وییەوە، هەم ئەستێرەكان و، هەم كەشهكەشانەكان و، گەلە كەهكەشانەكان، دروست بوو ون و، پێكیشەوە بەستراون، لە حاڵێك دا كە لە هەر چوار هێزەكەی دیكەی بێهێزترە!

**٢- هێزی كەهرۆموگناتیسیی (القوه الكهرومغناطيية):** ئەویش ئەو هێزەیە كە وای كردوە ئەلیكترۆنەكان لە سوورگەی نێوكەكاندا بخولێنەوە و، گەردیلەی هیدرۆجین و هیلیۆم دروست ببن و، ئەلیكترۆنە بەرهەڵدراوەكان نەمێنن و، رێگاش بگرێ لەوەی كە گەردیلەكان پێكەوە ئاوێتە ببن[1]، هەروەها هێزی كەهرۆموگناتیسیی ئەو هێزەیە، كە كارلێك دەكات لەگەڵ تەنۆلكەكاندا، كە بارگەی كارەباییان هەیە، وەك ئەلیكترۆنەكان و كواركەكان، بەڵام ئەو تەنۆلكانەی بارگەی كارەباییان نیە، وەك گراتوفیتات، لەگەڵیاندا كارلێك ناكات، ئنجا هێزی كەهرۆموگناتیسیی زۆر زۆر لە هێزی كێشندە بەهێزترە، بە ئەندازەی ژمارەی: ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن. یانی: ژمارە یەك (١) چل و دوو سفری هەبێت! واتە: یەك (١) لەسەر ژمارە یەك كە چل و دوو سفری هەبێ، ئەوە هێزی كێشندەیە، ئەوی دیكەش هێزی كەهرۆموگناتیسییە، كە بەم شێوەیە دەنووسرێ:

---

(١) (الكون بين القرآن والعلم)، ص٦٠، و (تأريخ موجز للزمن)ص٦٩ -٧٢.

www.alibapir.com


(١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠).

**٣- هێزی نێوكیی بێهێز (القوة النووية الضعيفة):** ئەویش ئەو هێزەیە كە بەرپرسیارە لە چالاكییە تیشكییەكان، كە لە توخمەكان هەندێكیان دەگۆڕن بۆ هەندێكیان، یاخود لە بەین دەچن و تیشك دەدەنەوە، وزە دەدەنەوە.

**٤- هێزی نێوكیی بەهێز (القوة النووية القوية):** ئەویش ئەو هێزەیە كە كوارکەكان لەگەڵ پرۆتۆن و نیوترۆنەكان دا پێكەوە گرێ دەدات، هەروەها پرۆتۆن و نیوترۆنەكان پێكەوە دەچەسپێنێ و، لە نێو نێوك و نێو جەرگەی گەردیلەدا دەیانهێڵێتەوە و، بەوەش گەردیلە دروست دەبێ.

## ٧- هاوسەنگیی ڕێژەیی هێزی كەهرۆموگناتیسیی:

(ماكس تیگمارك) زانای گەردوونناسی ئەمریكیی دەڵێ: ئەگەر هێزی كەهرۆموگناتیسیی - كە وەك پێشتر گوتمان: ئەو هێزەیە وا دەكات تەنۆلكەكانی نێو گەردیلە، پێكەوە ببەسترێن و گەردیلە پێك بێ - لەو ڕێژەیەی كە ئێستا لەسەریەتی، بە (٤٪) بێهێزتر بووایە، ئەوە خۆر هەر لەگەڵ دروست دەبوو، دەتەقیەوە، هەروەها ئەگەر هێزی كەهرۆموگناتیسیی لەوەی ئێستا هەیە، ڕێژەكەی زیاتر بووایە، بە هەمان شێوە، ئەستێرە و كەهكەشانەكان، یان هەر دروست نەدەبوون و یەكسەر دەتەقینەوە، یاخود بەو شێوەیەی ئێستایان نەدەبوون.

هەروەها ئەو زانا گەردوونناسە ئەمریكییە، دەڵێ: نەگۆڕەكانی سروشت، وەك دێتە بەرچاو، زۆر بە گرنگیی و بایەخ پێدان و وردەكارییەوە، لە ئاستێكی دیارییكراودا دانراون، بۆ وێنە: ئەگەر هێزی نێوكیی بێهێز (القوة النووية الضعيفة)، لەوەی كە ئێستا لەسەریەتی، كەمتر بووایە، ئەوە گازی هیدرۆجین دروست نەدەبوو و، ئەم گەردوونەی ئێمە تەنیا بە شێوەی تۆزو خۆڵێكی گەردوونیی (غُبار الكوني)دەمایەوە و، ئەگەر تۆزێك بەهێزتریش بووایە لەوەی كە ئێستا هەیە، ئەوە تەنۆلكەكانی نیوتریۆنۆ (Neutrinos) نەیاندەتوانی كە لە ئەستێرە

www.alibapir.com



مەزنەکان، (سوبرنۆڤا - Supernova) دەربازیان بێ و بە گەردووندا بڵاوبنەوە و، ئەو کاتەش ئەو توخمانەی کە پێویستن بۆ دروستبوونی ژیان، لەسەر زەوی، دروست نە دەبوون و سەرەنجام: ئەو توخمانەی کە ژیان پەکی لەسەریان کەوتوە، بە تایبەتی کاربۆن، دروست نە دەبوون.

## ٨)- هاوسەنگیی هێزی کێشندە:

ئەگەر هێزی کێشندە لەوەی کە ئێستا لەسەریەتی، (کە وەك گوتمان: بێهێزترینە لە چوار هێزەکانی گەردوون)، ئەگەر تۆزێك بەهێزتر بووایە، لەوەی ئێستا کە هەیە، ئەوە تەمەنی خۆر دوای ئەوەی کە دروست دەبوو، تەنیا دە هەزار (١٠٠٠٠) ساڵ دەیتوانی بەردەوام بێ، نەك بە مەزەندە دە (١٠) ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ، کە گەردوونناسان بۆیان داناوە، یانی: ئەگەر هێزی کێشندە بەهێزتر بووایە، تەمەنی خۆر، هەروەها تەمەنی ئەستێرەکان و تەمەنی کەهکەشانەکان بە قەدەر ئێستا نەدەبوو، بەڵکو زۆر زۆر زۆر کەمتر دەبوو.

## ٩)- هاوسەنگیی نێوان ڕێژەی تێکڕای هێزەکانی گەردوون بە ورد و درشتەوە:

(لیونارد سوسکایند)، کە مامۆستا فیزیای تیۆرییە لە زانکۆی (ستافۆرد) و دامەزرێنەری بیردۆزەی: ژێیە سەرووەکان، (الأوتار الفائقة)یە، کە بیردۆزەیەکی فیزیاییە، دەڵێ: زانیاریی ئێمە دەربارەی نەگۆڕە گەردوونییەکان، وەك ڕێژەی نێوان، ئەلیکترۆن و پرۆتۆن، هەروەها ڕێژەی هێزەکانی دیکە، لە چاو هێزی کێشندە، هەموو ئەو ڕێژانە، هێندە ورد دانراون، وەك لەسەر تیژایی چەقۆ وەستابن، یانی: نەدەبوو، یەك تۆز بەملادا یان بەولادا بچن، ئنجا هەر کامێکیشیان جیایە لەوی دیکە و، هەر کامێکیان سەربەخۆیە و، لە هەمان کاتدا هەموو ئەو نەگۆڕە سروشتیی و گەردوونییانە، ڕێژەکانیان پێك گەیشتوون و پێکەوە گونجاون، تاکو ژیان لەسەر زەوی دروست ببێ، ئەگەر هەر کامێك لەو ڕێژانە گۆڕابایە، ڕێگا

www.alibapir.com





نەدەدرا بەوەی ژیان لەسەر زەوی دروست بێ و، ئەو سیستمە گەردوونییەی ئێستا دەیبینین، تەنانەت هەر ببینین و بێتە بەرچاو[١].

## ١٠)- خۆر و هاوسەنگیی نێوان پێکهاتەکانی و، بارستایی و وزەکەی:

١- خۆر (شمس)ی ئێمە یەکێکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان، کە ئەستێرەکانی بە یەك تریلیۆن (١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ئەستێرە مەزەندە دەکرێن و، گەردونناسان دەڵێن: مەزەندە دەکرێ کە لە نێو گەردووندا زیاتر لە دوو سەد ملیار (٢٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) کەهکەشان هەبێت.



وێنەی (٥) خـــــۆر

---

(١) یەکێ لە سەرچاوەکانی کە زۆر لەو زانیارییانەم لێ وەرگرتوون، بریتیە لە کتێبی: (عیادة الملحدین)، ص(٢٤ - ٢٦).

www.alibapir.com



٢- تیرە (قطر)ی گەردوون (کون)یش بە سێزدە ملیار تاکو پازدە ملیار (١٣،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠ - ١٥،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵی تیشکیی مەزەندە دەکەن، واتە: ئەوەی کە بە تەلسکۆبەکان دەیبینن، هەڵبەتە نەشیان گوتوە: ئەوە کۆتایی گەردوونە، بەڵکو گوتوویانە: ئەوە ئەو سنوورەیە کە ئامێرەکانی ئێمە تا ئێستا دەیبینن.

٣- (خۆر) بارستاییەکەی: سێ سەدو سی و سێ هەزار (٣٣٣٠٠٠) جار لە بارستایی زەوی گەورەترە و خۆر: سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠٠٠٠٠٠٠) کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە.

٤- پێکهاتەی خۆر، بە پێی ڕای بەشێك لە گەردووناسان: (٨١،٧٦٪)ی (هیدرۆجین) پێکی دێنێ و، (١٨،١٧٪)ی (هیلیۆم) پێکی دێنێ[1].

بەڵام هەندێکی دیکە لە گەردووناسان دەڵێن: نەخێر، بەڵکو لە (٧١٪)ی خۆر، گازی (هیدرۆجین) پێکی دێنێ و، (٢٧٪)ی (هیلیۆم) و لە (٢٪)یشی، توخمە قورسەکانی وەك: کاربۆن و ئاسن پێکیی دێنن.

٥- خۆر(شمس) لە هەر چرکەیەکدا: شەشسەدو پەنجاو پێنج ملیۆن (٦٥٥٠٠٠٠٠٠) طەن لە گازی هیدرۆجین دەسووتێنێ و، دەیگۆڕێ بۆ گازی هیلیۆم، دەیگۆڕێ بۆ شەش سەدو پەنجا ملیۆن (٦٥٠٠٠٠٠٠٠) طەن گازی هیلیۆم، ئەو پێنج ملیۆن طەنەی کەم دەکات، دەبێتە تیشك و وزە و لە خۆر جیادەبێتەوە بەرەو کۆمەڵەی خۆر، کە یەکێك لە نۆ خڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر، ئەو زەوییەی ئێمەیە.

٦- پێویستە بزانرێ کە ماددە لە نێو جەرگەی خۆردا، جیایە، لە سێ حاڵەتەکەی ماددە، کە ئێمە دەیانبینین، ئێمە ماددە:

١- بە ڕەقیی (صَلْب) دەبینین. ٢- بە حاڵەتی شلیی (سائل) دەیبینین.

٣- بە حاڵەتی گازییش دەیبینین.

---

(١) السماء، ص٤٤١، نووسینی: د. زغلول النجار.

بەڵام حاڵەتی مادده لە نێو خۆردا، - هەڵبەتە بە هەمان شێوە لەنێو ئەستێرەکانی دیکەشدا - پێی دەگوترێ: حاڵەتی پلازمایی، ئەویش ئەوەیە کە پێکهاتەکانی گەردیلەکان هەڵدەوەشێنەوە و دەبنە نێوکی ڕووت و، ئیلیکترۆنەکان ئازاد دەبن و، نێوکی گەردیلەکان، کە پرۆتۆن و نیۆترۆنە، ڕووت دەبنەوە، یانی: لێك جیا دەبنەوە و هەڵدەوەشێنەوە و لەگەڵ ئەلیکترۆن بەیەکەوە نامێنن، ماوە (مسافة)ی نێوان پێکهاتەکانی یەکەمی مادده، دەبێتە یەك لەسەر سەد هەزار (١/١٠٠٠٠٠)ی ئەوەی کە گەردیلەکان لێرە هەیانە، واتە: چڕیی (کثافة)ی مادده لە نێو جەرگەی خۆر و ئەستێرەکاندا، زۆر زۆرە و چڕی مادده لێرە بریتیە لە یەك لەسەر سەد هەزار (١/١٠٠٠٠٠)ی چڕیی ماددەی ئەوێ.

ئنجا حاڵەتی پلازمایی مادده لە نێو خۆردا، شێوەیەکە لە شێوەکانی ماددەی زۆر زۆر چڕ، بە شێوەیەك کە یەك (١سم٣)ی، سەد ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠) طەن قورس دەبێت.

٧- ئنجا خۆر بەردەوامیش لە کشان دایە، لە ئەنجامی ئەو تەقینەوە بەهێزە نێوکییانەی کە لە نێویدا ڕوو دەدەن و، ئەگەر وا نەبووایە، وەك قومبەلەیەکی هیدرۆجینیی گەورە دەتەقیەوە[1].

٨- ئەگەر یەکێك بڵێ: ئەدی چۆن وزەی (خۆر) تەواو نابێ؟ دەڵێین: بارستایی خۆر(کتلة الشمس)، بە دوو هەزار تریلیۆن تریلیۆن تەن، مەزەندە دەکرێ، واتە: ژمارە (٢) بیست و شەش سفری هەبێ، ئەوەندە طەن بارستایی و قورسیی خۆر پێك دێنێ.

٩- هێزی کێشکردنی خۆر: بیست و هەشت (٢٨) هێندەی هی زەوییە، واتە: ئەگەر شتێك لێرە کیلۆیەك بێ، لەسەر خۆر بیست و هەشت کیلۆیە.

١٠- بێگومان ئەگەر خۆر ئەو هەموو هیدرۆجینەی تێدا نەبووایە و، بارستاییەکەی هێندە گەورەو بێ ڕەزا نەبووایە، یاخود ڕێژەیەکی زیاتری سووتاندبایە، لەو

---

(١) السماء، ص٤٤٣ - ٤٤٤، نووسینی: د. زغلول النجار.

www.alibapir.com






وێنەی (٦) پێکهـــاتەی خـــــۆر

ڕێژەیەی کە ئێستا دەیسووتێنیٚ، لەمێژ بوو کۆتایی پیٚ هاتبوو، هەروەها ئەگەر گەورەتریش بووایە، دیسان هەر هاوکێشەکە دەگۆڕا.

**١١-** خۆر سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠٠٠٠٠٠٠) کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە، ئنجا ئەگەر دوورتر بووایە، بێگومان ئەو ئەندازە تیشك و گەرمیی و وزەیەی کە دەمان داتیٚ، نەیدەداینیٚ، ئەو کاتەش هێندەمان نەدەگەیشتیٚ و سەرەنجام یان ژیان، نەدەبوو، یان بە جۆرێکی دیکە دەبوو، ئنجا ئەگەر نزیکتریش بووایە، بێگومان زیاتر وزە و گەرمییمان دەگەیشتیٚ و دیسان ژیان نەدەبوو، بەڵکو هەندێك لە زانایان ئەندازەیەکیان دیاریی کردوە، دەڵێن: ئەگەر خۆر ئەوەندە لە ئێمە نزیك بووایە، ئەوە سەر زەوی هەمووی دەبوو بە خۆڵەمێش، هەروەها

www.alibapir.com



بە بارەکەی دیکەشدا: ئەگەر دوورتر بووایە، سەر زەوی هەمیشە هەمووی بەستەڵەك دەبوو و، ژیانی تێدا نەدەگونجا.

## II)- جووڵانەوەکانی زەوی:

زەوی تیرە (قطر)ەکەی دوازدە هەزارو هەشت سەد (١٢،٨٠٠) کیلۆمەترە، واتە: ئەمسەرەوسەری ئەوەندەیە، شایانی باسیشە: زەوی چەند سوورانەوەیەکی هەن، بەلای کەمەوە زەوی پێنج (٥) سوورانەوەی هەن:

**١) خولانەوەی یەکەم:** زەوی لە شەوو ڕۆژێکدا جارێك بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە خێرایی بیست و هەشت (٢٨) کیلۆمەتر لە خولەکێکدا، یاخود دەتوانین بڵێین: بە خێرایی هەزارو شەش سەدو هەشتا (١،٦٨٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا، شایانی باسیشە ئەو فڕۆکانەی ئێستا هەن، - واتە: بارهەڵگر و نەفەر هەڵگرەکان - هەموویان هەشت سەد، نۆ سەد(٨٠٠-٩٠٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا، دەبڕن، ئەو پەڕی خێرایی یان دەگاتە: هەزارو دوو سەد(١٢٠٠) کیلۆمەتر، بەڵام هەزارو شەش سەدو هەشتا (١،٦٨٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا



وێنەی (٧) سوڕانەوەی زەوی

www.alibapir.com





بڕین، ئەوە خێرایی سووڕانەوەی زەوییە بە دەوری خۆیدا، کە دەکاتە بیست و هەشت (٢٨) کیلۆمەتر لە خولەکێکدا، هەڵبەتە لە ئەنجامی ئەو خولانەوەیەشدا، شەو و ڕۆژ لەسەر زەوی پەیدا دەبن.

**٢) سووڕانەوەی دووەم:** ئەوەیە کە زەوی لە ساڵێکدا جارێك بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، بەڵام بە خێراییەکی زۆر زیاتر لەوەی بە دەوری خۆیدا، ئەویش ئەوەیە کە بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە، یانی: زیاتر لە شەست ئەوەندەی سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، خێراتر بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە.

ئەو سووڕانەوەشی کە بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، لە سوڕگە (مَدار)یەکی ڕێك دا نیە، بەڵکو لە سووڕگەیەکی لاردایە، کە بە بیست و سێ پلەو نیو (٢٣،٥) لارە و، ئەو لارییەشیەتی دەبێتە هۆی ئەوە کە جارێك ئەو لای زەوی لە خۆرەوە نیزیکتر بێت، جارێکیش ئەملای و، لە ئەنجامی ئەوەدا، چوار وەرزەکانی ساڵ: (پایز و زستان و بەهارو هاوین) ڕوو دەدەن.

ئنجا ئەگەر سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، لە بەرانبەر خۆردا، کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی شەوو ڕۆژان، سستتر بووایە، شەوو ڕۆژ درێژتر دەبوون و، لە جیاتی ئەوەی یەکی دوازدە (١٢) سەعات بوونایە بە موعەددەلیی زیاتر دەبوون و، ئەگەر زیاتریش بوونایە، بۆ وێنە: ئەگەر شەو بیست (٢٠) سەعات بووایە، یاخود سی (٣٠) سەعات بووایە، ئەو کاتە تاکو ڕۆژ دەبووەوە، دنیا دەیبەست، ئنجا ئەو کاتە ڕۆژیش دیسان درێژتر دەبوو و، هەتا شەو دەبووەوە، دنیا دەپرووکا، ئەوە ئەگەر سستتر بووایە، بەڵام ئەگەر خێراتر بووایە، لە جیاتی ئەوەی شەوو ڕۆژ بە موعەددەلیی یەکی بۆ دوازدە (١٢) سەعات دابەش بن، کە دیارە ئەوانیش کورتیی و درێژیی دەکەن، ئەو کاتە شەوو ڕۆژ کورتتر دەبوون، بۆ وێنە: یەکی شەش (٦) سەعات شەش (٦) سەعات، یان چوار (٤) سەعات، چوار (٤) سەعات، یاخود کەمتر دەبوون و، لە هەموو حاڵاندا ئەو ژیانەی کە ئێستا هەیە، بەو شێوەیە نەدەبوو.

www.alibapir.com





هەروەها ئەگەر سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆریشدا، دیسان سستتر بووایە، یاخود خێراتر بووایە، هەر بە کەڵك نەدەهات و، لە کات سستتر بوونیدا، وەرزەکانی ساڵ زیاتریان پێ دەچوو و، لە کاتی خێراتر بوونیشیدا، وەرزەکانی ساڵ کورت دەبوونەوە.

**٣) سووڕانەوەی سێیەم:** سووڕانەوەیەکی دیکەی زەوی، ئەوەیە کە لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا، خۆرو هەر نۆ خڕۆکەکە بە دەوری ئەستێرەیەك دا، کە پێی دەگوترێ خڕۆکەی دانیشتوو (الكوكب الجاثي) بە خێرایی بیست (٢٠) کلیۆمەتر لە چرکەیەکدا، دەسووڕێنەوە.

**٤) سووڕانەوەی چوارەم:** دیسان زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا و، هاوڕێ لەگەڵ داڵی وەستاو، یاخود لەگەڵ خڕۆکەی دانیشتووشدا، بەدەوری چەقی کاکێشان دا دەسووڕێتەوە، ئەویش بەخێرایی بیست و شەش (٢٦) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، یاخود حەوت سەدو چل و یەك هەزارو شەش سەد (٧٤١،٦٠٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا.

**٥) سووڕانەوەی پێنجەم:** دیسان زەوی سووڕانەوەیەکی دیکەی هەیە لەگەڵ کاکێشان دا هەمووی، ئەویش بە خێرایی نۆ سەدو هەشتا (٩٨٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، کە دەکاتە سێ ملیۆن و پێنج سەدو بیست و هەشت هەزار (٣٥٢٨٠٠٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا.

زەوی بە لایەنی کەمەوە ئەو پێنج سووڕانەوەیەی هەن، وەك گەردووناسان و فیزیك زانەکان دەڵێن[1].

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو سووڕانەوانەدا، ئەو زەوییەی ئێمە، ئارام و هێمن دیارە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾﴾ النبأ.

واتە: ئایا زەویمان بۆ نەکردوون بە بێشکە! بە لانکە!

سُبْحَانَ الله! خوا زەوی بە لانکە(بێشکە) دەشوبهێنێ، چونکە بێشکە (لانکە) منداڵی تێدایەو ڕاشی دەژێنی، یان جۆلانە، ڕای دەژێنی، کەچی ئەو منداڵە

---

(١) الأرض، ص (٢٧٤-٢٧٥)، نووسینی: د. زغلول النجار.

www.alibapir.com



ناخاتە خوار، واتە: خوا (سبحانە وتعالی ) پێمان دەفەرموێ: ئەم زەوییە کە ئێوە پێتان وایە ناجوولێ، وەك لانکەی منداڵ، وەك جۆلانە چۆن دەجوولێ، ئەویش دەجوولێ، بەڵام ئێوە هەستی پێ ناکەن و، ژیانێکی ئارام لەسەر ڕووی ئەم زەوییە دەگوزەرێنن، لە حاڵێکدا کە:

١)- بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە.

٢)- بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە.

٣)- ئنجا لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا بە دەوری داڵی ڕاوەستاودا دەخولێتەوە.

٤)-دوایی لەگەڵ کۆمەڵەی خۆرو لەگەڵ خۆریشدا، بەنێو چەقی کاکێشاندا دەخولێتەوە.

٥)- لەگەڵ کاکێشانیشدا دیسان جارێکی دیکە دەخولێتەوە، بەڵام بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر، کە بریتیە لە: نۆ سەدو هەشتا (٩٨٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، واتە: سێ ملیۆن و پێنج سەدو بیست و هەشت هەزار (٣٥٢٨٠٠٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا، یانی: زۆر زۆر خێرا، کەچی ئێمە هەستی پێ ناکەین و، ژیانێکی هێمن و ئارامی لەسەر دەگوزەرێنین!



وێنەی (٨) سوڕانەوەی کۆمەڵەی خۆر



**حیكمەتی خولانەوەكانی زەوی:**

١- بێگومان ئێمە حیكمەتی خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا دەزانین، زەوی ئەگەر بە دەوری خۆیدا نەخولابایەوە لە بەرانبەر خۆردا، شەوو ڕۆژ پەیدا نەدەبوون، ئەوەیان زۆر چاك دەزانین.

٢- هەروەها حیكمەتی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆریشدا، دەزانین، ئەگەر زەوی بە دەوری خۆردا نەخولابایەوە، چوار كەشەكان (الفصول الأربعة) پەیدا نەدەبوون.

٣- بەڵام كە زەوی لەگەڵ نۆ(٩) خڕۆكەكاندا بە دەوری داڵی ڕاوەستاودا دەخولێتەوە، ڕەنگە تاكو ئێستا زانست بۆی دەرنەكەوتبێ، حیكمەت و نهێنیەكەی چییە؟ بەڵام بە تەئكید ئەویش بێ حیكمەت نیە، هەرچەندە تاكو ئێستا زانست پێی نەگەیشتوە.

٤- هەروەها كە لەگەڵ داڵی ڕاوەستاویشدا، بە دەوری چەقی كەهكەشاندا، دەخولێتەوە، ئەوەش تاكو ئێستا ڕەنگە زانست دەری نەخستبێ، یان من نەكەوتۆتە بەرچاوم، حیكمەتەكەی چییە؟.

٥- هەروەها كە لەگەڵ كاكێشانیشدا جارێكی دیكە، بۆ پێنجەمین جار دەخولێتەوە، بە دەوری شتێكی دیكەدا، ئەویش تاكو ئێستا حیكمەتەكەی نازانین؟!

بەڵام هیچ گومانی تێدانیە، وەك چۆن سووڕانەوەكەی بە دەوری خۆیی و بە دەوری خۆردا، دەبنە هۆی ئەوە كە شەوو ڕۆژ پەیدابن و، چوار وەرزەكانی ساڵ پەیدا بن، بە دڵنیاییی ئەو سووڕانەوانەی دیكەشی، چەند شتێكمان بۆ بەرهەم دێنن و، چەند حیكمەت و ئامانجێك دێنینە دی، با ئێمەش جارێ بۆمان دەرنەكەوتبن.

www.alibapir.com



## ١٢- دووریی نێوان زەویی و مانگ:

١- جاری وایە مانگ لە زەوی نیزیکتر دەبێ، وەك لە چەند مانگی ڕابردوودا[1]، شەوێکیان مانگ زۆر بە گەورەیی بینرا، جار جار مانگ ئاوا نیزیك دەبێتەوە لە زەوی، شارەزایان گوتیان: ئەوە حاڵەتی ئەوپەڕی نیزیکیەتی کە لە چەند ساڵێکدا، جارێك ئاوا ڕوو دەدا.

بەڵێ مانگ جاری وایە زۆر لە زەوی نیزیك دەبێتەوە، لە کاتێکدا کە بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە و، جاری واش هەیە دوورتر دەکەوێتەوە، بەڵام بە موعەددەلیی مانگ سێ سەدو هەشتا هەزار (٣٨٠،٠٠٠) کیلۆمەتر لە زەوییەوە دوورە، کە بە میل دەکاتە دوو سەدو پەنجا هەزار (٢٥٠،٠٠٠) میل.



وێنەی (٩) دووری مانگ لە زەوی

٢- مانگ بە بیست و حەوت ڕۆژ و یەك لەسەر سێی ڕۆژێك (٣/١، ٢٧) جارێك بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، ئنجا ئەگەر دووریی مانگ لە زەوییەوە زیاتر بووایە، بە کەڵك نەدەهات و کەمتریش بووایە، هەر بەکەڵك نەدەهات، چونکە سووڕانەوەی مانگ بە دەوری زەویدا زۆر پەیوەستە:

---

(١) لە ساڵی ٢٠١٧ ز دا.

www.alibapir.com


**أ-** هەم بە بەرگە هەوای دەوری زەوییەوەیە.

**ب-** هەم بەو بەرگە ئاوییەی کە بە دەوری زەوییەوەیە.

**ج-** هەم بە هەڵکشان و داکشانی ئۆقیانووس و دەریا گەورەکانەوە، کە بە هۆی هێزی کێشکردنی نێوان مانگ و زەوییەوە ڕوو دەدا، کە مانگ نزیك دەبێتەوە، دەریاکان هەڵدەکشێن و کە دووردەکەوێتەوە، دادەکشێن، واتە: هەڵکشان (مدّ) داکشان (جَزر)، بە هۆی هێزی کێشندەی نێوان مانگ و زەوییەوە، دروست دەبن.

**٣-** ئەو هێزی کێشندەی نێوان مانگ و زەوی، شارەزایان و پسپۆڕانی بواری گەردووناسیی، (وەك (د. زغلول النجار) لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی: (الأرض)[1] باسی دەکات)، مەزەندە کراوە بە کێبڵێکی پۆڵاییی کە تیرەکەی پەنجا (٥٠) کیلۆمەتر، بێ، ئەو هێزی کێشکردنەی نێوان مانگ و زەوی، ئەوەندە بەهێزە! زۆر زۆر قایمە، هەر بۆیەش زەوی توانیویەتی ئەو مانگە بە دەوری خۆیەوە بخولێنێتەوە و، ڕێگای نەدا بە فەزادا بڕوا.

**٤-** هەموو کێشکردنەکان حاڵەتی ڕاکێشان (جذب)یان هەیە و، حاڵەتی پاڵپێوەنان (طرْد)یش، یانی: حاڵەتی موجیبیان هەیە کە یەکدی کێش دەکەن و، حاڵەتی سالیبیشیان هەیە، یەکدی پاڵ پێوە دەنێن، چونکە ئەگەر تەنیا کێشکردن بووایە، مانگ بە زەوییەوە دەنووسا، بەڵام حاڵەتی پاڵپێوەنانیش هەیە و، لە ئەنجامی ئەوەدا نە ئەوەیە مانگ بڕوا، نە ئەوەشە کە بە زەوییەوە بنووسێ، بەڵکو بەدەوری زەوی دا، دەخولێتەوە، هەڵبەتە هەمان حاڵەتیش لە نێوان زەوی و خۆردا و، لە نێوان خۆرو ئەو خڕۆکانەی دیکەدا کە خۆر بە دەوری خۆیدا دەیانخولێنێتەوەو.. هتد، هەیە.

---

(١) الأرض في القرآن الكريم، ص٢٧٢-٢٧٤.

www.alibapir.com



## ١٣)- بەرگە هەوای دەوری زەوی:

دیاردەی سێزدەیەم، کە ئەو پەڕی ڕێك و پێکیی و وردەکاریی تێدا دەبینرێ و، ناچارمان دەکا بڵێین: پەروەردگارێك، خاوەنێك، تەگبیرکارێك کە خوای بەرزو بێ وێنەیە، بەو شێوەیەی هەڵخستوە، بریتیە لە: (بەرگە هەوای دەوری زەوی).

کە ئەمەیان حەز دەکەم وردەکاریی زیاتری لەبارەوە باس بکەین، چونکە بەڕاستیی زۆر جێی سەرنجە، هەرچەندە لەوانەیە کەمتر مرۆڤەکان جێی بایەخیان بوویێت و گرنگییان پێدابێ، خەڵك هەر لەوە ئازایە ئۆکسجین هەڵمژێ و، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بداتەوە، بەڵام نازانێ ئەو هەوایە چۆنەو چۆن نیە؟! با تەماشا بکەین، ئێمە لە چوار خاڵاندا باسی بەرگە هەوای دەوری زەوی دەکەین، بە گشتی لە چوار خاڵدا باسی دەکەین:

**یەکەم: بەبێ بەرگە هەوای دەوری زەوی، ژیان لەسەر زەوی مەحاڵ بوو:**

ئەو بەرگە هەوایەی - کە دوایی باسی دەکەین، چین و پێکهاتەکانی چەندن و چۆنن؟ - بەبێ بەرگە هەوا، واتە: ئەو هەوایەی کە دەوری زەوی داوە، ژیان مەحاڵ بوو، چونکە:




وێنەی (١٠) بەرگە هەوای دەوری زەوی

www.alibapir.com





١)- بەرگە هەوا پارێزەری مرۆڤەکانە لە تیشك و تەنۆلکە بارگاوییە زیانبەخشەکانی خۆر، کە بەرەو زەوی دێن، چونکە زەوی تەنیا تیشکی سوودبەخشی لە خۆرەوە بۆ نایەت، بەڵکو تیشکی زیانبەخش و تەنۆلکەی بارگاویی زۆر بکوژیش لە خۆرەوە بەرەو زەوی دێن، بەڵام بۆچی ناگەنە زەوی؟ چونکە: بەرگە هەوا، وەك چەترێك دەمانپارێزێ.

٢)- بەرگە هەوا پارێزەری مرۆڤە لەو پارچە نێزەکانەی کە لە فەزادا لە نێوان خڕۆکەکاندا دێن و دەچن و، ڕۆژانە ملیۆنانیان لە هەوای دەوری زەویدا دەبنە خۆڵەمێش، بۆچی دەبنە خۆڵەمێش؟ چونکە زەوی کێشیان دەکات، کە لە شوێنێکی دیکەوە هاتوون، بەرەو زەوی، بەڵام ئەو بەرگە هەوایەی کە بە دەوری زەوییەوەیە، لەبەر ئەوەی ئۆکسجینی تێدایە، کە یارمەتی سووتان دەدا، هەروەها نایترۆجینیش کە دەسووتێ، ئەوانە دەبنە هۆی ئەوەی ئەو تەنۆلکانە گەورەبن، یان گچکەبن، بسووتێن و، سەرەنجام دەبنە خۆڵەمێش، مەگەر جاروبارێك یەکێکیان لێ بکەوێتە سەر زەوی، ئەویش بۆ ئەوەی خەڵك وەك پەندو عیبرەتێك بزانێ، کە ئەگەر ئەو هەموو بەردو تەنۆلکانە هاتبانە سەر زەوی، ژیان لەسەر زەوی نەدەما، کە یەکێك لە زانایان دەڵێ: بەلای کەمەوە لە هەر شەوو ڕۆژێکدا یەك ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠) بەرد لەوانە بەرەو زەوی دێن، یانی: ئەم زەوییەی ئێمە شەوو ڕۆژ لە ئاسمانەوە بەرد باران دەکرێ، بەڵام بە هۆی بەرگە هەواوە، ئەو بەردو تەنۆلکانە، کە هەیانە چەند کیلۆ قورسە و، هەیانە کەمتر و ئەگەر قەبارەیان گەورەتر بێ، جاری وایە بەرگە هەوا فریا ناکەوێ هەمووی بسووتێنێ و، دەکەوێتە سەر زەوی، کە چەند جارێك ئەوە کەوتۆتە سەر زەوی، جارێکیان لە (سیبریا)، لە یەکێتی سۆڤیەت، جارێکی دیکە لە ئەمریکا، کە بە ئەندازەی چەندان قومبەلەی هیدرۆجینیی هێزیان هەبووە و، ئەو جۆرە بەردە قەبارە گەورەیە ئەگەر بگاتە سەر زەوی، زەوی قووڵ دەکاو دەیقەڵێشێ، ئنجا ئەگەر ئەوانە هەموویان کەوتبانە سەر زەوی، ژیان لەسەر زەوی نەدەما، بەڵام بەرگە هەوا هەموو ئەوانە دەسووتێنێ و، ئێمە دەپارێزێ.

بۆیەش خوا لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

واتە: ئاسمانمان کردوە بە سەربانێکی پارێزراو، سەقفێکی پارێزراو، (واتە: پارێزراوە کە کون ببێت)، بەڵام ئەوان لە نیشانەکانی ئاسمان پشت هەڵدەکەن، ڕووی تێ ناکەن، لێی تێ ناگەن.

٣)- بەرگە هەوا هۆکاری پاراستن و هێشتنەوەی هەڵمی ئاوە، بە دەوری زەوییەوە، کە دواتر بە هۆی هەڵمی ئاوەوە هەورەکان پێکدێن، بەڵێ بەرگە هەوا، هەڵمی ئاو و ئەو شێیەی کە لە هەوادا هەیە، دەیهێڵێتەوە و، دواییش هەر لەوە هەورەکان پێك دێن و، ئێمە ئاوی شیرینمان نەدەبوو، ئەگەر لە ڕێی هەورەکانەوە نەبووایە، کە دوایی باران و بەفرو تەرزەمان بەسەردا دەبارێ.

٤)- ڕێگا نەدان بە دەرکەوتن و پەنهان بوونی تیشك بە کت و پڕیی، یانی: بەرگە هەوایە کە ڕێگە نادا تیشك کت و پڕ پەیدا ببێت، یان کت و پڕ پەنهان بێت، وەك: سەر مانگ، لەسەر مانگ تیشك کت و پڕ پەیدا دەبێ و، کت و پڕیش پەنهان دەبێ، یانی: تیشکی خۆر کت و پڕ دەردەکەوێ، دواییش کە ئاوا بوو، یەکسەر دەبێتەوە، شەوە زەنگ، بەڵام کە لەسەر زەوی خۆر هەڵدێ، کت و پڕ هەڵنایەت و، شەبەقی بەیانی دەدا و وردە وردە، هەڵدێ، هەروەها کە خۆر ئاوا دەبێ، یەکسەر دنیا تاریك نابێ، بەڵکو وردە وردە سوورایی ئاسمان نامێنێ، ئنجا وردە وردە شین دەبێ، ماوەیەکی پێ دەچێ، ئەوەش هەمووی بە هۆی ئەو بەرگە هەوایەوەیە.

٥)- کەمکردنەوەی جیاوازیی نێوان شەوو ڕۆژ لە پلەی گەرمییدا، چونکە بەرگە هەوا بەشێك لە گەرمیی ڕۆژ بۆ شەوێ دەپارێزێ، ئێستا لەسەر مانگ لەگەڵ خۆر ئاوا بوو، یەکسەر دنیا سارد دەبێ، تاکو دەگاتە سەد و پەنجا (١٥٠) پلە لە ژێر سفر، لەگەڵ خۆریش دەرکەوت، یەکسەر گەرم دادێ، کە ئەویش دیسان لە سەد (١٠٠) پلە تێ دەپەڕێ.

www.alibapir.com



بەڵام بە هۆی بەرگە هەواوە، جیاوازیی نێوان گەرمیی و ساردیی شەوو ڕۆژان لەسەر زەوی، دەپارێزرێ، بەرگە هەوا بەشێك لە گەرمیی ڕۆژ بۆ شەوێ هەڵدەگرێ و، بەشێکیش لە فێنکایەتیی شەوێ، بۆ ڕۆژێ هەڵدەگرێ، ئاوا بەو شێوەیە هاوسەنگ دەبنەوە[1].

**دووەم: بەرگە هەوای دەوری زەوی، لە پێنج چینی سەرەکیی پێك دێ:**

**١) چینی یەکەم:** چینی ژێرەوەی نیزیك لە زەوی، کە پێی دەگوترێ: (ترۆپۆسفیر):
أ- دەوری بیست (٢٠) کیلۆمەتر، لەلای هێڵی یەکسانیی و، دە(١٠) کیلۆمەتر لەلای دوو جەمسەرەکەیەوە، بەزرە.

ب- ئنجا نۆ لەسەر دەی (٩/١٠)ی بارستایی بەرگە هەوا، ئەم چینی یەکەمە، پێکیی دێنێ، کە بە موعەددەلیی بەرزییەکەی پازدە(١٥) کیلۆمەترە، لەوێ بیست (٢٠) و لەوێش دە(١٠)، موعەددەل دەکاتە: پازدە (١٥).

ج- هەرچی حاڵ و باڵی هەورو باو بارانە، لەو چینە هەوایەدا، کە چینی یەکەمیەتی لە ڕووی نیزیکیی لە زەوییەوە، لەوێدا سەر هەڵدەدەن.

**٢) چینی دووەم:** (ستیراتۆسفیر):

أ- دەوری پەنجا (٥٠) کیلۆمەتر لە ئاستی زەوییەوە بەرزە، واتە: بەو پازدە، بیست کیلۆمەترەی چینی یەکەمیشەوە، هەتا پەنجا کیلۆمەتر دەڕوات.

ب- پلەی گەرمیی لەم چینی: (ستیراتۆسفیر)دا، لە ژێرەوەی سالیب شەستی (-٦٠)ی (سانتیگراد)ە، واتە: شەست(٦٠) لە ژێر سفرەوە و لە خوار شەست لە ژێر سفریشەوەیە، هەتا لای سەرەوەی دەگاتە، پلەی بەستن.

**٣) چینی سێیەم:** پێی دەگوترێ: (میزۆسفیر):

أ- دەوری هەشتا (٨٠) کیلۆمەتر لە ئاستی زەوییەوە بەرزە.

---

(١) ئەم زانیارییانەی ئەم خاڵی یەکەمەم لە کتێبی: (مبادیء علم الفلك الحدیث)، ص٩٠، للدکتور عبدالعزیز بکري أحمد، وەرگرتوون.

www.alibapir.com



ب- پلەی گەرمیی تێیدا بۆ کەمتر لە سەد لە ژێر سفر (-١٠٠)، واتە: (-١٠٠) پلەی سانتیگراد دادەبەزێ، بەڵام لای خوارەوەی، پلەی گەرمییەکەی تۆزێك زیاترە.

٤) **چینی چوارەم:** پێی دەگوترێ: (پیرمۆسفیر):

أ- لە ئاستی زەوییەوە هەتاکو چوارسەدو پەنجا (٤٥٠) کیلۆ مەتر بەرز دەبێتەوە.

ب- پلەی گەرمیی تێیدا یەکجار بەرزە، ئەو جارە پلەی گەرمیی بەرز دەبێتەوە، چونکە تەنۆلکە هەواییە کەمەکان، تیشکی خۆر دەمژن و پلەی گەرمیی لەلای سەرەوەی دەگاتە: دوو هەزار (٢٠٠٠) پلەی (سانتیگڕاد)، یانی: لە سەد (١٠٠) پلە شت دەکوڵێ، دەبێ لە دوو هەزار (٢٠٠٠) پلە، چی لێ بێ!!

٥) **چینی پێنجەم:** (ئیکسۆسفیر):

أ- چینی دەرەوەی هەوایە و لە ئاستی زەوییەوە هەتاکو نۆ سەد (٩٠٠) کیلۆمەتر بەرز دەبێتەوە.

ب- چڕیی (کثافة) هەوایەکەی زۆر کەمە، چونکە تەنۆلکەکانی بەرەو فەزای دەرێ، ڕا دەکەن.




وێنەی (١١) چینەکانی بەرگە هەوای دەوری زەوی

ئنجا شایانی باسە: بەرزیی بەرگە هەوا، هەتا دەوری هەزار (١٠٠٠) کیلۆ مەتر دەڕوات[1].

سێیەم: چینە هەوای (ستراتۆسفیر):

کە لە ڕیزبەندیی باسکردنمان دا چینی دووەم بوو و شتێکمان لە بارەوە باسکرد، بەڵام لەبەر زێدە گرنگیی ئەم چینە لە پاراستنی سەر زەویی دا، بە باشم زانی وردەکاریی زیاتری لەو ڕووەوە لە بارەوە باس بکەین:

١- ئەم چینە دەوری پەنجا (٥٠ کم) لە ئاستی ڕووی زەوییەوە بەرزە.

٢- پلەی گەرمیی لە ژێرەوەی سالیب شەستە (-٦٠)، یانی: سالیب شەست پلەی سەنتیگراند و، هەتا سەرەوەی دەگاتە پلەی بەستن.

٣- ئەو چینە هەوایە، چینێك گازی ئۆزۆنی تێدایە، کە تیشکی سەرووی وەنەوشەیی خۆر دەمژێ و ناهێڵێ بگاتە زەوی، ئنجا ئەو چینەی ئۆزۆن لە ئەنجامی ئەوەدا پەیدا دەبێ، کە تیشکی سەرو و وەنەوشەیی، مۆڵکۆڵەکان، واتە: بەشۆلکەکانی ئۆکسجین، کە هێما کیمیاییەکەی ($O_2$)ە، دەشکێنن، (تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، مۆڵکۆڵەکانی ئۆکسجین دەکشێنێ)، دواتر گەردیلە جیابووەوەکانی ئۆکسجین لەگەڵ بەشۆلکەکانی دیکەیدا، یەك دەگرن، وەك ($O_3$) کە پێی دەگوترێ: ئۆزۆن و جۆرە گازێکی تایبەتە، پێك دێنن.

ئنجا ئەم چینی ئۆزۆنە، وەك گوتمان ڕێ دەگرێ لەوەی: تیشکی سەروو وەنەوشەیی (الإشعاع فوق البَنَفسجي)، بگاتە زەوی، یانی: چینێکە وەك: حەوشەو حەسارێك، وەك دیوارێکی مەحکەم، لەبەردەم تیشکی سەرووی وەنەوشەییدا، چونکە ئەو چینە هەواییە، ئەو تیشکەی سەرووی وەنەوشەیی دەمژێ، نەك هەر ئەوەندەش، بەڵکو هەر کام لە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئاویش، دیسان مژەری بەهێزن نەك بۆ تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، بەڵکو بۆ تیشکی ژێر سوور، (الإشعاع تحت الأحمر)، کە ئەمیش هەر تیشکێکی بکوژە، یانی:

---

(١) ئەو زانیارییانە هەموویان لە: (الموسوعة العلمیة الشاملة)، ص(٢٤٨)دا هاتوون.

www.alibapir.com







أ- خوا (سبحانه وتعالى) چینی ئۆزۆنی دروستکردوە بۆ ئەوەی تیشکی سەروو وەنەوشەیی، کە بکوژە بۆ مرۆڤ و زیان بەخشە، بیمژێ و نەهێڵێ بگاتە زەوی.

ب- دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاویشی ڕەخساندوون، کە تیشکی ژێر سوور بمژن.

کەواتە: ئەم سێیە: ١- هەم چینی ئۆزۆن، ٢- هەم دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، ٣- هەم هەڵمی ئاو، ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێڕن لە ڕێکخستنی پلەی گەرمیی سەر زەوی دا و، ئەگەر هاتباو تیشکی سەرووی وەنەوشەیی و، تیشکی ژێر سوور، گەیشتبانە سەر زەوی، جگە لەوەی کە زیانبەخش بوون، پلەی گەرمییش زۆر بەرز دەبۆوە، بەڵام ئەو چینی ئۆزۆنە، کە وەك گوتمان: لە چینی دووەمی هەوا (ستراتۆسفیر)دایە، کە لە زەوییەوە بگرە تاکو ئاستی پەنجا کیلۆ مەتر (٥٠ کم) بەرز، ئەو چینەی تێدایە، دەبێتە پەردەو قەڵغانێکی پارێزەرمان.

بۆیە کە جار جار دەبیستن، دەگوترێ: لە فلان شوێن، چینی ئۆزۆن کون بووە، یان تەنك بووە، ئایا لە ئەنجامی چی دا چینی ئۆزۆن کون دەبێ یان تەنك دەبێ؟ بێگومان لە ئەنجامی دووکەڵی ئەو کارگانەدا کە چەك و تەقەمەنی دروست دەکەن.

بۆیە کاتی خۆی[1] ڕێککەوتننامەیەك کرا لە نێوان دەوڵەتانی دنیادا، بە ناوی ڕێککەوتننامەی (کیۆتۆ)، کە بەپێی ئەو ڕێککەوتنامەیە دەبووایە زلهێزەکانی کە چەك دروست دەکەن، دروستکردنی چەك کەم بکەنەوە، بە مەبەستی کەمکردنەوەی گازی زیانگەیەنەر بە هەواو ژینگە، هەموو دەوڵەتانی دنیا پێوەی پابەند بوون، جگە لە ئەمریکا، کە بە پێی هەندێك سەرژمێریی، وەك (نعوم چومسكی) لە کتێبەکانی خۆیدا باس دەکات: ئەمریکا بە تەنیا بە قەدەر هەموو دەوڵەتانی دنیا چەك بەرهەم دێنێ، واتە: بە قەدەر هەموو دنیا ژینگە

---

(١) لە: ١٩٩٧/١٢/١١ز دا، ئیمزا کراو، لە: ٢٠٠٥/٢/١٦ز دا، جێبەجێکرا، ئەو ڕێککەوتننامەیە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بەسترا (١٩٢) لایەن تێیدا بەشدار بوون، تەنیا ئەمریکا بەشداری نەبووە.

www.alibapir.com



پیس دەكات و، چینی ئۆزۆن زیان پێ دەگەیەنێ، كە سەرەنجام وەك ئێستا دەبیستن، بەستەڵەكەكانی باكووری خڕۆكەی زەوی، دەتوێنەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا كە چینی ئۆزۆن تەنك دەبێ و، چاك تیشكی ژێر سوورو سەرووی وەنەوشەیی ناگێڕێتەوە و دێنە نێو مەجالی زەوی و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی پلەی گەرمیی زەوی بەرزبێتەوە و، سەرەنجام بەستەڵەكەكان بتوێنەوە.

هەر بۆیەش خوای زانا و شارەزا دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الروم.

واتە: خراپەكاریی تەڕو وشكی گرتەوە، بە هۆی كردەی دەستی خەڵك، تاكو بەشێك لەوەی كە دەیكەن، سزایەكەیان پێ بچێژێ، بەڵكو بگەڕێنەوە.

بەڵێ كاتێك مرۆڤ دەستكاریی شتەكانی خوا دەكات، زیانبار دەبێ، مرۆڤ چەك دروست دەكات بۆ ئەوەی یەكدی پێ قڕ بكات، جارێ پێش ئەوەی بە چەكەكە مرۆڤەكان لە بەین بچن، هەر بە دووكەڵی كارگەی دروستكردنی چەكەكە، زیان بە هەوا و ژینگە، دەگات و چینی ئۆزۆن كون دەبێ، یان تەنك دەبێ و، دەرفەت دەدرێ بەوەی كە تیشكە زیانبەخشەكانی وەك: سەرووی وەنەوشەیی و ژێر سوور، بێنە نێو هەوای دەوری زەوی و، بەستەڵەكەكان بتوێنەوە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵكو وەك خوا فەرموویەتی زیان بگات بە تەڕو وشك، ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾، چونكە: لە ئەنجامی ئەوەدا، كە ئەو هەموو دوو كەڵ و خڵتەو خاڵ و ژەنگ و ژارە لە كارگەكان، بە تایبەت كارگەكانی دروستكردنی چەك، پەیدا دەبێ، زیان نەك تەنیا بە چینی ئۆزۆن، بگرە بە كۆی سەر زەوی و بە دەریاكانیش دەگات و، نەك تەنیا مرۆڤەكان، بەڵكو ژیاندارانی دیكەش زیانبار دەبن[1].

---

(١) بڕوانە: (إستكشافات ومقدمة في علم الفلك)، ص١٨٨-١٨٩، كە كتێبێكی بیانییەو تەرجەمەی عەرەبی كراوە.

www.alibapir.com


**چوارەم: پێکهاتەی بەرگە هەوا:**

بەرگە هەوا لە تێکەڵەیەك لە گازەکان پێکهاتوە، بەپێی قسەی زۆربەی زانایان - هەرچەندە هەندێکیان لە وردەکاریی ڕێژەکاندا ڕاجیایان هەیە - بەڵام زۆربەیان دەڵێن: لە (٧٨٪)ی بەرگە هەوا، گازی نایترۆجین پێکی دێنێ و، (٢١٪)ی ئۆکسجین پێکی دێنێ، (٠،٩٪)ی ئۆرگۆن پێکیی دێنێ و، (٠،٠٠٣٪)ی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن پێکی دێنێ، هەروەها شێ (بخار)یش (٠،٠٠١٪)ی پێك دێنێ، واتە: بە ڕێژەیەکی زۆر کەمتر، کەواتە: ڕێژەی زۆری هەوا، بریتیە لە نایترۆجین و ئۆکسجین، دیارە ئەو ڕێژانەش هەر کامێکیان ئەو پەڕی وردەکاریی تێدا ڕەچاو کراوە، لەلایەن خوای کارزانەوە و، ئەگەر هەر کام لەو ڕێژانە، کەمتر یان زیاتر بووایە، بە کەڵك نەدەهات و، ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی، ئەو ژیانەی ئێستا نەدەبوو، بۆ وێنە: ئەگەر دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، زیاتر بووایە، ئینسان تەنگە نەفەس دەبوو و، ئەگەر ئۆکسجین کەمتر بووایە، ئینسان وا بە ئاسانیی هەناسەی بۆ نەدەدرا، هەروەها ئەگەر نایترۆجین کەمتر بووایە، یان زیاتر بووایە، دەرهاویشتەی خراپی دەبوون، نەك هەر لەسەر مەسەلەی هەناسە هەڵمژین و هەناسە دانەوە، چونکە ئەو گازانە کاریگەرییان هەیە لەسەر پێکهاتە کیمیاییەکانی دیکەش.




وێنەی (١٢) پێکهاتەکانی بەرگە هەوای دەوری زەوی

## ١٤- بەرگە ئاوی دەوری زەوی:

ئەم زەوییەی ئێمە بەلای کەمەوە، سێ بەرگی هەن:

١- بەرگێکی گڵیی، کە چیاکانیش دەگرێتەوە.

٢- بەرگێکی ئاویی.

٣- بەرگێکی هەوایی.

بەرگە هەواییەکەمان باس کرد، کە هەتا هەزار کیلۆمەتر (١٠٠٠ کلم) دەڕوا بۆ بەرزیی

ئێستاش با لە دە (١٠) خاڵاندا باسی بەرگە، ئاوییەکەی زەویش بکەین:

١- ئەو بەرگە ئاوییەی دەوری زەوی داوە، کە بە زۆریی ئۆقیانووسەکان (المحیطات)ن و زیاتر لە (٧١٪)ی پانتایی ڕووی زەوی دادەپۆشن و، لەو (٧١٪)ە، لە (٩٪)ی بەستەڵەکەکان پێکیی دێنن، بەستەڵەکی سەروو و خوارووی زەوی.

٢- ژیان لەسەر زەوی، بەبێ ئەو بەرگە ئاوییە، نەك هەر ناگونجێ بەردەوام بێ، بەڵکو هەر ئەسڵەن نەدەگونجا دروست ببێ.

٣- ڕێژەی ئاو بە: هەزارو سێ سەدو سی و حەوت ملیۆن (١٣٣٧٠٠٠٠٠٠) کم٣، لە ڕووی قەبارەوە مەزەندە دەکرێ، کە هەر سێ حاڵەتی:

١- شل، کە ئاوە. ٢- گاز، لە هەوادا. ٣- ڕەق، کە حاڵەتی بەستن و بەفرە. پێکیی دێنن[1].

---

(١) ئەم زانیارییانە لە کتێبی (الأرض)ی: (د. زغلول النجار)، لە لاپەڕە (١٦٢)دا هاتوون، هەروەها لە کتێبەکانی دیکەشدا و زۆرجار ئەو زانیارییانە، وەك (ئەلیف و بێ)یان لێهاتوە و کتێبەکان وەك یەك نەقڵیان دەکەن.




وێنەی (١٣) پێکهاتەکانی بەرگە ئاوی دەوری زەوی

٤- ساڵانە: سێ سەدو هەشتا هەزار (٣٨٠٠٠٠) کم٣، لە ئاوی ئۆقیانووسەکان دەبێتە هەڵم و لەو سێ سەدو هەشتا هەزار (٣٨٠٠٠٠) کم٣، کە ساڵانە دەبێتە هەڵم، سێ سەدو بیست هەزاری (٣٢٠٠٠٠)ی هی ئۆقیانووسەکانە، ئەوی دیکەشی کە شەست هەزارە (٦٠٠٠٠)کم٣، هی ئاوی سەر زەوییە: دەریاچە و ڕووبارو چۆم و دارو درەخت و ...هتد.

٥- ساڵانە لە ئاوی باران: دوو سەدو هەشتاو چوار هەزار (٢٨٤٠٠٠)کم٣، ئاو دەکەوێتە سەر دەریاکان و، دەوری سی و شەش هەزار (٣٦٠٠٠) کم٣ ی کەم دەکات، لەوەی کە بۆتە هەڵم، چونکە وەك گوتمان: سێ سەدو بیست هەزاری (٣٢٠٠٠٠)ی هی ئۆقیانووسەکانە، کەچی دوو سەدو هەشتاو چوار هەزار (٢٨٤٠٠٠) کم٣ی دەکەوێتەوە سەر ئۆقیانووسەکان لەو ئاوەی کە دەبارێ، لە شێوەی باران و بەفرو تەزرەدا.

کەواتە: سی و شەش هەزار (٣٦٠٠٠) کم٣ ی کەم دەکات، لەوەی کە بۆتە هەڵم، بەڵام لەولاشەوە: نەوەدو شەش هەزار (٩٦٠٠٠) کم٣ دەکەوێتە سەر زەوی

www.alibapir.com





و، سی و شەش هەزار (٣٦٠٠٠) کم٣ ی زیاد دەکات، واتە: لەو شەست هەزار (٦٠٠٠٠)ی خۆی کە بۆتە هەڵم و، زیادەکەشی دەچێتەوە نێو دەریاکان و بۆیان قەرەبوو دەبێتەوە.

یانی: لە ئاوی سەر زەوی، شەست هەزار (٦٠٠٠٠) کم٣ی دەبێتە هەڵم، کەچی نەوەدو شەش هەزار (٩٦٠٠٠) کم٣ی ئەو ئاوەی کە لە ئاسمان دێتە خوارەوە، دەکەوێتە سەر زەوی، واتە: سی و شەش هەزار (٣٦٠٠٠) کم٣ ی زیاد، لەو ئەندازەی کە لێی بۆتە هەڵم، بەڵام دوایی بایی ئەو سی و شەش هەزار (٣٦٠٠٠) کم٣ش، دوای ئەوەی مرۆڤەکان بەکاری دێنن و، شوشتنی پێ دەکەن و، ئاودێری پێ دەکەن و، بۆ خواردنەوەو پاك و خاوێنی و بۆ هەموو شتێك، بەکاری دێنن، ئەو زیادەیەی کە بریتیە لە سی و شەش هەزار (٣٦٠٠٠) کم٣، دەچێتەوە نێو دەریاکان، واتە: ئەوەندەی کە کەمی کردوە لە هەڵمی دەریاکان، بۆیان قەرەبوو دەبێتەوە[1].

٦- هەتا قووڵایی چوار کیلۆ مەتر (٤ کم) لە دەریاکان دا، ژیانداران هەن، واتە: هەتا قووڵایی چوار هەزار (٤٠٠٠) مەتر ژیانداران لە ژێر دەریادا دەژین، یانی: شوێنی وا لە دەریا هەیە، کە چوار کیلۆمەتر (٤ کم) قووڵە، چوار کیلۆمەتر (٤ کم) زۆر زۆرە، بەڵام لەوێش ژیاندارانی تێدا هەن، زیندەوەرانی تێدا هەن.

٧- ژێرەوەی دەریاکان، باشترین جۆری خۆراکیان تێدایە، هەر بۆیەش نۆ لەسەر دەی (٩/١٠)ی ژیاندارانی دەریا، لە بنەوە دان، یانی: دەریاکان ژیاندارانی زۆریان تێدان، چ هی گەورە و درشت، وەك: نەهەنگەکان و هەموو ئەو ژیاندارانەی دیکە، چ هی ورد، وەك: زیندەوەرەکان، هەروەها ڕووەکەکان، بەڵام نۆ لەسەر دەی (٩/١٠)ی ژیاندارانی دەریاکان، لە بنەوە دان، لە ژێرەوەی ئاوی دەریاکان دان، چونکە باشترین جۆری خۆراکی تێدایە.

٨- لە (٢٠٪)ی ژیاندارانی سەر زەوی لە دەریاکان دان، واتە: ژیاندارانی زەوی

---

(١) "الأرض"، ص٤٦٦، نووسینی: د. زغلول النجار.

www.alibapir.com





هەموویان بکەیە سەد بەش، یەك لەسەر پێنجیان (٥/١)ی کە دەکاتە (٢٠٪) لە دەریاکاندا دەژین، کە باشترین خۆراکیش بۆ مرۆڤەکان دابین دەکەن[1].

٩- ئاوی دەریاکان سوێرە و، ئاوی شیرینیش هەر لە ئۆقیانووس و زەریاکانەوە دێ، بەڵام لە ڕێی پاڵاوتنی بە هۆی باران و بەفرو تەرزەوە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا ئاوی شیرین هەر بوونی نیە، ئەدی ئێمە چۆن ئاوی شیرینمان دەست دەکەوێ؟! بێگومان هەر ئەوەیە کە لە ئاسمان دێتە خوارێ، ئنجا ئایا ئەوەی کە لە ئاسمان دێتە خوارێ، لە کوێ پەیدا بووە؟! ئەو هەڵمەیە کە لە ئۆقیانووسەکان تیشکی خۆر لێی دەدا و دەبێتە هەڵم، هەڵمەکەش با دەیهێنێ بۆ شوێنە ساردەکان و دەبێتە هەور، پاشان بە شێوەی بەفرو باران و تەرزە، بەسەر زەویدا دەبارێ، ئێمە ئاوی شیرینمان تەنیا لەو ڕێ یەوە دەست دەکەوێ.

بۆیە خوا (سبحانە وتعالى) دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلۡمَآءَ ٱلَّذِي تَشۡرَبُونَ ٦٨ ءَأَنتُمۡ أَنزَلۡتُمُوهُ مِنَ ٱلۡمُزۡنِ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنزِلُونَ ٦٩ لَوۡ نَشَآءُ جَعَلۡنَٰهُ أُجَاجٗا فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ ٧٠﴾ الواقعة.

واتە: ئایا ئەو ئاوە دەبینن کە دەیخۆنەوە!! ئایا ئێوە لە هەور ناردووتانە خوارێ، یان ئێمە دامانبەزاندوە! ئەگەر ویستبامان تاڵ و تفتمان دەکرد، ئایا سوپاسگوزاریی ناکەن!

واتە: ئەگەر ویستبامان نەمان دەپاڵاوت، چونکە ئێوە تەماشای دەریاچەی دووکان و دەربەندیخان و ئەو دەریاچە بچووکانە مەکەن، کە ئاوەکەیان ئاوی شیرینەو کۆبۆتەوە، ئاوی ئۆقیانووسەکان (المحیطات)سوێرە و هەر کەسێ بیخواتەوە، نەك تینووایەتیی پێ ناشکێ، بەڵکو پێی دەمرێ، وەك پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

تەماع وەك ئاوی سوێری دەریایە      هەر دەیخۆیتەوەو تەسەللات نایە

---

(١) الموسوعة العلمية الشاملة، ص٣٨٦.

www.alibapir.com


ئاوی سوێر هەتا بیخۆیتەوە، تێنووترت دەبێ، بەڵکو ئاوی سوێری دەریاکان مرۆڤ دەکوژێ.

بەڵێ بەرێزان!

ئێمە ئاوی شیرینمان بەو جۆرە دەست دەکەوێ: ئاوی دەریاکان تیشکی خۆر لێی دەدا، دەبێتە هەڵم، خوێ یەکەی بەجێ دەمێنێ و، هەڵمەکەش دوایی ئاوی شیرین و زوڵاڵی لێ دروست دەبێ، بەرەو شوێنە ساردەکانی زەوی دێ، خواش (سبحانه وتعالى) بە شێوەیەك ڕێکیخستوە کە دوایی ببێتە هەور و متوربە ببێ و ئاوێکی شیرین و زوڵاڵمان دەست بکەوێ، لە چەند شوێنێکی قورئان خوای میهرەبان ئاماژەی بەم مەسەلەیە کردوە، بۆ نموونە:

﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ ﴾ فاطر.

واتە: خوا ئەو کەسەیە بایەکانی ناردوون، هەوران دەورووژێنن (پەیدایان دەکەن) پاشان بەرە و سەرزەمینێکی مردوو لێیان دەخوڕین و زەمینی مردووی پێ دەژیەنینەوە، هەڵسانەوەش( لە ڕۆژی دوایی دا) هەر بەو جۆرەیە.

١٠- حیکمەتی سوێریی ئاوی دەریاکان:

ئەگەر یەکێ بڵێ: ئایا ئاوی زەریاکان، ئاوی ئۆقیانووسەکان بۆچی سوێرە؟!

دەڵێین: ئەگەر سوێر نەبووایە بە کەڵك نەدەهات، بۆگەن دەبوو، خوا(سبحانه وتعالى) ئەو بەرگە ئاوییەی دەوری زەوی، کە وەك گوتمان (٪٧١)ی پانتایی و ڕووی زەوی دادەگرێ، بە دوو شێوە دەیپارێزێ لە بۆگەن بوون:

**یەکەم:** سوێری کردوە و ئەو ژیاندارانەش کە تێیدان، تێیدا دەژین و باکیان نیە، جێی سەرسووڕمانە کە ئاوی دەریاکان پڕ پڕە لە ژیاندارانی هەمە جۆر و، ئەو سوێرییەی ئاوەکە زیانیان لێ نادات، جگە لە دەریاچەی مردوو (بحر الميت) کە هیچ زیندەوەرێکی تێدا ناژی، لەبەر ئەوەی ڕێژەی خوێ یەکەی زۆر زۆرە،

www.alibapir.com





خوێواوکێکی ڕووتە، من چوومەتە نێوی، لوێچێکی لێ دەدەی، وەك لوێچ لە خوێواوکێك بدەی، بۆیە هیچ زیندەوەرێکی تێدا ناژی، نە هی ڕووەکیی، نە هی ژیانداریی، ئنجا جگە لەو دەریاچەیە، ئۆقیانووسەکان پڕن لە ژیانداران.

**دووەم:** بە هۆی هەڵکشان و داکشانی دەریاکانەوە، ئەویش بە هۆی هێزی کێشندەی نێوان زەوی و مانگەوە، کە لە شەوو ڕۆژێکدا چەند جارێك هەڵکشان و داکشان ڕوودەدا، ئەوەش وەك ئەوە وایە ئەو ئاوە بشڵەقێنرێ و بەردەوام ئەو ئاوە دەشڵەقێنرێ، هەڵبەتە ئەو شڵەقاندن و جووڵاندنەی ئاوی دەریاکانیش، هۆکاری هەڵکردنی (با) و دروستکردنی شەپۆل و، سەرەنجام هەڵم و هەور و داباریینی ئاوی ئاسمانە!

## ١٥) هاوکاریی و هاوسەنگیی نێوان ڕووەك و ژیانداران:

ئاشکرایە کە ڕووەك، ڕووەك هەر لە پنجە گیایەکەوە بگرە، تاکو ئەو دارو درەختە گەورە زەبەلاحانەی کە هەیانە، پازدە، بیست (١٥-٢٠)مەتر بەرز دەبێتەوە، ڕووەك بە گشتی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژێ و، دەخوا و، ژیاندارانیش بە مرۆڤیشەوە، ئۆکسجین هەڵدەمژن و دەخۆن.

ئنجا ئۆکسجینیش لە ڕێی تیشکە پێك هاتنەوە (التمثيل الضوئي)یەوە پەیدا دەبێ، گەڵای درەختەکان تیشکی خۆر لە خۆیدا حەپس دەکات و، پاشان لە ڕێی هەندێك کارلێکی کیمیاییەوە، تەنۆلکەکانی ئاو شی دەکاتەوە، گەڵای درەخت، ئاو شی دەکاتەوە بۆ ئۆکسجین و هیدرۆجین، دواتر گەردیلەکانی هیدرۆجینیش لەگەڵ دووەم ئۆکسیدی کاربۆن یەك دەگرن و، کلوکۆز پێك دێنن و، ئۆکسجینیش وەك بەرهەمێك پەیدا دەکات[1].

---

(١) الموسوعة العلمية الشاملة، ص٣٤٠.

سُبْحَانَ الله! یانی: ئەوەی کە ژیانداران و مرۆڤ وەك خۆراك پێویستییان پێیەتی، ڕووەك و دارو درەخت، وەك پاشەڕۆك دەری دەدەن، کە ئۆکسجینە و، ئەوەش کە ژیانداران و مرۆڤ وەك پاشەڕۆك فڕێی دەدەن، کە دوانەئۆکسیدی کاربۆنە، درەختەکان، وەك خۆراك دەیخۆن، کە ئەگەر وا نەبووایە، هەم مرۆڤ و ژیانداران لە مێژبوو ئۆکسجینیان تەواو کردبوو، هەم ڕووەك و دارو درەختەکانیش لەمێژ بوو دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیان تەواو کردبوو، لە هەوادا، لە بەرگە هەوای دەوری زەویدا، بەڵام بەردەوام ڕووەك و دارو درەختەکان چەندە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەخۆن و، ژیانداران و مرۆڤیش چەندە ئۆکسجین دەخۆن، ڕێژەکەی لە هەوادا هەر نەگۆڕەو وەك یەکە، چونکە ئەوەی ڕووەك و دارو درەخت فڕێی دەدا، ژیانداران و مرۆڤ دەیخۆن و، ئەوەش کە مرۆڤ و ئاژەڵان فڕێی دەدەن، ڕووەك و دارو درەخت وەك خۆراك دەیخۆن، کە ئەوەش کە هەم هاوکاریی پێکەوە کردنە لە نێوان ژیانداران و ڕووەك و دارو درەختدا و، هەم هاوسەنگیی ڕاگرتنە لە نێوان ئەو دوو جۆرە دروستکراوەی خوای بەرزو مەزندا.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## یاسای شەشەم: مشوورخۆریی و سەرپەرشتیاریی، بەڵگەی هەبوونی مشوورخۆرو سەرپەرشتیارە:

وەك چۆن ڕێكخستن بەڵگەی هەبوونی ڕێكخەرە (النِّظَام یَدلُّ عَلَى المُنَظِّم)، بە هەمان شێوەش مشورخۆریی و سەرپەرشتیاریی، بەڵگەی هەبوونی مشورخۆرو سەرپەرشتیارە: (التَدْبیر یَدلُّ عَلَى المُدَبِّر).

ئنجا هەر كەس بە چاوی هەق دیتن و، بە عەقڵی دەرككردن، سەرنجی خۆی و بوونەوەرو دەوروبەری بدات، زۆر بە دەرەوشاوەیی بۆی دەردەكەوێ، كە مرۆڤ و ژیان و گەردوون، تەگبیركارو نەخشەدانەرو مشورخۆرێكی، خاوەنی ئەو پەڕی زانایی و توانایی و حیكمەت و بەزەیی و بەخشندەیی و شارەزایی، بەڕێوەیان دەبات.

ئێمە لەوبارەوە دەتوانین گەلێك وێنان بێنینەوە، بەڵام ئیكتیفا دەكەین، بە هێنانەوەی دوو نموونە لە دوو تەوەردا:

تەوەری یەكەم: جەستەی مرۆڤ.
تەوەری دووەم: ژینگەی مرۆڤ.

### تەوەری یەكەم: جەستەی مرۆڤ:

باسی مرۆڤ هەمووی ناكەین، كە مرۆڤ لە دوو بەشی سەرەكیی پێك دێ: ١- ڕووح، ٢- جەستە، ئێمە لێرەدا باسی ڕووحەكەی ناكەین، چونكە زانیاریی لە بەردەم ڕووحدا، كۆڵەوارە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء.

www.alibapir.com





واتە: لەبارەی ڕووحەوە پرسیارت لێ دەکەن! بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە، واتە: تەنیا پەروەردگارم چییەت و نهێنییەکەی دەزانێ، ئێوەش، ئەندازەیەکی کەم نەبێ، زانیارییتان پێ نەدراوە (و بەو ئەندازە کەمە زانیارییەش، ناتوانن دەرکی چییەت و جەوهەری ڕووحی پێ بکەن).

بەڕێزان!

خوا پشتیوان بێ لە دوو بڕگەدا باسی جەستەی مرۆڤ دەکەین:

بڕگەی یەکەم: ڕوانینێکی گشتیی بۆ جەستەی مرۆڤ.

بڕگەی دووەم: سەرنجدانێکی وردی جەستەی مرۆڤ.

## بڕگەی یەکەم: ڕوانینێکی گشتیی بۆ جەستەی مرۆڤ:

بەڕێـــــزان!

ئەگەر ئاوا تەماشای جەستەی مرۆڤ بکەین، چی دەبینین؟! لەلای سەرێوە، سەر دەبینین، دوایی سینگ دەبینین، ئنجا سك دەبینین، دوایی لاقەکان دەبینین و، دەستەکان دەبینین.

ئنجا کاتێك خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾ التين.

واتە: بە دڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەدا خوڵقاندوە، کە مەبەستی هەم پێکهاتەی جەستەیی، هەم پێکهاتەی ڕووحییە، بەڵام ئێمە لێرەدا قسە لە جەستەکەی دەکەین، هەتا مرۆڤ لە خۆی ورد بێتەوە، زیاتر لەو فەرمایشتەی خوا تێ دەگات و، زیاتر قەدری ئەو فەرمایشتەی خوا دەزانێ، هەروەها کە خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَـٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾﴾ الذاريات.

www.alibapir.com





وێنەی (١٤) پێکهاتەکانی جەستەی مرۆڤ

واتە: لە زەویدا نیشانە(ی ناسینی خوا) هەن، بۆ کەسانێك کە زانیارییەکی بە دڵنیایی گەیەنەریان لەلا بێ[1]، لە خۆشتاندا (نیشانەی خواناسیی هەن)، ئایا سەرنج نادەن، نابینن (بە چاوی عەقڵ و دڵ)؟!

کەواتە: ئێمە تاکو زیاتر لە خۆمان ورد بینەوە، ئەو فەرمانەی خوامان، باشترجێ بەجێ کردوە، کە دەفەرموێ:

﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ ﴾ الذاريات.

لە خۆشتاندا (نیشانە هەن لەسەر بوونی خوای پەروەردگارو، لەسەر بەزەیی پەروەردگارو، لەسەر مشوورخۆریی پەروەردگار بۆ ئێوە)، بۆچی نابینن! بۆچی سەرنج نادەن و بە چاوی عەقڵ تێنافکرن!

---

(١) (مُوقِن): کەسێك زانیارییەکی لە لابێ بیگەیەنێتە دڵنیایی و قەناعەتی تەواو، (راغب الأصفهاني)، لەبارەی (يقين)ەوە گوتوویەتی: (وهو سكون الفهم مع ثبات الحكم)، (مفردات ألفاظ القرآن)، ص٥٧١، المكتبة العصرية، ط٢٠١٢م.

www.alibapir.com


کەواتە: لەسەرمان پێویستە کە لە خۆمان بفکرین، سەرنج لە خۆمان بدەین، هەم بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا، هەم بۆ ئەوەش کە بزانین: خوا ئێمەی چۆن هێناوەتە دی؟!

ئنجا وەك گوتمان: کاتێك تەماشای مرۆڤ دەکەی، ڕواڵەتەکەی ئاوا دەبینی، کە لە کۆمەڵێك ئەندام پێکهاتوە: سەر، ئنجا سینگ و پشت و سك، دوایی هەردووك لاق، ئنجا هەردووك دەستەکان.

ئینسان ئەگەر هەر ئاوا تەماشای خۆی بکات، دەزانێ کە خوا (سبحانە وتعالى) عەقڵی لە سەرەوەی جەستەی مرۆڤ داناوە، کەواتە: پێویستە عەقڵ لە ژیانی مرۆڤدا حاکم بێ، بڕیاری کۆتایی بە دەست عەقڵ بێ، کە عەقڵ زۆر پەیوەندیی هەیە بە مێشکەوە، کە لە نێو کەللەی سەردایە، ئنجا ئەندامەکانی دیکە: چاو و گوێ و لووت و زمان، دەبێ لە ژێر کۆنتڕۆڵی عەقڵدا بن دەبێ ئەوەی عەقڵ پێت دەڵێ، تەماشای ئەوە بکەی و لەوە ورد بیەوە، ئەوەی کە عەقڵ پێت دەڵێ، ئەوە بڵێی، ئەوەی کە عەقڵ پێت دەڵێ ئەوە بخۆی، ئنجا دوایی دەگاتە، دڵ و سییەکان.

کەواتە: دەبێ عاطیفەو هەست و نەست لە ژێر کۆنتڕۆڵی عەقڵدا بێ، خوا عەقڵی خستۆتە سەرووی دڵ و دەروونەوە، ئنجا دەگاتە گەدە، کەواتە: دەبێ خواردن و خواردنەوەت کە دەیخەیە نێو گەدەتەوە، لە ژێر کۆنتڕۆڵی عەقڵ و، لەژێر کۆنتڕۆڵی دڵ و دەروونیشتدا بێ، ئنجا دەگاتە داوێن، کە دیارە دەبێ ئەویش لەژێر کۆنتڕۆڵی عەقڵ و دڵ و دەرووندا بێ.

### جەستەی مرۆڤ و بەراوردکردنی لەگەڵ دەوڵەت دا:

ئنجا با تەماشا بکەین، بزانین داخۆ جەستەی مرۆڤ و، کۆئەندامەکانی، چۆن لەگەڵ وەزارەتەکانی دەوڵەتدا بەراورد دەکرێن[1]:

---

(١) بۆ ئەم بابەتە سوودم لە کتێبی: (الطب محرابٌ للإيمان)ی: (د. خالص جلبي)، وەرگرتوە، ج١، ص٢٥١ - ٢٥٤.

www.alibapir.com


**١- کۆئەندامی مێشك و دەمار:**

کاتی خۆی گوتراوە: ئەو کۆئەندامە لە چواردە ملیار (١٤،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) خانە پێکهاتوە، بەڵام زانستی توێکاریی و پزیشکیی تازە - وەك دوایی بە وردیی باسی کۆئەندامی مێشك و دەمار دەکەین - دەڵێ: کۆئەندامی مێشك و دەمار لە سەد ملیار (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) خانە پێکهاتوە، دیارە ئەو کاتە بەوەندە مەزەندەیان کردوە، گرنگ ئەوەیە کۆئەندامی مێشك و دەمار دەوری حوکمڕان و سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران دەبینێ، ئەو کەسەی کە لە سەرەوەی هەڕەمی دەسەڵاتە.

**٢- کۆئەندامی دڵ و خوێن:**

ئەمیش دەوری وەزارەتی هاتوچۆو گەیاندن و وەزارەتی شارەوانیی دەبینێ، چونکە لە ڕێی خوێنەوە، خواردن دەگات بە هەموو خانەکانی جەستە و، لە ڕێی خوێنیشەوە، هەرچی پاشەڕۆکی خانەکانی جەستەیە، فڕێ دەدرێتە دەرێ، چ لە ڕێی هەناسە دانەوە، چ لە ڕێی میزڵدانەوە، چ لە ڕێی کۆئەندامی هەرسەوە.

**٣- کۆئەندامی هەرس:**

ئەمیش دەوری وەزارەتی ئازووخە (وزارة التموین) دەبینێ کە پێداویستیی جەستە دابین دەکات و بە هۆی کۆئەندامی هەرسەوە، ئەو خواردنەی کە دەیخۆین، هەرس دەبێ و بە کەڵکی ئەوە دێ، خوێن بیگەیەنێ بە خانەکانی جەستەو، پاشەڕۆکەکەشی فڕێ بدرێ و، جەستەی لێ دەرباز بکرێ.

**٤- لوولە ئارەق ڕێژەکان:**

ئەمیش لەگەڵ وەزارەتی گەشت و گوزارەکان و هاوینە هەوارەکان دا، بەراورد دەکرێ، چونکە لوولە ئارەق ڕێژەکان، پلەی گەرمیی جەستە، لە سی و حەوت پلەو نیو (٣٧,٥)، شتێك کەمتر، شتێك زیاتردا ڕادەگرن و، ئەوە لوولە ئارەق ڕێژەکانن، کە ئەگەر گەرما بوو، گەرمایی نێو جەستە دەخەنە دەرێ و، ئەگەر سەرماش بوو، دادەخرێن، بۆ ئەوەی سەرمای دەرێ نەیەتە نێو جەستە، گرنگ

www.alibapir.com



ئەوەیە، ئەوان پلەی گەرمیی جەستە ڕادەگرن، چونکە ئەگەر پلەی گەرمیی جەستە، زیاتر بێ، یان کەمتر بێ، کۆئەندامەکان و خانەکان لە بەین دەچن و کاری خۆیان ناکەن.

**٥- پێست و پێڵوی چاوو نینۆك:**

ئەوانەش دەوری وەزارەتی دەرەوە دەبینن، ئینسان بە هۆی دەم و چاو و پێستەوە و، بە هۆی چاوەکان، پاشان گوێیەکانەوە، مامەڵە لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا، دەکات، هەر وەك چۆن وەزارەتی دەرەوە مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتەکانی دیکەدا، دەکات.

**٦- کۆئەندامی هەناسەدان:**

ئەمیش ڕۆڵی وەزارەتی ئابووریی دەگێڕێ، چونکە: وەزارەتی ئابووریی، خواردن و خۆراك دێنێ و دەبات، کۆئەندامی هەناسەدانیش کاتێك ئۆکسجین هەڵدەمژێ، دوایی دەبێتە خۆراك و لە ڕێی خوێنەوە، دەبرێ بۆ جەستەکان، پاشان دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیش هەر لەو ڕێیەوە فڕێ دەدەیە دەرێ.

**٧- کۆئەندامی ئێسك و ماسوولکەکان:**

ئەمانیش هەردووکیان: دەوری وەزارەتی بەرگریی دەبینن، بەڵێ: پەیکەری ئێسقان و ماسولکەکانیش دەوری وەزارەتی بەرگریی دەبینن، جەستە چۆن ڕادەوەستێ؟ بێگومان بە هۆی ئێسقانەوە و، بەرگریی لە خۆ کردنیشی بە هۆی پەیکەری ئێسقان و بە هۆی ماسوولکەکانیەوەیە.

**٨- جـــەرگ:**

جگەر ڕۆڵی گومرگی گشتیی دەبینێ، چونکە خواردنی هەرسکراو بە جگەردا دەڕوا و، ئەویش هی پەسەندکراو بۆ ڕیخۆڵەو خانەکانی جەستە دەنێرێ و، ڕەفزکراویش بۆ گورچیلەکان و، پاشان لە ڕێی کۆئەندامی میزو میزەڕۆوە، فڕێ دەدرێتە دەرێ.

www.alibapir.com





**٩- سپڵ:**

ئەمیش دەوری گۆڕستان دەبینێ، چونکە سپڵ بریتیە لە گۆڕستانی خڕۆکە سوورەکان، ئەو خڕۆکە سوورانەی کە دەمرن و ژیانیان کۆتایی پێهاتوە، لە سپڵدا کۆدەبنەوە، ئنجا هەر خڕۆکەیەکیش کە دەچێ بۆ نێو سپڵ، گەرد(جزيء - Mocol)ێکی ئاسنی پێیە، کە وەك تابووت بەکاری دێنێ، بەڵام دوایی گەردە ئاسنەکە، کە ئەو خڕۆکە سوورەی مردوە، لەگەڵ خۆی دا بردوە، وەك لە تابووت نرا بێ، دوایی تابووتەکە دێتەوە، ئەو گەردە ئاسنە دێتەوە، بۆ ئەوەی جەستە لێی بەهرەمەند بێ، خڕۆکە سوورەکە لەوێ بەجێ دەمێنێ و، گەردە ئاسنەکەش جارێکی دیکە بۆ نێو خوێن، دێتەوە، وەك چۆن مسوڵمانان جەنازە دەنێژن، بەڵام بە تابووتەوە نایینێژن، تابووتەکەی دێننەوە و مردوویەکی دیکەی پێ دەنێژن!.

**١٠- مۆخ:**

کە لە کرۆکی ئێسقان دایە و خڕۆکەی سوورو سپی دروست دەکات، ڕۆڵی وەزارەتی پیشەسازیی دەگێڕێ، هەڵبەتە خڕۆکە سوورەکان خواردن بۆ خانەکانی جەستە دەبەن و، خڕۆکە سپییەکانیش بەرگریی لە جەستە دەکەن، لە بەرانبەر میکرۆب و ڤایرۆسەکاندا.

**١١- کۆئەنجامی میز:**

ئەمیش ڕۆڵی وەزارەتی نێوخۆ دەبینێ، چونکە سیتسمی نێوخۆی جەستە دەپارێزێ و، شلەمەنییەکانی جەستە هاوسەنگ ڕادەگرێ، هی خراپ فڕێ دەدا و، هی باش دەهێڵێتەوە و کۆمەڵێك پرۆسەی دیکەی گرنگ ئەنجام دەدا، گورچیلەکان زۆر ڕۆڵێکی گرنگ و گەورە دەگێڕن و، وەك چۆن ئینسان بەبێ دڵ و، بەبێ سییەکان و، بەبێ جگەر ناژی، بەبێ گورچیلەکانیش هەر ناژی.

**١٢- پێنج هەستەکان:**

(بیستن، دیتن، بۆنکردن، تامکردن، دەست لێ کوتان)، ئەمانیش هاوکارانی وەزارەتی دەرەوەن، چونکە مرۆڤ لەڕێی چاوەوە شتەکان دەبینێ و، لەڕێی گوێوە،

www.alibapir.com



دەنگەکەکان دەبیستێ و بۆنەکان، تامەکان، لە ڕێی بۆنکردن و چێژتنەوە، دەزانێ: چین و چۆنن؟ زیانبەخشن، سودبەخشن، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات؟

هەروەها قەبارەکان و تەنەکان: نەرم و زبرو ساردو گەرم و ڕەق و شل و هتد، لە ڕێی دەستلێکوتان(لمس)ەوە دەزانێ.

**١٣- کۆئەندامی دەنگ و زمان:**

ئەمیش ڕۆڵی وەزارەتی ڕاگەیاندن دەبینێ.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە: شتێکمان لە جەستەدا نیە، کە ڕۆڵی وەزارەتی ئەوقاف ببینێ!! لەبەر ئەوەی لە ئیسلامدا خوای پەروەردگار مرۆڤی وا خوڵقاندوە دەبێ هەموو کەینونەی مرۆڤ، تەسلیمی خوا بێ و لە ڕاستییدا کاتێکیش کۆمەڵگا تەندروست دەبێ، هەمووی پابەند بێ بە شەریعەتی خواوە، نەك تەنیا وەزارەتێکی تایبەت دیاریی بکەین، بۆ کاروباری ئایینی، بەڵام هەموو کاروبارەکانی دیکە، بەبێ ئایین بەڕێوە بچن!

ئەوە پێچەوانەی ئەو فیطرەتەیە کە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە و، پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقیشە، دەبێ ئایین بێتە نێو هەموو کایەکانی ژیانەوە، بۆیە لە جەستەدا شتێکمان نیە لە بەرانبەر وەزارەتی ئەوقافدا بێ و، بەراوردی پێبکەین لەگەڵ ویدا!.

ئێمە لێرەدا کۆتایی بە بڕگەی یەکەم: (ڕوانینێکی گشتی بۆ جەستەی مرۆڤ) دێنین، کە سەرنجدانێکی ڕواڵەتی جەستە و، بەراورد پێ کردنی کۆئەندامەکانی جەستە بوو لەگەڵ وەزارەتەکانی دەوڵەتێکدا و، خوا پشتیوان بێ لە بڕگەی دووەمی ئەم توێژینەوەدا کە دەمانەوێ لە بارەی جەستەوە ئەنجامی بدەین، سەرنجێکی ورد، لە کۆئەندامەکانی جەستە دەدەین و کۆمەڵێك وردەکاریی، کە زانیاریی پزیشکیی و، زانیاریی توێکاریی و، زانیاریی زیندەوەرزانیی تازە پێیان گەیشتوون، لە بارەی جەستەی مرۆڤ و کۆئەندامەکانی پێکهێنەری جەستەی مرۆڤەوە، دەخەینە ڕوو.

www.alibapir.com



شایانی باسیشە:

(سەرنجدانێکی وردی جەستەی مرۆڤ) زۆر خۆی لێك کێشاوەتەوە و بۆتە بابەتێکی تا ڕاددەیەك تێر و تەسەل، کە بەر لە دەستپێکردنی نیازم نەبوو: هێندە فراوان ببێ، بەڵام بە هەرحاڵ وای لێهات و، بێگومان جەستەی مرۆڤیش وردەکاریی زۆری تێدایە و، وەك هەر دروستکراوێکی دیکەی خوای بەرز و مەزن و زانا و توانا، ئەو پەڕی ڕێك و پێکیی تێدا کراوە:

﴿صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ النمل(٨٨).

هەڵبەتە هەر بۆیەش خوای پەنهانزان فەرمانی پێکردووین: کە هەرچی زیاتر لە خۆمان وردبینیەوە و، سەرنجی خۆمان بدەین، تاکو زیاتر نیشانەکانی خواناسیی، لە خۆمان دا بەدی بکەین:

﴿وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾﴾ الذاريات.

کەواتە: ئێمە لە کاتێك دا سەرنجی جەستەی خۆمان دەدەین، کە خوای کارزان فەرموویەتی: لە باشترین شێوەدا دروستم کردوە:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾ التين.

با دڵنیا بین - ئەگەر نیەتی لێ بێنین - کە خەریکی جێبەجێکردنی فەرمانێکی گەورە و گرنگی خوای زانا و شارەزاین، کە بە شێوەی پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانە (إستفهام إنكاري)وە، ئاڕاستەی کردووین:

﴿وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾﴾ الذاريات!!.

www.alibapir.com





## بڕگەی دووەم: سەرنجدانێکی وردی جەستەی مرۆڤ:

بەڕێـــزان!

لە کۆتایی بڕگەی یەکەمی ئەم یاسای شەشەمەی عەقڵ دا - وەك بەڵگە لەسەر خواناسیی - بەڵێنماندا کە لەم بڕگەیەدا سەرنجێکی وردتر لە جەستەی مرۆڤ، بدەین، لەبەر ڕۆشنایی فەرمایشتی خوا (سبحانه وتعالى)، لە سووڕەتی: (الذاريات)دا کە دەفەرموێ:

﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: لە زەویدا نیشانەی زۆر هەن (لەسەر خواناسیی) بۆ کەسانێك، کە زانیارییەکی جێی دڵنیاییان هەبێ و، هەروەها لە نەفسی خۆشتان دا، ئایا نابینن، سەرنج نادەن؟!

واتە: ئەوانەی هەروا لە خۆوە بە دوا ناکەون، بەڵکو شت ورد دەکەنەوە تاکو تێیدا بگەنە دڵنیایی، بۆ ئەوانە لە زەوییدا نیشانەی زۆر هەن لەسەر ئەوە، کە خوای پەروەردگارو مشوورخۆر، ئەو زەوییەی وا هەڵخستوە، کە مرۆڤ بتوانێ لەسەری بژی، هەروەها لە خودی خۆشتان دا دیسان بەڵگە و نیشانەی زۆر و زەوەند هەن لەسەر خواناسیی، بۆچی سەرنج نادەن و ورد نابنەوە؟!

ئنجا ئێمە هەم وەك جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾، (لە خۆشتاندا نیشانەی خواناسیی زۆر هەن، بۆچی سەرنج نادەن و وردنابنەوە! بۆچی لە خۆتان ناڕوانن؟!)، هەم وەك ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی ئەو یاسایەی شەشەمی عەقڵ، کە ناچارمان دەکات، دان بە بوونی پەروەردگارماندا بێنین، کە بریتیە لەوەی: (مشوورخۆریی و سەرپەرشتییکردن، بەڵگەیە لەسەر هەبوونی مشوورخۆرو سەرپەرشتییکار)، ئێمە لەم بڕگەی دووەم دا بە نەفەسێکی درێژ، سەرنجی ورد لە جەستەی مرۆڤ دەدەین، هەڵبەتە بایی

www.alibapir.com







ئەوەندە کە خەڵك بە گشتیی لێی تێدەگات و، بۆ ئەو مەبەستەش پشتمان بە چەند بەرهەمێکی کەسانێکی شارەزا و پسپۆڕی ئەو بوارە بەستوە و، هەرچی لەم بڕگەیەدا لە بارەی جەستەی مرۆڤەوە دەیهێنین، لەو سەرچاوانەوە دەیهێنین و خوێنەرانی بەڕێز دەتوانن بۆیان بگەڕێنەوە و، بە پێویستیشی نازانم بۆ هەموو قسە و زانیارییەك، ئاماژە بەلاپەڕەکانیان بکەمەوە[1]:

شایانی باسە لەم سەرنجدانە وردە لە جەستەی مرۆڤ، هەوڵمداوە لە چواردە (١٤) خاڵدا، باسی جەستەی مرۆڤ بکەم، بەم شێوەیە:

یەکەم: خانە (الخلية)، یەکەی بنەڕەتی ژیانداران.

دووەم: کۆئەندامی مێشك و دەمار.

سێیەم: کۆئەندامی خوێن.

چوارەم: کۆئەندامی هەناسەدان.

پێنجەم: کۆئەندامی هەرس (الجهازُ الهَضمِي).

---

(١) کە بریتین لەو حەوت کتێبە:

١- (إبداع الرحمان في جسم الإنسان) د. أبو منصور شريعة العبادي، الطبعة الأولى (١٤٣٣) هـ، (٢٠١٢)م.

٢- (بيولوجيا الإنسان)، د.حميد أحمد حاج، الطبعة الثالثة، دار المصيرة، عمان، (١٤٣٨) هـ، (٢٠١٧)م.

٣- (الإعجاز الرباني في الجسم الإنسان)، د. علي فؤاد مخيمر، الطبعة الأولى دار النفائس، بيروت (١٣٤٣) هـ، (٢٠١٣)م.

٤- (الطب محراب للإيمان)، ج١ و ٢، الطبعة الأولي، المؤسسة الرسالة (١٣٩٨) هـ، (١٩٧٨)م.

٥- (الإنسان من الميلاد إلى البعث في القرآن الكريم، د. زغلول راغب محمد النجار، الطبعة الأولى: ٢٠٠٨م، دار المعرفة/بيروت.

٦- إعجاز القرآن في ما تخفيه الأرحام، كريم نجيب الأَغَرّ، دار المعرفة - بيروت/ لبنان، ط الأولى: ٢٠٠٥م/ ١٤٢٥هـ.

٧- خلق الإنسان في القرآن الكريم، د. زغلول النجار، ط الأولى: ٢٠٠٨ م، دار المعرفة - بيروت/ لبنان.

شەشەم: کۆئەندامی میز (الجهاز البَولي).

حەوتەم: کۆئەندامی ئێسکیی (الجهاز العَظمِي).

هەشتەم: کۆئەندامی ماسوولکەیی (الجهاز العَضلِي).

نۆیەم: کۆئەندامی پێستیی (الجهاز الجلدِي).

دەیەم: کۆئەندامی هۆڕمۆنیی.

یازدەیەم: کۆئەندامی لیمفاویی (الجهاز اللِّمفاوي).

دوازدەیەم: کۆئەندامی بەرگریی (الجهاز الدفاعي).

سێزدەیەم: پێنج هەستەکان: (بینین، بیستن، تام کردن، بۆن کردن، دەستلێکوتان).

چواردەیەم: پوختەیەك لە بارەی چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤەوە.

## خاڵی یەکەم: خانە (الخلية)

هەموو ژیانداریێك، چ زیندەوەریێکی یەك خانەیی، وەك ئەمیبا، کە لە یەك خانە دروست دەبێ، چ ژیانداریێکی وەك مرۆڤ، کە بە مەزەندە لە سەد تریلیۆن: (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، (١٠٠$^{١٢}$)، خانە دروستبووە، خشتی یەکەم و یەکەی بنەڕەتیی (الوحدة الأساسية)ی جەستەیان بریتیە لە خانە(خليّة)، ئنجا لە بارەی (خانە)وە دەگونجێ شتی زۆر زۆر بگوترێ.

بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین ئەوەی پێویستە لە بارەی خانەوە بیڵێین، لە پازدە(بەند) دا کورت و پوختی بکەینەوە:

١- قەبارەی خانە: خانەی وا هەیە تیرەکەی (٥) مایکرۆنە، کە ژیانداری نێو مەنیی پیاوە، {مایکرۆن واتە: یەك لەسەر هەزار (١/١٠٠٠)ی (ملم)ێك}، هەتا دەگاتە هێلکۆڵە (بويضة)ی نێو ئاوی ئافرەت، کە قەبارەکەی: (١٢٠-١٥٠) مایکرۆنە، واتە: سی چل هێندەی ژیانداری تۆویی (حيمن)ی پیاو.

www.alibapir.com






وێنەی (١٥) پێکهاتەکانی خانـــەی مرۆڤ

٢- کێشی خانە: کێشی خانە یەك نانۆگرامە، نانۆگرامێك یەك لەسەر یەك ملیاری گرامێکە (١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠) واتە: گرامێك بکەیە (یەك ملیار) بەش، یەك بەشی پێی دەگوترێ: (نانۆ گرام)، ئنجا کێشی خانە، بە گشتی (نانۆگرام)ێکە.

٣- جۆرەکانی خانە: خانە دوو سەد (٢٠٠) جۆر زیاترن و، خانە یەکەی بنەڕەتیی تێکڕای ژیاندارانە و، نهێنییەکانی ژیان(حیاة) هەموویان لە خانەدا شێردراونەوە.

٤- خانە بە تەنیاش توانای ژیانی هەیە: (خانە) ئەگەر بە تەنیاش بێت، هەر کات ئاو و هەواو و ژینگەی بۆ ڕەخسا، دەتوانێ بژی و، پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، کە حەتمەن لەگەڵ خانەکانی دیکەش بێ، بەڵکو بە تەنیاش دەتوانێ بژی.

www.alibapir.com







٥- خانە توانای بەرهەمهێنانی نوسخەیەکی تازەی لە خۆی هەیە:

خانە پاش دەرچوونی فەرمان لە لایەن ئەو ترشی نێوکییەی کە تێیدا کۆکراوەتەوە، (الحَامض النوَوي المخَزَّن فِيهِ)، دەتوانێ نوسخە لەبەرخۆی بگرێتەوە، ئەویش بریتیە لە کرۆمۆسۆمەکان، کە لە گەردی (DNA)دا هەن و (DNA) یش، جینەکانی بۆماوەیی و سیفەت بۆ هێڵەرەوەی تێدا هەن، هەر کرۆمۆسۆمێك بیست هەزار (٢٠،٠٠٠) جینی تێدایە، جین (مُورِّث)یش، ئەوەیە کە وادەکات سیفەتەکان لەوەی پێشییانەوە بۆ ئەوەی دوایان بگوازرێنەوە و، کۆپی بکرێنەوە.

٦- خانە دوای ئەوەی کە دوو لەت و دابەشیش دەبێ، هەردووك لەتەکە توانای ژیانیان هەیە و، هەرچی سیفەتی پێویستە بۆ دروستبوونی، لەسەر شریتی بۆ ماوەییەکەی تۆمارکراوە.

تێکڕای سیفەتەکانی کە بۆ دروستبوونی ژیاندارەکە پێویستن، بەشێوەی ژمارەیی لەسەر (شریتی بۆ ماوەیی)، کە لە ترشە نێوکییەکاندا هەیە، تۆمار کراون و شریتی بۆماوەیی مرۆڤ، لە شەش ملیار (٦،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) پیتی بۆماوەیی پێك دێ و، ئەو شەش ملیار پیتەش لە قەبارەیەکدا کۆکراونەتەوە، کە بە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنییش ناگونجێ ببینرێن، ئەو زانیارییانەش کە لەو شەش ملیار پیتەدا هەن، پێویستییان بە یەك ملیۆن لاپەڕە هەیە، کە لەسەری بنووسرێنەوە، بەڵکو هەندێك لە زانایان زیاتریش دەڵێن.

٧- پانایی ئەو شریتە بۆماوەییە، لە هەموو زیندەوەرەکاندا، بریتیە لە دوو نانۆمەتر.

وەك گوتمان نانۆمەترێك بریتیە لە: (یەك لەسەر ملیار(١/١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) یکی مەترێك، یانی مەترێك بکەی بە یەك ملیار بەش، ئنجا بەشێکی نانۆمەترێکە، کەواتە: (١٠٠٠) نانومتر(nm) = (١) مایکرومەتر[1].

پانایی ئەو شریتە بۆماوەییە، بریتیە لە دوو نانۆمەتر و، بۆ ئەوەی زیاتر لێی تێ بگەین کە چەند باریکە! چەند بچووکە! دەڵێین: تیرەی مووی مرۆڤ، مووی

---

(١) إستكشافات ومقدمة في علم الفلك، ص٧٧١.

www.alibapir.com



سەر بێت، یان مووی ڕیش بێت، تیرەی مووی مرۆڤ سەد(١٠٠) مایکرۆنە، واتە: سەد بەش لە هەزار بەشی میللی مەترێك (١٠٠/١٠٠٠)ملم، ئنجا تیرەی موو، پەنجا هەزار (٥٠،٠٠٠) جار لە تیرەی ئەو شریتە بۆماوەییە ئەستوورترە!

٨- خانە توانای پەیوەندیی هەیە لەگەڵ خانەکانی دیکەدا:

خانە بەپێی سیستمێکی ئاڵۆزی پەیوەندیی، کە هەزاران جۆرە گەردی پرۆتینی نامەهەڵگر بەکاردێنێ، پەیوەندیی بە خانەکانی دیکەوە دەبەستێ، یانی: خانە لەگەڵ خانەکانی دیکەدا، لە ڕێی گەردی پرۆتینەوە، کە زانیارییان پێدا دەنێرێ، هەواڵیان پێدا دەنێرێ، پەیوەندیی دەبەستێ، ئەگەرنا بۆ وێنە: ئەو خانەیەی کە مرۆڤی لێ دروست دەبێ، دەبێتە دوو (٢)، دوایی دەبن بە چوار (٤)، دەبن بە هەشت (٨)، دەبن بە شازدە (١٦)، دەبن بە سی و دوو (٣٢)، دەبن بە شەست و چوار (٦٤) و.. هتد، ئنجا ئایا ئەو خانانە دوایی چۆن کۆدەبنەوە و چۆن دابەش دەبن: کە هەندێکیان (سەر) پێك دێنن، هەندێکیان (ئێسقان) پێك دێنن، هەندێکیان (چاو) پێك دێنن، هەندێکیان (جگەر) پێك دێنن، هەندێکیان (سییەکان) پێك دێنن، هەندێکیان (دەست) و (لاق) و .. هتد؟ دیارە جۆرێك لە پەیوەندییان لە نێواندا هەیە، ئەویش لە ڕێی نامەی گەردی پرۆتینەوە، کە بۆ یەکدی دەنێرن، هەڵبەتە ئەویش هەمووی بە هۆی ئەو زانیارییە لەسەر تۆمار کراوانەوە، کە لەسەر کرۆمۆسۆمەکانیان تۆمار کراون و، پێشوەختە دەزانن دەبێ چی بکەن!

٩- خانە توانای خۆکوشتنی هەیە:

خانە جاری وایە بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراو (مُبَرْمَج)، خۆی دەکوژێ، بۆ ئەوەی ژمارەی خانەکانی جەستەیەك، لەو ئەندازەیەی کە پێویستە، زیاتر نەبێ، هەروەها هەر کاتێك خانەی شێرپەنجەیی (الخلية السرطانية) ویستی سەرهەڵدا، ئەو خانانە هەڵدەستن بە حاڵەتی خۆکوشتن، بۆ ئەوەی ڕێگریی بکەن، لە پەیدا بوونی خانەی شێرپەنجەیی!

١٠- خانەکان لە یەك کاتدا دەوری ئەندازیار و وەستا و کرێکار دەبینن، لە دروستکردنی جەستەدا:

www.alibapir.com



بەڵێ خانەکان کۆدەبنەوە و تەگبیر دەکەن و خۆیان ڕێك دەخەن و، شانە (نسیج) پێك دێنن و، دوایی لە شانەکان (الأنسجة) ئەندام (عضو) و، ئنجا لە ئەندامەکان، کۆئەندام (الجهاز) و، لە کۆی کۆئەندامەکان (أجهزة)یش، جەستەیەکی تێر و تەواو پێك دێنن!

**١١- خانە کارگەیەکە بەرهەمی جۆرا و جۆری زۆری هەن:**

بەڵێ خانە چەندان جۆرە ماددەی ئەندامیی (عضوي) بەرهەم دێنێ، چونکە ماددەی ئەندامیی (عضوي) هەیە، کە دەگونجێ ژیانی بچێتێ و، ماددەی نائەندامیی (غیر عضوي)یش، هەیە کە ناگونجێ ببێتە ژینگەی ژیان.

**١٢- خانە وزە لە ماددە ئەندامیی و نائەندامییەکان بەرهەم دێنێ:**

واتە: تەنبەڵانە دانانیشێ کەسێك بژیوی بۆ دابین بکات، بەڵکو بۆ خۆی قۆڵی هیممەت لە بژیو دابین کردنی خۆی هەڵدەماڵێ.

**١٣- خانە، وزە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك، دەگۆڕێ و پەزمەندەی دەکات و هەڵیدەگرێ:**

واتە: خوای میهرەبان خانەکانی وا دروستکردوون، کە حیسابی داهاتووش بکەن و، مشووری خۆیان و جەستە بخۆن، لە ڕووی ژیان و گوزەران و بەڕێوەچوونیانەوە!

**١٤- جەستەی مرۆڤ لە سوپایەکی بێ ژمار خانە و، هەر خانەیەکیش لە سوپایەکی بێ ژمارە گەردیلە پێکهاتوە:**

جەستەی مرۆڤ لە زیاتر لە سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) خانە پێك دێ و، هەر کام لەو خانانەش، لە یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) گەردیلە پێك دێن، کەواتە: ئەگەر بمانەوێ، ژمارەی گەردیلەکان(ذرات)ی جەستەی مرۆڤ بزانین، دەبێ: سەد تریلیۆن خانە، جارانی یەك تریلیۆن گەردیلە بکەین:

(١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) × (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) =

(١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) (١٠٠)[٢٤] سەد تریلیۆن تریلیۆن

www.alibapir.com



گەردیلە! ئەوە کۆی ئەو گەردیلانەیە کە جەستەی مرۆڤ لێیان دروست دەبێت.

١٥- ژمارەی خانەکانی بەکتریاکانی نێو جەستە، بیست (٢٠) هێندەی ژمارەی خانەکانی جەستەیە:

ژمارەی خانەکانی ئەو بەکتریایانەی کە لە جەستەدا هەن، بە تایبەت لە نێو ڕیخۆڵە گەورەدا - وەك دوایی باسی دەکەین - کە ئەوانیش کاری خۆیان هەیە، بیست (٢٠) هێندەی ژمارەی خانەکانی جەستەن و، دەوری کیلۆگرامێك قورسن و بە زۆریی لە ڕیخۆڵە گەورەدا هەن و، لە جۆری سوودبەخشن و بۆ جەستە پێویستن، ئەگەرنا جەستە قبووڵی نەدەکردن.

ئەمە خاڵی یەکەم بوو، لەبارەی جەستەی مرۆڤەوە، کە باسی یەکەی بنەڕەتیی دروستبوونی جەستەمان کرد، کە بریتیە لە خانە.

هەڵبەتە هەم بۆ ئەم بابەتە (خانە)، هەم بۆ تێکڕای ئەو بابەتانەی دیکە کە باسیان دەکەین، دەبێ خوێنەرانی خۆشەویست بزانن! کە تەنیا ئەو شتانە باس دەکەم، کە پێم وایە، زۆربەی خەڵکی لێیان تێ دەگەن، ئەگەرنا وردەکاریی زۆر زۆر زیاتر لەوانە هەیە، کە دیارە بۆ خەڵکی پسپۆڕو شارەزای خۆیان پێویستن، بەڵام ئەوانە چەند زانیارییەکی گشتیین، کە هەمووومان گرنگە بیانزانین.

ئنجا ئێمە هەموو ئەوەش کە ئەنجامی دەدەین - کە چەند جارێکی دیکەش گوتمان - وەك جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا دەیکەین، چونکە خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمویێ:

﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاريات.

لە خۆتان وردبنەوە، بۆچی لە خۆتان نافکرن!! هەروەها وەك بەڵگە هێنانەوەش لەسەر ئەوە کە ئێمە مشوورمان لێ خوراوە و، تەگبیرمان بۆ کراوە، هەر لە خانەکانی جەستەمانەوە تەگبیرمان لێکراوە و مشوورمان لێخوراوە، چونکە خانە کە ئەو هەموو کارانە دەکات، بێگومان خوا فێری کردوە و، بەرنامەی بۆ دانراوە و، لەسەر کرۆمۆسۆمەکانی ئەو زانیارییانە هەموویان تۆمار کراون.

www.alibapir.com



## خاڵی دووەم: کۆئەندامی مێشك و دەمــار:

بەڕێـــزان!

سەرەتا با کورتە باسێکی گوشرا و و پوخت لە بارەی پێکهاتە و بەشەکانی کۆئەندامی مێشك و دەمار (جهاز المخ والأعصاب)ەوە، بخەینە ڕوو، دواتریش لە چواردە(١٤) (بەند)دا، چەند زانیارییەکی گرنگ و خێرا لەو بارەوە باس دەکەین:

کورتە باسێك دەربارەی:

**پێکهاتەی کۆئەندامی مێشك و دەمار**

کۆ ئەندامی مێشك و دەمار(جهاز المخ والأعصاب) بەشێوەیەکی گشتیی لە سێ یەکەی سەرەکیی (ثلاث وحدات رئیسة) پێکهاتوە، بەم شێوەیەی خوارێ:

**یەکەم:** سەلکەی مێشکیی، یان مۆخە لاکێشەیی (البصلة المُخِّيَّة أو النُّخاع المستطيل) کە مێشك پەیوەست دەکات بە پەتکە دەمارییی سەنتەر(الحبل العصبي المركزي)ەوە، کە بە: پەتکی دڕکە مۆخ (حَبْلُ النُّخاع الشَّوكي) ناسراوەو، سەرەنجام بە هەردووکیان کۆئەندامی دەماری سەنتەر (الجهاز العَصَبي المركزي)پێك دێنین.

مۆخە لاکێشەیی (النخاع المستطيل)یش کۆمەڵێك کار و ئەرکی ئەندامە بنەڕەتییەکان، ڕێك دەخات و کۆنترۆڵیان دەکات، وەك:

١- هەناسەدان.

٢- فشاری خوێن.

٣- لێدانی دڵ و...هتد.

ئەم بەشەی کۆئەندامی مێشك و دەمار، بەبەشی خوارەوەی مێشك، یان بەشی دواوەی ناسراوە.

www.alibapir.com



**دووەم:** مێشکۆڵە (المُخَيخ) کە ڕێك کەوتۆتە سەرووی مۆخە لاکێشەیی (النخاع المستطيل)و هەندێ جاریش بە بەشی نێوەڕاستی مێشك (الجزء الأوسط من المخ) ناسراوە، کاری سەرەکیی: ڕێکخستنی پرۆسە ماسوولکەییە ئاڵۆزەکان و، هاوئاهەنگ کردنیانە، وەك:

١- ڕێك وەستانی قەدو قیافە.

٢- جووڵەی لاق و دەستەکان.

شایانی باسیشە هەرکام لە مێشکۆڵە (مُخَیخ)و مۆخە لاکێشەیی، قەدی مێشك (جَذع المخ) پێك دێنن.

**سێیەم:** مێشك (المخ) کە بەبەشی پێشەوەی مێشك ناسراوە، قەبارەی لە هەردووك بەش و پێکهاتەکەی دیکەی کۆئەندامی مێشك و دەمار، گەورەترە، هەرچی کاروچالاکیی کۆئەندامی مێشك و دەمارە، بەم بەشەوە پەیوەستە، ئەم بەشی سێیەمە چەق و سەنتەرەکەیەتی، وەك:



وێنەی (١٦) کۆئەندامی مێشک و دەمار

www.alibapir.com







١- وەرگرتنی تێکڕای زانیارییەکان لە هەموو شوێنەکانی هەستکردنەوە، لەجەستەدا.

٢- شیکردنەوەی هەموو ئەو زانیارییانەی کە لە شوێنەکانی هەستکردن (مراكز الحِسّ)ەوە، لە جەستەدا دێنەوە بۆ مێشك و، هاوئاهەنگ کردنیان و ڕێکخستنیان.

٣- ئەنجامدانی سەرجەم چالاکییە عەقڵیی و ئاکارییە هۆشییەکان.

شایانی باسە: مێشك بەچینێکی مەیلەو ئەستوور لەخانە دەمارییە مێشکییەکان (الخلايا العصبية المخية)داپۆشراوە، کە بە ماددەی خۆڵەمێشیی (المادة الرمادية) ناسراوەو مێشك بەهۆی چینێکی دەزوولەیی ورد، کە لە ژێریەوەیەو بە ماددەی سپی (المادة البيضاء) ناسراوە، هەم پێکەوە پەیوەست دەبێ و، هەم لەگەڵ بەشەکانی دیکەی کۆئەندامی مێشك و دەماریشداو، ئەو دووچینەش بە پۆشاکی مێشك (غطا و المخ) ناسراون.

ئنجا خودی مێشك (مُخّ)یش بۆ چوار پل (فَصّ) دابەش دەبێ:

**یەك:** پلی پێشەوە، یان نێوچەوان (الفصّ الأمامی أو الجبهي) کە دەکەوێتە لای پێشەوەی مێشك و، گەورەترین بەشی پێکهێنەری مێشکەو، زۆربەی کارو چالاکییەکانی مێشك، لەم بەشەدا ئەنجام دەدرێن، وەك:

١- پێنج هەستەکان.

٢- سۆزو هەست و نەست.

٣- شت هاتنەوە بیر.

٤- زمان و قسەکردن.

٥- ویست و بڕیاردان.

٦- حوکمدان بەسەرشتەکانداو، لە یەك جیاکردنەوەیان.

٧- کارلێك و ڕەفتارکردن لەگەڵ دەوروبەردا.

٨- خۆکۆنترۆڵ کردن لە هەڵس و کەوتداو، لە ڕووبەڕووبوونەوەی گیروگرفتەکاندا.

www.alibapir.com





٩- هەستکردن بە بەرپرسیارێتیی...

١٠- خۆڕاگریی لەکاتی هەڵچووندا و دووربینیی...

شایانی باسیشە ئەم بەشەی مێشك، بە زمانی عەرەبیی (ناصیة)ی پێدەگوترێ و، هەرلێرەشدا حیکمەتی ئەو تەعبیرە قورئانییەمان بۆ دەردەکەوێ، کە خوای کارزان لە بارەی بابایەکی کافری ملهوڕەوە فەرموویەتی[1]:

﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ ﴾ العلق، چونکە (ناصیة) بەتووکی پێشە سەر دەگوترێ.

واتە: نەخێر ئەگەر وازنەهێنێ، بەتوندیی قژی پێشە سەری دەگرین، پێشەسەرێکی درۆزنی خەتاکار، ئنجا با ئەویش کۆڕەکەی خۆی بانگ بکات و، ئێمەش دۆزەخەوانانی بۆ بانگ دەکەین...

هەڵبەتە ئەمەش ئیعجازێکی زانستیی تێدایە، چونکە دوای ساڵی: (١٨٤٨)ز پاش ڕووداوی پارچە ئاسن بە پێشە سەرداچوونی، گەنجێکی ئەمریکایی بەناوی: (فینیاس ب. جیدج) پزیشکەکانی مێشك و دەمار، حاڵی بوون کە هەر بەشێکی مێشك، کارو ئەرکێکی تایبەتیی هەیەو، پێشەوەی مێشکی مرۆڤیش، شوێنی زۆربەی کارو ئەرکە گرنگەکانی مێشکە، بەتایبەت ئیرادەو بڕیاردان...

**دوو:** پلی دیواریی (الفصّ الجداري)، کە دەکەوێتە لووتکەی مێشك، پشت نێوچەوان و، کاری سەرەکییشی، ئەمانەن:

١- ئاڕاستەکردنی شوێنیی (التوجیه المکاني).

٢- لەیەك جیا کردنەوەی شێوەو قەبارەو بەرزیی و نزمییەکان.

٣- دیاریی کردنی لایەکان (الإتجاهات).

٤- بەکارهێنانی توانا ژمێرەییەکان.

٥- دەربڕین و تێگەیشتنی سۆزو هەستەکان.

---

(١) بڕوانە: (صحیح البخاري: ٤٩٥٨، ومسلم: ٢١٥٤، ٢١٥٥).

www.alibapir.com



**سێ:** پلی لاجانگیی (الفصّ الصُدغي)، کە دەکەوێتە خوار پلی دیوارییەوەو، سەنتەرەکانی:

١- کۆنترۆڵکردنی بیستن.

٢- کۆنترۆڵکردنی قسەکردن.

٣- کۆنترۆڵکردنی دەنگەکان.

لەم بەشەی مێشك دان.

**چوار:** پلی پشتەوەی سەر (الفصّ الخَلفي) کە دەکەوێتە بەشی پشتەوەی مێشك و، شوێنی تێدا ئەنجام درانی ئەم ئەرکانەیە:

١- لەبنکەکەیدا چەقی بینین هەیە.

٢- لەسەررووییەوە ناوچەی خوێندنەوەو، بیردان (ذاکرة)ی بینین و، هاوڕێی بینین، هەیە[1].

مەبەست لە (هاوڕێ بینین) ئەوەیە کە مرۆڤ جاری وایە شتێك دەبینێ، بەڵام بەهۆی تێکچوونی ئەو شوێنەی مێشکەوە، دەوروبەرو ڕاست و چەپ و پێشەوەو داوایەکەی نابینێ.

ئێستاش دوای ئەم کورتە باسە دەربارەی (کۆئەندامی مێشك و دەمار) با لەچواردە (١٤) بەندی پوخت و گوشراودا چەند زانیارییەکی دیکەی گەورەو گرنگ، لە بارەی ئەو کۆئەندامە یەکجار بایەخدارو هەستیارەوە، بخەینەڕوو:

**١)- کۆئەندامی مێشك و دەمار:** گرنگترین کۆئەندامە لە جەستەدا و، لە ڕاستییدا کۆئەندامی مێشك و دەمار، ڕۆڵی حوکمڕان دەبینێ لە جەستەدا، لەوێوە ئاڕاستەکان و فەرمان و بڕیارەکان بۆ هەموو ئەندامەکان دەردەچن، کۆئەندامی مێشك و دەمار لە دوو بەشی سەرەکیی پێکدێ:

---

(١) کۆی ئەم باسەمان ڕاستەوخۆ لە کتێبی: (الإنسان من الميلاد إلى البعث في القرآن الكريم) ص٣٧١-٣٧٦، وەرگرتوە، کە هی: (د. زغلول راغب محمد النجار)ە.

www.alibapir.com



**یەك:** کۆئەندامی دەماریی سەنتەریی: (الجِهَازُ العَصَبي المَرْكَزِي)، کە مێشك و دڕکە پەتك (الحَبْلُ الشوْكِي)ە.

**دوو:** کۆئەندامی دەماریی چواردەور: (الجِهَازُ العَصَبي المُحِيطِي)، کە مەبەست پێی هەموو ئەو شتانەیە کە پەیوەستن بەو کۆئەندامەوە، لە دەرەوەی کەللەی سەر و لە دەرەوەی دڕکە پەتك (الحبل الشوكي)، ئەویش مەبەست پێیان: گرێ و کەزیی و ڕیشاڵە دەمارییەکان (العُقَد والضفائِر والألياف العَصَبِيّة) و هەست وەرگرەکان و جووڵێنەرەکانن، ئەوانەی کە هەست و خوستەکان لە ڕێی پێستەوە و لە ڕێی ئەندامەکانەوە وەردەگرن و، دەیگەیەننەوە بە مێشك، هەروەها فەرمانی جووڵە لە مێشکەوە وەردەگرن و، دەیگەیەنن بە ئەندامەکان، هەڵبەتە کاری سەرەکیی کۆئەندامی مێشك و دەمار، بریتیە لە کۆنترۆڵ کردنی ئەندامەکانی جەستە و سەرپەرشتیی کردنیان و بەڕێوەبردنیان.

**٢)- ژمارەی خانەکانی کۆئەندامی مێشك و دەمار:** بریتیە لە سەد ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) خانە، نەك چواردە ملیار (١٤٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، وەك کۆمەڵێك لە سەرچاوە پزیشکییەکانی ڕابردوو وایان گوتوە[1]، بەڵام زانیاریی کە زیاتر بەرەو پێشەوە چووە و لە وردەکارییەکان زیاتر ئاگادار بووە، ئێستا زانایان دەڵێن: لە سەد ملیار خانە پێك دێ، وەك کتێبی: (إبداع الرحمان في الجسم الإنسان)، گوتوویەتی[2].

**٣)- کێشی مێشك (مخ) لە پیاواندا دەوروبەری:** هەزارو پێنج سەد (١٥٠٠) گڕامە، واتە: یەك کلیۆ و نیو، بەڵام هی ژنان: (٢٠ تا ٣٠) گڕامی کەمترە.

**٤)- ژمارەی پێکگەیەنەرەکان (الوصلات) لە مێشکدا،** واتە: ئەو دەزوولە دەمارانەی کە خانەکانی کۆئەندامی مێشك و دەمار دەگەیەنن بە خانەکانی جەستە، بریتیە لە سەد ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) و درێژیی ئەو دەزوولانە - بێگومان

---

(١) بۆ وێنە: (الطب محرابٌ للإيمان) و (الإعجاز الرباني في الجسم الإنساني)، گوتوویانە: کۆئەندامی مێشك و دەمار، لە چواردە ملیار خانە پێك دێ.

(٢) ص١٩٨

www.alibapir.com



هیچیان نابینرێن - درێژییەکەیان کە ئەگەر هەموویان بخەیەوە سەریەك، دەکاتە دوو سەد هەزار (٢٠٠٠٠٠) کیلۆ مەتر! یانی: ئەندازەی دوو سەد هەزار کیلۆ مەتر دەزوولەی بچووك لە خانەکانی کۆئەندامی مێشك و دەمارەوە، دەچێ بۆ سەرجەم خانەکانی دیکەی جەستە.

٥)- ژمارەی ڕیشاڵ و دەزوولەکان کە مێشك بە سەرجەم ئەندامانی جەستەوە دەبەستنەوە، زیاتر لە دە ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠)ە، کە هەر کامێکیان خانەیەکی دەماریی، یان خانەیەکی مێشکیی لە نێو مێشکدا دەیگەیەنێ، دیارە پەیوەندییەکانی کە باسمان کردن: زیاتر لە سەد ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ن، لەم دە ملیۆن ڕیشاڵە دەمارییەوە سەرچاوە دەگرن.

٦)- مێشك هەرچەندە لە (٢٪)ی جەستەیە، بەڵام (٢٠٪)ی وزەی جەستە سەرف دەکات و، (١٥٪) تاکو (٢٠٪) خوێنی دڵ بۆ مێشك دەچێ.

٧)- مێشك (مخ) لە نێو کەللەی سەردایە و دڕکە پەتك (الحبل الشوكي) لە نێو بڕبڕەکانی پشتدا پارێزراوە، کە هەم جمجمەی کەللە سەر و، هەم نێو بڕبڕەکانی پشت، مەحکەمترین شوێنن لە جەستەی مرۆڤدا، بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) گرنگترین ئەندامی جەستەی مرۆڤ، کە مێشك و دڕکە پەتکن، لەو دوو شوێنە مەحکەمەدا پاراستوونی، کە ئەمە کارێکی هەڕەمەکیی نیە! بەڵکو ئەوپەڕی میهرەبانیی و وردەکاریی خوای کاربەجێیە!

٨)- دڕکە پەتکی پیاو بە موعەددەلیی (٤٥) سم درێژە، هی ئافرەتیش (٤٣) سم، لەبەر ئەوەی بە گشتیی باڵای پیاوان لە هی ئافرەتان بەرزترە، تیرەی دڕکە پەتك (١ سم)ە، واتە: هێندەی پەنجەیەکی باریك و، کێشەکەی (٣٥) گرامە و، ملیۆنان دەزووی مێشکیی دەگەیەنێتە ئەندامەکانی جەستە و، هەرچی پەیوەندییەکانی مێشکە، لە ڕێی دڕکە پەتکەوەن، کە بە هەموو جەستەدا دێن، لە نووکی پەنجەی پێی مرۆڤەوە، تاکو سەری سەرێ، هەموویان لە ڕێی دڕکە پەتکەوە و لەڕێی ئەو دەزوولانەوە، کە لێیەوە دەردەچن، هەم دەمارە هەستییەکان و هەم دەمارە جووڵەییەکان، هەموویان لە دڕکە پەتکەوە زانیارییەکان دێنن و دەبەن.

www.alibapir.com





**٩)**- دەزوولە دەمارەکان بە گشتیی دوو جۆرن: جووڵەیی (الحركية) و هەستیی (الحِسِّية):

**یەك:** دەمارە هەستییەکان: زانیاریی پێست و ئەندامەکان دەگەیەنن بە مێشك، بۆ وێنە: دەست لە شتێك دەدەی، گەرمە، ساردە، نەرمە، زبرە، ...هتد، یەکسەر ئەو زانیارییە دەگات بە مێشك و، مێشك دوایی ڕێنمایی ئەو ئەندامە دەکات چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو تەنەدا بکات!

**دوو:** دەمارە جووڵەییەکان: بە پێچەوانەوە، فرمان و ڕێنمایی مێشك دەگەیەنن بە ماسوولکەکان و بە لووەکان (الغُدَد)، بەبێ فەرمانی مێشك، مرۆڤ ناتوانێ چاوی هەڵبێنێ، ناتوانێ پەنجە بجووڵێنێ، دەبێ مێشك پێشێ فەرمان بدات، بەڵام هی هەستییەکان، لە هەستەکانەوە زانیاریی دەچێ بۆ مێشك و دوایی جارێکی دیکە لە مێشکەوە فەرمان دێ، کە چۆن مامەڵە بکرێ!

**١٠)**- سەرجەم خانەکانی جەستە، لە ماوەی پێنج (٥) بۆ حەوت (٧) ساڵدا، دەگۆڕێن، بەڵام خانەکانی مێشك و خانەکانی کۆئەندامی مێشك و دەمار، چەسپاون و نامرن و، هەر کامێکیان مرد، هیچی نایەتەوە جێ، خوای زانا ئەوانی وا دروست کردوە، کە لەگەڵ تەمەنی مرۆڤدان و، بۆیەش لە شوێنێکی هێندە مەحکەم و قایم دا دانراون.

**١١)**- کار و ئەرکە گرنگەکانی مێشك زۆرن، بەڵام دە (١٠) یان لە هەموویان گرنگترن، کە ئەمانەن و یەکەمیشیان لە هەموویان گرنگترە:

١- هۆشیاریی (هەست بە خۆ و بەدەور و بەرکردن بە ئێستا و ڕابردوو و داهاتووەوە)، (الوعي).

٢- بیرکردنەوە (التفكير).

٣- ژماردن (الحساب).

٤- لۆژیك (المنطق).

٥- فێربوون (التعلُّم).

www.alibapir.com



٦- وەبیرهاتنەوە (التذكُّر).

٧- ناسینەوە (التعرُّف).

٨- قسەكردن (الكلام).

٩- بڕیاردان (إتخاذ القرار).

١٠- كۆكردنەوەی زانیارییەكان (خزن المعلومات)، بیستن، دیتن، بۆنكردن، تامكردن، دەستلێكوتان زانیارییە عاتیفییەكان.

بەڵێ (هۆشیاریی - وعي) گەورەترین كاری مێشكی مرۆڤە، چونكە ئەوەی بە پلەی یەكەم مرۆڤ جیا دەكاتەوە لە ڕووی مێشكەوە، هۆشیارییە، ئەگەرنا زۆربەی ژیاندارانی دیكەش یان هەموویان، مێشكیان هەیە، جۆرێك لە مێشكیان هەیە، هەر لە بچووكیانەوە تاكو گەورەیان، بەڵام مرۆڤ هۆشیاریی (وعي) هەیە، هەست بە خۆیی و بە دەوروبەری دەكات، بە هەرسێك كاتی ئێستا و ڕابردوو و داهاتووەوە، هەروەها لە تایبەتمەندییە عەقڵییەكانی مرۆڤە و، لە ئیمتیاز و جیاكەرەوەكانیەتی كە، توانای بیركردنەوەی هەیە، توانای ژماردنی هەیە، توانای لۆژیكیی هەیە، توانای فێربوونی هەیە، توانای وەبیرهاتنەوەی هەیە، توانای ناسینەوەی شتەكانی هەیە، توانای قسەكردنی هەیە، توانای بڕیاردانی هەیە.

پاشان مێشك توانای كۆكردنەوەی زانیارییەكانی هەیە، لە ڕێی: دەزگای بیستن، دەزگای دیتن، دەزگای بۆنكردن، دەزگای چێشتن، دەزگای دەست لێكوتانەوە.

هەروەها مێشكی مرۆڤ توانای كۆكردنەوەی زانیارییە عاتیفییەكانی هەیە، وەك: خۆشویستن، ڕق لێ بوونەوە، دڵخۆشیی، دڵتەنگیی، كەسێكت یان شتێكت خۆش دەوێ، مێشك ئەو خۆشەویستییە لەوێدا تۆمار دەكات، كە ئەو كەسەت یان ئەو شتەت خۆشویستوە، ڕقت لە كەسێك یان شتێك هەڵدەستێ، مێشك ئەوەش تۆمار دەكات، بەڵێ ئا ئەو شتانە، تایبەتمەندیی مێشكی مرۆڤن.

www.alibapir.com





**١٢- مێشك فەرمانبەر (مطیع)ی ڕووحە:**

بێگومان ئەگەر ئینسان بە وردیی سەرنج بدات، ناتوانێ هۆكاری پەیدابوونی ئەو چالاكییە عەقڵییانە تەفسیر بكات، بەبێ دانهێنان بە بوونی ڕووحدا، چونكە بەڵێ ئەو زانیارییانە تۆمار كراون لە مێشكدا، بەڵام چۆنیەتی مامەڵەكردنی مێشك لەگەڵ زانیارییەكاندا، لەگەڵ دەوروبەریدا، ئەوەیان لە ڕاستییدا پێویستیی بە شتێكی دیكەی سەرووی مێشكەوە هەیە، كە ئەویش ڕووحە، بەڵێ بێگومان ڕووحە كە مێشك بەكاردێنێ، بۆ زانین و دەرك كردنی شتەكان، هەروەها پێنج هەستەكان بەكاردێنێ بۆ مامەڵە كردن لەگەڵ دەوروبەردا، چاو بەكاردێنێ بۆ دیتن، گوێ بەكاردێنێ بۆ بیستن، زمان بەكاردێنێ بۆ چێشتن، هەروەك بۆ قسەكردنیش، لووت بەكاردێنێ بۆ بۆنكردن، پێستیش بەكاردێنێ بۆ دەست لێكوتان، ئەوە هەمووی كاری ڕووحە، هەروەها ڕووح دڵیش بەكاردێنێ (دڵ بە مانا مەعنەوییەكەی) بەكاری دێنێ بۆ ویستن و نەویستن، خۆشەویستن و ڕق لێ بوونەوە، پەسەند كردن و ڕەفز كردن، ئەوانە هەموویان چالاكیی كاری ڕووحن و، كۆئەندامی مێشك و دەمار، هەروەها دڵ و دەروون و، پێنج هەستەكان، هەموویان فەرمانبەر و سەربازن لەبەر دەستی ڕووحدا.

**١٣-** مرۆڤێكی ئاسایی ڕۆژانە نیو ملیۆن وێنە دەخاتە هۆشدان (ذاكرة)ی، خۆیەوە، واتە: دەوری دە ملیار(١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) وێنە لە هەموو تەمەنیدا.

**١٤-** هەروەها مێشك جێگای نەوەد ملیۆن (٩٠٠٠٠٠٠٠) بەرگ (مجلد)ی پڕ لە زانیاریی، تێدا دەبێتەوە، هەڵبەتە ئەوە وەك مەزەندە دانراوە، ئەگەرنا من پێم وایە خوا (سبحانە وتعالی) مێشكی مرۆڤی وا خوڵقاندوە، كە بەبێ سنوور جێگای زانیاریی و زانراوەكانی تێدا دەبێتەوە، چونكە ئەگەر ڕۆژانە مێشك نیو ملیۆن وێنە دەخاتە هۆشدانی خۆیەوەو هەڵیان دەگرێ، بێگومان لە تامەكان و، لە بۆنەكان و، لە دەنگەكان، لە دەست لێكوتراوەكانیش. بە هەمان شێوە، هەروەها لە حاڵەتە عاتیفییەكانیش و، لە سەرجەم زانیارییەكانی دیكەش بەهەمان شێوە، چونكە وە نەبێ كە مێشك تەنیا وێنەكان بخاتە هۆشدانی خۆیەوە، بەڵكو سەرجەم زانیارییەكانی دیكەش، بە هەمان شێوە، هەڵدەگرێ و دەپارێزێ.



## خاڵی سێیەم: کۆئەندامی خوێن (الجهاز الدوري):

بەرێـــــــزان!

هەوڵدەدەین لە حەوت (٧) بەندا، باسی کۆئەندامی خوێن بکەین، کە لە ڕووی گرنگییەوە و لە ڕیزبەندیی (ترتیب)ی باسکردنی ئێمەش دا، دووەمین کۆئەندامی جەستەیە:

بەندی یەکەم: پێناسەو پێکهاتەی کۆئەندامی خوێن.

بەندی دووەم: گرنگیی کۆئەندامی خوێن.

بەندی سێیەم: بەشەکانی کۆئەندامی خوێن.

بەندی چوارەم: کاری کۆئەندامی خوێن.

بەندی پێنجەم: کۆئەندامی خوێن و پەیوەندییە زۆر و ئاڵۆزەکانی (دڵ) بەسەرجەم کۆئەندامەکانی جەستەوە.

بەندی شەشەم: ژمارەی زۆری دەزوولە خوێنینەکان.

بەندی حەوتەم: چۆنیەتی دابەشکردنی خوێن بەسەر جەستەدا.

### بەندی یەکەم پێناسەو پێکهاتەی کۆئەندامی خوێن[1]:

دڵی مرۆڤ ئەندامێکی ماسوولکەیی بەهێزە، کە لە ڕێگای گرژبوون و خاوبوونەوە یەك لەدوای یەکەکانییەوە، لە سییەکانەوە خوێنی پاك (هەڵگری بڕێکی زۆری ئۆکسجین) و خوراکی پێویست، دەگەیەنێتە سەرجەم خانەکانی لەش. پاشان پاشماوەی خانەکان و گازی دووانە ئۆکسیدی کاربۆن،لەسەرجەم خانەکانی جەستەوە، دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ لە سییەکاندا پاك بکرێتەوە.

---

(١) ئەم باسە لەلایەن دکتۆر شادی کوڕمەوە ئامادە کراوە،خوا پاداشتی بداتەوە.



وێنەی (١٧) کۆئەندامی خــوێن

دڵێکی تەندروست ٦٠ -١٠٠ جار گرژ دەبێت لە خولەکێکدا واتە: زیاتر لە ١٠٠٠٠٠ جار لە ڕۆژێکدا، و بەمەش بە تێکڕا لە ڕۆژێکدا نزیکەی ٧٥٠٠ لیتر خوێن هەنارده دەکات.

دڵی مرۆڤ لە چوار ژووری بچووکی نێو بۆش (هەگبە) پێك دێت؛ هەروەها لە نێوەڕاستییەوە بە ستوونیی دابەش دەبێت لە ڕێگای دیوارێکەوە،بۆ لای ڕاست و لای چەپ، دووباره هەریەك لە لای ڕاست ولای چەپی دڵیش، دابەش دەبن بۆ دوو ژووری سەرەوە کە گوێچەکەڵەیان پێدەگوترێت و، بەشی خوارەوەش دابەش دەبێت بۆ دوو ژوور، کە سکۆڵە یان پێدەگوترێت. بەمەش گوێچکەڵەکان دەکەونە لای ڕاست و چەپی سەرەوەی دڵ، کاتێك لە بواری ستوونییدا سەیری بکرێ و، سکۆڵەکانی ڕاست و لای چەپیش کە دەکەونە بەشی خوارووی دڵ.

www.alibapir.com







هەروەها لەنێواخنی دڵدا، چوار زمانە هەن:

١- زمانەی سێ پەڕەیی (Tricuspid valve) کە گوێچکەڵەی ڕاست و سکۆڵەی ڕاست لەیەکدی جیادەکاتەوە.

٢- زمانەی تاجیی (Mitral valve) کە گوێچکەڵەی چەپ و سکۆڵەی چەپ لەیەکدی جیا دەکاتەوە.

٣- زمانەی شاخوێنبەر (Aortic valve) کە سکۆڵەی چەپ لە شاخوێنبەر جیادەکاتەوە.

٤- زمانەی سییەکان (Pulmonic valve) کە سکۆڵەی ڕاست لە سییەکان (لەڕێگای خوێنبەری سییەکانەوە) جیادەکاتەوە.

کاتێك ماسوولکەکانی دڵ گرژ دەبن، خوێن بە سیستمێك لە لوولەی خوێن کە پێیان دەگوترێ: سیستمی ئاڵووگۆڕی خوێن، دەگوازرێتەوە، ئەو لوولانە لە قەبارەدا هەمەجۆرن و توانای کشانیان هەیە.

## جۆرەکانی لوولەکانی خوێن:

**سێ جۆری سەرەکیی لوولەی خوێن هەن:**

١- خوێن بەرەکان (Arteries)؛ کە بە شا خوێنبەر (Aorta)، لە لای ڕاستی دڵەوە دەست پێدەکەن، ئەرکی ئەم لوولانە گواستنەوەی خوێنی دەوڵەمەندە بە ئۆکسجین لە دڵەوە بۆ سەرجەم بەشەکانی جەستە،خوێن بەرەکان چەندین لقیان لێدەبنەوە تا دوورتر دەکەونەوە لە دڵ، دابەش دەبن بۆ لقی بچووکتر.

٢- مولولەکانی خوێن (Capillaries)؛ ئەوانە لوولەی خوێنی بچووك و باریکن و، وەك پردێك کاردەکەن بۆپێکەوە بەستنەوەی خوێن بەرەکان و خوێن هێنەرەکان، دیوارە تەنکەکانیان ڕێگا بە ئاڵووگۆڕی گازەکانی ئۆکسجین و،دووانەئۆکسیدی کاربۆن و، خواردن و پاشماوەی خانەکان، دەدەن لە نێوانیان و نێوان دیواری خانەکاندا.

www.alibapir.com





٣- خوێن هێنەرەکان (Veins)؛ ئەو لوولانەن کە خوێن دەگەڕێننەوە لەسەرتاپای لەشەوە بۆ دڵ، کە بڕی ئۆکسجین تێیاندا کەمە و دەوڵەمەندە بە پاشماوەی خانەکان، کە پێویستە خانەکانی لێ دەرباز بکرێ. بە پێچەوانەی خوێن بەرەکانەوە، خوێن هێنەرەکان تا نزیکتر دەبنەوە لە دڵ، گەورەتر دەبن، لە ئەنجامی یەکگرتن لەگەڵ خوێن هێنەری دیکەدا. خوێن هێنەری شاهانەی سەروو، خوێن لە سەر و پەلەکانی سەرەوە دێنێتەوە بۆ دڵ، خوێنهێنەری شاهانەی خواروو، خوێن لە هەناو و پەلەکانی خوارەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵ.

تێکڕای درێژی ئەم لوولانەی خوێن، زیاترە لە ٦٠٠٠٠ میل (نزیکەی ١٠٠٠٠٠ کیلۆمەتر). ئەمەش ئەوەندە درێژە کە ٢ جار دەوری زەوی پێبدرێتەوە!

**شێوەی کارکردنی دڵ:**

ئەو ڕووداوانەی لە یەك ترپەی دڵ، واتە: سووڕی دڵ (گرژ بوون و خاوبوونەوە) دا (کە کاتی پێچووی ٠.٨ چرکەیە) ڕوودەدەن:

أ- لای ڕاستی دڵ:

١- خوێنی کەم ئۆکسجین لەسەرجەم شانەکانی جەستەوە دەگەڕێتەوە بۆ گوێچکەڵەی ڕاستی دڵ لە ڕێگەی هەردووك شا خوێنهێنەرەکانی سەروو و خواروو.

٢- گرژبوونی گوێچکەڵەی ڕاست؛ لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی تەوژمێکی کارەبایی کە لە خوودی گوێچکەڵەی ڕاستەوە،لەلایەن هەندێ خانەی تایبەتمەندەوە سەرچاوە دەگرێ، گوێچەکەڵەکان گرژ دەبن.

٣- بەمەش خوێنی کۆبووەوەی نێو گوێچکەڵەی ڕاست، پاڵدەنرێ بۆ نێو سکۆڵەی ڕاست، لە ڕێگای زمانەی سێ پەڕەیی نێوانیانەوە.

٤- پاشان پاش پڕبوونی سکۆڵەی ڕاست لە خوێنی کەم ئۆکسجین، زمانەی سێپەڕەیی دادەخرێت.

www.alibapir.com


٥- گرژبوونی سکۆڵەی ڕاست، لە ئەنجامی گەیشتنی ئەو تەزووە کارەباییەی لە گوێچکەڵەی ڕاستەوە دەستیپێکردبوو،بەمەش خوێنی کۆبووەوە پاڵدەنرێت بۆ نێو خوێنبەرەکانی سییەکان، لە ڕێگای زمانەی سییەکانەوە بۆ نێو سییەکان.

لە سییەکاندا لە ئەنجامی سووڕی خوێنی نێو سییەکان، خوێن پاك دەکرێتەوە و بە ئۆکسجین دەوڵەمەند دەکرێت.

ب- لای چەپی دڵ:

١- خوێن هێنەرەکانی سییەکان، خوێنی دەوڵەمەند بە ئۆکسجین لە سییەکانەوە دەڕژێننە نێو گوێچکەڵەی چەپ.

٢- گوێچکەڵەکان گرژ دەبن و، لە ئەنجامدا خوێنی نێو گوێچەکەڵەی چەپ پاڵدەنرێتە نێو سکۆڵەی چەپ، لە ڕێگای زمانەی تاجیی یەوە کە لەو کاتەدا کراوەیە.

٣- پاشان پاش پڕ بوونی سکۆڵەی چەپ، زمانەی تاجیی، دادەخرێت، بۆ ئەوە خوێن بە ئاڕاستەی پێچەوانە نەگەڕێتەوە.

٤- سکۆڵەی چەپ گرژ دەبێت و، خوێن لەڕێگای سکۆڵەی ڕاستەوە، پاڵدەنرێت بۆ نێو شا خوێنبەر لە ڕێگەی زمانەی شا خوێنبەرەوە و، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ سەرجەم ئەندامانی جەستە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## بەندی دووەم: گرنگیی كۆئەندامی خوێن:

كۆئەندامی خوێن (الجهاز الدوري) یاخود (جهاز الدم)، لە دوای كۆئەندامی مێشك و دەمارە، چ لە ڕووی گرنگیی و، چ لە ڕووی ئاڵۆزیی، چ لە ڕووی كاریگەریی لەسەر ژیانی مرۆڤ و، بەردەوام بوونی جەستەوە، لە پلەی دووەم دا دێت.

با تۆزێك پێكەوە بەراوردیان بكەین:

**١)-** مێشك هەیە لە كۆئەندامی مێشك و دەمارداو، لە كۆئەندامی خوێن دا (دڵ) هەیە، مێشك و دڵ بەرانبەری یەكن.

**٢)-** لە كۆئەندامی مێشك و دەماردا، دوای مێشك: دڕكە پەتك (الحبل الشوكي) هەیە، لە كۆئەندامی خوێن دا دوای دڵ: خوێنبەرو خوێنهێنەرەكان (الشرايين والأوردة) هەن، (شرايين) كۆی (شريان)ە، واتە: خوێنبەر، كە خوێنی پاك و پڕ لە خۆراك، لە دڵەوە بۆ خانەكانی جەستە دەبات.

(وَرِيد) واتە: خوێن هێنەرەوە، كۆیەكەی (أوردة)یە، كە خوێنی پیس یاخود پڕ لە خشپ و خاڵ و پاشەڕۆكی خانەكان دێنێتەوە بۆ دڵ، بۆ ئەوەی لەوێ بپاڵێورێ و خشپ و خاڵ و زبڵ و زاڵەكە فڕێ بدرێتە دەر، لە ڕێی كۆئەندامی میزو، لە ڕێی كۆئەندامی هەناسەدانەوە و، جارێكی دیكە ئەو خوێنە، خواردنی پاك و چاك و پێداویستییەكان بۆ خانەكانی جەستە بگوازێتەوە.

**٣)-** ڕیشاڵە دەمارییەكان، لە كۆئەندامی مێشك و دەماردا هەن و، بۆڕی و دەزوولەكانی خوێن (شُعَيرات الدم)، لە كۆئەندامی خوێن دا هەن.

ڕیشاڵە دەمارییەكانی كۆئەندامی، مێشك و دەمار، كە پێشتر باسمان كرد: بە ملیۆنانن و، لە دڕكە پەتكەوە بە هەموو ئەندامەكانی جەستەدا، بۆ هەموو شانە و خانەكان دابەش دەبن، لە بەرانبەریشدا لە كۆئەندامی خوێن دا، بۆڕییەكانی خوێن، چ بۆڕییە گەورەكان، كە لە دڵەوە یەكسەر پەیوەست دەبنەوە بە سییەكانەوە و، بە





گورچیلەکانەوە، چ دەمارە دەزوولەییەکان، کە بەچاو نابینرێن، ئەوانەش دەکەونە بەرانبەری یەك.

## بەندی سێیەم: پێکهاتەکانی کۆئەندامی خوێن:

کۆئەندامی خوێن بە گشتیی سێ پێکهاتەی هەن:

١- دڵ. ٢- بۆڕیی و دەمارەکان. ٣-خوێن.

### ١)- یەکـــەم: دڵ:

لە هەشت (٨) وردە خاڵاندا باسی (دڵ - قلب) دەکەین:

١- بەهێزیی و پتەویی دڵ:

دڵ بەهێزترین ماسوولکەیە لە جەستەدا، لە ڕووی کارکردنی بەردەوامیەوە.

٢- کێشی دڵ:

کێشی دڵ لە پیاواندا (٣٠٠ -- ٣٥٠) گرامە، واتە: یەك لەسەر سێی کیلۆیەکە، بەڵام لە ژناندا (٢٥٠ - ٣٠٠) گرام قورسە.

٣- قەبارەی دڵ:

دڵ بە قەدەر کۆڵە مستێکە و، لە شێوەی هەرمێیەك دایە.

٤- شوێنی دڵ:

شوێنی دڵ قەفەسی سینگ و پشت سییەکانە، کە باشترین شوێنە لە جەستەدا، لە دوای شوێنی مێشك، سبحان الله! چونکە مێشك گرنگترینە، خوا مەحکەمترین شوێنی بۆ داناوە و، لە دوای مێشك، دڵ گرنگترینە، خوای پەروەردگاریش لە دوای شوێنی مێشك، گرنگترین و مەحکەمترین شوێنی بۆ

www.alibapir.com





داناوە، کە پشت سییەکانە و، لە نێوان بڕبڕەکان(فقرات)ی پشت و، سییەکان و قەفەسی سینگ دا، دانراوە.

٥- شێوەی پێکهاتەیی دڵ:

دڵ بە گشتیی لە چوار ترومپا (مضخَّة) پێك دێ:

**١و٢:** دوو گوێچکۆڵەکانی ڕاست و چەپ (الأُذَيْنَين: الأَيْمَن وَالأَيْسَر).

**٣و٤:** دوو سکۆڵەکانی ڕاست و چەپ (البطينين: الأيمن والأيسر)، کە ئەمەیان پێویستە وردەکاریی یەکەی، باس بکەین، بەڵام دیارە ئێمە هەروا بە شێوەیەکی گشتیی و بایی ئەوەندە، کە هەموو کەس لێی تێ بگات، قسەی لەسەر دەکەین.

هەرچی دوو گوێچکۆڵەی چەپ و ڕاستن، تا ڕاددەیەك لە دوو سکۆڵەی ڕاست و چەپ، بێهێزترن، چونکە ئەوان (گوێچکۆڵەی چەپ و ڕاست) تەنیا کاریان ئەوەیە: خوێنی پاك و پیس بهێننەوە نێو سکۆڵەی چەپ و ڕاست، گوێچکۆڵەی چەپ (الأذين الأيسر)، خوێنی پاك دەخاتەوە نێو سکۆڵەی چەپ (البُطين الأيسر) و، گوێچکۆڵەی ڕاست (الأذين الأيمن)یش خوێنی پیسی بەکارهێنراو دەخاتەوە نێو سکۆڵەی ڕاست (البُطين الأيمن).

هەروەها دوو سکۆڵەکانیش لە هێزدا جیاوازن: سکۆڵەی چەپ کە خوێن بۆ هەموو جەستە دەبات، خوێنی پاك لە سکۆڵەی چەپەوە دەچێ بۆ هەموو جەستە، بۆیە ئەمیان بەهێزترە لە هی دووهەمیان، هی دووهەمیان سکۆڵەی ڕاست خوێنی پیس دەبات بۆ سییەکان، بۆ ئەوەی لەوێ بیپاڵێون.

٦- لێدانی دڵ:

دڵ لە خولەکێکدا دەوری حەفتا (٧٠) جار لێ دەدا و، لە ڕۆژێکدا سەد هەزارو هەشت سەد (١٠٠،٨٠٠) جار لێ دەدا و، لە تەمەنی مرۆڤێکی ئاساییدا، زیاتر لە دوو ملیارو نیو (٢،٥٧٥،٤٤٠،٠٠٠) جار لێ دەدا.

www.alibapir.com







٧- کارکردنی دڵ:

دڵ بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی کار دەکات و، تەنانەت فەرمان لە مێشکیش وەرناگرێ، بەڵکو لەچەند گرێیەکی دەماریی سەربەخۆ، کە لە پشت گوێچکۆڵەی ڕاستەوەن، لەوێوە فەرمان بۆ دڵ دێ، بە ئاماژەی کارەبایی فەرمانی بۆ دێ، بەبێ دەست تێوەردانی ڕاستەوخۆیی مێشك، هەر بۆیەش دڵ، ئەگەر لە مێشکیش بپچڕێ، کاری خۆی هەر دەکات.

٨- دڵ دوو کیفی هەن:

یەکێکیان پێی دەگوترێ: (غشاء شِغاف) ئەو پەردەی کە دەکەوێتە سەر دڵ، دووەمیشیان پێی دەگوترێ: (غشاء تامور)، ئنجا کیسی (تامور)، ماددەیەکی وەك زەیت دەردەدات، تاکو جووڵەی دڵ ئاسان بکات، چونکە دڵ زۆر لێ دەداو دێتەوە یەك و دەکرێتەوەو دێتەوە یەك، لە خولەکێکدا حەفتا جار، ئەو ماددە شێوە زەیتییەش یاریدەی دڵ دەدات کە لووس بێ و نەرمی دەکات، تاکو تووشی زیان نەبێ، لەگەڵ ئەو هەموو لێدان و هاتنەوەیەك و کرانەوەیەدا.

**٢)- پێکهاتەی دووەم: بۆڕیی و دەمارەکان:**

١)- کاری سەرەکیی بۆڕیی و دەمارەکانی خوێن، گەیاندنی خوێنی هەڵگری ئۆکسجین و خۆراکە، بە تێکڕای خانەکانی جەستە و، گێڕانەوەی پاشەڕۆکیانە بۆ سییەکان و گورچیلەکان، تاکو لەوێوە ئەو زبڵ و خاشاکە، فڕێ بدرێتە دەرەوەی جەستە.

٢)- بۆڕیی و دەمارەکان، دوو جۆری سەرەکیین، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا:

أ/ خوێنبەرەکان (شرايين)[1]: کە ئەمانە زۆر بەهێزو پتەون، چونکە کاری قورستر ئەنجام دەدەن، کە بریتیە لە ناردنی خوێن بۆ تێکڕای خانەکانی جەستە و، لە هەر خولەکێکدا، جارێك خوێن دەگەیەننە ئەو پەڕی جەستە.

---

(١) شرايين: کۆی (شريان)ە.

www.alibapir.com





**ب/** خوێن گێڕەرەوەکان (أوردة)[1]: ئەمانە تەنکتر و بێهێزترن لە خوێنبەرەکان، چونکە کاریان هەر ئەوەیە کە خوێن لەو سەرەوە دەگێڕنەوەو دەیهێننەوە.

بەڵێ خوێنبەرەکان خوێنی پاك و چاك دەبەن بۆ خانەکانی جەستە و، خوێن گێڕەرەوەکان خوێنی پیس و پاشەڕۆك هەڵگری خانەکان، دەهێننەوە، بۆ ئەوەی لە ڕێی سییەکان و هەناسە دانەوە، دووەم ئۆکسید کاربۆنەکە بچێتە دەر و، لە ڕێی گورچیلەکانیشەوە، لە ڕێی کۆئەندامی میزو میزەڕۆوە، ئەو شتانەی دیکە فڕێ بدرێنە دەرێ.

**٣)- پێکهاتەی سێیەم: خوێن:**

**١-** خوێن: ماددەیەکی شلی لینجی ڕەنگ سوورە و لە (٧٪ تاکو ٨٪)ی هەموو جەستە پێك دێنێ، هی پیاوان لە (٥ - ٦) لیترە و، هی ئافرەتان (٤ - ٥) لیترە.

**٢-** خوێن، چوار پێکهاتەی سەرەکیی هەن:

**أ-** پلازما: (٥٥٪)ی هەموو خوێن پێکدێنێ و، پلازما پێکهاتەکانی چەند ماددەیەکی گرنگن: (پرۆتین، چەوریی، خوێیەکان) و بەشێکی زۆری پلازما لە کارگەی جگەردا دروست دەکرێ.

**ب-** خڕۆکە سوورەکان: کە هیمۆگلۆبینیان تێدایە و ئۆکسجین دەبەن بۆ خانەکانی جەستە.

**ج-** خڕۆکە سپییەکان: کە بەرگریی لە جەستە دەکەن لە بەرانبەر میکرۆبەکاندا و، کارگەی دروستکردنی خڕۆکە سوورەکان و خڕۆکە سپییەکان: مۆخی ئێسقانە، کە بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (نُخاع).

**د-** خەپلەکان(الصفائح): خڕۆکە سوورەکان و خڕۆکە سپییەکان، لەگەڵ خەپلەکان[2]، دوای (پلازما) پێکهێنەری خوێنن، خەپلەکان ئیشیان ئەوەیە، کاتێك خوێن بەر

---

(١) (أوردة): کۆی (وَرِید)ە،

(٢) صَّفَائِح: کۆی (صَفیحة)یە، بە کوردیی (خەپلە)ی پێ دەگوترێ،

دەبێ، ئەو خوێنە، بگرنەوە و ئەگەر خەپلەكان لە خوێن دا نەبوونایە، مرۆڤ هەمیشە خوێنی لەبەر دەڕۆیی، هەندێ كەس كە خەپلەكانی خوێنی نامێنن، هەر كە خوێنی بەربوو، نەزیف بوو، تازە خوێنی ناگیرسێتەوە، تاكو هەموو خوێنەكەی لە جەستەی دەچێتە دەر.

ئنجا ئەم سێیانە: (خڕۆكە سوورەكان و، خڕۆكە سپییەكان و، خەپلەكانی خوێن)، (٤٥٪)ەكەی دیكەی خوێن پێك دێنن، (٥٥٪)ی پلازمایە، (٤٥٪) یشی ئەو سێیانەی دیكەن.

## بەندی چوارەم: كاری كۆئەندامی خوێن:

كارەكانی كۆئەندامی خوێن، پێنج كاری گەورە و گرنگن:

١)- كاری یەكەم: پێی دەگوترێ: سووڕی گەورەی خوێن (الدَّوْرَة الدَّمَوِيَّة الكُبْرَى)، كە بریتیە لەوەی خوێن دابەش دەكات بەسەر هەموو خانەكانی جەستەدا، خۆراكیان بۆ دەبات، بژیویان بۆ دەبات.

٢)- كاری دووەم: پێی دەگوترێ: سووڕی گچكەی خوێن (الدَّوْرَة الدَّمَوِيَّة الصُّغْرَى)، كە بریتیە لە هێنانەوەی ئەو خوێنەی لە خانەكانی جەستەوە دێتەوە بۆ دڵ، ئەویش هەندێكی لە ڕێی كۆئەندامی هەناسەدان و، هەندێكی لە ڕێی كۆئەندامی میزەوە، ئەو پاشەڕۆكانە، فڕێ دەداتە دەرێ.

هەڵبەتە ئەو كارەی یەكەم و دووەم گرنگترین و سەرەكییترین كاری كۆئەندامی خوێنن، بەڵێ: كاری سەرەكیی كۆئەندامی خوێن، بریتیە لە گەیاندنی خۆراك بە خانەكان و، گێڕانەوەی پاشەڕۆكیان و فڕێ دانە دەری لە جەستە.

٣)- كاری سێیەم: بریتیە لە پارێزگاریی لێكردنی ژینگەی جەستە، لە ڕووی مەترسیی میكرۆبەكانەوە، كە خڕۆكە سپییەكان زیاتر بەو كارە هەڵدەستن، هەروەها لە ڕووی پاراستنی پلەی گەرمیی جەستە، كە لە: (٣٧،٥)پلەدا، ئەو دەوروبەرەدا، پلەی گەرمیی جەستە ڕادەگیرێ.

www.alibapir.com



٤)- کاری چوارەم: هەروەها کۆئەندامی خوێن، ماددەکانی نێو جەستەش کۆنترۆڵ دەکات لە جەستەدا، ئەو ماددانەش کە لە جەستە دان وەك: (ئاو، خوێ، شەکری کلۆکۆز، پرۆتینات .. هتد)، کۆئەندامی خوێن، ئەوانە لە جەستەدا کۆنترۆڵ دەکات، لەڕێی وەدەرنانی هەندێکیان و گۆڕینی هەندێکیان، هەندێکیان کە پێویست نەبن، وەدەریان دەنێ، بە تایبەت لە ڕێی میزەوە، هەندێکیشیان دەگۆڕێ لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دی، کە پێویستیی پێیانە.

٥)- کاری پێنجەم: هەروەها کارێکی دیکەی کۆئەندامی خوێن، کە ئەمە تازە دۆزراوەتەوە، لێکۆڵینەوە تازەکان ئەوەیان دەرخستوە، دەڵێن: (دڵ) هەندێك شوێنی تێدا هەن، کە پەیوەستن بە چەقەکانی دەمارو مێشك (مَرَاكِزِ المُخ وَالعَصَب)ەوە و، هەندێك کاری فیکریی و عاتیفییان تێدا ئەنجام دەدرێن، هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا ﴿١٧٩﴾﴾ الأعراف.

واتە: دڵ یان هەن، پێیان تێناگەن.

یان دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾﴾ الحج.

واتە: چاوەکانیان کوێر نین، (چاوی سەریان)، بەڵکو ئەو دڵانەیان کوێرن کە لە سینەکاندان.

کەواتە: دڵیش توانای دەرك کردنی شتەکانی هەیە، بە تایبەتیی بە باری سۆزو عاتیفەدا: ویستنی شتەکان، یان ڕەفزکردنیان، ڕق لێ بوونەوەیان، یان خۆشویستنیان، پەسند کردنیان، یان پەسند نەکردنیان، کە زانیاریی تازە پەی بەوە بردوە، بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) لە قورئاندا لە مێژە باسی کردوە.

سُبْحَـــانَ الله!

مرۆڤ زۆر جار بوغرا دەبێ، بە تۆزە زانیارییەك کە هەیەتی، زۆر جار بیستوومە، کە گوتوویانە: لە قورئان دا باسی دڵ دەکات، کە ئەو دڵانەی لە

www.alibapir.com


سینەکاندا هەن، کوێرن، تێناگەن، بەڵام ئیدراکی مرۆڤ و دەرککردنی مرۆڤ، تەنیا پەیوەندیی بە مێشکەوە هەیە، مێشکیش لە نێو کەللەی سەر دایە!![1] بەڵام ئێستا زانیاریی تازە دەریخستوە، کە: بەڵێ زانیارییەکان لە مێشکدا تۆمار دەکرێن و، هەر کام لە جۆری زانیارییەکان، شوێنی تایبەتیی هەیە لە مێشکدا، کۆمەڵێك خانەی تایبەتی هەن، بەڵام بەشێکیش لە زانیارییەکان و بەشێکی دەرککردنەکان، پەیوەندییان بە دڵەوە هەیە، کە تاکو ئێستا زانیاریی وردەکارییەکانی ئەوەی نەزانیوە، بەڵام دەزانێ کە بەشێك لە دەرککردن و زانینی مرۆڤ بۆ شتەکان، بە تایبەت ئەوانەی کە پەیوەستن بە حاڵەتی عاتیفییەوە: شتێکی دەوێ، شتێکی ناوێ، خۆشی دەوێ، خۆشی ناوێ، ڕقی لێ هەڵدەستێ، هەروەها تووڕەبوون، ڕازیی بوون، پاشان خەمباریی، دڵخۆشیی، ئەوانە پەیوەندییان بە دڵەوە هەیە.

هەرچەندە وشەی (قلب) لە قورئانێ دا، بۆ عاقڵ و هۆشیش بەکارهاتوە.

## بەندی پێنجەم: کۆئەندامی خوێن (الجهاز الدوري) و پەیوەندییە زۆرو ئاڵۆزەکانی (دڵ) بە سەرجەم کۆئەندامەکانی جەستەوە:

بەلای کەمەوە (کۆئەندامی خوێن) پەیوەندیی بە دە (١٠) لە کۆئەندامەکانی جەستەوە هەیە:

١)- (دڵ) و کۆئەندامەکەی، پەیوەندیی هەیە بە کۆئەندامی هەرسەوە، لە میانی: ڕیخۆڵە باریکەکان و ڕیخۆڵە ئەستوورەکان دا، کە ئەو ڕیخۆڵانە بە باریك و ئەستووریانەوە، هاوکاریی خوێن دەکەن، بەوە کە خواردنی پێویست و ماددە پێویستەکانی پێ دەدەن، بۆیە دڵ پەیوەستە بە کۆئەندامی هەرسەوە، تاکو خواردن و خۆراکی پێویستی لێ وەربگرێ و بیگەیەنێ بە خانەکان.

---

(١) مەبەستیان ئەوەیە: ئەوەی قورئان فەرموویەتی، وانیە!

www.alibapir.com



٢)- كۆئەندامی خوێن، یاخود دڵ، پەیوەستە بە سییەكانیشەوە، بۆ ئەوەی كە ئۆكسجینی پێویست لە سییەكان وەربگرێ و بیخاتە نێو خوێن، پاشان بیگەیەنێ بە خانەكان، هەروەها خانەكانیش لە زبڵی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن، كە پاشەڕۆكی خانەكانە، دەرباز بكات و لە ڕێی هەناسەدانەوە فڕێی بداتە دەرێ.

٣)- دڵ پەیوەستە بە هەردوو گورچیلەكانیشەوە، كە هەڵدەستن بە ڕزگاركردنی خوێن لەو پاشەڕۆكە نایترۆجینییە، جۆراو جۆرەی، هەروەها لە ئاوو لە خوێ زیادەكان، كە لە پێویستیی جەستە زیادن و، لە ڕێی میزەڕۆوە فڕێیان دەداتە دەرێ.

٤)- دڵ پەیوەستیشە بە جەرگەوە، كە جەرگ هەڵدەستێ بە هاوكاریی كردنی دڵ و خوێن، بەوە كە ماددە ئەندامییەكانی پێ بدات، كە خۆی دروستیان دەكات، جەرگ وەك كارگەیەكی زۆر گەورە وایە، كە ئەو ماددە ئەندامییانەی دروستیان دەكات لە ماددە سەرەتاییەكان، كە لە ڕیخۆڵە باریكەكانەوە وەریان دەگرێ و دەیاندا بە خوێن.

٥)- هەروەها دڵ پەیوەستە بە كۆئەندامی هۆڕمۆنییەوە، كە چەندان جۆرە هۆڕمۆن، لە كۆئەندامی هۆڕمۆن وەردەگرێ و دەیاننێرێ بۆ شوێنەكانی دیكەی جەستە.

٦)- هەروەها دڵ پەیوەستە بە كۆئەندامی لیمفاوییەوە، كە هەندێك لە زانایان بە بەشێك لە كۆئەندامی خوێنی دادەنێن، چونكە كۆئەندامی لیمفاویی هەڵدەستێ بە گێڕانەوەی ئاوی زیاد كە لە خانە و شانەكانی جەستەدا هەیە، دەیهێنێتەوە بۆ نێو سووڕی خوێن.

٧)- هەروەها دڵ پەیوەستیشە بە كۆئەندامی بەرگریی كردنەوە لە جەستە، ئەویش لەمیانی پێكهاتە جۆراو جۆرەكانی، وەك: ئێسقان، سپڵ، دڵ، لووەكان، یاخود ڕژێنەكان، بە تایبەتی ئێسقان، كە خانە سوورەكانی خوێن، (واتە: خڕۆكە سوورەكان) و خڕۆكە سپییەكان، هەروەها خەپلەكانی خوێن، دروست دەكات و دەیانخاتەوە نێو خوێن.

www.alibapir.com





٨)- هەروەها دڵ پەیوەستیشە بە سپڵەوە، کە سپڵ وەك مەخزەنێك وایە بۆ خوێن و، لە سپڵەوە کۆئەندامی خوێن هاوکاریی دەکرێ بەو ماددانەی کە پێویستن و لە سپڵدا هەڵگیراون، هەروەها سپڵ هەڵدەستێ بە پاککردنەوەی خوێن و پاڵاوتنی لەو خڕۆکە سوورە مردووانەی کە لە نێویدان، هەروەها ئیمدادیشی دەکات بە خڕۆکە سپییە پێگەیشتووەکان.

٩)- هەروەها دڵ پەیوەستە بە کۆئەندامی مێشك و دەماریشەوە، لێدانەکانی دڵ ڕێك دەخات لەمیانی ئەو ڕیشاڵە دەمارە مێشکییانەی کە پێیەوە پەیوەستن، هەروەها کۆئەندامی مێشك و دەمار، دەزوولە خوێنییەکان، فراوان دەکات و ئەندازەیەکی زیاتری خوێن دەنێرێ بۆ ئەو ئەندامانەی کە زیاتر دەجووڵێن و چالاکن و کار دەکەن.

١٠ و کۆتایی)- هەروەها دڵ پەیوەستەو پەیوەندیی هەیە بە پێستەوە، کە پێست ئەو گەرمییە زیادەی کە لە جەستەدا هەیە، بە هۆی کاری ماسوولکەکانەوە، کە ماسوولکەکان کار دەکەن و گەرمیی زیاد دەکات، ئینسان کە دەجووڵێ، بەدەنی گەرم دادێ، پێست ئەو گەرمییە دابەش دەکات و دەیخاتە دەرێ، چونکە خوێن ئەو گەرمییە هەڵدەگرێ و، لە ڕێی کونەکانی پێستەوە دەیخاتە دەرێ.

## بەندی شەشەم: ژمارەی زۆری دەزوولە خوێنینەکان (الشُعَيْرَاتِ الدَّمَوِية):

١)- پسپۆڕان دەڵێن: ژمارەی دەزوولە خوێنینەکان لە جەستەی مرۆڤێکی پێگەیشتوودا، هەتا دە ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) دەڕوات و، ئەگەر هەموویان بخرێنەوە سەر یەك، نەوەد هەزار (٩٠٠٠٠)کم درێژ دەبێت و، دەزوولە خوێنینەکان لە جەستەی مرۆڤدا (٩٠٪)ی دەمارەکانی خوێن پێك دێنن.

٢)- تیرەی دەزوولە خوێنینەکان، یاخود مولوولەکانی خوێن، دە (١٠) میکرۆمەترە، کە مایکرۆ مەتر یەك لەسەر هەزاری میللی مەترێکە، کەواتە: دە (١٠) مایکرۆمەتر، دەکاتە یەك لەسەر سەدی میللی مەتر (١/١٠٠ملم)ێك.

www.alibapir.com



٣)- ئنجا لەبەر ئەوەی تیرەی خڕۆکەی سووریش، حەوت (٧) مایکرۆنە، دەزوولەکانی خوێن لە یەك کات دا تەنیا ڕێ بە یەك خڕۆکەی سوور دەدەن، پێیان دا بڕوات، چونکە تیرەکەیان سێ (٣) مایکرۆن بەرینترە لە تیرەی خڕۆکەی سوور، تاکو ئۆکسجین لە خڕۆکە سوورەکە وەربگرێ و، لە بەرانبەریشدا دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی بداتێ.

## بەندی حەوتەم و کۆتایی: چۆنیەتی دابەشکردنی خوێن بەسەر جەستەدا:

پێشتر باسمان کرد کە (دڵ) هەموو خولەکێك جارێك، هەموو خوێن دەپاڵێوێ و خۆراکی تازەی پێ دەداتەوە، زبڵ و زاڵەکەشی لێ وەردەگرێ و لە ڕێی میزڵدان و، لە ڕێی هەناسەدانەوە، فڕێی دەدا.

ئنجا ئێمە لەم (بەندی حەوتەم) و کۆتاییەدا چۆنیەتی دابەشکردنی خوێن لەلایەن دڵەوە بەسەر ئەندامەکانی جەستەدا و، ڕێژەکانی دەخەینە ڕوو، کە بەگشتیی بەم شێوەی خوارێیە:

١- لە (٢٥٪)ی خوێن بۆ ڕیخۆڵەکان دەچێ، بە ڕیخۆڵە ئەستوورەکان و باریکەکانەوە.

٢- لە (٢٠٪)ی بۆ گورچیلەکان دەچێ.

٣- لە (١٨٪)ی بۆ ماسوولکەکان دەچێ.

٤- لە (١٣٪)ی بۆ مێشك دەچێ.

٥- لە (٧٪)ی بۆ پێست دەچێ.

٦- لە (٥٪)ی بۆ خودی دڵ دەچێ، دڵیش پێویستیی بە خۆراك پێدران و خزمەت کردن هەیە.

٧- لە (١٢٪)ی دەمێنێ و، ئەویش بۆ کۆئەندامەکانی دیکەی جەستە دەچێ.

www.alibapir.com



مرۆڤ دەبێ تەماشا بكات: (دڵ)ی ئێمە بەبێ ئەوەی خۆمان ئیرادەمان لەسەری هەبێ، چونكە بە شێوەیەكی ناویستەنیی (لا إرادی) كار دەكات و، ئەگەر بە ویستی ئێمە كاری كردبایە، كاتێك مرۆڤ بێ ئاگا دەبوو و دەخافلا، - بێگومان (دڵ) نەك چەند خولەكێك، چەند چركەیەك بوەستێت، كۆتایی بە ژیانی مرۆڤ دێ - ئنجا كاتێك مرۆڤ سەرقاڵ دەبوو و ئاگای لێ نەدەما، یاخود لە كاتی خەودا، دڵەكەی دەوەستا و مەرگ یەخەی دەگرت، بەڵام خوا (سبحانە وتعالی) هەموو ئەو كۆئەندامانەی كە نابێ لە كار بكەون تاكو كاتی مردن، بە شێوەیەكی ناویست (لا إرادی) وەگەڕی خستوون و، مێشك بەردەوام فەرمانیان بۆ دەنێرێ، بەبێ ئەوەی ئێمە بزانین، بەڵێ ئێمە بیردەكەینەوە لە شتەكان، بەڵام بیركردنەوە جیایەو، ئەو پەیوەندییەی كۆ دەماری مێشك بە ئەندامەكانەوە جیایە، ئەوە لە ژێر كۆنتڕۆڵی ئێمەدا نیە و، بەوەش چاكە كە لە ژێر كۆنتڕۆڵی ئێمەدا نیە!

بۆ وێنە:

١)- مێشك ڕێنمایی جەرگ دەكات، كە دەوری پێنج سەد (٥٠٠) جۆرە ماددە دروست دەكات، بەڵام ئاگامان لە هیچی نیە.

٢)- هەروەها گەدە بەبێ ئاگاداریی ئێمە خواردن هەرس دەكات.

٣)- گورچیلەكان بەبێ ئاگاداری ئێمە خوێن دەپاڵێون و میز فڕێ دەدەن.

٤)- هەروەها سپڵ و پەنكریاس و ڕێخۆڵە باریك و ئەستوورەكان و، سییەكان، بەڵێ سییەكان هەناسەدانەكە بە دەست خۆمانە، بەڵام كاری سییەكانیش دیسان، بەبێ ویست و بیركردنەوەی ئێمە ئەنجام دەدرێ!

ئنجا ئەو دڵەی ئێمە و، ئەو خوێنەی ئێمە و، ئەو هەموو خوێنبەرو خوێن هێنەرانە، ئەگەر ئینسان بیریان لێ بكاتەوە، تێدەگات خوا (سبحانە وتعالی) چ مشوورێكی لە مرۆڤ خواردوە؟!!

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاريات.

واتە: لە زەوی دا چەندان نیشانە هەن، بۆ كەسانێك كە زانیارییەكی جێی دڵنیایی وەدەست بێنن، هەروەها لە خۆشتاندا، ئایا سەرنج نادەن؟!

## خاڵی چوارەم: کۆئەندامی هەناسەدان



وێنەی (١٨) کۆئەندامی هەناسەدان

بەڕێـــــزان!

خوا پشتیوان بێ لە سێ (٣) بەندان دا، باسی کۆئەندامی هەناسەدان (جِهَازُ التنَفُّس) دەکەین:

بەندی یەکەم: پێناسە و ئەرکی کۆئەندامی هەناسەدان.

بەندی دووەم: پێکهاتەی کۆئەندامی هەناسەدان.

بەندی سێیەم: پێنج کارەکەی کۆئەندامی هەناسەدان:

١- هەناسەدانەوە، ٢- هەناسە هەڵمژین، ٣- پژمین، ٤- باوێشکدان، ٥- کۆکە.




## بەندی یەکەم: پێناسە و ئەرکی کۆئەندامی هەناسەدان:

کۆئەندامی هەناسەدان (جِهَازُ التنَفّس)یش یەکێکە لە کۆئەندامە هەرە گرنگ و سەرسوڕهێنەرەکانی جەستەی مرۆڤ و، سێ ئەرکی گرنگ ئەنجام دەدات، کە هی یەکەمیان گرنگترینیانە و، بەبێ وی مرۆڤ چەند خولەکێك زیاتر ناژی، ئەو سێ ئەرك و کارەش ئەمانەن:

١)- ئەرك و کاری سەرەکیی کۆئەندامی هەناسەدان (جهاز التنفس)، بریتیە لە دەستەبەر کردنی گازی ئۆکسجین بۆ خانەکان و، دەربازکردنیان لە گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، کە بێگومان مرۆڤ بەبێ هەناسە هەڵمژین و هەناسەدانەوە، لە چەند خولەکێك زیاتر ناژی.

٢)- پەیداکردنی دەنگ لە ڕێی صندوقی دەنگەوە، بە هۆی ئەو هەوایەی کە بۆی دەچێ و، بەبێ هەوا مرۆڤ قسەی بۆ ناکرێ و دەنگی دەرنایەت.

٣)- هەروەها پرۆسەی بۆنکردن، ئەمیش دیسان هەر لە ڕێی هەناسەدان و هاتن و چوونی هەواوە، ئینسان دەتوانێ بۆن بکات.

## بەندی دووەم: پێکهاتەی کۆ ئەندامی هەناسەدان:

کۆئەندامی هەناسەدان بە گشتی لە شەش بەش پێکهاتوە:

١- لووت، ٢- زار، ٣- قوڕگ (گەروو)، ٤- صندووقی دەنگ (حنجرة)، ٥- بۆڕی هەناسە، ٦- هەردووك سییەکان.

ئێمە لەم بەندەدا - کە پێکهاتەی سەرەکیی ئەم خاڵی چوارمەیە - پێناسەی هەر کام لەو شەش ئەندامە دەکەین و، ئەرکەکانیشیان دەخەینە ڕوو:

www.alibapir.com



١)- لـــــووت:

لە چەند ماددەیەكی كرِكرِاگەیی و[1] پاشان لە گۆشت پێكهاتوە و چوار بۆشایی (تجویف)ی هەن، كە بە عەرِەبی (جیب)یان پێ دەگوترێ، واتە: گیرفان:

**یەكەم:** گیرفانی شەویلاگەیی، كە درێژییەكەی پازدە (١٥)سم دەبێ، ئەویش لە هەردووك ئەملاو لای خوارەوەی بۆشایی لووتن.

**دووەم:** گیرفانی نێوچاوان (تەوێڵ - جبهة)، ئەویش درێژییەكەی دوازدە (١٢) سم دەبێ.

**سێیەم:** گیرفانی گوڵمیخیی (الجیب الوتدي)، درێژییەكەی هەشت(٨سم)ە و، لە پشت بۆشایی لووتەوەیە.

**چوارەم:** گیرفانی بێژینگیی (الجیب الغِرْبَالِي)، كە لەملاو لای شەویلاگەكانەوەیە، لە باری بەرزیی دا.

ئەركی ئەم بۆشایی و گیرفانانە، كە لە دەوروبەری لووت دا هەن، بریتیە لە رِێنەدان بە چوونەوە ژووری هەوا رِاستەوخۆ، چونكە: بێگومان بۆ تەندروست مانەوەی جەستە، دەبێت پلەی گەرمییەكەی رِابگیرێ، كە (٣٧،٥) ئەو دەوروبەرانەیە، ئنجا جاری وا كە هەوا زۆر گەرمە، یاخود زۆر ساردە، ئەو بۆشاییانە، ئەو گیرفانانەی دەوری لووت، لەبەر ئەوەی پرِۆسەی هەناسە وەرگرتن، بە پلەی یەكەم لە رِێی لووتەوەیە و، لە كاتی ناچارییدا ئینسان بە زار هەناسە دەدات، هەوا وەردەگرێ، ئنجا ئەگەر ئەو بۆشایی و گیرفانانەی دەوری لووت نەبوونایە، هەوا یەكسەر دەچووە نێو سییەكانەوە و، ئەوەش پلەی گەرمیی جەستەی دەشێواند، چونكە -وەك گوتمان -- دەبێ پلەی گەرمیی لەش لە ئەندازەیەكی دیارییكراودا، كە (٣٧،٥) پلەیە، رِابگیرێ.

---

(١) كرِكرِاگەیی: كرۆژ كرۆژەیی (غضروفي).

**٢)و ٣)-: زارو قـــوڕگ:**

دەم، زار، دوایی باسی دەكەین[1]، بەڵام لێرەدا باسی قوڕگ دەكەین، كە بە عەرەبی (بَلْعُوم)ە، ئەویش بۆڕییەكی ماسوولكەییە و، سێزدە (١٣)سم درێژە.

ئێستاش با لە سێ وردە خاڵدا باسی قوڕگ بكەین:

**یـــــەك:** قوڕگ شەش دەروازەی بەسەرەوە هەن:

**١-** دەروازەی زار (دەم).

**٢و٣-** دوو دەروازەكەی هەردوو تفنك، هەردوو كونە لووت.

**٤و٥-** هەردوو كونی بۆڕییەكانی (ئیستا كیوس)ی گوێیەكان.

**٦-** دەروازەی قوڕقوڕاگە.

**دوو:** قوڕگ هەم بۆ خواردن و بۆ هەناسەدانیشە، بەڵێ: لە یەك كاتدا: قوڕگ هەم خواردن و خواردنەوەی پێدا دەچێ، هەم هەواشی پێدا دەچێ و، ئەگەر وا نەبووایە لە كاتی لووت گیراندا، كە لووت ڕێگای سەرەكیی هەوا وەرگرتن و هەوا هەڵمژینە، مرۆڤ وەزعی زۆر شپرزە دەبوو، بگرە هەر دەمرد! بەڵام لەڕێی (زار)یشەوە، لە كاتی ناچارییدا، هەوا دەچێتە نێو سییەكانەوە.

**ســـێ:** هەروها قوڕگ جگە لەوەی خواردن و خواردنەوەو هەواشی پێدا دەچێ، كاری دەنگدانەوەو دروستكردنی پیتەكانیشی هەیە، بە تایبەتی ئەو پیتانەی كە پیتەكانی گەروو (حُرُوفُ الحَلْقَ)، یان پێ دەڵێن، وەك: ع، ح، أ، هـ، ق، غ.

---

(١) لە كاتی باسكردنی كۆئەندامی هەرس(جهاز الهضم)دا.

www.alibapir.com





**٤)- قورقوڕاگە (الحُنجرة):**

کە صندووقی دەنگ (صندوق الصوت)یشی پێ دەڵێن، (Voice Box):

کە لە چوار وردە خاڵان دا باسی دەکەین:

**یەك:** ئەو صندووقی دەنگە، صندووقێکی کرکڕاگەیيە و لە پێشەوەی ملە و، لە ئاستی بڕبڕەکان (فقرات)ی سێ و چوارو پێنج و شەشە، درێژییەکەی لە پیاواندا (٤٤ ملم) و، لە ئافرەتاندا (٣٦ ملم)ە و، تیرەکەی (٣٠ ملم)ە.

**دوو:** صندووقی دەنگ لە نۆ کرکڕاگە (غضروف) پێکهاتوە، کرکڕاگەش جۆرە ماددەیەکە لە نێوان گۆشت و ئێسقاندا، نەوەك ئێسقان ڕەقە و نەوەك گۆشتیش نەرمە.

سُبْحَانَ الله! شوێن هەیە نە ئێسقانی بە کەڵك دێ، نە گۆشتیشی بە کەڵك دێ، خوای کارزان کرکڕاگەی لەوێ داناوە، کرکڕاگە (غضروف)یش لەلایەکەوە لە ئێسقان نزیکە، پتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە لە گۆشتەوە نزیکە، جۆرێك لە نەرمیی هەیە و، دەگونجێ فراوان بێ و بکرێتەوە، کە وەك دوایی بۆ هەندێك لە ئەندامەکان باسی دەکەین، ئەگەر ئەو کرکڕاگەیە نەبووایە، ئەو ئەندامە نەیدەتوانی ئەو ڕۆڵەی خۆی ببینێ.

**سێ:** ئەو نۆ (٩) کرکڕاگە و کرۆژ کرۆژەیە، کە صندووقی دەنگ پێك دێنن، سێیان تاك تاکن و شەشیشیان دوو دوون، جووتن، کە یەکێك لە کرکڕاگە تاکەکان، بریتیە لە زمانە بچکۆڵە (لسَان المزمار)، ئەو زمانە بچکۆڵەی کە کاتێك تۆ شتێك دەخۆی، بەبێ ئەوەی تۆ ئاگات لێ بێ، یەکسەر ئەو دەچێت بۆڕی هەناسە دەگرێت، چونکە بۆڕی هەناسەو بۆڕی خواردن، هەردووکیان لە قوڕگ جیا دەبنەوە، ئنجا ئەو زمانە بچکۆڵەیە کە تۆ شتێك دەخۆی یەکسەر دەچێ بۆڕی هەناسەکە دەگرێ، بۆ ئەوەی کە ئەو خواردنە نەچێتە نێو بۆڕی هەناسەوە و، ئەگەر شتێکیش بچێ بۆ نێو بۆڕی هەناسە، مرۆڤ هەر دەکۆکێ و دەکۆکێ، تاکو ئەو شتە دێتە دەرێ.

www.alibapir.com







**چـوار:** ژێیە دەنگییەکان (الحِبَال الصَّوْتِيَة)، ئەرکیان پەیداکردنی دەنگە و درێژییان لە پیاواندا: (١٧،٥ - ٢٠ ملم) و، لە ژناندا: (١٢،٥ - ١٧،٥ ملم)ە، واتە: ژێیەکانی صندووقی دەنگی ئافرەتان کورتترن و، ئەستووریی ژێیەکانی دەنگ (٢ - ٣ ملم)ە.

هەڵبەتە بۆیەش دەنگی ئافرەتان لە هی پیاوان ناسکتر و تیژترە، هەروەها دەنگی منداڵان لە هی ئافرەتانیش تیژترە، چونکە ژێیەکانیان باریکتر و کورتترن و، لەرینەوەکانیان زیاترن.

دیارە بە لەرینەوەی ژێیەکانی دەنگ، دەنگ پەیدا دەبێ، کە هی پیاوان: (١٥٠) (هیرتز) لەرینەوەی هەیە و، هی ژنان: (٢١٠) (هیرتز) و، هی منداڵان: (٣٠٠) (هیرتز) لەرینەوەی هەیە، ئەویش بە هۆی باریکیی و کورتیی ژێیەکانی دەنگەکانی منداڵان و، پاشان ژنانەوە، لە چاو هی پیاوان.

بەڵێ بەڕێزان! دروستکراوی خوای کاربەجێ هەمووی بە حیساب و کیتابە و هیچی بە گۆترە نیە: ئافرەت جەستەی ناسکە و، دەنگیشی ناسکە و، هەست و سۆزیشی ناسکە، ئنجا بۆچی خوا وای خوڵقاندوە؟ چونکە ئەرکەکەی وا دەخوازێ، ئەرکەکەی - وەك دایکیك - بریتیە لە بەخێوکردنی منداڵ، ڕاگرتنی ماڵ، کابانەتیی، ئەوەش پێویستیی بە جەستەی ناسك و، دەنگی ناسك و، هەست و سۆزی ناسك دەکات.

ئەدی پیاوان بۆچی دەنگیان گڕەو، جەستەیان زبرەو، زیاتر ماسوولکەییە؟! لەبەر ئەوەی ئەو ئەرکانەی بە پیاوان سپێردراون، بەپێی فیتڕەت و سروشتێك کە خوا پیاوان و ئافرەتانی لەسەر خوڵقاندوون، پێویستییان بەوە دەکات، ئەرکی پیاوان زیاتر لە دەرەوەی ماڵە، ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ گەرماو سەرماو کێشەو گرفت دا و، پەیداکردنی بژێو و دروست کردنی شتەکانە، بەڵام ئەرکی ئافرەت بریتیە لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی ئینسانەکان و بەخێوکردن و پەروەردەکردنی ئینسانەکانیش، پێویستیی بە: سۆزی زۆر و نەرم و ناسکیی و وەستایی و لێزانیی و وردەکاریی دەکات و، ئەوەش زیاتر لە ئافرەتان دا هەیە، هەروەك

www.alibapir.com



مامەڵەکردن لەگەڵ دەرەوەدا، لەگەڵ شتەکاندا، پێویستیی بە دەنگیی گڕ و، جەستەی زبر و، بیرکردنەوەی بەهێزتر دەکات، کە ئەوەش زیاتر لە پیاواندا هەیە، ئیدی وەك گوتراوە: (نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەصاب).

هەر بۆیەش ئەوانەی ژنان و ئافرەتان وا حاڵیی دەکەن، کە دەبێ وەك پیاوان بکەن، ئەو کاتە یەکسان دەبن لەگەڵ پیاواندا! لە ڕاستییدا ئەوانە ڕێز لە تایبەتمەندییەکانی ئافرەتان، ناگرن و، وا دیارە ئەوانە مێیینە بوون و ئافرەت بوونیان پێ ناتەواوییە! بەڵام نەخێر، پەیوەندیی نێوان پیاوان و ئافرەتان، پەیوەندییەکی تەواوکاریی (تكاملي)یە و، نە پیاو بە هۆی پیاوەتییەکەیەوە چاکترە و، نە ژن بە هۆی ژنەتییەکەیەوە چاکترە، بەڵکو دەبێ یەکدی تەواو بکەن.

**٥)- بۆڕی هەوا، یاخود قامیشی هەوا (القَصَبَة الهَوَائِيَة):**

أ- پێناسەی بۆڕی هەوا:

درێژییەکەی: (١٠ - ١٦سم)ە و تیرەکەی: (٢ - ٣سم)ە، جێی سەرنج ئەوەیە کە ئەو بۆڕی هەوایە (القصب الهوائية) لە چەند بازنەیەکی کرۆژ[1] کرۆژەیی دروست بووە، واتە: نە ئێسقانە، نەگۆشت، بەڵکو کرکراگەییە، بە شێوەی چەند بازنەیەکی یەك لەسەر یەك، کە لە کتێبەکانی توێکاریی (تشريح)دا، وێنەی هەموو ئەو ئەندامانە زۆر جوان هاتوە.

ب- کارەکانی بۆڕی هەوا:

**پێنج کاری گرنگیی هەن:**

**یەك:** تێپەڕاندنی هەوا (ئۆکسجین) بەرەو سییەکان و، پاشان هێنانەوە دەری، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە سییەکانەوە و فڕێ دانە دەرێ.

---

(١) کرکراگەیی (غضروفي).

www.alibapir.com


**دوو:** دەرهاویشتنی بەڵغەم لە سییەکان، ئینسان جاری وا هەیە بە هۆی سەرمابوونەوە تووشی ئیلتیهابی سینگ دێ، ئەو تف و بەڵغەمە، کە لە نێو سیکڵدانۆچکەکاندا پەیدادەبێ، لە نێو سییەکاندا، لە ڕێی ئەو بۆڕی هەوایەوە، فڕێ دەدرێتە دەرێ.

**سێ:** پژمین (عَطاس) کە هەر لە ڕێی ئەو بۆڕی هەوایەوە، دەبێ.

**چوار:** کاری دەنگ، هەر بە هۆی ئەو هەوایەوە کە لەوێوە دێ و دەچێ، دەنگ پەیدادەبێ.

**پێنج:** تێپەڕاندنی خواردن و خواردنەوە، ئەویش هەر لەوێوەیە، جێی سەرنجیشە کە ئەو بۆڕی هەوایە کرکڕاگەیی و بازنە بازنەییە:

١- بۆیەش کرۆژ کرۆژەییە، تاکو بەپێی پێویست تەسك و فراوان ببێ، یەکێ لە سیفەتەکانی ماددەی کرۆژ کرۆژەیی ئەوەیە، کە دەگونجێ فراوان بێ و، دەشگونجێ تەسك بێتەوە، ئێسقان هەروەك خۆیەتی و گۆشت دەگونجێ پێکەوە بنووسێ، بەڵام کرکڕاگەیی قەت ناگونجێ پێکەوە بنووسێ، ئنجا لەبەر ئەوەی ئینسان ئەگەر بێت و ڕێی هەناسەدانی بگیرێ، دەخنکێ، بۆیە خوا (سبحانە وتعالى) ئەو بۆڕییەی لەو مادده کرۆژ کرۆژەییە دروست کردوە، تاکو بە پێی پێویست تەسك بێت و بکرێتەوە.

٢- هەروەها چەند بازنەیەکیشە، نەك یەك پارچەیی، تاکو درێژبوون و هاتنەوەیەکی بۆ بکرێ، واتە: تا بگونجێ هەم بێتەوەیەك و هەم درێژ ببێ، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە چەند بازنەیەکی لەسەر یەکە و ئاڵقە ئاڵقەیی یە.

ئنجا دواییش ئەو بۆڕی هەوایە دەبێتەوە بە دوو بەش، هەر بەشێ دەچێ بۆ یەکێك لە سییەکان و بەشێکیشی بۆ گەدە(معدة).

www.alibapir.com



٦)- دوو سییەکان (الرئتان):

له دوو ورده خاڵدا باسی سییەکان دەکەین:

**یــەك:** پێناسە و پێکهاتەی سییەکان:

١- سییەکان دەکەونە سەرووی بۆشایی سینگ، پشت نێوپەنچك (الحِجَابُ الحَاجز)ەوە.

٢- چیکڵدانۆچکەکان (الحويصلات)، کە سییەکانیان لێ پێك دێن، له هەردووك سییەکاندا، ژمارەیان سێ سەد ملیۆن (٣٠٠،٠٠٠،٠٠٠) دەبێ و، تیرەی هەر کامیان: (٠،١٪ - ٠،٢)ی (ملم)ێکە، واتە: (یەك لەسەر سەد تاکو دوو لەسەر سەدی میللی مەترێك)، ئنجا پانتایی هەموویان، ئەگەر هەموویان پێکەوە دابنرێن: حەفتا (٧٠)م٢ دەبێ.

٣- له هەر کام لەو چیکڵدانۆچکانەدا، پەردەی هەناسەیی (الغِشَاء التنفُّسي) هەیە، کە شوێنی پێکگەیشتنی خوێن و هەوایە و، ئەو پەردەیە له سێ چین (طبقة) پێکهاتوە:

أ)- پەردەی سیکڵدانۆچکەی سییی (غِشَاءُ الحَوْيصَلَة الرِئَوِية).

ب)- پەردەی دەزوولەی خوێنیی (غِشَاءُ الشُعَيْرَة الدَّمَوِية).

ج)- پەردەیەکی بنکەیی کە له هەردووك پەردەکەوە دەردەچێ (غِشَاء قَاعِدِيٌّ خَارِج كُلّ مِن الغشَائين المذكورين).

شایانی باسیشە ئەو پەردەیەی سێیەم، ئەستوورییەکەی لە: (٠،٠٠٠٥)ملم، واتە: (١/١٠،٠٠٠(ملم))ێك کەمترە!

هەرچەندە ئەم پێنج جۆرە خانەیەشی تێدان:

www.alibapir.com


١- خانە بخۆرەكان (الخلايا الأكولة).

٢- خانە ماسوولكەییەكان (الخلايا العضلية).

٣- خانە ڕیشاڵییەكان (الخلايا اللِّيفية).

٤- ڕیشاڵە نەرمەكان (الألياف المرنة).

٥- خانە سیكڵدانۆچكە گەورەكان، كە ڕێ لە ڕووخانی سیكڵدانۆچكەكان دەگرن (خلايا حوصلية كبيرة).

**دوو:** ئەركی سییەكان:

وەك پێشتر گوتمان: ئەركی گەورە و بنەڕەتیی دوو سییەكان (الرئتان) ئەوەیە كە ئۆكسجین لەوانەوە بۆ هەموو خانەكانی جەستە، وەك خۆراكێك، دەگوازرێتەوە و، لەولاشەوە دووەم ئۆكسیدی كاربۆن وەك پاشەڕۆكی خانەكان دەنێردرێتەوە بۆ سییەكان، كە لە ڕێی ئەوانەوە فڕێ بدرێتە دەرەوە.

ئنجا لێرەدا پێویستە چەند وردەكارییەك باس بكەین:

١)- بە هۆی (پرۆتینی هیمۆگلۆبین)ەوە، كە لە نێو خڕۆكە سوورەكاندا هەیە، ئەو كاری گواستنەوەی ئۆكسجینە بۆ خانەكان و، لەولاوەش هێنانەوەی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن، ئەنجام دەدرێ، كە هەر گەرد(جزيء - Mocal)ێكی، هیمۆگلۆبین دەتوانێ چوار گەردی ئۆكسجین هەڵبگرێ، ئەمەش وا دەكات كە لە ڕێی هیمۆگلۆبینەكانەوە حەفتا(٧٠) هێندەی ئەوە، كە لە ڕێی پلازمای خوێنەوە، ئۆكسجین نەقڵ دەبێ بۆ خانەكان، نەقل ببێ، كە ئەگەر ئەو ئۆكسجینە لە ڕێی توانەوەی لە نێو پلازمای خوێندا بووایە، دەبووایە ئێستا چەندە كە لە ڕێی هیمۆگلۆبینەوە دەگوازرێتەوە، لە نێو پلازمای خوێندا، حەفتا هێندەی دیكە ببووایە، ئەوەش وای پێویست دەكرد: ڕێژەی ئێستای خوێن لە جەستەدا، چەندە، حەفتا هێندەی دیكە ببووایە!

٢)- جێی سەرسوڕمانیشە كە: هەر خڕۆكەیەكی سوور دوو سەدو حەفتا ملیۆن (٢٧٠٠٠٠٠٠٠) گەردی هیمۆگلۆبینی تێدایە و، هەر كامێك لەو

www.alibapir.com


گەردانەی هیمۆگلۆبین، دەتوانێ چوار گەردی ئۆكسجین هەڵبگرێ، كەواتە: (٢٧٠٠٠٠٠٠٠) × (٤) = (١٠٨٠٠٠٠٠٠٠) یەك ملیار و هەشتا ملیۆن دانە گەردی ئۆكسجین، هەر خڕۆكەیەكی سوور لەگەڵ خۆی دا هەڵیاندەگرێ و دەیانبات بۆ خانەكان، هەر كاتێك كە مرۆڤ هەناسە دەدات!

٣)- ئنجا خڕۆكەی سوور نێوكی تێدانیە و، تیرەكەی حەوت مایكرۆمەترو نیوە و، ڕووبەرەكەی سەدو شەش (١٠٦مم٢) مایكرۆمەتر دوو جایە.

٤)- شایانی باسە: (١ ملم٣) لە خوێن، پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) خڕۆكەی سووری تێدایە و، هەموو ئەو خڕۆكە سوورانەی كە لە جەستەی مرۆڤێكدا هەن، ژمارەیان دەگاتە: بیست و پێنج تریلیۆن (٢٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) خڕۆكە.

٥)- تەمەنی مام نێوەندیی (متوسِّط عمر)ی خڕۆكەی سوور، سێ مانگە و، لە سێ مانگ شتێك كەمتر یان شتێك زیاتر دەژی.

٦)- مۆخی ئێسقان: كارگەی خڕۆكە سوورەكان و خڕۆكە سپییەكان و خەپلەكانی خوێنە و، بە موعەددەلیی: لە هەر چركەیەكدا دوو ملیۆن (٢٠٠٠٠٠٠) خڕۆكەی سوور بەرهەم دێنێ.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر




## بەندی سێیەم: پێنج کارەکەی کۆئەندامی هەناسەدان[1]:

سییەکان و کۆئەندامی هەناسەدان، پێنج کاریان هەن:

١- هەناسە وەرگرتن (الشهيق).

٢- هەناسە دانەوە (الزفير).

٣- پژمین (العطاس).

٤- باوێشك (التثاؤب).

٥- کۆکە، یان کۆخە (السُّعال).

سەرەتا ئەوە تەئکید دەکەینەوە، کە شوێنی دوو سییەکان، بریتیە لە بە تاڵایی سینە، کە لەملاولاوە قەفەسی سینگ دەوری داوە، بە ماسوولکەکانی و بە پەراسووەکانی، دیارە قەفەسی سینەش: بیست و چوار (٢٤) پەراسووی هەیە، دوازدە لەملا دوازدەش لەولا و، لە خواری سییەکانەوە کە ئەندامی سەرەکیی کۆئەندامی هەناسەدانن، نێوپەنچك (الحجاب الحاجز) هەیە.

ئەمەش کورتەیەك لەبارەی پێنج کارەکەی کۆئەندامی هەناسەدانەوە:

**١- هەناسە وەرگرتن (شهيق):**

بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێ: لە ئەنجامی ئەوەدا کە ماسوولکەکانی نێوپەنچك گرژ دەبن، هەروەها ئەو ماسوولکانەی کە دەوری پەراسووەکانیان داوە و، لە حاڵێکی وادا بۆشایی سینە زیاد دەکات و، سییەکانیش فراوان دەبن و، فشار لەسەر سییەکان کەم دەبێتەوە و، سینگ فراوان دەبێ و، سییەکان بواریان بۆ دەڕەخسێ، کە هەوای زیاتر بکەنە نێو چیکڵدانۆچکەکانیانەوە.

---

(١) دیارە پێشتر لەملا و لای باسەکەمان باسی هەندێك لە ئەرك و کارەکانی: (کۆئەندامی هەناسەدان)مان کردوە، بەڵام بە باشمان زانی لێرەدا، هەر پێنج (٥) ئەرك و کارەکەی پێکەوە بێنین.

www.alibapir.com



**٢- هەناسە دانەوە (الزفیر):**

بەمجۆرە ئەنجام دەدرێ: ڕێك بە پێچەوانەی هەناسە وەرگرتنەوەیە، ئەویان دەبوو بە هۆی فراوانبوونی سینەو، فشار خستنە سەر ماسوولکەکانی نێو پەنچك و، فشارکردن لە ماسولکەکانی دەوری پەراسووەکان، بەڵام ئەمیان بە پێچەوانەوە، لە کاتی هەناسە دانەوەدا، سینە بچووك دەبێتەوەو سییەکان خۆیان دەگوشن، بۆئەوەی ئەو هەوایەی کە تێیاندایە، بتوانن دەری بکەن.

**٣- پژمین (العطاس):**

هەر کام لە (پژمین) و (کۆکە) و (باوێشك) تا ڕاددەیەکی زۆر، بە تایبەتیی پژمین، بە شێوەیەکی ناویستیی (لا إرادي) ڕوو دەدات، پژمین بەم شێوەیە ڕوودەدات: سییەکان هەڵدەستن بە هەوا هەڵمژینێکی قووڵ و، لەمیانەی ئەوەدا ئەندازەیەکی زۆر هەوا دەکەنە نێو خۆیان، دوایی ئەو هەوایە کە وەریان گرتوە، بە شێوەیەکی بەهێز و کت و پڕ، لە ڕێی لووت و زارەوە فڕێی دەدەن و، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا کە لە چرکەیەك تێناپەڕێ و، بە خێرایی دوو سەد (٢٠٠ کم) لە سەعاتێکدا، پژمین ڕوودەدات و، جەستەش بۆیە بەم کاری پژمین هەڵدەستێ، تاکو خۆی دەرباز بکات، لەو میکرۆب و تەنۆلکە پەیدابوو و فڕیوانەی کە پەیدا دەبن، ئنجا پژمین پێویستیی بە وزەیەکی زۆری جەستە دەکات، بۆیەش لە کاتی پژمیندا، جەستە هەموو کارو ئەرکەکانی خۆی ڕادەگرێ، لە نێویشیاندا (دڵ)، دڵیش لەو کاتەدا ڕادەوەستێ، بۆ ئەوەی وزەیەکی زۆر کۆببێتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیەی پژمین، لە میانی کەمتر لە چرکەیەکدا، بۆیەش ڕاگرتنی پژمین، ئینسان پژمینی بێت و ڕایبگرێ، زیان بە جەستە دەگەیەنێ، چونکە ئەو وزەیەی کە جەستە کۆی کردۆتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە، ئەو وزەیە ڕۆڵی خۆی نابینێ و حەپس دەبێ لە جەستەدا و زیانی پێ دەگەیەنێ، هەر بۆیەش سوننەتە کە مرۆڤ دوای پژمین، بڵێ: (الحمدلله) ستایش بۆ خوا، کە ئەو هەموو کۆئەندامانەی جەستە، وەستان، لە نێویشیان دا (دڵ) بۆ

www.alibapir.com



ئەوەی وزە کۆبکەنەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە، کە وەك گوتمان: دڵیش لەو کاتەدا ڕادەوەستێ، پشوویەك دەدات، ئنجا مرۆڤ ستایشی خوا دەکات، کە دووبارە کۆئەندامەکان کەوتنەوە کار و ئەو (پژمین)ەش ئەنجام درا، کە زۆرجار بۆ دەرکردن و خستنە دەری ئەو تەنۆلکە نامۆو، ئەو دەردراوانەیە، کە جەستە بە پێویستی دەزانێ کە خۆیان لێ دەرباز بکات.

٤- باوێشك (التثاؤب):

ئەویش هەر پرۆسەیەکی ناویستیی (لا إرادي)یە، زۆرجار ئینسان بە دەست خۆی نیە، ئنجا لەمیانی باوێشکدا، ئەندازەیەکی زۆری هەوا دێتە نێو دوو سییەکانەوە، بەڵام بە زۆریی لە ڕێی زارەوە دێ، بۆیەش لەو کاتەدا بە تەواویی زارو قوڕگ دەکرێنەوە، بۆ ماوەیەك کە جاری وایە دەگاتە شەش چرکە.

هۆکاری باوێشك جاری وا هەیە خەو هاتنە، جاری وا هەیە بێ تاقەتییە، جاری وایە برسییەتییە، جاری وایە دڵەڕاوکەیە، جاری واشە هۆکارەکەی ماندووبوونە، ئەوانە هەموویان کاریگەرییان هەیە لەسەر ڕوودانی باوێشك.

لە ڕووی زانستییشەوە، زانایان زۆریان لێ کۆڵیوەتەوە، بەڵام لەسەر شتێك ڕێك نەکەوتوون:

أ- هەندێك دەڵێن: هۆیەکەی ئەوەیە، کە ئۆکسجین کەم بۆتەوە و، جەستە دەیەوێ هەڵیمژێ.

ب- هەندێك دەڵێن: بە هۆی ئەوەوەیە، کە ڕێژەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، زیاد بووە لە جەستەدا و دەیەوێ فڕێی بدات.

ج- هەندێکیش دەڵێن: بە هۆی ئەوەوەیە کە کەناڵی ئەستاکویس، کە پەیوەندیی بە گوێیەکانەوە هەیە، لەو کاتەدا دەکرێتەوە و پێویستیی بە هەوا هەیە، یاخود پێویستیی بەوە هەیە، کە هەوای خراپ و پیس دەربکات.

چەند بیردۆزەیەك لەو بارەیەوە هەن و، ڕەنگە هەر کامێکیش لەو هۆکارانە کاریگەریی خۆی هەبێ.

www.alibapir.com


**٥- کۆکە، یان کۆخە (السعال):**

ئەمیش پڕۆسەیەکە لە ئەنجامی چەند وریاکەرەوەیەکی میکانیکیی، یاخود کیمیایی دا، کە ڕوو لە بۆڕییەکانی هەناسەدان دەکەن، دێتە دێ و، ئامانجەکەشی بریتیە لە دەربازکردنی سییەکان و ئەندامەکانی هەناسەدان، لەو دەردراوانە و لەو تەنۆلکە نامۆییانەی کە تێیدان و پێی بێگانەن، دەیەوێ دەریان بکات.

کۆتایی ئەم باسەی: (کۆئەندامی هەناسەدان)یش، بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دێنم، کە دەفەرموێ:

{إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْعُطَّاسَ وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ وَحَمِدَ اللَّهَ، كَانَ حَقّاً عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يَقُولَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ، وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ، فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَثَاءَبَ، ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٥٢٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٨٦٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٠٢٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٧٤٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٩٨).

واتە: بە دڵنیایی خوا پژمینی خۆش دەوێ و ڕقی لە باوێشکە، (پژمین نیشانەی گورج و گۆڵیی چالاکییە، بەڵام باوێشك نیشانەی قالب گرانیی و تەوەزەلیی و بێ تاقەتییە)، هەرکات یەکێ لە ئێوە پژمی و ستایشی خوای کرد، لەسەر هەر کەسێکە کە لەوێیەو گوێی لێیە، پێویستە پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللهُ) خوا بەزەیی پێتدابێت، بەڵام بە دڵنیایی باوێشك لە شەیتانەوەیە، (شەیتان پێی خۆشە، ئینسانی مسوڵمان بێ تاقەت بێ، بێزار بێ، ماندوو بێ، بۆیە دەفەرموێ:) ئەگەر یەکێك لە ئێوە، باوێشکی هات، با بەپێی توانا بیگرێتەوە، (دەستی لەسەر دەمی دابنێ)، چونکە یەکێك لە ئێوە کە باوێشك دەدا، شەیتان پێی پێدەکەنێ.

بێگومان شەیتان هەموو ئەو شتانەی پێخۆشە، کە بۆ مرۆڤ خراپن و، ئەو شتانەیشی پێ ناخۆشن، کە بۆ مرۆڤ باشن، بۆیە مرۆڤ دەبێت پێچەوانەی خواستی شەیتان ڕەفتار بکات.

www.alibapir.com




## خاڵی پێنجەم: کۆئەندامی هەرس (الجهاز الهضمي)

بەڕێـــزان!

هەوڵدەدەین لە حەوت (٧) بەنددا باسی (کۆئەندامی هەرس) بکەین:

بەندی یەکەم: پێناسەی کۆئەندامی هەرس.
بەندی دووەم: پێکهاتەکانی کۆئەندامی هەرس.
بەندی سێیەم: ئەرکی سەرکیی کۆئەندامی هەرس.
بەندی چوارەم: پێکهاتەکانی جەستەی مرۆڤ و، پێویستیی ڕۆژانەی لە خۆراك.
بەندی پێنجەم: قۆناغەکانی پرۆسەی هەرسکردن.
بەندی شەشەم: چۆنیەتی کارکردنی هەر شەش پێکهاتەکەی کۆئەندامی هەرس.
بەندی حەوتەم: لیکی نێو زار و پەنکریاس و جەرگ و زراو.

### بەندی یەکەم: پێناسە:

کۆئەندامی هەرس لە بۆڕییەك، یاخود لە جۆگەلەیەکی ماسوولکەیی درێژی پێچاو پێچ پێك دێ، کە لە هەندێ شوێنان فراوان دەبێ و لە هەندێ شوێنان تەسك دەبێتەوە، کە بە (زار) دەست پێدەکات و، بە (کۆم) کۆتایی پێ دێ.

درێژی ئەو بۆڕییە لە مرۆڤێکی پێگەیشتوودا نۆ (٩) مەترە، هەر چەندە ماوەی نێوان زارو کۆم، کە زار خواردنی لێوە دێ و، کۆمیش پاشەڕۆکی لێوە دەردەچێ، لە مەترێك زیاتر نیە، بەڵام ئەدی ئەو نۆ مەترە چۆن جێی بۆتەوە؟ وەڵام: ئەو بۆڕییە لەو شوێنانەی کە بۆشایین لە نێو سکدا پێچراوە بەیەکدا، نووشتێنراوەتەوە، بۆیە ئەو نۆ مەترە لەو ماوە یەك مەترییە، بەڵکو کەمتر لە یەك مەترییەدا، جێگای بۆتەوە.

www.alibapir.com





وێنەی (١٩) کۆئەندامی هــــەرس

## بەندی دووەم: پێکهاتەکانی کۆئەندامی هەرس:

پێکهاتەکانی کۆئەندامی هەرس، شەشن:

١- زار، ٢- قورگ، ٣- سووریێنچك،

٤- گەدە، ٥- ڕیخۆڵە باریکەکان، ٦- ڕیخۆڵە ئەستوورەکان.

www.alibapir.com





چوار پێکهێنەری دیکەش لە دەرەوەی کەناڵی هەرس پێوەی پەیوەستن و هاوکاریی کەناڵی هەرس دەکەن، ئەوانیش:

١- ڕژێنی لیك، ٢- پەنکریاس، ٣- زراو، ٤- جەرگ.

## بەندی سێیەم: ئەرکی سەرەکیی کۆئەندامی هەرس:

ئەرکی سەرەکیی کۆئەندامی هەرس، بریتیە لە دابینکردنی ئاوو پرۆتینات و کاربۆهیدرات، (شیرنەمەنیی) و چەورییەکان و ڤیتامینەکان و کانزایەکان و خوێیەکان، بۆ هەر کام لە خانەکانی جەستە، بۆ ئەوەی ژیانیان بەردەوام بێ و، سەرەنجام ژیانی مرۆڤیش بەردەوام بێ.

هەڵبەتە خانەکانی جەستە، جگە لە سادەترین خۆراك، بۆیان ناخورێ، واتە: خواردنی لێکدراویان بۆ ناخورێ، دەبێ شیتەڵ بکرێتەوە، بۆ یەکە سەرەتاییەکانی.

**خۆراکی خانەکانیش بە گشتی چوار جۆرە:**

**یەك:** بیست ترشە ئەمینییەکان (الأحماض الأمينية العشرون) (Amino acids): کە ئەوانیش بریتین لە یەکە بنەڕەتییەکانی دروست کردنی پرۆتینەکان.

**دوو:** شەکرە یەکییەکان (السَّكاكر الأُحادية): چونکە شەکری دوویی و سێی و فرەییش، هەن، واتە: شەکرە سادەکان، کە شیتەڵ کراونەوە، کە بریتین لە: گلوکۆز و، فەرکتۆزو، گالاکتۆز، کە پێویستن بۆ بەرهەم هێنانی جۆرەکانی کاربۆهیدرات و نیشاستەکان.

**ســێ:** ترشە چەورییە ئازادەکان (الأحماض الدهنية الحرة)، هەروەها (گلیسیرد)ە، یەکییەکان و (گلیسیرۆل)، کە ئەوانیش پێویستن بۆ بەرهەم هێنانی جۆرەکانی چەوریی.

**چوار:** لێکدراوە کیمیاییەکان: کە پێیان دەگوترێ: ڤیتامینات (Vitamins)، کە بیست جۆریان دۆزراونەتەوە، بەڵام سێزدەیان ناودارن، هەڵبەتە ڕەنگە زیاتریش

www.alibapir.com



هەبن، بەڵام تاکو ئێستا زانایان بیست جۆریان دۆزیوەتەوە، کە ئەم سێزدەیان زیاتر ناودارن، ئەوانیش بریتیە لە ڤیتامینەکانی: (A،B1، B2، B3، B5، B6، B7، B9، B12، C، D، E، K) کە دیارە هەر کامێك لەوانە جۆرێك لە کاریگەریی هەیە، کە ئێمە دەرفەتی ئەوەمان نیە بە وردەکاریی هەموویان دا بچینە خوار.

## بەندی چوارەم: پێکهاتەکانی جەستەی مرۆڤ و پێویستیی ڕۆژانەی لە خۆراك:

### أ- جەستەی هەر مرۆڤێك بە گشتیی ئەم پێکهاتانەی هەن:

١- لە (٦٥٪)ی پێکهاتەی جەستە ئاوە.

٢- لە (١٦٪)ی پرۆتینەکانن، کە پرۆتینەکان پێویستن بۆ دروستکردنی خانەکانی جەستە و، جێبەجێکردنی چالاکییە ژیانییەکان.

٣- لە (١٠٪)ی پێکهاتەی جەستە کاربۆهیدراتە، کە پێویستە بۆ ئەوەی جەستە وزەی تێدابێت، شیرینی وزە بە جەستە، دەبەخشێ.

٤- لە (٥٪)ی بریتیە لە چەورییەکان، کە ئەوانیش پێویستن، هەم بۆ دروستکردنی خانەکان و، هەم بۆ پەزمەندەکردن و هەڵگرتنی وزە لە جەستەدا.

٥- لە (٤٪)یشی بریتین لە کانزاو خوێیەکان.

### ب- پێویستیی ڕۆژانەی جەستەی مرۆڤ:

جەستەی مرۆڤی باڵغ، ڕۆژانە پێویستیی بە دوو هەزار (٢،٠٠٠) کالۆریی، یەکەی گەرمیی (السعرة الحرارية) دەکات، کە ئەو دوو هەزار کالۆرییە، بە شێوەیەکی میانجیی وەرگیراوە و بەم جۆرە دابەش دەبێ:

١- لە (٥٠٪)ی (ئەو دوو هەزار کالۆرییە) کاربۆهیدراتە.

٢- لە (٣٠٪)ی چەورییەکانن.

www.alibapir.com



٣-لە (٢٠٪)ی پڕۆتینە، چونکە گرامێك لە پڕۆتین و گرامێك لە کاربۆهیدرات، چوار کالۆرییان تێدایە، بەڵام گرامێك چەوریی نۆ(٩) کالۆریی تێدایە.



## بەندی پێنجەم: قۆناغەکانی پڕۆسەی هەرسکردن:

مادده ئەندامییە ئاڵۆزەکان (المَوَادّ العُضوِية المعقَّدَة) دەگۆڕێن بۆ مادده ئەندامییە سادەکان، تاکو خوێن بە ئاسانیی بتوانێ هەڵیانبگرێ و دابەشیان بکات بەسەر خانەکانی جەستەدا، ئەو کاتە ئەو مادده ئەندامییە سادانە، کە لە ڕێی کۆئەندامی هەرسەوە، شیتەڵ کراونەوە، بە ئاسانیی دەتوانن لە دیواری خانەکانەوە بچنە ژوور و ببنە خۆراك بۆ خانەکان، بەڵام ئەگەر بە لێکدراویی بوونایە، لەبەر قەبارەی گەورەیان، نەیاندەتوانی بچنە نێو خانەکانەوە.

ئنجا دروستکردن و پاشان هەڵوەشاندنەوەی ماددەی ئەندامییە ئاڵۆزەکان، هەردووکیان تەنیا لە ڕێی ئەنزیمەکانەوە دەبن، دوایی باسی ئەنزیم دەکەین، کە ئەویش جۆرە ماددەیەکە، جەستە بۆ خۆی دروستی دەکات و، چەندان جۆرە ئەنزیم هەن، کە هاندەرن و جووڵێنەرن بۆ پڕۆسەی هەرسکردن، کە لە نێو خانەکاندا ڕوو دەدات.

ئنجا ئەویش - گۆڕینی مادده ئەندامییە ئاڵۆزەکان، بۆ مادده ئەندامییە ساددەکان - بە سێ قۆناغ دەبێ:

**قۆناغی یەکەم:** بریتیە لە پڕۆسەیەکی میکانیکیی، کە بریتیە لە لەت و پەتکردن و هاڕینی خواردن و تێکەڵ کردنی لەگەڵ شلەمەنییەکان، (مەبەست پێی لیکە)، ئەوەش لە زاردا ڕوودەدا، ئینسان کە خواردن دەخوات، پارچە پارچەی دەکات و پاشان لەگەڵ لیك تێکەڵی دەکات، ئەوە یەکەمین هەنگاو و یەکەمین قۆناغی، پڕۆسەی هەرسکردن و گۆڕینی خواردنەکانە بۆ یەکەی سادە، تاکو دوایی خانەکان بتوانن لێیان بەهرەمەند بن.

**قۆناغی دووەم:** پرۆسەیەكی كیمیاییە، كە بریتیە لە تواندنەوەی خۆراك، ئەویش بە بەكارهێنانی ترشەڵۆكی هیدرۆكلۆریك، بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا، دەنكۆڵە گچكەكانی خواردن دەست بكەون، لە نێو شلەیەكدا، كە لە ئاوو لە ترشەڵۆك پێك دێ، لەوێدا خۆیان دەبیننەوە.

**قۆناغی سێیەم:** دیسان هەر كیمیاییە و بریتیە لە تێكشاندنی پەیوەندییە كیمیاییەكانی نێوان گەردەكانی ئەو ماددە هەرسكراوانە، كە وەك گوتمان: قەبارەیان گەورەیە، بەڵام تێك دەشكێنرێن و دەگێڕرێنەوە بۆ یەكە سەرەتاییە بچووكەكانیان، تاكو بتوانن بچنە نێو خانەكانەوە.

## بەندی شەشەم: چۆنیەتی كاركردنی هەر شەش پێكهاتەكەی كۆئەندامی هەرس:

ئەم بەندە بەندی كۆتاییە و بە تەنیا لە هەموو بەندەكانی ڕابردوو زیاتر پانتایی داگرتوە.

هەڵبەتە پێكهاتەكانی كۆئەندامی هەرس، بە شێوەیەكی هەڕەمەكیی كاری خۆیان ناكەن، بەڵكو بە شێوەیەك كە زۆر چاك كۆنترۆڵ كراوە و، بە شێوەیەكی بەرنامە بۆ دارێژراو، لە نێو مێشكدا یاخود لە نێو گرێ یە دەمارییەكان دا، مەرج نیە تەنیا لە نێو مێشك دا بێ، كە هەندێك گرێی پەیوەست بە مێشك و دەماریش هەن، كە لە نێو دیوارەكانی هەندێك لەو پێكهاتانەی كۆئەندامی هەرسدا، دانراون، ئەوانیش ڕۆڵی كۆئەندامەكانی هەرس دیاریی دەكەن، هەروەها سیستمی هۆرمۆنیی، ئەویش دیسان كاریگەریی زۆری هەیە، كە هەركام لەو كۆئەندامانەی هەرس، كاری خۆیان بكەن و، ئێمە دوایی بە تایبەت باسی (كۆئەندامی هۆرمۆنیی) دەكەین.

ئێستاش یەك بە یەك باسی هەر شەش ئەندامەكەی كۆئەندامی هەرس دەكەین:





**١) زار(الفــم):**

زار، دەم، هەڵدەستێت بە لەت و پەتکردنی ئەو خواردنە بە ددانەکان، پاشان ڕژێنی لیکی پێدا دەکات، کە ڕۆژانە لە نێو زاردا لیترو نیوێك (١،٥ لیتر) لیك، لە ڕژێنە لیکییەکاندا پەیدا دەبێ، کە ژمارەیان نیزیکەی شەش سەد (٦٠٠) ڕژێنە لە نێو زاردا.

هەروەها زمانیش، کە ئەندامێکی ماسوولکەییە و لە حەڤدە ماسوولکە پێکهاتوە، ئەویش چەند کارێك ئەنجام دەدا بۆ بەڕێوەچوونی قۆناغی یەکەمی هەرس، کە بریتیە لە چێژتن و تام لێکردن و، دواییش سەروبەرکردنی ئەو خواردنە، دەیخاتە بن ئەو ددان و، ئەم ددان و، دەیخاتە ئەملا و ئەولا و هەڵی دەگێڕێ و وەری دەگێڕێ و، دوایی لە قوڕگ ئەو دیوی دەکات، ئەوە هەمووی کاری زمانە ئەنجامی دەدا!

کە بە ڕاستیی ئینسان هەرچەندە بیر دەکاتەوە، لەو هەموو وردەکارییانە، سەری سوڕدەمێنێ لە حیکمەتی خوا، کە چ تەگبیرێکی بۆ مرۆڤ کردوە! (چونکە ئەم باسانە هەموویان ئێمە لە ژێر ئەو ناوونیشانەدا دەیانهێنین کە: هەبوونی مشوور خواردن و هەبوونی سەرپەرشتیاریی، بەڵگەیە لەسەر مشورخۆرو سەرپەرشتیار).

خوا (سبحانه وتعالى) چ تەگبیرێکی بۆ مرۆڤ کردوە! مرۆڤ هەر بیریش لە جووڵەی زمان، ناکاتەوە، هەڵبەتە دەردانی لیك، ئەوە هەر هیچ، چونکە ئەوە شتێکە کە بە دەست ئێمە نیە و ناویستیی (لا إرادی)یە، شتێکە یەکسەر لە مێشکەوە فەرمان دێ بۆ ڕژێنەکانی نێو زار: لیك دەربدەن! لەبەر ئەوەی خواردن هەیە، بەڵکو جار وایە بەبێ خواردنیش لیك دەردەدرێ، بۆ ئەوەی قوڕگ و گەروو وشك نەبن، بەڵام خۆ زمان زیاتر بە شێوەیەکی ویستیی (إرادي) دەجووڵێ، کەچی تەماشا دەکەی ئەو سی و دوو(٣٢) ددانە بە دەوری زمانەوەن، مەگەر چۆن، جار جارێك مرۆڤ لێی هەڵە بێ، ئەگەرنا ئەو ددانانە، زیان بەو زمانە ناگەیەنن و، ئەو زمانە کاری خۆی دەکات!

www.alibapir.com





ئنجا ئایا زمانیش چۆن چۆنی تام دەکات؟ دواتر ئێمە کە باسی پێنج هەستەکان دەکەین: (دیتن، بیستن، تامکردن، بۆنکردن، دەستلێکوتان)، لەوێ باسی ئەوە دەکەین.

## ٢) قـــورگ:

قورگ بۆرییەکی ماسوولکەییە، درێژییەکەی نیزیکەی دوازدە (١٢ سم)ە و، قورگ ئەندامێکی دیکەشی لەلایە، پێی دەگوترێ: زمانە چکۆڵە (اللسان المزمار)[١]، کە لە کاتێکدا مرۆڤ دەیەوێ ئاو بخواتەوە، یاخود خواردن ئەو دیو بکات لە قورگی، ئەو زمانە بچکۆڵە، بێ ئەوەی ئێمە پێی بزانین، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، وەك پۆلیسێکی هاتوچۆی هەمیشە ئامادە، یەکسەر ڕێگای هەناسەدان، ڕێگای هەوا، دادەخات، تاکو خواردن یان خواردنەوە نەچێتە نێو بۆڕی هەناسەوە، ئنجا ئەگەر جار جاریش لێی تێکبچێ، یاخود مرۆڤ بە پەلە پەل بخواتەوە و بخوات و زمان بچکۆڵە فریا نەکەوێ، ئەوە سییەکان دەست دەکەن بە هەوا پاڵپێوەنان، تاکو ئەو تەنۆلکە نامۆیە فڕێ دەدەنە دەرێ، ئەمەش پێیدەگوترێ: کۆکین.

## ٣) سوورێنچك:

ئەویش بریتیە لە بۆرییەکی ماسوولکەیی، درێژییەکەی: سی (٣٠ سم)ە و، تیرەکەی: دوو سانتیم و نیو (٢،٥ سم) دەبێ و، لە قورگ جیا دەبێتەوە لەلای بڕبڕەی شەشەمەوە، دوایی لە پشت بۆڕی هەواوە دەڕوا، هەروەها دوایی بە پشت دڵیشدا دەڕوات، تاکو نێوپەنچك دەبڕێ لەلای بڕبڕەی دەیەمی سینە، دوایی ئەو سوورێنچکە بەسەر گەدەدا دەکرێتەوە، بە دووریی یەك سانتیم لە نێو پەنچکەوە، (لەوێ دەکرێتەوە بەسەر گەدەدا) تاکو ئەو خواردنەی تێیدایە، بیکاتە نێو گەدەوە.

---

(١) لسان المزمار: زمانی شمشاڵ.

www.alibapir.com



**٤) گـــەدە (المعدة):**

لە چوار وردە خاڵ دا باسی گەدە دەكەین:

**یەك:** گەدە بریتیە لە كیسەیەكی ماسوولكەیی زۆر بەهێز، كە بە شێوەیەكی مام نێوەندیی درێژییەكەی بیست و پێنج (٢٥)سم دەبێت و، پانییەكەی دوازدە (١٢)سم دەبێت، قەبارەكەی لە كاتێك دا كە خاڵییە و هیچی تێدا نیە، بە قەدەر قەبارەی یەك لیتر ئاو، یان شلەمەنییە.

**دوو:** شوێنی گەدە: گەدە دەكەوێتە لای چەپی سك، لە خوار نێو پەنچك و جەرگەوە و، لە پشت قوڵۆنی كە بە شێوەی لاكێشەیی ڕاكشاوە لە نێو سكدا، هەروەها دەكەوێتە سەرووی ڕیخۆڵە باریكەكان و پەنكریاسیشەوە.

**سێ:** دیواری گەدە، لە سێ چین پێك دێت:

**١-** یەكەمیان چینێكی ڕیشاڵیی لووسە.

**٢-** دووەمیان چینی نێوەڕاستە، كە ئەویش لە سێ چین پێك دێ و، هەر سێكییان ماسوولكەیین:

**أ-** چینێكی خاوەن ماسوولكەی لارە.

**ب-** چینێكی خاوەن ماسوولكەی بازنەییە.

**ج-** چینێكی خاوەن ماسوولكەی درێژە.

یانی: ماسوولكەكانیان جۆراو جۆرن و هەركامیان ئەركێكی تایبەتی هەیە.

**٣)-** چینی سێیەمی گەدە، كە پێی دەگوترێ: چینی نێوەوە، واتە: یەكسەر بەسەر دیوی نێوەوەی گەدەوەیە، ئەویش بریتیە لەو چینە لینجەیی (الطبقة المخاطية) یە، خاوەن پێچ و لوولە ڕیشوودارەی، كە سی و پێنج ملیۆن (٣٥،٠٠٠،٠٠٠) ڕژێنی گەدەیی تێدایە و، ماددەی جۆراو جۆر دەڕژێننە نێو گەدەوە.

www.alibapir.com





**چوار:** گوشراوە گەدەییەکان (العُصَارات المَعِدِية) کە گەدە دەیانرژێنێتە نێو خۆی و ئەم نۆ (٩) جۆرەن:

١)- لە (٩٠٪)ی بریتیە لە ئاو.

٢)- ترشی هیدرۆکلۆریك.

٣)- هەوێنی، یاخود ترشی بیبسین، یاخود ببسینوجین.

٤)- لینجاوی قەلەویی (المُخَاط القَلَوي)[1]، کە دەردراوێکی ئاویی لینجە، هەندێك لە ڕژێنەکان، یاخود هەندێك لە پەردەکان کە لە کۆئەندامەکاندا هەن، دەری دەدەن.

٥)- هۆڕمۆنی جاسترین.

٦)- هۆڕمۆنی هیستامین.

٧)- هۆڕمۆنی سۆرماتوستین.

٨)- هۆکاری نێوخۆیی.

٩)- ئەنزیمی لیبینزی گەدەیی.

ئنجا هەموو ئەو ڕژێنانە، کاتێك گەدە دەریان دەدا، کە خواردن دەچێتە نێو گەدەوە و، بەپێی جۆری ئەو خواردنەی دەچێتە نێو گەدەوە، گەدە مێشك ئاگادار دەکاتەوە، کە ئەو جۆرە خواردنە هاتوە، ئایا چی بۆ بڕژێنم تاکو هەرس بێت؟ مێشکیش یەکسەر فەرمانی پێ دەکات: فڵان شتەو فڵان شتە، بەو ڕێژەیەو بەو ڕێژەیە.

ئەو هەموو وردەکارییە بەکاردەهێنرێ، ئەگەرنا وە نەبێ ئەو ماددانە هەموویان لێکرا بێن، بەڵکو هەر کامێك لەو دەردراوانە بە ئەندازەی خۆی و بە ڕێژەیەکی دیارییکراو، بۆ جۆرێك لە خواردن و بە فەرمانی مێشك دێ، بێ ئەوەی ئێمە

---

(١) (مخاط قَلَوي): (مُخَاط)ماددەیەکی لینجە، (قَلَوي): بریتیە لە ماددەیەك کە لە ئاودا دەتوێتەوە و ڕێژەی (ئەیۆناتی هەیدرۆکسید)، بەسەر ڕێژەی (ئەیۆناتی هیدرۆجین)دا، زاڵ دەکات، وەك صۆدە. (المعجم الوسیط)، ص٧٥٧.

www.alibapir.com


ئاگامان لێ بێ، ئێمە هەر ئەوەمان لەسەرە، پاروو لە گەروو ئەو دیو دەکەین و لێی دەگەڕێین! بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) ئاوا سەرپەرشتیی ئەو خواردنەی بۆ کردووین، ئەو سیستمە پڕ وردەکارییەی داناوە!

**٥- ڕیخۆڵە باریکەکان (الأَمْعَاءُ الدَّقِيقَة):**

لە چوار وردە خاڵ دا، باسی ڕیخۆڵە باریکەکان دەکەین:

**١)-** ڕیخۆڵە باریکەکان، بریتیە لە بۆڕییەکی ماسوولکەیی کە درێژییەکەی شەش مەترو نیو (٦،٥)م و، تیرەکەی سێ (٣)سم،ە.

**٢)-** بۆڕیی ڕیخۆڵە باریکەکان، یەکسەر پەیوەستە بە گەدەوە، لە میانی ئەو دەروازەیەوە کە بەسەر گەدەوەیە، سەرێکی پەیوەستە بە گەدەوە و، سەرێکیشی پەیوەستە بە ڕیخۆڵە ئەستوورەوە، لەلای کوێرە زمانە(الصَّمَّامُ الأَعْوَر)[1].

**٣)-** هەڵبەتە بە هۆی ئەوەوە کە ڕیخۆڵە باریکە: شەش مەترو نیو (٦،٥)م، درێژە، زۆر پێکەوە پێچراوە و نووشتێنراوەتەوە، ئەگەرنا جێگای نەدەبووەوە.

**٤)-** ڕیخۆڵە باریکە دوو کاری سەرەکیی ئەنجام دەدات:

**یەکەم:** بۆ جاری کۆتایی خواردن هەرس دەکات، کە سەرەتا لە زارەوە دەست پێ دەکا، ئنجا لە نێو گەدەدا، دوایی ڕیخۆڵە باریکە بۆ جاری کۆتایی پڕۆسەی هەرسکردن و شیتەڵ کردنەوەی ئەو خواردنە، یاخود ماددە لێکدراوەکان، ئەنجام دەدا، بۆ ئەوەی بیانکاتەوە بە یەکەی سەرەتایی و، تێکەڵ بەخوێنیان بکا و، خوێنیش بیگەیەنێ بە خانەکان.

**دووەم:** مژینی ئەو خواردنەی کە هەرسکراوە: دەیمژێ و دەیگەیەنێ بە دەزوولەکان و بۆڕیچکەکانی خوێن، تاکو لەوێشەوە بگوازرێتەوە بۆ خانەکان.

---

(١) الصّمّام: زارەوانە، سەرقاپ، زمانە، هەر شتێکە دەروازە و دەمی شتێکی پێ ببەسترێ.

www.alibapir.com





**٦- ڕیخۆڵە ئەستوورەکان (الأمعاء الغليظة):**

لە چوار وردە خاڵیش دا، باسی ڕیخۆڵە ئەستوورەکان دەکەین:

**١)**- دوا وێستگەی پرۆسەی هەرسکردنە.

**٢)**- درێژییەکەی مەترو نیوێك(١،٥)م،ە.

**٣)**- ڕیخۆڵە ئەستوورە، بە شێوەیەکی لاکێشەیی لە نێو سكدا دانراوە و، ڕیخۆڵە باریکەی لە نێو خۆی وەرگرتوە[1].

**٤)**- ڕیخۆڵە ئەستوورە، دوو ئەرکی سەرەکیی هەن:

**یەکەم:** مژینی ئەو ئاوو ڕژێنراوانەی گەدەو، ڕیخۆڵە باریکەو، زراوو پەنکریاس، هەروەها ئەو ئاوەش کە مرۆڤ دەیخواتەوە، ڕۆژانە ڕیخۆڵە ئەستوورە هەشت (٨) لیتر دەمژێ، لەو ئاوو شلەمەنییانە و لە ڕێی خوێنەوە، دەیگێڕێتەوە بۆ جەستە.

**دووەم:** لە ڕیخۆڵە ئەستوورەدا، زیاتر لە پێنج سەد (٥٠٠) جۆرە بە کتریای سوودبەخش هەیە، کە ژمارەیان بە سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) مەزەندە دەکرێ، ژمارەی هەموو خانەکانی جەستەی مرۆڤ: سەد تریلیۆنە و ژمارەی ئەو بەکتریایانەش کە پێنج سەد جۆرن و، تەنیا لە ڕیخۆڵە ئەستوورەدا هەن، بە قەدەر ژمارەی هەموو خانەکانی جەستەی مرۆڤە، کێشی ئەو بەکتریایانە، کیلۆگرام و نیوێکە (١،٥)کگم، کاریان ئەوەیە کە لەمیانی ئەنزیمەکان دا، هەڵدەستن بە هەرسکردنی ماددە کاربۆهیدراتە ئاڵۆزەکانی نێو ڕیشاڵەکانی سەوزەو میوە، وەك: (سیلیلۆز) پاشان گۆڕینیان بۆ ترشەڵۆکە چەورییە دەوڵەمەندەکان بە وزە، ئەوانیش لەوێدا بێ ئیش نین و زۆریش ماندوون!

---

(١) لە نێو خۆی وەرگرتوە: گرتوویەتە نێو خۆی، دەوری داوە.

شایانی باسە کە ترشاندن (تخمیر)ی نێو ڕیخۆڵە گەورە، چەند گازێکی وەك: (میثان) و (دووەم ئۆکسیدی کاربۆن) و (هیدرۆجین) پەیدا دەکەن، ئەو حاڵەتی ترشاندنی خواردنە، کە لە نێو ڕیخۆڵە ئەستوورەدا ڕوودەدا، ئەو سێ گازە پەیدا دەکات و، بەرەو دەروازەی ڕیخۆڵە ئەستوورە دەچن و، هاوکاریی دەرچوونی پاشەڕۆك دەکەن، چەند ناخۆش دەبوو، ئەو گازانە بەرەو سەرێ هاتبان و لە ڕێی زارەوە دەرچووبان!! ئەو بۆن و بەرامە ناخۆشە؟!!

خوا(سبحانە وتعالی) کە دەفەرموێ: ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ الإسراء(٧٠).

یەکێك لە ڕێزەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە ئەو خواردنە دەخوا، زۆر بە نەجیبیی، بەڵام دوایی دەزانین پاشەڕۆکەی چۆن دەردەچێ!! ئنجا ئەو گازانەش کە لە نێو ڕیخۆڵە گەورەدا دروست دەبن، ئەگەر ئەو گازانە نەبوونایە، چ شتێك ئەو پاشەڕۆکەی پاڵپێوە دەنا لە جەستەی مرۆڤ، دەربچێ؟ ئەویش حیکمەتی خۆی هەیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## بەندی حەوتەم: لیکی نێو زار و پەنکریاس و جەرگ و زراو:

بەڕێـــــزان!

دوای ئەوەی لە بارەی کۆئەندامی هەرس (الجهاز الهضمي)ەوە، دواین و باسی شەش پێکهاتە نێوخۆییەکەی: (زارو، قوڕقوڕاگەو، سوورێنچك و، گەدە و، ڕیخۆڵە باریکە و، ڕیخۆڵە ئەستوورە)مان کرد، ئێستاش چوار ئەندام کە هاوکارو یارمەتییدەری کۆئەندامی هەرسن: (لیك و، پەنکریاس و، جەرگ و، زراو)، باسی ئەو چوار ئەندامە دەکەین:

**١)- لیکی نێوزار (لعاب الفم):**

پێشتر باسمان کرد کە لە نێوزار (دەم)دا، دەوری شەشسەد (٦٠٠) لیکە ڕژێن (غدة لعابية) هەن و، ڕۆژانە لیتر و نیوێك (١،٥)لیك دەردەدەن.

خوا پشتیوان بێ لە کاتی باسکردنی پێنج هەستەکان (الحواس الخمس)یش دا، جارێکی دیکە باسی زار و زمان و وردەکارییەکانیان دەکەین.

**٢)- پەنکریـــــاس:**

١- پەنکریاس ڕژێنێکی لووسی نەرمە(غدة مَلساء ناعمة)، لە شێوەی گێزەر دایە، درێژییەکەی پازدە (١٥) سم دەبێ و، کێشەکەی حەفتا (٧٠) گرام دەبێ.

٢- پەنکریاس وەك ڕژێنێکی دەرەکیی کار دەکات، کە کارەکەی بریتیە لە دەردانی هەندێ شلەمەنیی هەرسکەر(هاضمة)، کە یەکسەر دەڕژێنە نێو ڕیخۆڵەی دوازدە گرێ وە.

٣- هەروەها وەك ڕژێنێکی نێوخۆیی، کەرە ڕژێن (غدة صماء) کار دەکات، کۆمەڵێك هۆڕمۆنی جۆراو جۆریش دەردەدات، کە ئەو هۆڕمۆنانە یەکسەر دەڕژێنە نێو خوێنەوە، ئەوانیش بریتین لە: (ئەنسۆلین) و (ئەملین) و (گلۆکاگۆن) و (سۆماتۆستاتن) و (غریلین)، ڕەنگە هی دیکەش هەبن.

www.alibapir.com


٤- پەنكریاس چەند ئەنزیمێكیش دەردەدا، (ئەنزیم هەندێك ماددەی جووڵێنەرن بۆ ئەو پرۆسانەی كە لە جەستەدا ڕوودەدەن، بەتایبەت لە خانەكان دا)، ئەو ئەنزیمانەی كە پەنكریاس دروستیان دەكات و دەریان دەدا: ١- ئەمیلاز، ٢- لیبینز، ٣- فۆسفۆلیبینز، ٤- ئیستریزی كولیسترول)، ئەو چوارەن و، ڕەنگە هی دیكەش هەبن.

كەواتە: پەنكریاسیش هاوكارییەكی باشی كۆئەندامی هەرس، دەكا لەوەدا كە خواردنەكەی باش و بە ئاسانیی بۆ سەرو بەر بكرێ و، بۆی شیتەڵ بكرێتەوە و بۆی ئامادە بكرێ، تاكو خانەكان بتوانن لێی بەهرەمەند بن.

٣)- جـــــەرگ:

١- جەرگ: گەورەترین ئەندامی جەستەیە لە ڕووی قەبارەو كێشەوە، كیلۆو نیوێك قورسە و، جەرگ لە سەد هەزار (١٠٠٠٠٠) یەكەی جەرگیی (وحدة كبدية) پێكهاتوە، واتە: لە سەد هەزار پارچەی بچووك بچووك پێكهاتوە.

٢- زیاتر لە چوار سەد (٤٠٠) ئەرك هەیە بۆ جەرگ، بەڵكو هەندێك لە زانایانی توێكاریی و لێكۆڵەرەوانی جەستە دەڵێن: جەرگ پێنج سەد (٥٠٠) ئەركی هەیە، كە ئێمە لێرەدا هەشت (٨) ئەركیان لێ دەژمێرین:

**یەك:** پەزمەندە كردن و پاشەكەوتكردنی ئەو ماددانەی كە لە جەستە زیادن، پاشان لە كاتی پێویستدا هاوكاریی جەستەیان پێ دەكاتەوە.

**دوو:** دروستكردنی دەردراو و گوشراو (عصارة)ێكی هەرسكەر (هاضمة)، كە بریتیە لە زەرداو (صفراء).

**سێ:** لادانی زۆرێك لە ژەهرەكان لە جەستەدا.

**چوار:** دروستكردنی: پرۆتینەكانی خوێن و، چەورییەكانی خوێن و، ڕێگرەكانی خەست بوونەوەی خوێن، (مانعات التجلط)، (تجلط الدم) یانی: خەستبوونەوەی خوێن، كە خوێن خەست بۆوە، چاك بە دەمارەكان دا هاموشۆ ناكات و دەگیرێن.

www.alibapir.com





٥- چارەسەرکردنی پاشماوەی خانە مردووەکان و، فڕێدانیان و جەستە لێ دەربازکردنیان.

٦- ڕێکخستنی ئاستەکانی زۆرێك لە ماددەکان، وەك: شەکرو کۆلیسترۆڵ و هۆڕمۆنەکان و ڤیتامینەکان، جەرگ ڕێژەی ئەو ماددانە کۆنترۆڵ دەکات و ڕێکیان دەخات.

٧- قووتدان و خواردنی هەندێك لە میکرۆبە جۆراو جۆرەکان، بۆ ئەوەی لە کۆڵ جەستەیان بکاتەوە.

٨- چارەسەرکردنی هەندێك لە ماددە جۆراو جۆرەکانی، کە ڕیخۆڵە باریکە و ڕیخۆڵە ئەستوورە دەیانمژن، پاشان ئەوەی کە بە کەڵکە، لە ڕێی خوێنهێنەرەوەی گەورە (الوريد الكبير)وە، ڕەوانی دەکات بۆ دڵ، بۆ ئەوەی دڵیش جارێکی دیکە، ئەو دیاریی و خەڵاتە کە لە جەرگەوە بۆی هاتوە، کە بریتیە لەو ماددانەی بە کەڵکن، جارێکی دیکە بەسەر خانەکانی جەستەدا، دابەشیان دەکاتەوە.

**٤)- زراو (الـمَــرَارَة):**

جەرگ گوشراوێك دەردا، پێی دەگوترێ زەرداو، بە ڕێژەی لیترێك لە شەوو ڕۆژێکدا، جەرگ ئەو زەرداوە کۆدەکاتەوەو هەڵیدەگرێ لە کیسێکی ماسوولکەییدا، کە یەکسەر لە دیوی خوارەوە بە جەرگەوە نووسێنراوە، پێی دەگوترێ: چیکڵدانە (الحويصلة) و پێشی دەگوترێ: میزڵدانی زراو(المثانة المرارية)، ئەو کیسەش لە شێوەی هەرمێ یەك دایە و، درێژییەکەی: هەشت (٨)سم و تیرەکەی: چوار (٤)سم و، جێی پەنجا (٥٠)ملل (میللی لیتر) لەو زەرداوەی تێدا دەبێتەوە.

زەرداویش (الصفراء ) شلەمەنییەکی خەستە، ڕەنگەکەی زەردە بەلای سەوزییدا دەچێ و، زۆر زۆر تاڵە، ئیشی ئەو زەرداوە، بریتیە لە لێك هەڵوەشاندنەوەی چەورییەکان لە خوێندا.





## خاڵی شەشەم: کۆئەندامی میز (الجهـــاز البـولـي)

بەڕێـــــزان!

لە سێ بەنددا باسی کۆئەندامی میز (الجهاز البولي)دەکەین:

بەندی یەکەم: پێکهاتەی کۆئەندامی میز.

بەندی دووەم: کارەکانی کۆئەندامی میز.

بەندی سێیەم: پێکهاتەکانی خوێن و میز.

### بەندی یەکەم: پێکهاتەی کۆئەندامی میز:

کۆئەندامی میز لە پێنج ئەندام پێکهاتوە:

١- دوو گورچیلەکان.

٢- دوو بۆڕییەکانی میز (الحالبان).

٣- میزڵدان (المثانة).

٤- میزەڕۆ (الإحليل)، ئەو شوێنەی کە میزی پێدا دەڕوا.

٥- ڕژێنی کەزەریی (الغدة الكظرية).

بێگومان ئەوەی کاری بنەڕەتیی لە کۆئەندامی میز دا ئەنجام دەدات، بریتین لە هەردوو گورچیلەکان، ئەگەرنا هەر کام لە دوو حالیبەکەو، میزڵدان و، میزەڕۆ، تەنیا شوێنی کۆکردنەوەو فڕێدانی میزن.

ئنجا با تۆزێ باسی هەرکام لە پێنج لە پێکهاتەکەی کۆئەندامی میز بکەین:

www.alibapir.com





وێنەی (٢٠) کۆئەندامی میـــــز

### ١- گورچیلە (الکلیة):

گورچیلەکان دووانن، هەر کامیان درێژییەکەی دوازدە (١٢ سم)ە و، پانییەکەی دەوری شەش (٦ سم)ە و ئەستوورییەکەی دەوری سێ (٣ سم)ە و، کێشی هەر کام لە گورچیلەکان، بۆ پیاوان: (١٢٥ - ١٧٥ گرام)ە، بە موعەددەلیی: (١٥٠ گرام)، بەڵام گورچیلەی ئافرەت: (١١٥ - ١٥٥ گرام)ە، واتە: بە موعەددەلیی: (١٣٥ گرام)ە.

گورچیلەکان ڕەنگیان سوورە و دەشوبهێنە دەنکە فاسوڵیاوە لە شێوەیاندا، بەڵام بە قەدەر کۆڵە مست دەبن، شتێك بچووکتر لە کۆڵە مست.

### ٢- دوو بۆڕییەکەی میز(حالبان):

دوو بۆڕیی بەرزن، نێوان گورچیلەو میزڵدان پێك دەگەیەنن، درێژییەکەیان: (٢٠ - ٢٥)سم دەبێ، بە تەئکید هی پیاوان درێژترە لە هی ئافرەتان، ئەویش بە حوکمی ئەوەی کە جەستەی پیاوان لە هی ئافرەتان گەورەترە و، هەموو ئەندامەکانی دیکەش هەر وان.

www.alibapir.com



تیرەی بۆڕی میز (حالِب) نیو (٠،٥) سم ە، ئەوانیش دووانن (الحالِبان)، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیان گیرا، ئەوی دیکە هەبێ، وەك چۆن گورچیلەکانیش دووانن، ئەگەر یەکێکیان وەستا، ئەوی دیکەیان هەروەها، کەسانێك هەن یەك گورچیلەیان هەیە، (سبحان الله) ئەو شتانەی کە مرۆڤ زیاتر پێویستیی پێیانە، خوا (سبحانه وتعالى) دوو دووی دروست کردوون: دوو چاو، دوو گوێ، دوو دەست، دوو پێ...هتد، ئنجا نەك بەس ئەوەندە، بەڵکو زانیاریی توێکاریی کە بەرەو پێش چووە، زانایان بۆیان دەرکەوتوە، کە هەندێك ئەندام و بۆڕی دەمار، لە جەستەدا هەن، وەك شتی ئیحتیاط هەڵگیراون بۆ کاتی پێویست، بە تایبەت دەمارەکانی خوێن.

کاری دوو حالیبەکە: ماسوولکەکانی حالیب هەڵدەستن بە کرانەوەو هاتنەوە یەك، گرژبوون و ئاسایی بوونەوە، بەشێوەیەکی دەوریی لە هەر یەك لەسەر چوار(٤/١)ی خولەکێکدا، جارێك دێنەوە یەك، بۆ ئەوەی میز لە گورچیلەکانەوە ڕاکێشن و بیخەنە نێو میزڵدانەوە، لە هەر خولەکێکدا چوار جار حالیب دێتەوە یەك و ئەو میزە ڕادەکێشێ، وەك ترومپایەك.

### ٣- میـــزڵدان (مـثـانة):

میزڵدان توورەکەیەکی ماسوولکەیی بۆشە، شێوەکەی هێلکەیی هەڵکەوتوە و، ئەندازەی (٥٠٠ - ٩٠٠) میللی لیتر لە میز دەگرێ، لە کاتێکدا کە بەتاڵە، تیرەکەی شەش (٦ سم) دەبێ، بەڵام کە پڕ دەبێ تیرەکەی دوازدە (١٢ سم) دەبێ، واتە: قەبارەی چەندە، دەتوانێ ئەوەندەی دیکە خۆی بکشێنێ، بۆ ئەوەی جێی ئەو میزەی تێدا ببێتەوە.

### ٤- میزەڕۆ (الإحليل):

ئەویش بۆڕییەکە میزی لێوە دەردەچێ، بۆ دەرەوەی جەستەی مرۆڤ، لە نێرییناندا: درێژییەکەی بیست (٢٠ سم)ە، هەر لە میزڵدانەوەی تاکو دەرێ و، لە ئافرەتاندا: درێژییەکەی چوار (٤ سم)ە، بە نسبەت هی نێرییەنەوە، ڕژێنی (پرۆستات)یش لە دەوری ئەو میزەڕۆیە هەیە، کە ئەوە تەنیا لە پیاواندا هەیە.

www.alibapir.com



**٥- ڕژێنی کەظەریی:**

لە پشت هەر کام لە گورچیلەکانەوە، ڕژێنێك هەیە پێی دەگوترێ: (الغدة الكظرية)، کە لە شێوەی کڵاوێکە، لای سەری گورچیلە دادەپۆشێ و، تیرەکەی پێنج (٥ سم)ە، ڕژێنی کەظەریی پێنج جۆرە هۆڕمۆن دەردەدا، کە هەموویان زۆر گرنگن لە جەستەدا:

**یەك:** (ئەدرینالین): لە کاتێکدا ئینسان توورە دەبێ و ڕقی هەڵدەستێ، ئەم ڕژێنە دەردەرێ، کە دیارە ئەویش پێویستە، چونکە ئینسان دەبێ لە شوێنی خۆیدا، توندیی و زبریی و تووڕەبوونیشی هەبێ، هەرچەندە مرۆڤ دەبێ بە زۆریی لای ئارامیی و هێمنیی و نەرمیی بگرێ، بەڵام جارجاریش کە پێویست بوو، دەبێ لای توندییش بگرێ، ئنجا ئەو ڕژێنە، ئەو دەورە دەبینێ لە جەستەی مرۆڤدا.

**دوو:** (نوور ئەدرینالین): ئەم ڕژێنە کار لەسەر فشاری خوێن، دەکات.

**سێ:** (کورتیزول): کە کار لەسەر ڕێکخستنی بەکارهێنانی خواردنی هەرسکراو، دەکات.

**چوار:** (هۆڕمۆنی بنەڕەتیی ڕژێنی کەظەریی) ئەمیش کار دەکات لەسەر بەهێزکردنی کۆئەندامی بەرگرییکردنی جەستە و چاککردنی شانەکان و، سنووردانان بۆ نەخۆشییەکانی بەتەمەن داچوون و پیرییەتیی.

**پێنجەم:** هۆڕمۆنێك کە ڕژێنی کەظەریی دەری دەکات، هۆڕمۆنە جینسییەکانن، بۆ پیاوان و ئافرەتان.

## بەندی دووەم: کارەکانی کۆئەندامی میز:

کۆئەندامی میز هەشت (٨) کاری گرنگ و پێویست بۆ جەستە ئەنجام دەدات:

١) وەدەرنانی بەشێك لە پاشەڕۆکەکان، کە خانەکانی جەستە بەرهەمی دێنن، لە ئەنجامی کارلێکە کیمیاییەکاندا، (پرۆسەی هەرسی نێو خانەکان)، کە خوێن دەیان هێنێتەوە بۆ نێو گورچیلەکان و لەڕێی گورچیلەکانەوە، ئەوەی کە بە کەڵك نایەت، فڕێ دەدرێتە دەرێ، لە ڕێی میزەوە.

٢) پاڵاوتنی خوێن لە هەر تەنۆلکەیەکی نامۆ، کە لەڕێی کۆئەندامی هەرسەوە، دەچێتە نێو جەستە.

٣) پارێزگاریی کردن، لە قەبارەی نەگۆڕی خوێن و ئەو شلەمەنییانەی کە لە جەستە زیادن، لە ڕێی کۆئەندامی میزەوە، فڕێ دەدرێنە دەرێ، بۆ ئەوەی قەبارەو ئەندازەی ڕێژەی خوێن چەسپاو بێ و، زیاد نەکات لە خۆڕا لەسەرییەوە بڕژێ و، لە کونەکانی جەستەوە بێتە دەرێ، کە جار جار ئەوە ڕوو دەدا، وەك حاڵەتێکی نائاسایی.

٤) پارێزگاریی لێ کردنی هاوسەنگیی نێوان خوێیەکانی نێوخوێن، ئەوەی کە زیادە دەری دەکات و ئەوەش کە پێویستیی پێ بێت، داوای دەکات.

٥) کۆنترۆڵکردنی هیدرۆجینی بنەڕەتیی (الأُسُّ الهیدروجینی)، کە ڕەمزەکەی (PH)ە، بە شێوەیەك کە لە ئەندازەی خۆی کە بریتیە لە (٧٠٤)، لەوەدا ڕایبگرێ.

٦) ڕاگرتنی فشاری خوێن، لە ئەندازەیەکی دیاریی کراودا و کۆنترۆڵ کردنی، کە لە کاتێکدا فشاری خوێن دادەبەزێ، گورچیلەکان هۆڕمۆنی (ڕینین) دەردەدەن و، ئەویش هانی کۆمەڵێك کارلێکی کیمیایی دەدات، کە کار دەکەن لەسەر هاتنەوەیەکی دەمارە خوێن بەرەکانی هەر چوار پەل و، سەرەنجام زیادکردنی

www.alibapir.com





ناردنی خوێن لە دڵەوە، کە ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی جارێکی دیکە فشاری خوێن بەرز بێتەوە، بەڵام ئەگەر فشاری خوێن بەرز بێ، ئەوە کۆئەندامی میز، گورچیلەکان، هۆڕمۆنی (برۆستاجلاندین) دەردەکات، کە دەبێتە هۆی فراوانبوونی دەمارەکانی خوێن و، کەمکردنەوەی ناردنی خوێن لە دڵەوە بۆ جەستە، بۆ ئەوەی فشارەکە دابەزێ.

٧) ڕێکخستنی بەرهەمهێنانی خڕۆکە سوورەکان، چونکە گورچیلە هۆڕمۆنی (ئەریترۆبیوتین) دەردەدا، کە دەبێتە هۆی چالاککردنی خانەکانی مۆخی ئێسقان، کە لەوێدا خڕۆکە سوورەکان دروست دەبن.

٨) چالاککردنی ڤیتامین دی (D)، کە ئەویش بەرپرسیارە لە ڕێکخستنی مژینی (کالیسیۆم) لە ڕیخۆڵەکان و چەسپاندنی لە نێو ئێسقانەکاندا.

## بەندی سێیەم: پێکهاتەکانی خوێن و میز:

### یەکەم: پێکهاتەکانی خوێن:

پێشتریش باسمان کرد و، دووبارەی دەکەینەوە، کە خوێن لە (٥٥٪)ی لە پلازما پێك دێ و (٤٥٪)یشی بریتیە لە خانەکانی خوێن، کە ئەوانیش سێ جۆرن:

١- خڕۆکە سوورەکان.

٢- خڕۆکە سپییەکان.

٣- خەپلەکانی خوێن.

خڕۆکە سوورەکان خۆراك دەبەن بۆ خانەکان و، خڕۆکە سپییەکان بەرگریی دەکەن لە جەستە و، خەپلەکانی خوێن هاوکاریی خوێن دەکەن، کە لە کاتێکدا پێویستی بوو لە شوێنێکەوە خوێن نەڕوا، ڕایبگرن.





**دووەم: پێکهاتەکانی میز:**

میز ڕەنگێکی زەردباوی هەیە:

١- (٩٥٪)ی میز بریتیە لە ئاو.

٢- (یۆریا) کە لە هەر لیترێکدا (١٧گرام) لە میزدا هەیە.

٣- (سۆدیۆم) لە هەر لیترێکدا (٢،٧ گرام) هەیە.

٤- (کلۆر) لە هەر لیترێکدا (٤،٤ گرام) هەیە.

٥- (پۆتاسیۆم) لە هەر لیترێکدا (٢ گرام) هەیە.

٦- (کریاتینین)، لە هەر لیترێکدا (١،٨ گرام) هەیە.

٧- (کالیسیۆم) کە (٢ گرام) لە هەر لیترێکدا هەیە.

٨- (ترشی یۆریك)، کە لە هەر لیترێکدا (٤،٠گرام) هەیە.

لە ڕێی میزەوە جەستەی مرۆڤ، لە هەموو ئەو ماددەو ژەهرە زیانبەخشانە دەرباز دەبێ، بەبێ ئەوەی کە مرۆڤ بۆ خۆی ئاگای لێ بێ! خوای خاوەن ئەو پەڕی بەزەیی و، ئەو پەڕی لوتف و کەرەم و، ئەو پەڕی زانیاریی و حیکمەت، هەموو ئەو تەگبیرانەی بۆ مرۆڤ کردوون لە نێو جەستەی دا، ئنجا ئایا کەسێك: خوا نەناسێ، یان بیناسێ، بەڵام نەیپەرستێ زۆر سپڵە و ناسپاس و پێ نەزان نیە، بەرانبەر بە بەدیهێنەر و خاوەن و مشوورخۆری خۆی؟!

## خاڵی حەوتەم: کۆئەندامی ئێسك (الجهاز العظمي):

بەڕێـــــــزان!

خوا پشتیوان بێ لە چوار بەند دا باسی کۆئەندامی ئێسك دەکەین:

بەندی یەکەم: کۆئەندامی ئێسك لە پازدە (١٥) وردە خاڵ دا.

بەندی دووەم: پێکهاتەی ئێسك.

بەندی سێیەم: ژمارە و جۆرەکانی ئێسکەکان.

بەندی چوارەم: جومگەکانی جەستە.

### بەندی یەکەم: کۆئەندامی ئێسك لە پازدە (١٥) وردە خاڵ دا:

١)- پەیکەری ئێسکیی شێوەو قیافە بە مرۆڤ دەدا و، بەهۆی پەیکەری ئێسکەوە مرۆڤ ڕادەوەستێ، واتە: شێوەو دیمەنی مرۆڤ لەسەر پەیکەری ئێسك بەندە.

٢)- ئەندامەکانی جەستە بەهۆی پەیکەری ئێسکەوە، هەم ڕادەگیرێن لە شوێنی خۆیان، هەم دەپارێزرێن، بۆ وێنە: کەللەی سەر، بڕبڕاگەی پشت، قەفەزی سینە، هەم لە شوێنی خۆیان بەهۆی پەیکەری ئێسکەوە ڕاوەستاون، کە ئەوانە خۆشیان بەشێکن لە پەیکەری ئێسك، هەم ئەندامەکانیش لەنێو خۆیاندا دەپارێزن:

**یەك:** کەللەی سەر، جومجومە، مێشك دەپارێزێ.

**دوو:** بڕبڕاگەی پشت، دڕکە پەتك دەپارێزێ.

**سێ:** قەفەزی سینگ، سییەکان و دڵ و جەرگ و پەنکریاس دەپارێزێ.





وێنەی (٢١) کۆئەندامی ئێســـك

٣)- بە هۆی ئەو ماسوولکانەوە کە پێیانەوە پەیوەستن، (ئێسقانەکان پێیانەوە پەیوەستن)، مرۆڤ کارو جموجۆڵەکانی خۆی دەکات.

٤)- خڕۆکە سوورو سپیی و خەپلەکان و دژە میکرۆبەکان، هەموویان لەنێو پەیکەری ئێسك دا بەرهەم دێن، بە تایبەتی ئێسکە درێژەکان.

٥)- توخمە گرنگەکانی وەك: کالیسیۆم و فۆسفۆر، لە نێو ئێسکدا دروست دەبن و، ئێسك بەرهەمیان دێنێ.

٦)- ماددە چەورییەکان، لە نێو ئێسکە درێژەکاندا هەڵدەگیرێن و، لە کاتی پێویستدا دەدرێنەوە بە جەستە.

٧)- ئێسکەکان بە هۆی جومگەو ژێ یەکانەوە، پێکەوە دەبەسترێنەوە.

٨)- پارچە ئێسکەکان هەر کامێکیان، واتە: هەر کامێك لە پارچە ئێسکەکان کە پەیکەری ئێسکیان لێ پێکهاتوە، ئەو ئەرکەی کە بۆی دیاریی کراوە، باشترین

www.alibapir.com





شێوەی پێ دراوە، بۆ وێنە: کەللە سەر، باشترین شێوەی هەیە بۆ پارێزگاریی لێکردن و هەڵگرتنی مێشك، هەروەها بڕبڕەکانی پشت و، هەموو ئێسکەکانی دیکەش.

٩)- ئەو ئێسکانەی کە جووتن لە جەستەدا، هەموویان بەقەدەر یەکن، لەگەڵ ئەوەشدا هەر کامێکیان بەجیا دروست کراوە، (سبحان الله) دەستێك لە دەستێك درێژتر نیە، ڕانێك لە ڕانێك و، لوولاکێك لە لوولاکێك و، پێ یەك لە پێ یەك درێژتر نیە، هەروەها ئێسکەکانی دیکەش.

١٠)- ئێسکەکان هەرچەندە هەرکامیان بە جیا دروست بووە، بەڵام لە (١٠٠٪) پێکەوە گونجاون، هەموویان پێکەوە گونجاون، هاوکاری یەکدین، چونکە با ئینسان بیربکاتەوە: ئەگەر گریمان کەللەی سەر، لە شوێنی قوڵ بووایە، یان لە شوێنی دەست بووایە، یان ئەژنۆ.. ! بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) هەر کامیان لە شوێنی خۆی و بە قەبارەی خۆی، دروستی کردوون، پاشان گونجاوو هاوکاریشن لەگەڵ ئەندامەکانی دیکەدا.

١١)- هەر چەندە پەیکەری ئێسکیی لە ماوەی بیست ساڵدا هەر گەشە دەکات، بەڵام ئێسکەکان هەموویان هاوسەنگ و ڕێك و پێکن، ئەوە نیە کە هەندێکیان لە هەندێکییان گەورەتر بن، ئنجا هەم شوێن و هەم قەبارەکانیشیان پێکەوە گونجاون.

١٢)- ئێسکەکان پێکهاتەی نێوەوەیان لە هی دەرەوەیان سەرسوڕهێنەرترە، لە دەرەوە هەر ئێسقانن، بەڵام لە نێوەوە ئێسقانەکان هەموویان کارگەن، مەڵبەندی دابینکردنی زۆر لە پێداویستییەکانی جەستەن.

١٣)- پەیکەری ئێسك خۆراك دەخاتە نێو ئەو ئێسکە ڕەق و پتەوانەوە! ئەو خۆراکە چۆن دەگاتە نێو ئەو ئێسکە ڕەق و پتەوە؟ دیارە لەڕێی پەیکەری ئێسکەوە، کە هەڵبەتە ئەویش پەیوەستە بە کۆئەندامی خوێنەوە.

١٤)- ئێسکەکان (عظام) یەکجار پتەو و بەهێزن و هەر وشەی (عظم)، لە زمانی عەرەبیی دا، مانای هێز و پتەویی (القوة والشدة) دەگەیەنێ[1]، هەر بۆیەش

---

(١) بڕوانە: معجم مقاييس اللغة، لابن فارس، ج٤، ص٣٥٥، لفظ: (ع، ظ، م).

www.alibapir.com


بەو پەیکەرە ئێسکییەوە کە خوای کارزان و میهرەبان لە باشترین شێوەدا بۆی دروستکردوە:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾ التین.

هەزاران جۆرە کاری قورس و سووك و سەرسوورِهێنەری پێ ئەنجام دەدات و تەحەممولی چەندان جۆرە بەلاّ و گرفتاریی و فشاری جۆرا و جۆر دەکات.

**١٥)-** هەر کام لە ئێسکەکان لە یەك خانەوە دروست دەبن، کە بە هۆی پرۆسەی خۆدابەش کردن (إنقسام)ەوە، خانەیەك چەندان جار خۆی دابەش دەکا و سەرەنجام ئەو ئەندامە پێکدێ، ئەگەر ئینسان تەنیا بیر لەوە بکاتەوە، سەری سوورِدەمێنێ، کە چۆن ئەو خانانە، وەك ئەو پەڕی عەقڵ و شعووریان هەبێ، کە پێکەوە کۆببنەوەو ئەو ئەندامە پێك بێنن، پاشان هەموو ئەندامەکان ئەو جەستەیە پێك بێنن! بۆیەش خوا (سبحانه وتعالی) کە دەفەرموێ:

﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾﴾ الذاریات.

واتە: لە زەوی دا چەندان نیشانە هەن (لەسەر خواناسیی) بۆ ئەوانەی کە خاوەن زانیاریی جێی دڵنیایین، هەروەها لە خۆشتاندا، بۆچی سەرنج نادەن؟! یانی: لە جەستەی خۆشتاندا چەندان بەڵگە هەن، لەسەر خواناسیی و پێویستیی خوا پەرستیی.

## بەندی دووەم: پێکهاتەی ئێسك:

ئێسك (العظم) لە دوو چین (طبقة) پێك دێ:

**یەك:** پێی دەگوترێ: ئێسکی ڕوو پۆش (عظام القشرة)، کە ماددەیەکی زۆر پەستێنراو و چڕە و، لە (٨٠٪)ی ئێسك، ئەم چینە پێکیی دێنێ.

**دوو:** پێی دەگوترێ: مۆخ (نُخَاع)، ئەویش شانەیەکی ئێسکییە، شێوەی ئیسفنجی هەیە، چڕییەکەی کەمە و، لە (٢٠٪)ی ئێسك پێك دێنێ.

## بەندی سێیەم: ژمارە و جۆرەکانی ئێسکەکان:

پەیکەری ئێسك بە گشتیی لە دوو سەدو شازدە (٢١٦) پارچە ئێسك پێکهاتوە و، بەسەر ژمێریکییش دوو سەد و شەش(٢٠٦)ن[1]، هۆی جیاوازییەکەشیان ئێسکە ژێیەکان (الأعصاب الوترية)ی پەنجە گەورەکانی هەردووك دەست و پێیەکانن، کە ژمارەیان دە (١٠) دانەیە: دوو پەنجە گەورەکانی هەردووك دەست، چوار دانە یەکی دوو دوو، دوو پەنجە گەورەکانی پێیەکانیش، یەکی سێ سێ: (٢×٢ + ٣×٣ = ١٠).

بەڵام ئێمە ئەو ڕایەمان پێ ڕاستترە کە دەڵێ: ژمارەیان (٢١٦)یە.

شایانی باسیشە زانایانی پسپۆڕی بواری توێکاریی (تشريح) بە گشتیی ئەو دوو سەد و شازدە (٢١٦) پارچە ئێسکە، بۆ دوو بەشی سەرەکیی دابەش دەکەن:

بەشی یەکەم: پەیکەری سەنتەریی (الهيكل المحوري).

بەشی دووەم: پەیکەری چوارپەلەکان (هيكل الأطراف الأربعة).

ئنجا کۆی ئەو (٢١٦) پارچە ئێسکەش، دابەش دەبن بۆ بیست و یەك (٢١) جۆر، بەم شێوەیەی خوارێ:

١-٥ سی و سێ(٣٣) بڕگە (٣٣) (فقرة) لە بڕبڕاگەی پشت دا، بەم شێوەیە:

أ- حەوت (٧) بڕگەی مل (عنقية).

ب- دوازدە (١٢) بڕگەی پشت (ظهرية).

---

(١) بۆ وێنە: (إعجاز القرآن في ما تُخفيه الأرحام)ی (كريم نجيب الأغر)، ص٣٣٣، دەڵێ: ژمارەیان دووسەد و شەش (٢٠٦)ە، بەڵام (الإنسان من الميلاد إلى البعث)ی (د. زغلول النجار)، دەڵێ: (٢١٦)ن.

www.alibapir.com


ج- پێنج (٥) بڕگەی کەلەکە (قطنية).

د- پێنج (٥) بڕگەی سێبەندە (عجزية).

ه- چوار (٤) بڕگەی کلێنجە (عُصْعُصيَّة).

٦- بیست و هەشت (٢٨) پارچە ئێسکی لێکدراوی کەللەی سەر (جمجمة).

٧- بیست و چوار (٢٤) پەراسووی قەفەزی سینگ لکاو بە بڕبڕەی پشتەوە.

٨- سێ (٣) پارچە ئێسکی دەفەی سینگ (عظمات القص).

٩- دوو (٢) پارچە ئێسکی تەختەی شانەکان (لوحي الكتفين).

١٠- دوو (٢) پارچە ئێسکی چۆڵەمە (الترقوة).

١١- دوو (٢) پارچە ئێسکی هەردووك قۆڵ (العَضدَين).

١٢- چوار (٤) هەردووك ئێسکە درێژەکانی باسك (الزند والكعبرة)ی هەردووك دەست.

١٣- شازدە (١٦) پارچە ئێسکی مەچەکی هەردووك دەست (رَسغي اليدين).

١٤- دە (١٠) پارچە ئێسکی هەردووك شانەکان (الكتفين).

١٥- (٢٨) ئێسکی بەشەکانی پەنجەکانی هەردووك دەستەکان (سُلاميات اليدين).

١٦- شەش (٦) ئێسکەکانی کلۆت (عظام الحوض).

١٧- دوو (٢) ئێسکی هەردووك ڕانەکان (الفخذين).

١٨- چوار (٤) هەردووك جووتە ئێسکی لوولاکەکان (قصبتان وشظييتان بالساقين).

١٩- چواردە (١٤) وردە ئێسك لە هەردووك پێیەکاندا.

٢٠- بیست و هەشت (٢٨) وردە ئێسکەکانی پەنجەکانی پێیەکان (سلاميات أَصابع القدمين).

٢١- دە (١٠) ئێسکە ژێیەکان (عظمات وترية) یەکی دوو دانە، بۆ هەر کام لە پەنجە گەورەکانی دەست و، یەکی سێ دانەش بۆ هەر کام لە پەنجە گەورەکانی پێ.

کۆی گشتی = دووسەدو شازدە ٢١٦.

www.alibapir.com





**پازدە (١٥) وردە زانیاریی لە بارەی هەندێك لە پارچە ئێسکەکانەوە:**

١- پارچەکانی کەللەی سەر(الجمجمة) کە بیست و هەشت (٢٨) دانەن، پێنج جۆرن، بەم شێوەیە:

أ- هەشت(٨)یان کڵاوەی سەر(قَحْف) پێك دێنن.

ب- چواردە(١٤)یان ئێسکەکانی دەم و چاو پێك دێنن.

ج- شەش(٦)پارچە شیان کۆئەندامی گوێ و بیستن پێك دێنن.

٨+١٤+٦ = ٢٨.

٢- پارچە ئێسکەکانی بڕبڕەی پشت (عظام العمود الفقري)، بیست و هەشت(٢٨) دانەن و پێنج جۆرن:

أ- حەوت (٧)یان بڕبڕەکانی گەردنن.

ب- پێنج (٥)یان بڕبڕەکانی کەلەکە (القطنیة)ن.

ج- پێنج (٥) یان بڕبڕەکانی سێ بەندە (العَجُزیة)ن.

د- چوار (٤)یان بڕبڕەکانی کلێنجە (العُصعُصیة)ن.

٣- درێژیی بڕبڕاگەی پشت لە پیاواندا بە موعەددەلیی (٧٥ سم)ە و، لە ئافرەتاندا: (٦٥ سم)ە.

٤- ئێسکەکانی قەفەزی سینگ، بیست و پێنج (٢٥) پارچەن:

یەکیان دەفەی سینگ (عظمة القص) کە بریتیە لەو پارچە ئێسکەی بە پانیی بە سینگ ڕاهێڵراوە، درێژییەکەی حەقدە (١٧ سم)ە.

بیست و چوار(٢٤)یشیان پەراسووەکان (أضلاع)ن، هەرلایەی دوازدە(١٢) دانە و، هەرکام لە پەراسووەکانیش درێژییان (١٢ - ٢٤سم)ە، بەپێی جیاوازیی قەبارەی سینەی مرۆڤەکان و، پانییەکەشیان دوو(٢سم)ە.

٥- ئێسکی چۆڵەمە (ترقوة)، درێژییەکەی پازدە (١٥سم)ە.

www.alibapir.com


٦- ئێسکی شان (لوح) درێژییەکەی لە نێوان: (١١ - ١٦سم)ە.

٧- ئێسکی قۆڵ (عظمة العَضد) درێژییەکەی: (٣٦سم) و تیرەکەی (٢،٥سم)ە.

٨- دوو ئێسکەکەی باسك، کە بە عەرەبیی (زَنْدَ) و (عَكْبَرة)یان پێدەگوترێ، - نەمزانیوە بە کوردیی ناوێکی تایبەتیان هەبێ - یەکیان (زَنْد)، (٢٨ سم)ە و، ئەوی دیکەیان (عکبرة)، (٢٦ سم)ە و، دوو سانتیم لەوی دیکە کورتترە.

٩- مەچەك (رَسْغ) لە هەشت(٨) پارچە ئێسك پێکهاتوە.

١٠- شانەی دەست (مشط الید) لە پێنج (٥) پارچە ئێسك پێکهاتوە.

١١- بڕگەکانی پێنج پەنجەکانی هەردووك دەست (سُلامیات الأصابع الخمسة للیدین) بیست و هەشت (٢٨) بڕگە (سُلامي)ن، هەر دەستەی چواردە (١٤).

١٢- ئێسکی ڕان (عظم الفخذ)، درێژییەکەی (٥٠ سم) و تیرەکەی (٣ سم).

١٣- دوو ئێسکەکەی لوولاك (ساق) کە بە عەرەبیی (قَصَبة) و (شظیة) یان پێدەگوترێ - نەمزانیوە لە کوردیی دا ناوێکی تایبەتیان هەبێ- (قَصَبة) (٤٣ سم) و (شظیة)ش (٤٠ سم) درێژن.

١٤- پاژنەی هەر پێیەك کە بە عەرەبیی (عرقوب)ی پێدەڵێن و لە جێی (رَسْغ)ی دەستە، لە حەوت (٧) پارچە ئێسك پێکهاتوە، بە هەردووك پێیەکان چواردە(١٤)ن.

١٥- شانەی پێ (مشط القدم) وەك هی دەست، لە پێنج (٥) ئێسك پێکهاتوە.

www.alibapir.com



## بەندی چوارەم: جومگەکان (مفاصِل)ی جەستە:

کۆی ئەو، دووسەدو شازدە (٢١٦)، ئێسکەی جەستەی مرۆڤ، بە هۆی سێسەد و شەست(٣٦٠) جومگەوە، پێکەوە بەستراون و قایم و مەحکم کراون، کە ئەوەش ئیعجازێکی سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەردەخات کە فەرموویەتی: {إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِى آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلاَثِمَائَةِ مَفْصِلٍ...} (رواه مسلم برقم: (٢٣٢٧)، واتە: بێگومان هەموو مرۆڤێك لە وەچەی ئادەم لە سێسەد و شەست جومگە دروستكراوە..

ئەو (٣٦٠) جومگەیەش بەم شێوەیەن:

١- (١٤٧) دانەیان لە بڕبڕاگەی پشت دان.

٢- (٢٤) دانەیان لە سینگ دان.

٣- (٨٦) دانەیان لە هەردووك پەلی سەروو (دوو دەستەكان)دان.

٤- (٨٨) دانەیان لە دوو پەلی خوارەوە (دوو لاقەكان) دان.

٥- (١٥) دانەشیان لە ناوچەی حەوز (حوض)دان.

کەواتە: ١٤٧+٢٤+٨٦+٨٨+١٥=٣٦٠ جومگە.

شایانی باسیشە کە جومگەکان لە کڕکڕاگە (کرۆژ کرۆژە - غضروف) دروست بوون، کە ماددەیەکە لە نێوان ئێسك و گۆشت (العظم واللحّم)دا و، جومگەکان ماددەیەکی مەیلە وشك و لینجی جەلاتینی (المَصْلي أو الزلالي)یان بە دەورەوەیە، بە ئەستووریی پەنجا (٥٠ مایكرۆن) (١ مایكرۆن ١٠٠/١٠٠٠ملم) کە دەوری گریز لە نێو بۆڵبەرین و بورغیی دا، دەبینێ، بۆ چەورکردنی جومگەکان.

www.alibapir.com





ئنجا جومگەكان بە گشتی سێ جۆرن، لە ڕووی جوولآن و نەجوولآنەوە:

**جۆری یەكەم:** چەسپاون و ناجوولێن، كە جومگەكانی نێوان ئێسكەكانی كەللەی سەرن.

**جۆری دووەم:** جووڵەیان كەمە، كە جومگەكانی نێوان بڕبڕەكانی پشتن.

**جۆری سێیەم:** جووڵەیان ئازادە، كە جومگەكانی سەرجەم ئەندامەكانی دیكەی جەستەن، بۆ وێنە:

١- مل (گەردن).

٢- شان.

٣- ئانیشك.

٤- مەچەك.

٥- ڕان.

٦- ئەژنۆ.

٧- گۆیزینگ.

٨- پەنجەكانی دەست و پێ.

ئنجا با بیهێنینە بەرچاومان: ئەگەر هەركام لە جومگەكانی ئەو هەشت ئەندامە، نەجوولآبان ژیانمان چۆن دەبوو؟!

كەواتە:

ئایا ڕاست نیە كە خوای میهرەبان بە چاكترین شێوە، مشووری لێخواردووین و سەرپەرشتیی كردووین؟!

www.alibapir.com





## خاڵی هەشتەم: کۆئەندامی ماسوولکەیی (الجهاز العضلي)

خوێنەرانی بەڕێز و سەنگین!

خوا عزوجل ڕێنماییکار و هاوکارمان بێ، هەوڵدەدەین لە نۆ (٩) بەندی گوشراودا، باسی (کۆئەندامی ماسوولکە) بکەین:

بەندی یەکەم: پێناسە و ئەرکی کۆئەندامی ماسوولکە.

بەندی دووەم: ژمارەی ماسوولکەکانی جەستە.

بەندی سێیەم: ڕیزبەندیی ماسوولکەکان لە ڕووی گرنگییەوە.

بەندی چوارەم: حەوت ڕووی سەرسامکاری ماسوولکەکان.

بەندی پێنجەم: جۆرەکانی ماسوولکەکان.

بەندی شەشەم: قەبارەی ماسوولکەکان.

بەندی حەوتەم: چۆنیەتی کارکردنی ماسوولکەکان.

بەندی هەشتەم: چۆن ویست (إرادة)ی مرۆڤ، تەرجەمە دەبێتەوە بۆ جووڵە.

بەندی نۆیەم: دابەشبوونی ماسوولکەکان بەسەر جەستەدا.

### بەندی یەکەم: پێناسە و ئەرکی کۆئەندامی ماسوولکە:

دەتوانین بڵێین کۆئەندامی ماسوولکەیی، دوو ئەرکی سەرەکیی هەن:

أ/ یارمەتی دانی جەستە، کە جووڵە جۆراو جۆرەکانی ئەنجام بدات، چ جووڵە ویستییەکان (الحركات الإرادية)، کە ئینسان بە ویستی خۆی ئەنجامیان دەدات، وەك: جووڵاندنی سەرو دەست و لاق و پشت و، چەمانەوەو، خۆهەڵدان و، ...هتد، چ جووڵە ناویستییەکان (الحركات اللا إرادية) وەك ئەو جووڵانەی کە



وێنەی (٢٢) کۆئەندامی ماسولکەیی

لە جەستەدا ڕوو دەدەن، بەبێ ویستی مرۆڤ، بۆ وێنە: لێدانی دڵ، کارکردنی سییەکان، هەروەها کارکردنی گەدەو گورچیلەکان و، هەموو کۆئەندامەکانی نێو جەستەی مرۆڤ، کە بەبێ ویستی ئێمە کار دەکەن، کە ئەوانیش هەر بە هۆی ماسوولکەکانەوە کار دەکەن، بەڵام بە ئاڕاستە کردن و فەرمانی مێشك.

**ب/** داپۆشینی پەیکەری ئێسکیی و ئەندامەکانی کە دەیانگرێتە نێو خۆی و، پاشان پاراستنیان لە مەترسییەکانی میکرۆب و ئەو دوژمنانەی کە ڕوو لە جەستە دەکەن، هەروەها لە مەترسییەکانی سەرماو گەرماو، بەرکەوتنی شتەکانی دی.

## بەندی دووەم: ژمارەی ماسوولکەکان:

لە نێوان پسپۆڕان و شارەزایانی توێکارییدا لە بارەی ژمارەی ماسوولکەکانەوە ڕاجیایی هەیە، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: شەشسەد و چل (٦٤٠) ماسوولکەی قەبارە جۆراو جۆر هەن[1]، لە هەموو جەستەدا، بەڵام ئەوانیش لە دەیان ملیۆن

---

(١) هەندێکیش ژمارەیان بە: هەشتسەد و پەنجا (٨٥٠) مەزندە دەکەن.

ڕیشاڵی دیکەی ورد پێکهاتوون و، هەمووشیان باشترین هاوکارییان پێکەوە هەیە، پێکەوە هاوکارن و وەك یەك تیم كار دەكەن، نەك هەندێك لە ماسوولكەكان بە بارێكدا بجووڵێن و، ئەوانی دی بە بارێكی دیكەدا و سەرەنجام تێك بگیرێن! هەرگیز شتی وا ڕوو نادا.

## بەندی سێیەم: ڕیزبەندیی ماسوولكەكان لە ڕووی گرنگییەوە:

١)- لە هەموو ماسوولكەكانی جەستە گرنگتر: (دڵ)ە، كە بۆ خۆی تۆپەڵە گۆشتێكی ماسوولكەیی یە، وەك پێشتر باسمان كرد و، لە ڕاستیی دا (دڵ) كانگای ژیانە لە جەستەدا، ماسوولكەكانی دڵیش خۆكارانە ئیش دەكەن، یانی: ئۆتۆماتیكیی، ئینسان بیەوێ یان نەیەوێ.

٢)- ماسوولكەكانی كە سییەكان دەجووڵێنن، هەروەها ماسوولكەكانی نێو پەنچك و قەفەزی سینگ، كە یارمەتی سییەكان دەدەن بجووڵێن: بكرێنەوە و وێك بێنەوە و، حاڵەتی هەناسە هەڵكێشان و هەناسە دەردان ڕووبدات.

٣)- ماسوولكە جووڵێنەكانی سەرجەم كۆئەندامەكان، بە تایبەت كۆئەندامی هەرس: گەدەو ڕیخۆڵە باریكەو ڕیخۆڵە ئەستوورە و....هتد.

٤)- ماسوولكە جووڵێنەرەكانی پەلەكانی مرۆڤ: هەردوو دەستی و هەردوو لاقی، ئنجا پەنجەكانی دەست و پێیەكان.

## بەندی چوارەم: حەوت ڕووی سەرسامكاری ماسوولكەكان:

١)- خانەی ماسوولكەیی وا دروست كراوە، كە لە كاتی فەرمان بۆ هاتن و وروژێنرانیدا، بە لێدانێكی دەماریی (نبضة عصبية)، ئەو ماسوولكەیە كە فەرمانی بۆ هات لە مێشكەوە، گرژ دەبێ و بەپێی جۆری فەرمانەكە دەجووڵێ.

www.alibapir.com


٢)- دروستبوونی ماسوولکەکان لە ڕیشاڵ و لە گوژمەکان (الألياف والحُزَم)، کە هێزێکی زۆر بە یەك ئاڕاستە بەرهەم دێنیٚ لە کاتی گرژبوونیاندا، بە هۆی ئەوەوە کە ماسوولکەکان لە ڕیشاڵەکان و، ڕیشاڵەکانیش لە تۆپەڵەو گوژمە ڕیشاڵێك پێکهاتوون.

٣)- قەبارەو چۆنیەتی جۆراو جۆریی و گونجایی ماسوولکەکە، کە هەر کامێکیان لەگەڵ کارو جووڵەیەك کە بۆی دیاریی کراوە، پڕ بە پێستە و، هەر کام لە ماسوولکەکان لە شوێنی خۆیاندا دانراون و، خوا وای دروستکردوون، ئەو ئەرکە کە پێیان سپێردراوە، بە باشترین شێوە جێبەجێی بکەن.

٤)- شێوازی چەسپاندنی ماسوولکەکان بە پەیکەری ئێسکییەوە و، جووڵاندنیان بۆ ئەندامەکانی جەستە بە ئاسانیی، بۆ وێنە: کە دەست بەرز دەکەینەوە، لە مێشکەوە فەرمان دێ بۆ شان، ئنجا دەتوانین دەست بەرز بکەینەوە، هەروەها کە پەنجە دەجووڵێنین، ئەوە فەرمانێکی تایبەت بۆ پەنجەکان دێ و، ئەو ماسوولکانەی پەنجە دەجووڵێن، هەروەها هەموو ئەندامەکانی دیکەی جەستە، واتە: چەسپێنراویی ماسوولکەکان بە پەیکەری ئێسکییەوە، هەر کامێکیان لە شوێنی خۆی، ئەوە وای کردوە کە بتوانن ئەو ئەندامە بجوڵێنن.

٥)- کۆنتڕۆڵکردنی جووڵەی ماسوولکەکان، لە ڕێی لێدانە دەمارییەکانەوە و، لە میانی ملیۆنان دەماری پەیوەست بە مێشکەوە، دیارە جووڵە لە ماسوولکەکاندا کە ڕوو دەدات، لەگەڵ خۆشیاندا، ئەو ئەندامەی کە لە سەرینی، لە پەیکەری ئێسکیی، دەیجووڵێنن، ئەوەش هەمووی لە ڕێی فەرمانی مێشکەوە دەبیٚ، کە بە ملیۆنان ڕیشاڵی دەماریی و ڕیشاڵی مێشکیی دا، ئەو فەرمانە دیٚ.

٦)- درێژکردنەوەی ملیۆنان ڕیشاڵی دەماریی (اللّيف العصبي) لە مێشکەوە بۆ ماسوولکەکان، کە هەر ڕیشاڵێکی عەصەبیی، پەیوەست دەبێتەوە بە ڕیشاڵە ماسوولکەییەکانەوە و، هەر ڕیشاڵێکی مێشکیی پەیوەست دەبێتەوە، بە چەندان ڕیشاڵی ماسوولکەییەوە، ئەو فەرمانە لە نێوان مێشك و ماسوولکەکاندا دیٚ و دەچیٚ.

٧)- هەڵگرتنی ئەو هەموو بەرنامە جۆراو جۆرانەی جووڵاندنی ماسوولکەکان بە ویستیی و ناویستییەوە، لە مێشك دا، کە بێگومان پێشتر بەرمەجە کراون لە مێشکدا، وەك دواییش زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، پێشێ بەرنامەی بۆ دانراوە و وەك زانیاریی هەڵگیراوە لە مێشکدا، بۆیەش بۆ وێنە: کە دەست دەکەمە شتێکی گەرم، پەنجەم یەکسەر و زۆر جاران بێ ئەوەی بمەوێ، بە ناویستیی (لا إرادي) لەو جێیە لا دەچێ، چونکە یەکسەر کە پەنجە لەسەر ئەو شتە گەرمە دادەنێم، ئەو ڕیشاڵە هەستیبیانە، ئەو هەست وەرگرانە، زانیارییەکە دەگەیەننە مێشك و، ئەویش یەکسەر بە ماوەیەکی زۆر کەمتر لە چرکە، فەرمان دەنێرێ بۆ ماسوولکەکان، کە ئەو پەنجەیە، یان ئەو ئەندامە، دوور بخرێتەوە لەو شوێنە، چونکە گەرمەو زیانی پێ دەگەیەنێ.

## بەندی پێنجەم: جۆرەکانی ماسوولکەکان:

وەك پێشتر گوتمان: بە گشتیی ماسوولکەکان، دوو بەشن: ویستیی (إرادی) و ناویستیی (لا إرادی)، ئەوانەی کە بە ویستی مرۆڤ دەجووڵێن و، ئەوانەش کە بەبێ ویستی مرۆڤ دەجووڵێن، ئنجا وەك چۆن ئێسکەکان جۆراو جۆرن، ماسوولکەکانیش جۆراو جۆرن و ماسوولکەکان دابەش دەبن، بۆ چوار جۆری سەرەکیی، واتە: لە ڕووی شێوەی پێکهاتەیاندا:

١)- ماسوولکە تەشیلیەییەکان (العضلات المغزلية): واتە: ئەو ماسوولکانەی، لە شێوەی تەشییدا دروست بوون، ئەو سەری باریك و، نێو قەدی ئەستوورو، ئەو سەری باریك دەبێتەوە، وەك ماسوولکەکانی قۆڵ و باسك و ڕان و لاق، ئەوانە بەو شێوەیە هەڵکەوتوون، نێو قەدیان ئەستوورەو ئەوسەرو ئەوسەریان باریکە.

٢)- ماسوولکە باوەشێنییەکان (العضلات المِرْوَحية): ئەوانەش لە شێوەی باوەشێندان، ئەو باوەشێنەی کە ئینسان باوەشێنی خۆی پێ دەکات، ئەوانیش وەك ماسوولکەکانی سینگ و سك و پشت، بەو شێوەیە خوا عزوجل دروستیکردوون،

لەبەر ئەوەی ئەو جووڵانەی سینگ و سك و پشت، پێویستییان بەو جۆرە ماسوولکانەیە، هەروەك ئەوانەی قۆڵ و باسك و ڕان و لاق، پێویستییان بەو جۆرانەی دیکەیە.

٣)- ماسوولکە بازنەییەکان (العضلات الدائرية): وەك ماسوولکەکانی لێوەکان و پێڵوی چاو و هەندێك کۆئەندامی دیکەی جەستە، ئەوانیش شێوەی بازنەییان هەیە.

٤) ماسوولکە گوشەرەکان (العضلات العاصرة): کە ئەوانە زیاتر لە نێو جەستە دان، وەك ماسوولکەکانی کۆئەندامی هەرس و، گورچیلەکان و، ڕیخۆڵەکان و، میزو میزەڕۆو ...هتد.

## بەندی شەشەم: قەبارەی ماسوولکەکان:

تیرەی ڕیشاڵی ماسوولکەیی: (١٠ - ١٠٠) مایکرۆ مەترە، مایکرۆ مەتر، واتە: یەك لەسەر هەزاری میللی مەترێك (١/١٠٠٠)، کەواتە: جیاوازیی زۆریان هەیە و، هەیانە دە (١٠) هێندەی ئەوی دیکەیە.

درێژیی ڕیشاڵە ماسوولکەییەکان، لە (٦٠) مایکرۆمەتر تاکو (٣٠) سم (٦٠ میکرۆ مەتر - ٣٠سم)دەبێ، کەواتە: لە ڕووی کورت و درێژیشەوە، زۆر جیاوازن لە (٦٠) مایکرۆمەتر، تاکو (٣٠) سم! کەواتە: هەیانە سەدان و بگرە هەزاران جار، لەوی دیکە درێژترە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## بەندی حەوتەم: چۆنیەتی کارکردنی ماسوولکەکان:

ماسوولکەکان بە دوو میکانیزم کار دەکەن:

**١)-** بە هۆی لێدانە کارەباییەکانەوە، کۆنترۆڵ دەکرێن، لێدانی کارەبایی (النَّبضة الکهربائیة) بۆ ئەو ڕیشاڵە ماسوولکەییە دێت، لە ماوەی یەك لەسەر دە (١٠/١)ی چرکەیەکدا، کە لە ماوەی یەك لەسەر دە (١٠/١)ی چرکەیەکدا، هەتا پەنجا (٥٠) جار ئەو ماسوولکەیە دەتوانێ گرژ بێت و بجووڵێ، ئیدی لە ئەنجامی ئەوەدا، ماسوولکەکان کاری خۆیان دەکەن.

**٢)-** ڕیشاڵە ماسوولکەییەکان، هەر کامێکیان دابەش دەبێتەوە بۆ چەند یەکەیەکی بچووك، کە پێی دەگوترێ: یەکەی جووڵێنەر (الوحدة المُحَرِّکة)، کە هەندێکیان ژمارەیان زۆر کەمە، وەك ئەوانەی کە لە چاوو، پێڵوەکانی چاوو، قوڕقوڕاگە و، صندووقی دەنگدا، هەن.

بەڵام هەندێکیان ژمارەیان زۆر زۆرە، وەك ئەوانەی کە لە قۆڵ و ڕان و باسك و ئەوانە دان، بۆ وێنە: جووڵاندنی دەست، بەس یەکەم جار لە مێشکەوە فەرمانەکەی بۆ دێ، ئیدی دوایی بەپێی ئەو زانیارییە خەزنکراوەی لە مێشکدایە، بەردەوام مێشك کە یەکەمجار فەرمانی بۆ نارد، دوایی ئەو فەرمانەی بۆ دووبارە دەکاتەوەو ماسوولکەکەش کاری خۆ دەکات، هەروەك چۆن دوگمەیەکی کۆمپیوتەریی یاخود حاسیبەیەك، کە پەنجەی لێدەدەی و یەکجار کاری پێ دەکەی، دوایی بۆ خۆی کارەکانی خۆی دەکا، چونکە زانیارییەکانی تێدا خەزن کراون، ئنجا جووڵەی ماسوولکەکانیش، پەیوەندییان لەگەڵ مێشکدا بەو شێوەیە.

## بەندی هەشتەم: چۆن ویست (إرادة)ی مرۆڤ، تەرجەمە دەبێتەوە بۆ جووڵە؟

بۆ وێنە: من دانیشتووم دوایی دەمەوێ تەماشای ئەو پەنجەرەیە بکەم، ئنجا ئایا ئەو ویستەی من کە دەمەوێ تەماشای پەنجەرەکە بکەم، ئەو ویستە چۆن تەرجەمە دەبێتەوە بۆ جووڵە؟! یەکسەر کە ویستم: لە مێشکەوە فەرمان دەچێ بۆ ماسوولکەکانی گەردن و سەر، کە من سەر بەرز بکەمەوە و پێڵوەکانی چاوو چاویشم بکەمەوە و، بە چاویش تەماشا بکەم و سەرنج بدەم، ئایا ئەو ئیرادەو ویستە، چۆن تەرجەمە دەبێتەوە بۆ جووڵەیەکی فیزیکیی؟

زانایانی بواری توێکاریی و لێکۆڵینەوە لە جەستەی مرۆڤ، تا ئێستا وەڵامێکی ڕوونیان پێ نیە، ئەو ویست (إرادة)ە، کە شتێکی مەعنەوییە، چۆن یەکسەر دەبێ بە جووڵەیەکی فیزیکیی؟ تا ئێستا وردەکارییەکانی ئەوە بە تەواویی نەزانراون.

## بەندی نۆیەم: دابەشبوونی ماسوولکەکان بەسەر جەستەدا:

١)- پێشتریش باسمان کرد کە زانایانی توێکاریی دەڵێن: ژمارەی سەرجەم ماسوولکەکانی جەستە لە نێوان (٦٤٠ - ٨٥٠) دایە، بەڵام بێگومان ئەو (٦٤٠)، یاخود (٨٥٠)یە، یەکەی سەرەکیی ماسوولکەکانن و، هەرکامیان لە چەندان ڕیشاڵی ماسوولکەیی پێك دێ، کە بە هەموویان چەندان ملیۆن ڕیشاڵی وردیلەن، بۆ وێنە: هەر مووێك لە جەستەی مرۆڤدا، وەك دوایی باسی دەکەین، چ گەندە مووەکان - ئەو مووە بچووکانەی کە بە زەحمەت بە چاویش دەبینرێن - چ مووە بینراوەکان، هەر مووێك ڕیشاڵێکی ماسوولکەیی هەیە، واتە: ماسوولکەیەکی بۆ دانراوە بیجووڵێنێ، بۆ گەشەکردنی، بۆ جووڵانی، هەروەها هەر ڕژێنێکی ئارەقە، یانی غودەی ئارەق ڕێژ، ئەوانیش دیسان هەر کامێکیان ماسوولکەیەك یاخود زیاتری بۆ دانراوە.

www.alibapir.com





٢)- (٤٢٪)ی جەستەی پیاو و، (٣٦٪)ی جەستەی ئافرەت، ماسوولکەکان پێکیی دێنن.

٣)- ماسوولکەکان بۆ دوو شوێن لە جەستەدا دابەش دەبن:

**یەکەم:** ماسوولکەکانی پەیکەری سەنتەریی (عضلات الهیکل المحوري)، واتە: سەرو گەردن و بڕبڕەی پشت و سینگ و سك و حەوزو ئەوانە.

**دووەم:** ماسوولکەکانی چوار پەلەکان، واتە: هەردوو پەلی سەریێ، کە هەردوو دەستەکانن بە هەموو پێکهاتەکانیانەوە و، هەردوو پەلی خواریێ، کە لاقەکانن.

ژمارەی ماسوولکەکانیش بۆ ئەو دوو بەشە سەرەکییە، بەمجۆرەیە:

**یەکەم:** ئەوانەی سەنتەر، ئەوانەی پەیکەری سەرەوەی جەستە، سەرجەم ژمارەیان چوارسەد و دوو(٤٠٢) ماسوولکەیە، بەم شێوەیە:

١- (١٣٠)یان پەیوەندییان بە (سەر)ەوە هەیە، یانی: (١٣٠)یان لە سەر دان.

٢- (٣٤)یان پەیوەندییان بە گەردن و ملەوە هەیە.

٣- (١١٢)یان پەیوەندییان بە پشتەوە هەیەو لە پشت دان.

٤- (٩٣)یان لە سینگ دان.

٥- (١٤)شیان لە سك دان.

٦- (١٩)شیان لە حەوزدان، واتە: سیێ بەندە.

**دووەم:** ئەوانەی چوار پەلەکان، واتە: هەردووك دەست و هەردووك لاق، ژمارەی ماسوولکەکانیان: (٢٣٨)ە، بەم شێوەیە:

١- (١١٤)یان هی دوو پەلەکەی سەرێن، هەردووك دەستەکان.

٢- (١٢٤)یشیان هی دوو پەلی خوارێن، واتە: هەردووك لاقەکان.

شایانی باسیشە کاتێك مرۆڤ باش قەدری ئەو ماسوولکانە دەزانیێ، کە کەسێك ببینیێ بە ڕواڵەت ساغ و سەلیم، بەڵام بەهۆی لە کارکەوتنی ماسوولکەکانیەوە، هەموو جەستەی یان بەشێکی، وەك مردوو بیێ و نەجووڵیێ!!

www.alibapir.com







## خاڵی نۆیەم: کۆئەندامی پێست (الجهاز الجلدي)

بەڕێـــــزان!

خوا پشتیوان بێ لە حەوت (٧) بەند دا باسی کۆئەندامی پێست دەکەین، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

بەندی یەکەم: پێناسەی پێست (جلد).

بەندی دووەم: پێکهاتەی پێست.

بەندی سێیەم: ئەرکەکانی کۆئەندامی پێست.

بەندی چوارەم: مووەکانی سەر پێست.

بەندی پێنجەم: ڕژێنە ئارەقەییەکان.

بەندی شەشەم: خانە هەستکەرەکان (المستقبلات الحِسِّيَّة).

بەندی حەوتەم: نینۆکەکان (الأَظافر).



وێنەی (٢٣) کۆئەندامی پێســـــت

www.alibapir.com



## بەندی یەکەم: پێناسەی پێست:

١- پێست کیفێك، یاخود بەرگێکی گۆشتییە، دەوری هەموو جەستەی مرۆڤ دەدا و، پانتاییەکەی: (١،٥ م٢ - ٢ م٢)ە، یانی: موعەددەل: (١,٨ م٢)ە، هەڵبەتە بەپێی جیاوازیی گەورەیی و بچووکیی جەستەی مرۆڤەکان، پانتایی و، ڕووبەری پێستیش فەرق دەکات.

٢- ئەستووریی پێست: پێست ئەستوورییەکەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك جیاوازە، بۆ وێنە: پێڵوی چاو و، چەرمی سەر سەیوانی گوێ: نیو میللی مەتر(٢/١ملم)ە، بەڵام پێستی پاژنە پێ و، هی لەپە دەست (٥) میللی مەترە، واتە: دە (١٠) ئەوەندەی ئەوان ئەستوورە.

٣- کێشی پێست: پێست بە گشتیی: (١٠٪)ی جەستەی مرۆڤ، پێك دێنێ لە ڕووی کێشەوە، کە دەکاتە (٥ - ١٠)کیلۆ، بەپێی قەبارەو گەورەو بچووکیی جەستەکان.

ئنجا با تەماشا بکەین! خوا(سبحانە وتعالی) ئەو پێستە کە بە ئێمەی داوە و لەوانەیە زۆرجار قەدری نەزانین و نادیدەی بگرین، با بزانین چەند وردەکاریی لە دروستکردنیدا کراوە لەلایەن خوای پەنهانزانەوە (سبحانە وتعالی):

## بەندی دووەم: پێکهاتەی پێست:

پێست لە سێ توێژ (طبقة)ی سەرەکیی پێکهاتوە، ئەگەرنا ئەو توێژانەش لە نێو خۆیاندا، دیسان لە چینی ورد و تەنکی دیکە پێکدێن:

١)- توێژی یەکەم: توێژی دەرەوە بە عەرەبیی پێی دەگوترێ (البَشَرَة)، ئەستووریی (سمك)ەکەی: (٠.٢٪ ملم)ێکە و، ئەویش بۆ خۆی پێنج چینە، واتە: توێخی سەرەوەی پێست، کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (البَشَرة)، لە پێنج چینان پێکهاتوە، کە دوایی باسیان دەکەین.

www.alibapir.com



٢)- توێژی دووەم: توێژی نێوە ڕاست، بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (الأَدَمَة) ئەستوورییەکەی (٢ملم)ە، واتە: دە (١٠) هێندەی (البَشَرَة) ئەستوورە.

٣)- توێژی سێیەم: توێژی ژێر ئەدەمە، کە توێژی نێوەوەیە و بەعەرەبیی پێ دەگوترێ: (الطبقة الداخلية)، ئەستووریی ئەم چینە بەپێی جەستەکانە، چونکە ئەو کەسەی قەڵەوترە، ئەو توێژەی چەوری زۆر لە ژێردا هەیە و ئەستوورترە و، ئەوی دیکەش کە لاواز بێ، تەنکترە.

ئێستاش با باسێکی چینەکان (طبقات)ی هەرکام لە توێژی دەرەوە و توێژی نێوەڕاست، بکەین:

(١)- چینەکانی توێژی دەرەوە(البَشَرَة)، کە ڕووکەشی پێستە و، پێنج چینن لە ژێرەوە بۆ سەرێ.

١- یەکەمیان پێی دەگوترێ: چینی بنکەیی، یان چینی تفت (الطبقة القَاعِدِية).

٢- دووەمیان پێی دەگوترێ: پوولەکەیی (الطبقة الحرشفية).

٣- سێیەمیان پێی دەگوترێ: دەنکۆڵەیی (الطبق الحُبَيْبِيَّة).

٤- چوارەمیان پێی دەگوترێ: چینی کراوە، یان چینی ڕوون (الطبقة الفاتحة) یان (الطبقة الشفّافة).

٥- پێنجەمیان پێی دەگوترێ: چینی وشکهەڵاتوو (الطبقة القَرْنيّة)، لەبەر ئەوەی کە لە سەری سەرەوەیە و سەرما و گەرمای زیاتر لێیدەدات و، خانەکانی زۆرتر دەفەوتێن.

(٢)- پێکهاتەکانی توێژی نێوەڕاست (الأَدَمَة)، کە ئەوانیش دیسان پێنج چینن، لە بنەوەڕا بەرەو سەرێ:

١- یەکەمیان: ئەو شوێنەی کە بنکی مووەکانی لێیە، شوێنی ڕواندنی مووەکان، تا ئەندازەیەك قووڵە.

٢- دووەمیان: شوێنی ڕژێنی چەوریی.

٣- سێیەمیان: شوێنی ڕژێنی ئارەقە.

٤- چوارەمیان: شوێنی خوێنبەرو خوێنهێنەرە مولوولەییەکان.

٥- پێنجەمیان: شوێنی هەستوەرگرەکان.

هەستوەرگرەکان یاخود پێشوازییکارەکانیش لە هەست، حەوت جۆرە هەست وەردەگرن:

١- گەرمیی.

٢- ساردیی.

٣- ئازار.

٤- هەستی سووك، بۆ وێنە جاری وایە بە ئاستەم پەنجەت لێ دەدەن، یەکسەر ئاوڕ دەدەیەوە، ئەوە پێی دەگوترێ: هەستی سووك.

٥- فشاری بەهێز.

٦- لەرینەوەکان.

٧- جووڵەی موو.

هەستوەرگرەکان هەموو ئەوانە دەگەیەنن بە مێشك و، مێشك لە ڕێی ئەو هەستوەرگرانەوە، دەزانێ کەچی بۆ پێست یان لە پێستدا ڕوو دەدا؟ چونکە کاتێك کە موو گەشە دەکات (کە لە هەر هەفتەیەکدا میللیمەترێك موو گەشە دەکات)، ئەوە بە فەرمانی مێشکە و مێشك فەرمانی بۆ دەنێرێ: کە دەبێ گەشە بکات.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## بەندی سێیەم: ئەركەكانی كۆئەندامی پێست:

پێست كە - وەك گوتمان - زۆرجاران ئێمە بە شتێكی كەم بایەخ تەماشای دەكەین، ئەركی زۆرن و، دەتوانین بڵێین: ئەو دە(١٠)یە، ئەركە گرنگەكانی:

١- پارێزگاریی لێكردنی ئەندامەكانی ژێرەوەی خۆی، لە چی دەیانپارێزێ؟ لە تەن و تەنۆلكەكان، لە تۆزو دووكەڵ، لە میكرۆب، لە سەرما، لە گەرما، لە تیشك، لە شەپۆلە كارۆموگناتیسییەكان....هتد، هەموو ئەو شتانەی زیان بە جەستە دەگەیەنن، پێست پارێزگاریی دەكات لە هەموو ئەندامەكانی كە لە نێوەخۆی گرتوون.

٢- پاراستنی ئەندامە نەچەسپێنراوەكان لە هاتنەدەر، بۆ وێنە: (گەدە) بە هیچ شوێنێكەوە نەچەسپێنراوە، هەروەها ڕیخۆڵەكان، ئنجا ئەوانە كە نەچەسپێنراون، پێست ڕێیان لێ دەگرێ كە بێنەدەر، هەر بۆیە جاری وایە كە پێست دەبڕێ، كابرا گەدەو ڕیخۆڵەی دەكەوێتە گۆڕێ! چونكە هیچ شتێك نەماوە بیگرێتەوە، هەروەها پێست كاریگەریی هەیە بۆ كەمكردنەوەی جووڵەی هەڵواسراوەكانیش، ئەو ئەندامانەی كە پەیوەستكراون، وەك جەرگ و دڵ و سییەكان، پێست جووڵەیان كەم دەكاتەوە، جووڵەیەك كە پێویست نەكات، پێست ڕێی لێ گرتوون و وایكردوە كە لە شوێنی خۆیان چەسپاو بن.

٣- بە هاوكاریی لەگەڵ مێشكدا، ڕاگرتنی پلەی گەرمیی جەستە، لە نێوان (٣٦،٥ - ٣٧،٥) پلەدا، چونكە دەبێ لەو نێوانەدا پلەی گەرمیی جەستە بپارێزرێ، مەگەر كەسێك كە نەخۆش دەبێ، تای لێ بێ، پلەی گەرمیی بەرز بێتەوە، یەك دوو پلە، یاخود لەرزی لێ بێ و پلەی گەرمیی دابەزێ، ئەگەرنا دەبێ لەو نێوانەدابێ، ئنجا پێست وا دەكا، كە ئەو پلەی گەرمییە، - هەڵبەتە بە هاوكاریی لەگەڵ مێشكدا - لەو ڕێژەیەدا ڕابوەستێ.

www.alibapir.com



٤- ڕێگرتن لە دەرچوونی ئاوو شلەمەنییەکان لە جەستە، کە دیارە (٧٠٪)ی جەستەی مرۆڤ، ئاو پێکیی دێنێ، پێست ڕێی لێ دەگرێ کە بچێتە دەر، کە پێکهاتەی هەرە زۆری خوێن، ئاوە و شلەمەنییەکانی دیکەش هەن.

٥- هەستکردن بە هەموو کارتێکەرە دەرەکییەکان (المؤثرات الخارجية)، پێست زانیارییەکان دەگەیەنێ، وەك پێشتر باسمان کرد، ئنجا سەرمایە، گەرمایە، بەرکەوتنێکە، ئازارێکە.. هتد.

٦- پەزمەندە کردن و هەڵگرتنی ئاوو چەوری زیاد لە پێویستی جەستە، بۆ کاتی پێویست، هەمووی لە ژێر پێستدا کۆدەبێتەوە، چەوریی و وزەی زیادی نێو جەستە، کە جەستە پێویستی پێی نیە سەرفی بکات، لە ژێر پێستدا هەڵدەگیرێ بۆ کاتی پێویست.

٧- دەربازکردنی جەستە لە ڕێی ئارەقەکردنەوەوە، لە پاشەڕۆك و خوێ یەکانی جەستە و، بار سووك کردنی گورچیلە، وەك پێشتر باسی کۆئەندامی میزمان کرد، لە ڕێی میزەوە جەستە دەرباز دەبێت، لە زۆرێك لە پاشەڕۆکی کە لە نێو جەستەدا کۆدەبێتەوە، هی کارکردنی خانەکان، پێست لەڕێی ئارەقەکردنەوە، هاوکارییەکی باشی گورچیلەکان و کۆئەندامی میز دەکات، بۆ ئەوەی ئەندازەیەکی زۆر لە خوێ یەکان لە ڕێی ئارەقەوە، هەروەها پاشەڕۆکەکانی دیکە، وەك چەوریی، لە ڕێی پێستەوە بێتە دەرێ و، جەستە لێی دەرباز بێ.

٨- ڕواندنی مووە جۆراو جۆرەکان لە چەند شوێنێکی جەستەدا، کە ئەوانیش دیسان جەستە دەپارێزن، وەك مووەکانی سەر و، مووەکانی دەست و لاق، هەروەها جەستەش جوان دەکەن: ئنجا مووی سەرە، مووی برۆیە، برژانگی چاوە، تایبەت بۆ پیاوان: ڕیش و سمێڵە.

هەروەها مووەکان ئەو کاریگەرییەشیان هەیە، کە جەستە دەپارێزن لە کۆمەڵێك کەڕوو (فطريات)، ئەو مووانەش هەموویان لەسەر پێست دەڕوێن، ئەوەش یەکێکە لە ئەرکەکانی پێست و، پێست زۆر باش ئەنجامی دەدات.

www.alibapir.com



٩- دروستکردنی ڤیتامین (D) لە تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، کە بۆ گەشەی ئێسك پێویستە، دیارە تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، ئەگەر ڕاستەوخۆ بە ڕێژەی ڕەها لە جەستە بدات، زیانی پێ دەگەیەنێ، بەڵام پێست لە تیشکی سەرووی وەنەوشەیی ڤیتامین (D) دروست دەکات، کە بۆ گەشەی ئێسك پێویستە.

١٠- بە هۆی ڕەنگەکانی میلانینەوە، دیاریی کردنی ڕەنگی جەستە، دیارە ئەمیش هەر کاری پێستە و، پێست ڕەنگی جەستە دیاریی دەکات، کە فلان کەس سوورو سپیە، ئەوی دیکەیان ڕەش پێستە، ئەوی دیکە ئەسمەرە، ئەوە هەمووی لە ڕێی پێستەوە و بەهۆی میلانینەوە، ئەو ڕەنگە جیاوازانە بە جەستە دەدرێن.

## بەندی چوارەم: مووەکانی سەر پێست:

**١)- پێنـــاسە:**

مووەکانی سەر جەستەی مرۆڤ، بە گشتیی دوو جۆرن:

**أ- جۆری یەکەم:** گەندە موو (الشعر الزَّغَبی)، واتە وردیلە موو، یان مووی وردیلە، چونکە (زغب) بە پەڕی بچووك بچووکی باڵندەکان دەگوترێ، (الزَّغَب: صِغَار الريش والشَّعْرِ وَلَيِّنُهُ)[1]، (زَغَب): بریتیە لە مووی نەرم و بچووك، یاخود پەڕی نەرم و بچووکی باڵندە، کە ڕەنگەکەی ڕوونە، ئنجا ئەو گەندە موونە، بێجگە لە لێوەکان و لەپی دەست و بنی پێ، لە هەموو جەستەی مرۆڤ دەڕوێن، بەڵام ڕەنگەکەیان ڕوونە و، زۆر وردیلەو نەرمن و، هەست پێ ناکرێن.

**ب- جۆری دووەم:** کە ئەوە زیاتر هەستی پێ دەکرێ مووی چڕو گەشە خێرا، گەندە مووەکان هەم بە سستیی گەشە دەکەن و، هەمیش زۆر بچووکن و بە زەحمەت هەستیان پێ دەکرێ، بەڵام مووی چڕ دیار و بەرچاون و گەشەشیان خێرایە، وەك مووی سەر بە نسبەت پیاوان و ئافرەتانەوە و، مووی ڕیش و سمێڵ بۆ پیاوان، هەروەها مووی برژانگ و بن هەنگڵ و...هتد، بۆ پیاوان و ئافرەتان.

---

(١) المعجم الوسيط، ص٣٩٤.

www.alibapir.com





**٢- ئەركی مـــووەكان:**

بابزانین خوای كارزان بۆچی جەستەی مرۆڤی هەمووی بە موو داپۆشیوە؟!
چ مووی وردیلە، كە بە كوردی دەڵێین: گەندە موو، چ مووی درشت و گەشە
خێرا، دەتوانین بڵێین: مووەكانی جەستە دوو ئەركی سەرەكییان هەیە:

١- پاراستنی جەستە لە سەرماو گەرما، لە گەرما دەیپارێزن، بەهۆی ئەوەوە
كە ئەو مووانە تیشكی خۆر دەمژن و، لە سەرما دەیپارێزن، بەوە كە چینێكی
جیاكەرەوە، (عازل) پێك دێنن، دیارە مووەكان ئەگەر چڕو پڕ بن، بە تایبەتی
مووی سەر، كاریگەرییان زۆرە بۆ پاراستنی سەر لە سەرما، هەروەها لە
كاریگەریی خراپی گەرماش.

هەروەها بە هۆی ئەوەوە كە مووەكان جاری وایە، هەڵدەستن و ڕاست دەبنەوە،
بە هۆی حەپس كردنی هەواوە لە نێو توورەكە موو (جراب الشعر)دا و، سەرەنجام
ئەوە دەبێتە چینێكی گێڕەرەوەی كارتێكەرە خراپەكان.

٢- ڕژێنە چەورییەكان ماددەیەكی چەور دەردەدەن و، دەیرێژنە توورەكەی موو
(جراب الشعر) و لەوێوە دەڕژێتە سەر پێست، ئنجا ئەو ماددە چەورییە، دوو
ئامانجان دەپێكێ:

**یەكەم:** موو و پێست نەرم و بریقەدار دەكات، یانی: هەم مووەكان، هەم پێستەكە،
ئەو ماددە چەورییە نەرم و جوانیان دەكات و، بریقەداریان دەكات.

**دووەم:** ڕێ لە هاتنە نێو جەستەی، ئاوو كەڕووەكان و بەكتریاكانیش دەگرێ،
واتە: ئەو ماددە چەورییەی سەر پێست، دیسان ئەویش قەڵغانێكی دیكەیە بۆ
جەستە، بۆیەش لە كاتی كەم بوونەوەی ماددەی چەوریی پێستدا، پێست ڕەق
دەبێ و وشك هەڵدەگەڕێ و، كەلێنی زیاتریشی تێدا پەیدا دەبێ بۆ هاتنە نێو
جەستەی ئەو شتانەی زیانی پێ دەگەیەنن.

www.alibapir.com







٣)- ڕێژەی ڕووانی موو:

ئایا مووەکان لە کوێ دەڕوێن، لە کوێ ناڕوێن؟ بێگومان جیاوازییان هەیە، ئەگەر سەرنج بدەین، دەبینین: مووی سەر لەگەڵ مووی برۆ، لەگەڵ مووی برژانگ، لێك جیان، هەم لە ڕووی چۆنیەتیی و هەم چەندێتییشەوە: لە هەر یەك (سم$^2$)دا، (٢٠٠ - ٣٠٠) بنکە موو هەیە، مەرج نیە تەنیا ئەوانەی کە دەبینرێن، بەڵکو گەندە مووەکانیش هەن، بۆ وێنەدا: مووەکانی سەر، کە دەیان بینین، لەسەردا: نیزیکەی: (١٠٠٠٠٠ - ١٥٠٠٠٠) تاڵە موو هەیە لەسەردا، هەر کام لەو تاڵە مووانەی سەر، هەروەها هی هەموو جەستەش، هەر هەموویان یەکی تاڵە ماسوولکەیەك ڕیشاڵە ماسوولکەیەکیان هەیە، کە لە کاتی پێویستدا دەیجووڵێنێ و، بە هۆی ئەوەوە موو گەشە دەکا.

شایانی باسە: لە هەموو جەستەدا بە شوێنە ئاشکرا و پەنهانەکانیەوە، دەوری پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) تاڵە موو هەیە، بە مووە بیندراوەکان و نەبیندراوەکانیشەوە، بۆ وێنە: لە ڕیشی پیاودا: (٧٠٠٠ - ١٥٠٠٠) تاڵە موو هەیە و، لە هەر کام لە برۆیەکان دا: (٤٥٠ - ٦٠٠) تاڵە موو هەیە.

## بەندی پێنجەم: ڕژێنە ئارەقەییەکان (الغدد العَرَقية):

**یەکەم:** جۆرەکانیان:

ڕژێنە ئارەقەییەکان دوو جۆرن:

جۆری یەکەمیان: کە لە هەموو جەستەدا هەیە، بریتیە لە بۆڕییەکی بەیەکدا پێچراو لەلای توێژی (أَدَمَة)وە، چینی ژێر پێست، لەوێوە دەست پێ دەکات و، لەسەر ڕووی پێست دەردەکەوێ، واتە: بنکی لووە ئارەقە ڕێژەکان، لە توێژی خوارەوەی پێست دایە.

www.alibapir.com





جۆری دووەمیان: ڕژێنەکانی ئەم جۆرەی دووەمیان تەنیا لەبن هەنگڵ و لای موسوڵدان (عانة)دا هەن، کە لەو شوێنانەی جەستەدا، جۆرە ئارەقەیەکی تایبەت هەیە.

**دووەم:** ئەندازەیان:

ڕژێنە ئارەقەییەکان، لە هەر یەك (سم٢)ێکدا، سەد (١٠٠) ئارەق ڕێژ هەیە، کەواتە: لە پێستی مرۆڤدا بە گشتی: دەوری دوو ملیۆن (٢٠٠٠٠٠٠) لووی ئارەق ڕژێن هەیە.

**سێیەم:** سوودەکانیان:

١- ڕۆڵی ساردکردنەوەی جەستە دەبینێ، کە دیارە لەخۆوە جەستە ئارەقە ناکات، بەڵکو کە گەرمای بوو، هەستوەرگرەکان، مێشك ئاگادار دەکەنەوە و، مێشك فەرمان دەنێرێ بۆ پێست، کە کونەکانی خۆی بکاتەوە ئارەقە و گەرمیی بەرێتە دەر، بۆ ئەوەی جەستە، سارد بێتەوە، بەڵام ئەگەر سەرما بێ، مێشك فەرمان دەنێرێ: پێست کونەکانی خۆی دابخات، بۆ ئەوەی گەرمیی نەچێتە دەر و سەرما نەیەتە ژوورێ، بۆیە ئینسان کە سەرمای دەبێ، پێستی ڕێك دێ و گرژ دەبێ.

٢- پاراستنی ڕووکەشی پێست لە وشك بوون، کە بە هۆی ئارەقە ڕێژەکانەوە، پێست تەڕ و تازە و نەرم دەبێ.

٣- هاوکاریی کردنی گورچیلەکان لە ڕێکخستنی ئاوو شلەمەنییەکان دا و، دەرکردنی ئەوەی کە لە جەستە زیادە لە خوێیەکان و، تواندنەوەی چەوریی جەستە.

٤- کوشتنی هەندێك جۆری بەکتریا، بە هۆی بەکارهێنانی هەندێك ئەنزیمی نێو ئارەقەوە، کە پێست بۆ خۆی دروستیان دەکات.

٥- لە بەری پێ و لەپی دەست دا، لووە ئارەقە ڕێژەکان زیاترن، تاکو لەپی دەست و بەری پێ، بە هۆی ئارەقەوە تەڕ ببن و، باشتر بەو شتانەوە بچەسپن کە مرۆڤ دەست و پێیان دەخاتە سەر.

www.alibapir.com




## بەندی شەشەم: خانە هەستكەرەكان (المستقبِلات الحِسِّية):

**یەكەم: پێناسە:**

خانە هەستكەرەكان (الخلايا الحِسِّيَّة): ئەو خانانەن كە لە پێست دا، پێشوازیی دەكەن لە هەست پێكراوەكان و وەریاندەگرن و دەیانگەیەننەوە بە مێشك.

**دووەم: جۆرەكانیان:**

ئەو خانە هەستكەرانە سێ جۆرن:

١- جۆرێكیان تەنیا هەست بە ساردیی و گەرمیی دەكەن.

٢- جۆرێكیان هەست بە جووڵە میكانیكییەكان دەكەن.

٣- جۆرێكیان تەنیا هەست بە ئازار دەكەن.

ئێستاش با سەروتیشك بخەینە سەر هەركام، لەو سێ جۆرە خانە هەستكەرانە، كە ئەوانیش هەر لە پێست (جلد)دان:

**جۆری یەكەم:** ئەوانەن كە هەست بە ساردیی و گەرمیی دەكەن، ئەو جۆرەیان بریتیە لە تۆڕێك، لە كۆتایی دەمارە مێشكییەكان، یان دەمارە هەستییەكان دا، لە نێو توورەكۆكەیەكی گچكەی شێوە تەشیلەدا[1]، درێژیی ئەو خانە هەستكەرانە: (١ ملم)ە و، دەكەونە نێوەڕاستی توێژی بنەوەی پێست، كە پێی دەگوترێ: (أَدَمَة)، واتە: توێژی ژێر پێست.

ئەمجۆرەیان ژمارەیان لە هەموو جەستەدا، شازدە هەزار (١٦٠٠٠) خانەی هەستكەر دەبێ، كە لە هەموو جەستەدا چێندراون و، كە لە هەندێك شوێندا چڕترو پڕتر هەن، بۆ وێنە: لەسەرە ئەنگوستەكاندا، زیاتر هەن، بۆ ئەوەی ئینسان كاتێك سەرەپەنجەكانی دەسووتێن، زووتر هەست بە ئازار بكات، بۆیە ئەو خانە

---

(١) تەشی: (مِغزَل)، تەشیلە (مُغَيْزِلْ).

www.alibapir.com







هەستکەرانەی ساردیی و گەرمیی زیاتری تێدان، لە سەرە پەنجەکان دا، لە هەر یەك (١ سم٢)دا، حەفتاو پێنج (٧٥) لەو خانە هەستکەرانە هەن.

هەروەها ئەو خانە هەستکەرانە لە پێستی لووت دا هەن و، لە لێوەکاندا هەن و، لە نێوچەوانیشدا هەن، ئەوانە بە شێوەیەکی چڕو پڕ لەو ئەندامانەدا هەن، ئەگەرنا لە هەموو جەستەدا، کەم و زۆر، هەن.

**جۆری دووەم:** خانەکانی هەستکردن بە ئازار، ئەوانیش بریتین لەو خانە هەستکەرانەی کە لە کۆتایی دەمارە مێشکییەکاندا هەن، بە شێوەیەکی ئازاد و ئەوانە بە تایبەت لە توێژی سەرەوەی پێست(بَشَرَة)دا هەن، واتە: نزیك لە ڕووکەشی پێست، ژمارەیان لە هەموو جەستەدا: بە سێ ملیۆن (٣٠٠٠٠٠٠) مەزەندە دەکرێ.

ئنجا ئایا بۆچی خوا (سبحانه وتعالى) ئەوانەی زیاتر کردوون؟! بۆ ئەوەی لە هەر شوێنێکدا ئازارێك بە جەستە گەیشت، زوو هەواڵەکە بگاتەوە بە مێشك، بەڵام هی سەرماو گەرما، ڕێژەکەیان کەمترە.

**جۆری سێیەم:** ئەو خانانەن کە هەست دەکەن بە فشار لێ کردن و بەرکەوتن، ئەمانە لە هەر یەك (١ سم٢)دا: (٧٥٠ - ١٥٠٠) دانە هەیە و، بەپێی شوێنەکانی جەستە کەوتوون، بە تایبەت لە سەرە پەنجەکانی دەستدا، هەروەها لە هی پێیەکاندا، چڕییان زیاترە، چونکە ئینسان لە ڕێی سەرەپەنجەکانی دەست و سەرەپەنجەکانی پێیەوە، زیاتر هەست بە فشارو بەرکەوتنی تەنەکانی دیکە دەکات.

جێی سەرنجە کە:

خوا (سبحانه وتعالى) ئاماژەی کردوە بە سەرە پەنجەکان لە سوورەتی (القيامة)دا، کە دەفەرموێ:

﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ ﴾.

www.alibapir.com







واتە: ئایا مرۆڤ پێی وایە: ئێسقانەکانی کۆناکەینەوە؟! با، دەتوانین سەرەپەنجەکانیشی ڕێك بخەینەوە.

ئنجا بەم دوا دواییانە دەرکەوتوە، کە سەرە پەنجەی هیچ کەس، وەك سەرە پەنجەی کەسێکی دیکە ناچێ، نەك هەر پەنجەی گەورە، بەڵکو هەموو پەنجەکانی دەست و پێ، بەڵام خوا (سبحانە وتعالی) لەبەر ئەوەی کە بۆ خۆی سەرەپەنجەکانی دروستکردوون، دەشزانێ چۆنی دروستکردوون، بۆیە لە نێو هەموو جەستەدا، ئاماژەی کردوە بە سەرەپەنجەکان، واتە: هەموو ئێسقانەکانیان پێکەوە کۆدەکەینەوە، جەستەکەشیان زیندوو دەکەینەوە و، بە هۆی سەرە پەنجەکانیانەوە، لێکیان جیا دەکەینەوە، کە هەر کەسە کەسایەتیی تایبەتی خۆی هەیە.

## بەندی حەوتەم: نینۆکەکان (الأظـافـر):

### یەکەم: پێناسە:

نینۆك (ظفْر)یش، هەر بە پێستەوە پەیوەستە، چونکە نینۆکەکان لە کۆتایی پەنجەکانی دەست و پێدا هەن، هەر مرۆڤێك بیست نینۆکی هەیە، بە ژمارەی پەنجەکانی هەردوو دەست و هەردوو پێی.

نینۆکەکان لەو ماددەیە دروست دەبن، کە خوا (سبحانە وتعالی) وای خوڵقاندوە لە کۆتایی پەنجەی دەست و پێ دا کۆببێتەوە و ببێتە جۆرێك لە ئێسقان، کە نینۆکی پێ دەگوترێ.

### دووەم: پێکهاتەی نینۆك:

نینۆك لە سێ بەش پێکهاتوە:

١- خودی نینۆکەکە خۆی.

٢- ئەو گۆشتەی کە نینۆکەکەی لەسەر دانراوە.

٣- هەروەها ڕیشەی نینۆکەکە کە دەچێتە نێو گۆشتەوەو، نێو خوێنەوە و، لەوێ دا خۆراك وەردەگرێ، چونکە نینۆکیش گەشە دەکات.

بەڵێ نینۆك خوا (سبحانه وتعالى) وای خوڵقاندوە: گەشە بکات، بەڵام کە گەشەش دەکات، وەك گۆشت نیە کە بڕرا ئازاری هەبێت، هەموومان دەزانین نینۆك دەماری هەستی تێدا نیە، تاکو هەست بە ئازار بکەین، بەڵام بۆچی نینۆك گەشە دەکات و حیکمەتەکەی چییە؟!

حیکمەتەکەی ئەوەیە کە گریمان نینۆکێکت دەقرتێ، پەنجەیەکت بەر شتێك دەکەوێ و نینۆکەکەی دەقرتێ، ئنجا ئەگەر ئەو نینۆکە گەشەی نەکردبایە، نەدەهاتەوە، (سُبْحَانَ الله)، خوای پەروەردگار (سبحانه وتعالى) حسابی بۆ هەموو شتێك کردوە، ئەو نینۆنەکە لەبەر ئەوەی ئینسان پەنجەکانی زۆر دەجووڵێنێ، وای دروستکردوون، کە گەشە بکەن، ئنجا ئەگەر نینۆکەکان زۆر درێژ بوون، بە کەڵك نایەن و دەبێ ببڕدرێن، بۆیە خوا دەماری خانە هەستییەکانی تێدا دانەناون، بۆ ئەوەی ئەگەر بڕران، مرۆڤ هەست بە ئازار نەکات، پەنجەکانیش گەشە ناکەن و درێژ نابن، تەنیا نینۆکەکان درێژ دەبن و گەشە دەکەن.

### سێیەم: ڕەنگی نینیۆك:

ڕەنگی نینۆك بە باری سووریی دایە، لەبەر ئەوە کە ئەو شانانەی لێیان پێکهاتوە، ئەو تۆپەڵە شانەیەی کە لێی پێکدێ، سوورباوە، بۆیە نینیۆکیش مەیلەو سوورە، جگە لەو بەشەی کە دەقرتێ.

### چوارەم: گرنگیی نینۆك:

گرنگیی نینۆك لە زۆر شتدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام بەداخەوە زۆرجاران ئینسان تاکو پێویستیی بە ئەندامێك نەبێ، قەدری نازانێ، ئینسان ئەگەر نینۆکی بقرتێ، یان نینۆکی هەڵکێشرێ، ئەوانەی کە لە ئەشکەنجەدان دا، نینۆکیان هەڵکێشراوە، ئەو کاتە قەدری نینۆکەکان دەزانن:

١- ئینسان ئەگەر نینۆکی نەبێ، تەنانەت پشتی خۆی پێ ناخورێنرێ و، سەری خۆی پێ ناخورێنرێ، عەرەبیش گوتوویانە: (ماحكَّ ظَهْرَكَ مِثْلُ ظُفْرِكَ)، هیچ شتێك وەك نینۆکی خۆت پشتت ناخورێنێ.

٢- پاشان نینۆك بۆ پتەو ڕاگرتنی پەنجەکان زۆر گرنگە، لە ڕاستییدا پەنجەکان کە گۆشتن، بەڵێ ئێسقانیشیان تێدایە، بەڵام کۆتاییەکەیان گۆشتە، بە هۆی نینۆکەوە قایم و مەحکەم بوون، پەنجەکان بە هۆی نینۆکانەوە زیاتر هێز پەیدا دەکەن.

٣- زۆر جار ئینسان شتێك کە بیەوێ هەڵی بگرێتەوە، یان شتێکی ورد، پەنا دەباتە بەر نینۆکی و بەبێ نینۆکی پەکی دەکەوێ.

هەروەها بۆ گەلێك ئیش و کاری دیکە، ئینسان سەری لە نینۆکەکانی دەوەستێ و ئیشی پێیان دەبێ، بەڵام بە زۆریی وایە مرۆڤ تا پێویستیی بە شتێك نەبێ، وەك پێویست قەدرو قیمەتی نازانێ.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## خاڵی دەیەم: کۆئەندامی هۆڕمۆنیی (الجهاز الهورموني)

بەڕێـــــزان!

ئەم کۆئەندامە، کۆئەندامێکی یەکجار گرنگ و هەستیارەو، خوا کۆمەککارمان بێ، لە پێنج (٥) بەنددا باسی دەکەین بەم ناوونیشانانە:

بەندی یەکەم: پێناسە.

بەندی دووەم: ئەرکەکانی کۆئەندامی هۆڕمۆنیی.

بەندی سێیەم: چۆنیەتیی و میکانیزمی کارکردنی کۆئەندامی هۆڕمۆنیی.

بەندی چوارەم: کەرە ڕژێنەکان (الغُدَدُ الصَّمَّاء).

بەندی پێنجەم: جۆرەکانی کەرە ڕژێنەکان و هۆڕمۆنەکانیان.



وێنەی (٢٤) کۆئەندامی هۆڕمـــۆنی



## بەندی یەکەم: پێناسە:

کۆئەندامی هۆڕمۆنیی کە لە کەرە ڕژێنەکان (الغُدَدُ الصَّمَّاء) و ئەو هۆڕمۆنانە پێك دێ، کە دەریان دەدەن، کە پزیشکەکان و زانایانی توێکاریی (الغدة الصمَّاء)یان بۆ بەکاردێنن، چونکە ئەو لووە ڕژێنانە جۆگەلەو بۆڕییان نیە کە هۆڕمۆنە دەردراوەکانیان بنێرن بۆ دڵ و، لەوێوە دابەش بکرێ، بەڵکو یەکسەر خۆیان دەیڕژێنە نێو خوێنەوە، بەڵێ (کۆئەندامی هۆڕمۆنیی):

١- لەڕووی گرنگیی کۆنترۆڵ کردنی جەستەوە، لە دوای کۆئەندامی مێشك و دەمارەوە دێ، هەرچی کۆئەندامی مێشك و دەمارە، بەشێوەیەکی میکانیکیی، کارە میکانیکییەکانی جەستە ئەنجام دەدا، وەك جووڵاندنی ماسوولکەکان و کارپێکردنی ئەندامەکان، ئەوە لە ڕێی مێشکەوە ئەنجام دەدرێ، بەڵام کۆئەندامی هۆڕمۆنیی لە ڕێی کیمیاییەوە هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی کارەکانی جەستە، چونکە چەند ماددەیەك دەڕژێنێتە نێو خوێنەوە، -- وەك دوایی باسی دەکەین — کە ئەوانە کاریگەریی دادەنێن لەسەر کارەکانی جەستە.

٢- لە ڕووی وردەکایی و ئاڵۆزییشەوە، دیسان کۆئەندامی هۆڕمۆنیی، لە دوای کۆئەندامی مێشك و دەمارەوەیە و، وەك چۆن کۆئەندامی مێشك و دەمار، ئێستاش لایەنی پەنهان و تاریك و شێردراوەی زۆری تێدا ماون، بۆ زانایانێك کە لەو بوارە دەکۆڵنەوە، بەهەمان شێوە کۆئەندامی هۆڕمۆنییش، لایەنی نادیارو پەنهانی زۆر تێدا هەن.

٣- شێوەی پەیوەندییەکانی کۆئەندامی مێشك و دەمار بە ئەندامەکانی جەستەوە، دەتوانین بڵێین: وەك پەیوەندییەکی ئینتەرنێتیی وایە، زۆر بەخێرایی پەیوەندییەکانی جێبەجێ دەبن، بەڵام پەیوەندیی کۆئەندامی هۆڕۆمۆنیی، وەك پەیوەندییەکی پۆستەیی وایە و، درەنگتر پەیوەندییەکان دەکرێن، بەڵام دواتریش کاریگەرییەکەیان زیاتر دەمێنێتەوە.

## بەندی دووەم: ئەرکەکانی کۆئەندامی هۆڕمۆنیی:

ئەم کۆئەندامە حەوت(٧) ئەرك و كاری گەورە و گرنگ لە جەستەدا دەكات:

١- یەكێك لە ئەركەكانی ئەو كۆئەندامە كە لە جەستەدا ئەنجامیان دەدا، بریتیە لە گەشەكردن، بەڵێ گەشەكردنی جەستە، كۆئەندامی هۆڕمۆنیی كاری گرنگی تێدا دەكات و، وەك دوایی باسی دەكەین، هەندێك هۆڕمۆن ئەگەر كەم بن، لە كۆرپەلەدا، یان لە كۆرپەدا، یان لە منداڵدا، ئەو كۆرپەیە و ئەو منداڵە، گەشە ناكات، لە هەر ڕوویەكەوە و چ هۆڕمۆنێكی كەم بێ، لەو ڕووەوە گەشە ناكات.

٢- ئەنجامدانی: {زیندەچالاكیی-Metabolism (التَّمْثِيلُ الغِذَائِي) لە نێو خانەكاندا، لە ڕێی هۆڕمۆنەكانەوە ئەنجام دەدرێ.

٣- هاوسەنگ ڕاگرتنی شلەمەنییەكانی جەستە.

٤- هاوسەنگ ڕاگرتنی خوێ و كانزایەكانی جەستە.

٥- ڕێكخستنی پلەی گەرمیی جەستە، لە نێوان: (٣٦,٥ - ٣٧,٥)دا.

٦- ڕێكخستنی پرۆسەی وەچە خستنەوەی جینسیی.

٧- ڕێكخستنی پرۆسەی هەرسكردن، واتە: لەسەر ئاستی كۆئەندامی هەرس.

ئنجا كۆئەندامی هۆڕمۆنیی، ئەو كارانەی خۆی، بەهۆی پەنجا جۆرە هۆڕمۆنەوە دەكات، كە تا ئێستا زانایان دۆزیویانەوە و پەییان پێ بردووە، ڕەنگە زیاتریش هەبن، كە لەو یازدە (١١) كەڕە ڕژێنەوە دەردەچن، - كە وەك دوایی باسیان دەكەین - بەسەر شوێنە جیاوازەكانی جەستەدا دابەش بوون.




## بەندی سێیەم: چۆنیەتیی و میکانیزمی کارکردنی کۆئەندامی هۆڕمۆنیی:

کۆئەندامی مێشك و دەمار لەڕێی ڕیشاڵە مێشکییەکان (الألياف العَصَبية)ەوە، کارەکانی خۆی دەکات و پەیوەندیی دەکات بە خانەکانی جەستەوە و، بە کۆئەندامەکانەوە و فەرمانەکانی خۆییان بۆ دەنێرێ، بەڵام هۆڕمۆنەکان، کە لە پێکهاتەی کیمیایی ئەندامیی دروست دەبن، لە ڕێی خانە تایبەتییەکانی نێو کەرە ڕژێنەکانەوە، کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن و، هۆڕمۆنەکان ئەوە نیە کە بچنە نێو دەمارەکان و لە ڕێی تایبەتەوە، بنێردرێن بۆ دڵ و لەوێوەش دابەش بکرێن بەسەر جەستەدا، بەڵکو یەکسەر دەڕژێنرێنە نێو خوێنەوە و، بەرەو خانەکانی جەستە، دەچن.

ئنجا هەرچەندە ئەو ڕژاوانە، ئەو هۆڕمۆنانە، کە لە غوددەکانەوە دەڕژێن، دەچنە نێو هەموو خوێنەوە، بەڵام خوا(سبحانه وتعالى) وای کردوە کە تەنیا ئەو خانانەی سەروکاریان لەگەڵ ئەو هۆڕمۆنانەدا هەیە، دەتوانن پێشوازییان لێ بکەن، ئەگەرنا ئەوان ڕوو لە هەموو خانەکانی جەستە دەکەن، بەڵام تەنیا ئەو خانانەی کە پێیان دەگوترێ: وەرگرەکان (المستقبلات) وەرگری هۆڕمۆنەکان (مستقبلات الهورمونات) تەنیا ئەوان وەریان دەگرن، هەروەها پێشیان دەگوترێ: خانە بە ئامانج گیراوەکان (الخلايا المُسْتَهْدَفة).

زانایان دەڵێن: لە هەر خانەیەکدا (٢٠٠٠ - ١٠٠،٠٠٠) وەرگر هەیە بۆ هۆڕمۆنەکانی جەستە، بۆ هۆڕمۆنە جۆراو جۆرەکان، ئنجا هۆڕمۆنەکانیش بۆ چوونە نێو خانەکان، دوو جۆرن و هەموویان یەك جۆر نین، بە گشتی دوو جۆرن:

أ/ (هۆڕمۆنە ناستیرۆدیدەکان) کە لە گەرد (جُزَيء - mocol)ی گەورە پێکهاتوون و، ناتوانن یەکسەر بچنە نێو خانەکانەوە، بەڵکو لە دەرەوەی کیف و بەرگی خانەکان، وەردەگیرێن و، لەوێوە کارلێکیان لەگەڵ دا دەکرێ.

www.alibapir.com





ب/ (هۆڕمۆنە ستیرۆدیدەكان) هۆڕمۆنی قەبارە بچووكن و، ئەوانە لە ڕێی گەردی پرۆتینی نێو (سایتۆپلازم)ی خانەكانەوە، دەچنە نێو خانەكان و، لەبەر ئەوەی كە بچووك و وردن، خۆیان ڕاستەوخۆ دەچنە نێو خانەكان، نەك لەسەر دیواری خانەكان وەربگیرێن و، كارلێكیان لەگەڵدا بكەن.

## بەندی چوارەم: كەرە ڕژێنەكان (الغدد الصماء):

هەرچەندە پێشتریش تاڕاددەیەك پێناسەمان كردن، بەڵام بۆ زیاتر ناساندنیان دەڵێین:

ئەوانە بریتین لە تۆپەڵە شانەیەكی قەبارەی گچكە، كە لە چەند شوێنێكی جیاوازی جەستەدا هەن، هەندێك ماددەی كیمیایی دەردەدەن بە ناوی هۆڕمۆن، كە ئەندازەی ئەو ماددەیە زۆر زۆر كەمە، بەڵام كاریگەریی لەسەر خانەكان یەكجار زۆرە، ئەو هۆڕمۆنانە یەكسەریش دەڕژێنە نێو خوێنەوە و، پرۆتینەكان دەیانگوازنەوە بۆ خانەكان.

## بەندی پێنجەم: جۆرەكانی كەرە ڕژێنەكان (الغدد الصماء) و هۆڕمۆنەكانیان:

ئەم بەندە بە تەنیا لە هەر چوار بەندەكەی پێشوو زیاترە و دەتوانین بڵێین: بەندەكانی پێشوو زیاتر ڕێ خۆشكەری ئەم بەندەن.

سەرەتا دەڵێین: ئەو لووانە، ئەو ڕژێنانە بۆیە پێیان دەگوترێ: (كەرە ڕژێن)، چونكە داخراون و ئەوە نیە كراوە بن بەسەر بۆڕییەكانی خوێندا، بەڵكو لەنێو خۆدا داخراون و، ئەو ماددەیەی كە پێیانە، یەكسەر دەیڕژێننە نێو خوێنەوە.

شایانی باسە: یازدە (١١) كەرە ڕژێنی سەرەكیی هەن لە جەستەدا:

www.alibapir.com


**یەکەم: ڕژێنی ژێر مێشك (غده تحت المهاد):**

ئەمەیان نۆ (٩) جۆرە هۆڕمۆن دەردەدات، کە زۆربەیان بە ڕژێنی نوخامییەوە پەیوەستن، دوایی باسی ڕژێنی نوخامیی (الغدة النخامية) دەکەین، ئنجا ئەم نۆ(٩) هۆڕمۆنە، کۆنترۆڵی هۆڕمۆنەکانی ڕژێنی نوخامیی دەکەن، چ بە فەرمان کردن بە زیادکردنیان، چ بە ڕاگرتنیان، واتە: ئەو ڕژێنەی ژێر مێشکە، فەرمان دەکا بە ڕژێنی نوخامیی، کە فلان هۆڕمۆنە زیاد بکە و فلان کەم بکە!

ئێمە ئاگامان لە هیچ نیە، بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) تەگبیرو نەخشەو بەرنامەیەکی لە نێو جەستەی ئێمەدا داناوە، کە بەس بۆ خۆی هەموو شتێکی لەبارەوە دەزانێ و، زانیاریی وردە وردە خەریکە هەندێك لاپەڕەی لێ هەڵدەداتەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣.

واتە: لەمەودوا لە ئاسۆیەکان و لە خۆشیاندا نیشانەکانمانیان - لەسەر پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتییمان بۆ گەردوون - پیشان دەدەین، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە (خوا یان قورئان) هەقە....

**دووەم: ڕژێنی نوخامیی (الغدة النخامية):**

ئەم ڕژێنە بە قەدەر دەنکە نۆکێکە، واتە: تیرەکەی یەك (١سم)ە، شوێنە جوگرافییەکەی دەکەوێتە بنکی مێشکەوە و، بەهۆی قاچۆکەیەکەوە بەڕژێنی ژێر مێشکەوە پەیوەستە، لە دوو پل(فص) پێك دێ، کە نێوانێکیان هەیە و، هەر کامێکیان بە جیا کاری خۆی دەکات، پلی پێشەوەیان تەنیا کاری بریتیە لە دەردانی هۆڕمۆنەکان، بەڵام بەشی دواوەیان لە ڕێی غوددەی ژێر مێشکەوە، یەکسەر بە مێشکەوە پەیوەستە، ئنجا نیوەی هۆڕمۆنەکان کە (نوخامیی) دروستیان دەکات، کاری ڕێکخستن و کۆنترۆڵی کەرە ڕژێنەکان، دەکەن، واتە:

www.alibapir.com


ڕژێنی نوخامیی وەك گەورەو پادشای هەموو ڕژێنەکانی دیکە وایە، لەوێوە سەرپەرشتیارییان دەکات، کەم بکرێن، زیاد بکرێن، بۆ کوێ بچن، چۆن بچن؟

أ- ئنجا بەشی پێشەوەی ڕژێنی نوخامیی، هەشت (٨) جۆرە هۆڕمۆن دەردەدات:

١- هۆڕمۆنی گەشە کردن.

٢- هۆڕمۆنی هاندەری ڕژێنی کەظەریی، کە دوایی باسی دەکەین.

٣- هۆڕمۆنی هاندەری ڕژێنی دەرەقیی، کە دوایی باسی دەکەین.

٤- هۆڕمۆنی هاندەری تۆودانە جینسییەکانی، پیاوو ئافرەت (الحویصلات التناسلیة).

٥- هۆڕمۆنێکی زەردباو، کە پێی دەگوترێ: (الأصفري) و هاندەری گونی پیاو و هێلکەدانی ئافرەتە، بۆ دەردانی هۆڕمۆنە جینسییەکان.

٦- هۆڕمۆنی برۆلاکتین، کە یارمەتیی ئافرەت دەدات، شیر دروست بکات و، ئەم هۆڕمۆنە شیر ڕێژە(مُدِرٌّ للحلیب).

٧- هۆڕمۆنی هاندەری (میلانین)، کە هانی خانە ڕەنگییەکانی پێست دەدا، کە میلانینی زیاتر دەر بدەن، بۆ ئەوەی ڕەنگەکە تۆخ تر بێ، یاخود کەمتر بێ، بۆ ئەوەی ڕەنگەکە کاڵتر بێ.

٨- هۆڕمۆنی (ئەندرۆفین)، کە لە پێشوازیی کەرانی کۆئەندامی مێشك و دەمار دا هەیە و هەستکردن بە ئازارو ماندوویێتیی، لە مرۆڤ دا کەم دەکاتەوە.

ب- بەشی دواوە غوددەی نوخامیی، تەنیا کاری هەڵگرتنی ئەو دوو هۆڕمۆنەیە، کە ڕژێنی ژێر مێشك دەریان دەدا، کە بریتین لە:

**یەك/** هۆڕمۆنی ڕێگرتن لە میز کردن، بۆچی ئینسان لە خۆڕا میزی نایەت؟ هۆڕمۆنێك هەیە، هەتا ئەو دەست بەکارنەبێ، مرۆڤ میزی بۆ ناکرێ.

**دوو/** هۆڕمۆنی (ئوکسیتوسین)ە، کە لە ماوەی حامیل بوونی ئافرەتدا و لە دوای منداڵبوونیشی، دەردانی زیاد دەبێ و، ئافرەت هەم مەسەلەی منداڵ دانانی بۆ ئاسان دەبێ و، هەم مەسەلەی شیر پێدانی.

سێیەم: ڕژێنەکاژ (الغدة الصنوبرية):

ئەمیش ڕژێنێکی زۆر بچووکە، لە نێو ئێسکێکی گچکەدا، کە وەك ئەشکەوتێکی بچووك وایە و، لە ناوچەی ڕژێنی ژێر مێشك دایە، شێوەی دەنکە کاژ (صنوبر)ی هەیە، یەك سانتیم درێژییەکەیەتی و، نیو سانتیم پانە و، یەك لەسەر دە (١٠/١)ی غرامێك قورسە.

هۆڕمۆنێك دەردەدات کاریگەریی لەسەر ڕێکخستنی ئەو کارانەی جەستە هەیە، کە بە شێوەی دەوریی ڕوودەدەن، وەك خەوتن و لە خەو هەستان، هەروەها برسیی بوون و تینوو بوون، ئنجا جووت بوونی پیاوو ئافرەت، پاشەرۆك دانان، هەروەها عادەتی مانگانەی ئافرەتان، ئەوانە هەموویان لەلایەن ئەم ڕژێنە کاژەوە، ئەنجام دەدرێن، گرنگترین هۆڕمۆن کە دەری دەدا، بریتیە لە هۆڕمۆنی (میلاتۆنین).

چوارەم: ڕژێنی دەرەقیی(الغدة الدرقية):

ئەمیش دەکەوێتە پێشەوەی مل، لای قوڕقوڕاگە و لە شێوەی پەپوولەدایە، پانییەکەی پێنج (٥) سم دەبێ و بەرزییەکەی چوار (٤) سم دەبێ و، کێشەکەی سی (٣٠) گرام دەبێ، ئەویش لە دوو بەش پێك دێ و، سێ جۆرە هۆڕمۆن دەردەدا:

١- (ثایرۆکسین).

٢- (پیرۆنین) ئەم دووانە هەڵدەستن بە کۆنترۆڵکردنی کاری هەرس کردن لە نێو خانەکاندا، هەروەها گەشەپێدانی جەستە بە گشتی و، کۆئەندامی مێشك و دەمار بە تایبەت.

٣- (کالیستۆنین)، ئەمیش هەڵدەستێ بە ڕێکخستن و، سەقامگیرکردنی کالیسیۆم و فۆسفۆڕ لە خوێندا، بۆیە لە کاتێکدا (یۆد) کەم دەبێتەوە لە جەستەدا، کە پێکهێنەری بنەڕەتی ئەو هۆڕمۆنانەیە، کە ڕژێنی دەرەقیی

دەریان دەدا، تەماشا دەکەین ڕژێنی دەرەقیی زۆر گەورەیە، هەندێ کەس کە ئەو شوێنەی زۆر دەئاوسێ، هۆی ئەوەیە کە ئەو نەخۆشییەی هەیە.

**پێنجەم: ڕژێنی دراوسێی دەرەقیی (الغدة الجار درقیة):**

دیارە ئەمیش لە چوار ڕژێنی بچووك پێکدێ، کە هەر کامێکیان بە قەدەر دەنکە نیسکێکن و، دەکەوێتە لای سەرووی ڕژێنی دەرەقیی و، لە هەر چوار لایەکانی دا هەن، ئەوانیش چەند هۆڕمۆنێك دەردەدەن، لە هەموویان گرنگتر (باڕاثرمون)ە، کە هەڵدەستێ بە ڕێکخستنی مژینی کالیسیۆم لە کۆئەندامی هەرسدا و، لە کۆئەندامی میزدا و پارێزگاریی کردن لە ئاستی کالیسیۆم لە جەستەدا، هەر بۆیەش کەمیی ئەم هۆڕمۆنە، دەبێتە هۆی ئەوە کە بە خێرایی کالیسیۆم دابەزێ و، شوێنەوارەکانیشی بە تایبەت لەسەر کۆئەندامی مێشك و دەمار - کە بە پلەی یەکەم پشت بە کالیسیۆم دەبەستێ - دەردەکەوێ.

**شەشەم: ڕژێنی زەعتەریی:**

ئەمیش ڕژێنێکی داخراوی ڕەنگ سوورە، کە دەکەوێتە لای بەشێك لە بۆڕی هەوا، نزیك لە لای سەرەوەی دڵ و لە ژێر ئێسکی دەفەی سینگ، کە بە شێوەیەکی پان هەڵکەوتوە و، پێنج (٥)سم درێژە و، چوار (٤)سم پانە، بەڵام ئەستوورییەکەی نیو (٠،٥)سم و، کێشەکەشی سی و پێنج (٣٥) گڕامە، لە سەرەتای تەمەنەوە زۆرە، بەڵام تاکو ئینسان دەکەوێتە تەمەن، کێشی کەم دەکات و بچووك دەبێتەوە، تاکو لە دوای تەمەنی شەست (٦٠)ساڵیی، تەنیا پازدە(١٥)گڕامی لێ دەمێنێتەوە، لەو سی و پێنج(٣٥) گڕامە.

ئەمیش هۆڕمۆنێك دەردەدا بەناوی: (ثیموسین)، کە هەڵدەستێ بە ڕێکخستنی کۆئەندامی بەرگریی کردن لە جەستە و، هاوکاری دەکات بۆ بەرهەمهێنانی خانە لیمفاوییەکان و، کەمیی لە جەستەدا، دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ بەرهەڵستیی (مناعة) لە جەستەی دا، کەم بێتەوە و، هەندێك لە پسپۆڕان دەڵێن: کاریگەرییشی هەیە بۆ ئەوە کە ئینسان خێراتر فێری زمان ببێ، واتە: ئەو منداڵانەی کە ئەو هۆڕمۆنەیان کەمە، درەنگتر فێری قسە کردن دەبن.

www.alibapir.com



**حەوتەم: ڕژێنی کەظەریی پشت گورچیلە (الغدة الكظرية فوق الكلية):**

کە - وەك پێشتر باسمان کرد - لە شێوەی کڵاوێك، لە شێوەی تەڕبووشێك لەسەر هەردووك گورچیلەکان ئەو ڕژێنە هەیە، درێژییەکەی حەوت (٧) سم و، بەرزییەکەی یەك (١)سم و، کێشیشی لە نێوان: (٤ - ٥) گرام دایە.

ئەمیش کۆمەڵێك هۆڕمۆن دەردەکات:

**١و٢و٣:** (کۆرتیزۆل، کۆرتیزۆن، کۆرتیکۆسترون)، ئەم سێ هۆڕمۆنە، هەر سێکیان کار دەکەن لەسەر چالاککردنی کاری زیندەچالاکیی (أيْض) لە نێو خانەکاندا و، پارێزگاریی کردن لە ئاستی شەکر لە نێو خانەکاندا.

٤- هۆڕمۆنێکی دیکە دەردەکات بە ناوی: (ئەندوستیرۆن)، کە پارێزگاریی دەکات لەسەر هاوسەنگیی خوێ یەکان لە خوێندا و لە خانەکاندا.

**٥و٦و٧:** هەروەها سێ هۆڕمۆنی جنسیی، بە ناوەکانی: (ئەستڕۆجینات، ئەندرۆجینات، بڕۆجسترۆنات)، دەردەدات، ئەمانەش هەموویان هۆڕمۆنی جینسیین.

**٨و٩:** هەروەها هۆڕمۆنێکی دیکە بەناوی: (ئەدرینالین) و یەکی دیکە بەناوی: (نوور ئەدرینالین)، ئەمانیش پارێزگاریی دەکەن لە فشاری خوێن، لە کاتی دابەزینیدا، وا دەکەن کە بەرز بێتەوە و، لە کاتی بەرزبوونەوەی دا، کار دەکەن لەسەر نزم کردنەوەی.

**هەشتەم: ڕژێنە گورچیلەییەکان (الغدد الكلوية):**

گورچیلەکانیش کۆمەڵێك هۆڕمۆن دەردەکەن:

١- هۆڕمۆنی: (ئیرثر بایوستین)، کە کار دەکات لەسەر پێکهاتنی خڕۆکە سوورەکانی خوێن.

٢- هۆڕمۆنی: (ئەنجیوتینسین)، کە کار دەکات لەسەر فراوان کردن و تەسك کردنەوەی دەمارەکانی خوێن، بەپێی حاڵەت، ئەگەر فشار بەرز بێ، وا دەکەن

www.alibapir.com





دەمارەكانی خوێن فراوان بن، بۆ ئەوەی فشارەكە دابەزێ و، ئەگەر فشار (ضغط) نزم بێ، وا دەكەن دەمارەكانی خوێن بێنەوە یەك، بۆ ئەوەی فشارەكە بەرز بێتەوە.

٣- هۆڕمۆنی: (كالیستریۆن)، كە ڤیتامین (D) بەرهەم دێنێ بۆ چالاككردنی ڕیخۆڵە وردەكان لەسەر مژینی كالیسیۆمێك كە لە خواردنی هەزم كراودا هەیە.

**نۆیــەم: ڕژێنی پەنكریاس:**

كە پێشتریش هەر باسمان كردوە و، ئەمیش سێ جۆرە هۆڕمۆن دەردەدات:

١- هۆڕمۆنی (ئەنسۆلین): كە كاری بریتیە لە مژینی شەكری كلۆكۆز لە میانی سووتاندنی وزەدا.

٢- هۆڕمۆنی (گلوكاگۆن): كە پارێزگاریی دەكات لە ئاستی شەكر، چ بەرزی بكاتەوە، چ نزمی بكاتەوە، یانی: پێویست بوو، بەرزی دەكاتەوە و، كە زیاد بوو، نزمی دەكاتەوە.

٣- هۆڕمۆنی (ئەمیلین): كە هاوكاریی (ئەنسۆلین) دەكات و هاندەرە بۆ جووڵەی ڕیخۆڵەكان.

**دەیەم: ڕژێنە وەچەییەكان (غدد المناسل):**

ئەمانە لە ئافرەتدا: لە هەردووك هێلكەدانی ئافرەتدا هەن و لە پزدان، ئاوەڵ منداڵ (مَشيمة)[1]شدا هەن، لە كاتێك دا كە ئافرەت حەملی هەیە، بەڵام لە پیاودا لە هەردووك گونەكانیدا هەن.

**یەك:** ئەوانەی هێلكەدانی ئافرەت، دوو جۆرە هۆڕمۆن دەردەدەن:

١- هۆڕمۆنی (ئیسترۆجین)، كە ئەم هۆڕمۆنە كار دەكات لەسەر ئەوەی تایبەتمەندییەكانی ئافرەت قووڵ بكاتەوە، وەك ئەوە كە:

---

(١) پزدان، ئاوەڵ منداڵ: (مَشيمة: قُرص لَحميٌّ على جدار الرَّحم أثناء الحمل، تمدُّ الجنين بالغذاء والأوكسجين) إبداع الرحمن في جسم الإنسان، ص٣٥٨.

www.alibapir.com



أ- مووی زیاتر گەشە بکات، لە قژی دا و بە پێچەوانەوە: لە دەم و چاوی دا، موو نەیەت.

ب- پاشان دەنگی نەرم و ناسك بێ و بەدەنی ناسك بێ، بۆیەش هەندێك ئافرەت كە دەكەونە تەمەنەوە، موو لە هەندێك شوێنیان دێ، كە پێشتر لێی نەهاتوە، هەروەها دەنگیان گڕ دەبێ، لەبەر ئەوەی كە ئەم هۆڕمۆنەیان، كە هۆڕمۆنی (ئیسترۆجین)ە، كەم دەبێتەوە.

٢- هەروەها دوو هێلكە دانەكەی ئافرەت، هۆڕمۆنێكی دیكەش دەردەدەن، بە ناوی: (برۆجیسترۆن)، كە ئەمیش كار دەكات لەسەر فراوان بوونی منداڵ دان، لە كاتێكدا كە ئافرەت دوو گیان دەبێ، بۆ ئەوەی كە منداڵدانی فراوان بێت و، جێی كۆرپەكەی تێدا ببێتەوە و، كە وردە وردە كۆرپەكە گەورە دەبێ، ئەو منداڵدانەش فراوان دەبێ، بە هۆی ئەو هۆڕمۆنەوە.

**دوو:** دوو گونەكانی پیاویش هۆڕمۆنێك دەردەدەن بەناوی: (تیستۆستیرۆن)، كە ئەمیش كار دەكات لەسەر گەشەپێدانی تایبەتمەندییەكانی پیاو، وەك:

أ- دەنگی گڕ.

ب- موو لە شوێنی سمێڵ و ڕیشی بێ.

ج- ماسوولكەكانی بەهێز بن و، هەروەها ئەو شتانەی كە تایبەتمەندیی پیاون، بۆیەش پیاوانێك كە لەم هۆڕمۆنەیان كەم بێ، لە تایبەتمەندییەكانی پیاویشیان كەم دەبێتەوە، پیاوانێك كە دەكەونە تەمەنەوە، دەنگیان ناسك دەبێتەوە و ئەو تایبەتمەندییانەیان كە پێشتر هەیان بوون، لێیان كەم دەبێتەوە.

**یازدەیەم و كۆتایی: ڕژێنەكانی كۆئەندامی هەرس:**

هەروەها كۆئەندامی هەرس، بەتایبەت گەدە و ڕیخۆڵەكان، چوار جۆرە هۆڕمۆن دەردەدەن:

١- (جاسترین)، ٢- (كۆلیستۆكینین)، ٣- (سكریتین)، ٤- (جریلین).

www.alibapir.com



ئەم چوار هۆرمۆنە، ڕژێنەکانی نێو کۆئەندامی هەرس دەریان دەدەن، کاریشیان بریتیە لە ڕێکخستنی کارە جۆراو جۆرەکانی کە پێکهاتەکانی کۆئەندامی هەرس پێیان هەڵدەستن: زار، قورقوڕاگە، سووریێنچك، گەدە، ڕیخۆڵە باریکە، ڕیخۆڵە ئەستوورە، پەنکریاس، زراو، ئەم هۆرمۆنانە، یارمەتی ئەوانە هەموویان دەدەن، بۆ ڕێکخستنی کارەکانی خۆیان و، ئەم ڕژێنانەی کە یارمەتیی کۆئەندامەکانی هەرس دەدەن، لە هەموو شوێنەکانی و لە هەموو ئەندامەکانی کۆئەندامی هەرس دا هەن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە (کۆئەندامی هەرس) لە هەموویان پێك دێ: لە زارەوە کە پرۆسەی هەرس کردنی خواردن دەست پێ دەکا و، بە قورگ و قورقوڕاگەدا تێدەپەڕێ و، دوایی لە سووریێنچکەوە دێتە نێو گەدە، دوایی ڕیخۆڵە باریکەو دوایی ڕیخۆڵە ئەستوورە و تا کۆتایی، لە هەموویان دا پرۆسەی هەرس کردنی خواردن هەیە، بۆیە ئەو هۆرمۆنانە لە نێو هەموو ئەو بەشانەی کۆئەندامی هەرس دا هەن، جگە لەوەش لە نێو پەنکریاس و زراویشدا هەن، کە لە دەرەوەی بۆڕی کۆئەندامی هەرسن، لەبەر ئەوە کە ئەوانیش هاوکاری ئەنجامدانی پرۆسەی هەرس کردنن.

لە نۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر



## خاڵی یازدەیەم: کۆئەندامی لیمفاویی (الجهاز الیمفاوي):

خوێنەرانی سەنگین!

ئەم کۆئەندامە (کۆئەندامی لیمفاویی)، لە دوو بەنددا دەتوێژینەوە:

بەندی یەکەم: پێناسە و ئەرکی بنەڕەتیی کۆئەندامی لیمفاویی.

بەندی دووەم: پێکهاتەکانی کۆئەندامی لیمفاویی و چۆنیەتی کاریان.

### بەندی یەکەم: پێناسە و ئەرکی بنەڕەتیی ئەو کۆئەندامە:

پێناسەی ئەم کۆئەندامە، لە میانی خستنە ڕووی ئەرکەکەی دا دەکرێ و، ئەرکەکانیشی دوو کاری گەورە و گرنگن:

**یەکـــەم:** یارمەتییدانی کۆئەندامی خوێن، لە ڕاکێشان و هێنانەوەی ئەو شلەمەنییانەی کە لە خانەو شانەکانی جەستەدا کۆدەبنەوە، کە خوێن هەر خۆی ئەو خۆراکەی بۆ ناردوون، بەڵام وەك شتێکی زیادە و وەك پاشەرۆکێك لە خانەکاندا دەمێننەوە، ئنجا لە ڕێی ئەو کۆئەندامی لیمفاوییەوە، دەهێنرێنەوە، دەگێڕدرێنەوە، بۆ ئەوەی پاراستنی هاوسەنگیی شلەمەنییەکان لە جەستەدا، ئەنجام بدرێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ڕێژەی شلەمەنییە نێردراوەکان کە لە خوێنبەرەکان (شرایین)ەوە ئەنجام دەدرێ، چونکە خوێنبەرەکان بە ترومپایەکی بەهێزی دڵەوە، پەیوەستن و ئەو خوێنە بەگوڕم دەنێرێ، کە ئەو شلەمەنییانەی تێدایە، خوێنەکە لەم سەرەوە زۆر بە خێرایی و بە قوەتەوە دەچێ، بەڵام لەو سەرەوە کە دەگەڕێتەوە، بە شێوەیەکی ئاسایی دەگەڕێتەوە، بۆیە هەندێك پاشماوە دەمێننەوە کە پێویستە کۆئەندامێکی دیکە هەبێ، ئەو شلەمەنییانە بهێنێتەوە، لەبەر ئەوەی دڵ ترومپایەکی تایبەتیی نیە بە گێڕانەوەو هێنانەوەی خوێن،

www.alibapir.com





وێنەی (٢٥) کۆئەندامی لیمفـــاوی

بەڵکو بە شێوەی ئاسایی دێتەوە، بە تایبەت ئەو شلەمەنییە زیادانە، بۆیە لە ڕێی ئەم کۆئەندامی لیمفاوییەوە، ئەو کارە ئەنجام دەدرێ.

ئنجا ژمارەیەکی زۆر لە خوێن هێنەرەوەکان (أوردة)، کە کۆتاییەکانیان وەك ئەوانی دیکە - کە بەشێوەیەکی ئاسایی خوێنیان پێدا دێت و دەچێ - پەیوەست نەبوونەوە بە خوێنبەرەکانەوە، ئەگەرنا سوڕی خوێن لە نێو خۆیدا داخراوە: خوێنبەرەکان خوێن دەبەن و، خوێنهێنەرەکان دەیهێننەوە و پێکەوە پەیوەستن، بەڵام ئەو خوێنهێنەرەوان (أوردة)ەی تایبەت کراون بە کۆئەندامی لیمفاوییەوە، ئازادن، یەکسەر ئەو شلەمەنییانە کۆدەکەنەوە لە خانەو شانەکان و، بەو وردە دەمارانەدا دەیانهێننەوە بەرەو دڵ، کە ڕۆژانە دەوری پێنج (٥) لیتر لەڕێی ئەو کۆئەندامی لیمفاوییەوە، لەو شلەمەنییانە لە ڕێی دەمارە لیمفاوییەکانەوە، دەگەڕێتەوە، ڕۆژانە پێنج (٥) لیتر شلەمەنیی کەم نیە!

**دووەم:** مژینی چەورییەکانی نێو خواردنی هەرسکراو لە ڕیخۆڵە باریکەدا، دووبارە ڕشتنەوەی بۆ نێو خوێن، دوای ئەوەی کە لە جەرگدا پاك دەکرێتەوەو پاڵفتە دەکرێ.

ئەمە بە کورتیی ئەرکی بنەڕەتیی کۆئەندامی لیمفاویی یە.





## بەندی دووەم: پێکهاتەکانی کۆئەندامی لیمفاویی و چۆنیەتی کاریان:

کۆئەندامی لیمفاویی، حەوت پێکهاتەی سەرەکیی هەن:

**پێکهاتەی یەکەم: بۆڕیچە لیمفاوییەکان (الأوعیة اللِّمفاویة):**

کۆئەندامی لیمفاویی خوێنهێنەرەوە (أوردة)ی زۆر بەکاردێنێ بۆ یارمەتییدانی خوێنهێنەرەوەکانی کۆئەندامی خوێن، ئنجا ئەو بۆڕیچە و بۆڕیچکانە لە هەموو شوێنێکی جەستەدا نین، بۆ وێنە: لە کۆئەندامی مێشك و دەمار دا نین و، لە نێو ئێسقاندا نین، هەروەها لە نێو پێستیش دا نین.

ئنجا لەبەر نەبوونی ترومپا(مِضخَّة)یەکی دڵ، کە ئەوانە ڕاکێشێتەوە، ئەو وردە بۆڕییانە و ئەو بۆڕیچکانە، زمانە(صمَّام)یان زۆرن، کە ڕێگا نادەن بە جوولەی شلەمەنیی، مەگەر بە ئاڕاستەی دڵدا، واتە: هەر کاتێ ئەو شلەمەنییە ویستی بگەڕێتەوە، ئەو زمانانە دەیگرن و، دەبنە بەربەستێك و، دەبێ ئەو شلەمەنییە هەر بەرەو دڵ بجوولێ.

ئنجا ئەو وردە بۆڕییانەش دواتر تێکەڵ دەبنەوە بە دوو بۆڕیی سەرەکیی (قناتین رئیسیتین):

**یەکەمیان:** پێی دەگوترێ: جۆگەلەی سینە (قناة الصَّدر)، یاخود بۆڕی سینە، هەروەها پێشی دەگوترێ: بۆڕی لیمفاویی چەپ، کە دەڕژێتەوە نێو جۆگەلەی سینە، لەلای خوێنهێنەرەوەی چەپی چۆڵەمە(ترقوة)، کە درێژییەکەی چل (٤٠) سم دەبێ و تیرەکەی، ئەستوورییەکەی: نیو (٥،٠ سم)ە.

**دووەمیان:** لە دوو بۆڕییە سەرەکییەکە، کە شلەمەنییە لیمفاوییەکان دەڕژێنەوە نێوی، کە لە وردە بۆڕییەکانەوە دێنەوە، ئەمیش شلەمەنییەکانی: قۆڵی ڕاست و شانی ڕاست، هەروەها هی سەرو مل و بەشێك لەلای ڕاستی سینە، کۆدەکاتەوە

www.alibapir.com





و دەیانڕێژێتەوە نێو خوێنهێنەرەوەی چۆڵەمەی لای ڕاست، کە درێژییەکەی زۆر کەمە، یەك (١ سم)ە، ئەمە پێکهاتەی یەکەمی کۆئەندامی لیمفاوییە.

**پێکهاتەی دووەم: (لیمف) شلەمەنیی لیمفاوییی:**

کە بریتیە لە شلەمەنییەکی ڕوونی زەردباو، ئەو شلەمەنییە لە پێنج شتان پێکهاتوە:

١- ئاوی زیادی جەستە.

٢- پڕۆتینە گەورەکان، کە ناتوانن بچنەوە نێو مولوولەکانی خوێنەوە.

٣- خڕۆکە سپییەکان.

٤- ترشە چەورییەکان (الأحماض الدهنية).

٥- تەنۆلکە نامۆیەکان بە جەستە (الأجسام الغريبة).

**پێکهاتەی سێیەم: لیمفە گرێیەکان:**

ئەوانیش بریتین لە تۆپەڵە شانە بازنەییەکان، کە تیرەیان یەك (١ ملم) تاکو بیست و پێنج (٢٥ملم) دەبێ، واتە: لە قەبارەی دەنکە نیسکەوە، تاکو هی دەنکە بادەم.

ژمارەشیان شەشسەد (٦٠٠) دانە دەبێ، لە هەموو جەستەدا، ئەوانە شوێنەکانیان لەسەر ڕێی بۆڕییە لیمفاوییەکانە، کە ئەو شلەمەنییانە دێننەوە، بەڵام بە تایبەت لە: قوڕگ و، بن هەنگڵ و، حەوزو، سینگ و، ڕیخۆڵەکاندا، بەرجەستەترن.

**پێکهاتەی چوارەم: لەوزەکان:**

(لَوْز) یانی: بادەم، بەڵام بۆ هی هەموو شوێنەکان، ئەم وشەیان بەکارهێناوە، ئەوانیش چوار جۆرن:

١- جووتێکیان لەملاو لای گەروون، ئەوەیان هەموو کەس دەیانزانێ، دەگوترێ: لەوزەکانی هەڵساون، بۆیەش دەڵێن: لەوزە، چونکە یەکی بە قەدەر دەنکە بادەمێك دەبن.

www.alibapir.com


٢- جووتی دووەم لەلای مەلاشوو بەلای لووت دان، کە پێیان دەگوترێ: لەوزەی بۆڕیی (اللوز الأُنبوبية).

٣- جووتی سێیەم کە جۆری سێ یەمی لەوزەکانن، پێیان دەگوترێ: لەوزەی قوڕگ (لوز البلعوم)، کە لە سەقفی قوڕگ، بەرانبەر بە دوو کونەکەی پشتەوەی لووت دان.

٤- کۆمەڵەی چوارەم، پێیان دەگوترێ: لەوزەکانی زمان (اللوز اللسانية)، کە کۆمەڵە لەوزەیەکن ژمارەیەکی زۆرن، لەسەر شێوەی دەنکۆڵەی ورد، لەسەربانی سەرەوەی بنکەی زمان، دانراون.

ئەم لەوزانە هەموویان هێڵی یەکەمی بەرگریی جەستە و، پارێزگاریی لێ کردنی کۆئەندامی هەرس و کۆئەندامی هەناسەدانن، کە میکرۆبەکان دەیانەوێ لە ڕێی خواردن و خواردنەوەوە بە قوڕگ دا، یاخود لە ڕێی هەواوە بە قوڕگ و لووت دا، بێنە ژووری، ئەوانە ڕێیان پێ دەگرن.

**پێکهاتەی پێنجەم: سپڵ (طحَـال):**

پێشتریش باسمان کردوە: درێژییەکەی: دوازدە (١٢سم)ە و، پانییەکەی: حەوت (٧سم)ە و، ئەستوورییەکەی: سێ (٣سم) دەبێ، کێشیشی: سەدو حەفتاو پێنج (١٧٥)گرام دەبێ.

(سپڵ)یش هەڵدەستێ بە پاڵاوتنی خوێن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و، دەرباز کردنی جەستە لەو تەنۆلکە نامۆیانەی کە دێنە نێوی و، تێکشاندن و هەڵوەشاندنەوەی خڕۆکە سوورە مردووەکان و، کۆکردنەوەی ئەندازەیەکی باش لە خڕۆکە سوورە تازەکان و لە نێوخۆ گرتنیان، بۆ ئەوەی پێ بگەن و، لە کاتی پێویستدا بیانداتەوە بە جەستە.

**پێکهاتەی شەشەم: ڕژێنی زەعتەریی:**

ئەویش پێشتریش باسمان کردوە و، ئەم ڕژێنە، ئەم لووە، هەم پەیوەستە بە هەر کام لە: کاری هۆڕمۆنییش و لیمفاوییش و هۆڕمۆنێك دەردەدا بەناوی

www.alibapir.com





(ثیموسین)، کە کاری بریتیە لە ڕێکخستنی کاری کۆئەندامی بەرگریی، هەروەها هاوکاریی دەکا بۆ بەرهەم هێنانی هەندێك لە خانە لیمفاوییەکان.

هەروەها ڕژێنی زەعتەریی، هەڵدەستێ بە فەرمان کردن بە مۆخی ئێسقان، کە خانەی لیمفاویی بەرهەم بێنن و، ئەو خانە لیمفاوییانە کە پێ نەگەیشتوون، پێشوازییان بکات و، بیانگرێتە خۆی تاکو پێ دەگەن، دوایی جارێکی دیکە بیانڕژێنێتەوە نێو خوێن.

**پێکهاتەی حەوتەم و کۆتایی: مۆخی ئێسقان (نُخاع العظم):**

(مۆخی ئێسقان) پێشتریش گوتومانە: شانەیەکی ئێسکیی ئیسفنجییە و، خانە ئێسکییەکان دەگرێتە خۆی و، مۆخی ئێسقان، چ مۆخی سووری ئێسقان، چ مۆخی سپی، مۆخی سووری ئێسقان، لە زۆربەی هەرە زۆری ئێسکەکانی بەدەن دا هەیە و، هەڵدەستێ بە بەرهەم هێنانی خڕۆکە سوورەکان و خەپلەکانی خوێن.

بەڵام مۆخی سپی ئێسقان، بە زۆریی لە ئێسکە درێژەکاندا هەیە، وەك هی ڕان و قۆڵ و باسك و لوولاك، ئەویش کارگەی بەرهەم هێنانی خڕۆکە سپییەکانە.

مۆخانی ئێسقان بە گشتیی لە جەستەدا: (٤٪)ی جەستە پێك دێنێ و، لە نێو مۆخی ئێسقاندا، (خانە بنجییەکان) (stem cells) (الخلايه الجذعية)هەن، کە هەڵدەستن بە بەرهەم هێنانی خڕۆکەی سوورو سپی و خەپلەکانی خوێنیش.

ئنجا خڕۆکە سپییەکان، کە لە هەر یەك میللی مەتر سێ جا(١ملم$^{٣}$)ی خوێندا: (٥٠٠٠ - ١٠٠٠٠)خانەی خڕۆکەی سپی تێدایە، بەڵام قەبارەی خڕۆکە سوورەکان، یەك میللی مەتر سێ جا (١ملم$^{٣}$)یان، دەگاتە پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) خڕۆکەی سوور! چونکە خڕۆکە سوورەکان، زۆر بچووکترن و زۆرتریشن لە خڕۆکە سپییەکان.

ئنجا خڕۆکە سپییەکانیش سێ جۆرن:

١- خانە دەنکۆڵەییەکان (الخلايا الحُبَيبيَّة).

www.alibapir.com



٢- خانە لیمفاوییەکان (الخلايا الليمفاوية).

٣- خانە یەکییەکان (الخلايا الأحادية).

١)- خانە دەنکۆڵەییەکان: (٥٠٪ - ٦٠٪)ی خڕۆکە سپییەکان، پێك دێنن و، تیرەیان: (١٠ - ١٥) میکرۆ مەترە، تەمەنیشیان چەند سەعاتێك، یاخود چەند ڕۆژێکە.

٢)- خانە لیمفاوییەکان: (٣٠٪ - ٤٠٪) خانەکانی خوێن پێك دێنن و، تیرەیان: (٧ - ١٥) میکرۆ مەترە و، تەمەنیشیان لە نێوان: چەند هەفتەیەك و چەند ساڵێك دایە.

٣)- خانە یەکیەکان: (١٠٪)ی خڕۆکە سپییەکان پێك دێنن و، تیرەیان: (١٠ - ٢٠) میکرۆ مەترە و، تەمەنیشیان لە نێوان: چەند ڕۆژێك و چەند هەفتەیەك دایە.

ئەم حەوتە، پێکهاتەکانی کۆئەندامی لیمفاویین، کە لەلایەکەوە یارمەتیدەری کۆئەندامی سووڕی خوێنە و، لەلایەکی دیکەشەوە بەرگرییکارێکی باش و پارێزەرێکی دڵسۆزی جەستەیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## خاڵی دوازدەیەم: كۆئەندامی پێشگیریی (الجهاز المناعي):

بەڕێـــزان!

لەم خاڵی دوازدەیەمەدا، باسی كۆئەندامێكی دیكەی گرنگی جەستەی مرۆڤ دەكەین، كە پەیوەستە بە تێكڕای كۆئەندام و ئەندام و، بگرە سەرجەم شانە و خانەكان (الأنسجة والخلايا)ی جەستەوە، ئەویش كۆئەندامی پێشگیریی (الجهاز المناعي)یە، ئێمە لە چوار بەندان دا، باسی ئەو كۆئەندامە گرنگە دەكەین:

بەندی یەكەم: پێناسە و ئەركی كۆئەندامی پێشگیریی.

بەندی دووەم: چوار دوژمنە سەرەكییەكانی جەستەی مرۆڤ.

بەندی سێیەم: هێڵی یەكەمی پاراستنی جەستە: پێشگیریی كردنی دەرەكیی (المناعة الخارجية).

بەندی چوارەم: هێڵی دووەمی پاراستنی جەستە: پێشگیریی كردنی نێوەكیی (المناعة الداخلية).



وێنەی (٢٦) كۆئەندامی پشتگیری

## بەندی یەكەم: پێناسە و ئەركی كۆئەندامی پێشگیریی:

كۆئەندامی پێشگیریی (الجهاز المناعي) جەستە دەپارێزێ لە سەرجەم زیندەوەرە وردیلەكان: (میكرۆبەكان - microbes) كە جەستە تووشی نەخۆشیی دەكەن، كە نەك هەر لە دەرەوەی جەستەوە پەلاماری جەستە دەدەن، بەڵكو لە نێو خۆشیەوە بۆ وێنە: خانە شێرپەنجەییەكان (الخلايا السرطانية) كە لە ئەنجامی زۆر هۆكاران دا، بە بەردەوامیی لە جەستەدا پەیدا دەبن، هەروەها لە پاشماوەی خانە مردووەكان و لە ژەهرەكانیش.

چونكە خانەكانی جەستە، نێچیرێكی ئاسان و كێڵگەیەكی بەپیزی نەخۆشكەرەكان (المُمْرِضات)ی وەك: ڤایرۆس و بەكتریا و كەڕوو و مشەخۆرەكانن.[1]

## بەندی دووەم: چوار دوژمنە سەرەكییەكانی جەستەی مرۆڤ:

جەستەی مرۆڤ جگە لە دوژمنە ناحەزە دیار و بینراوەكانی وەك: سەرما و گەرما و دڕندە و ئاو و ئاگر و باو و هەورە تریشقە و...هتد، چوار دوژمنی وردیلە و گچكەیشی هەن، كە بریتین لە:

١- ڤایرۆس.

٢- بەكتریا.

٣- كەڕووەكان (فطريات).

٤- مشەخۆرەكان (طفَيليات).

---

(١) إبداع الرحمن في جسم الإنسان، ص٣٧٥، د.منصور أبوشريعة العبادي.

www.alibapir.com



١- ڤـــــايرۆس:

درێژییەكەی (٢٠ - ٣٠) نانۆمەترە، نانۆمەترێك بریتیە لە یەك لەسەر یەك ملیار(١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ی مەترێك، واتە: یەك لەسەر یەك ملیۆن (١/١٠٠٠٠٠٠)ی (ملم)ێك! ڤایرۆسەكان جۆرەكان (أنواع)یان سەرژمێر ناكرێن و، ژمارەشیان یەكجار زۆرە.

ناودارترین نەخۆشییەكانی كە بەهۆی ڤایرۆسەوە پەیدا دەبن، نەخۆشییەكانی: ئەنفلەوەنزا (زكام - هەڵامەت) و، سووریژە (الحَصَبة) و ئاوڵە (الجدري)ن، دیارە نەخۆشیی دیكەش بە هۆی ڤایرۆسەوە پەیدا دەبن، بەڵام ئەوانە ناودارترینیانن.

٢- بـــەكـــتـــريا:

جۆرەكانی لە هی ڤایرۆس زیاترن و، لە نێو گڵ و ئاوو هەوادا زۆرن، بەڵام جۆرە زیانبەخشەكانی بەكتریا زۆر كەمن و جۆری سوودبەخشی زیاترە.

درێژیی بەكتریا: (١ - ٥) مایكرۆ مەترە، مایكرۆمەتر یەك لەسەر هەزاری (١/١٠٠٠)ی میللی مەترێكە، واتە: بەكتریایەك چەند سەد جار، قەبارەكەی لە ڤایرۆسێك گەورەترە، هەر بۆیەش بەكتریا بە ئاسانیی ناچێتە نێو شانەكانی جەستەوەو، وەك ڤایرۆس نیە.

ئەو نەخۆشییانەی كە بە هۆی بەكتریاكانەوە پەیدا دەبن، ئەوانیش ژمارەیەكن، بەڵام ناودارترینیان: سیل و، تیتانوس، دفتریا، سیفلس، تیفوئید (گرانەتا)ن.

٣- كەڕووەكان (الفطريات):

كەڕووەكانیش زۆر جۆراو جۆرن، تیرەیان: (١ - ٤٠) مایكرۆ مەتر دەبێ و، مەترسییان لەسەر مرۆڤ كەمترە و، نەخۆشییەكانی كەڕووەكان (فطريات) تایبەتن بە پێستەوە، بەڵام جاری واش هەیە كە بە هۆی كەمیی بەرگریی لەشەوە، دەچنە نێو شانەكان.





**٤) مشە خۆرەکان: (طفيليات):**

ئەوانیش ئەو زیندەوەرانەن کە لەسەر خوێن و جەستەی مرۆڤ دەژین، وەك: ئەسپێ و کێچ، یان لەسەر ئاژەڵ دەژین، وەك: گەنەو قرنوو.

ئەمانە چوار دوژمنەکانی جەستەن، ئنجا با بزانین خوا (سبحانه وتعالى) چ تەگبیرێکی کردوە، بۆ بەرگریی لێکردنی جەستەو پاراستنی لەو دوژمنانەی؟!

دیارە چەند شێوازێکی پێشگیریی دانراون، کە بە گشتی دەبنەوە بە دوو شێواز، یان دوو هێڵی بەرگریی، خوای کارزان بۆ پاراستنی جەستە، دایناون، کە ئێمە لە هەردووك بەندی سێ و چواردا، باسیان دەکەین:

## بەندی سێیەم: هێڵی یەکەمی پاراستنی جەستە: پێشگیریی دەرەکیی:

خوای بەبەزەیی و مشوورخۆر ژمارەیەك پارێزە و بەرگرییکاری جەستەی دروستکردوون، کە لە دەرەوەی جەستە یان لە دەرەوەی سنوور و بازنەی قەڵەمڕەوی ئەندام و کۆئەندامەکانی دا، پێشگیریی و ڕێگریی و لە دوژمن و ناحەزەکانی دەکەن، کە ئێمە لێرەدا شەش(٦) جۆریانمان هێناون:

**١)- پێســـت (جــلد):**

پێشتر باسمان کرد، کە پێست دەبێتەوە دوو بەشی سەرەکیی:

١- توێژی دەرێ (البَشَرة) کە دیوی سەرەوەی پێستە و توێخی پێستە.

٢- توێژی نێوەوە (الأَدَمَة) کە توێژی ژێرەوەی پێستە، کە هەر کامێك لە توێخی سەرەوەو، توێژی ژێرەوەی پێستیش، لە چەند پێکهاتەیەك دروست بوون و، پێشتر باسمان کردوون.



خانەكانی دیوی سەرەوەی پێست، هەموویان پێكەوە جۆش دراون و، بەیەكەوە ڕیز كراون زۆر بە مەحكەمیی، چونكە ڕیشاڵەكانی (كیراتین)یان تێدایە، كە بەربەستێكی مەحكەم لە بەرانبەر میكرۆب و دوژمنەكانی دیكەش دا دروست دەكەن.

**٢)- لیكی نێو دەم (لُعاب الفم):**

لیكی نێوزار، دوو ڕۆڵی سەرەكیی دەگێڕێ لە پێشگیریی كردن لە دوژمن و، ناحەزەكانی جەستە و پارێزگاریی لێكردنی جەستەدا:

**أ/** ئەو میكرۆبانەی لە ددان و لینجی زارو زمان و پووك و مەلاشوو، دەئاڵێن، لێیان دەكاتەوەو، لایان دەبات و دەم و ددانیان لێ پاك دەكاتەوە.

**ب/** ڕۆڵی لـــیك، لە پارێزگاریی لێكردنی جەستەدا، تەنیا ئەوەندە نیە كە دەوری پاككەرەوە ببینێ، بەڵكو هەندێك ئەنزیمیشی تێدان، كە بەكتریا زیانبەخشەكان لەبەر یەك هەڵدەوەشێننەوە و دەیانفەوتێنن.

**٣)- فــــرمێسك:**

**أ/** ئەنزیمە لێك هەڵوەشێنەرەوەكانی بەكتریای تێدان.

**ب/** چاو دەشوات و لە وشكیی و ڕەق هەڵاتن دەیپارێزێ.

**٤)- ئـــارەقە:**

**أ/** ئەمیش بەكتریا لەسەر پێست لادەبات.

**ب/** خوێ و كانزا زیانبەخشەكان لە جەستە دەخاتە دەرێ.

**٥)- چەوریی پێست:**

ئەمیش چینێكی تەنك لەسەر پێست دروست دەكات و، لە وشك هەڵاتن و سەرەنجام: دروست بوونی بەكتریاكان دەیپارێزێ.

www.alibapir.com







**٦)- گوشراوەکانی گەدە:**

گەدە چەند گوشراوێك دەردەدا، نەك تەنیا یەك گوشراو، کە ڕێژەیەکی بەرزی ترشییان هەیە و، گەدە لە میکرۆبەکان دەپارێزن.

ئەمە هێڵی یەکەمی پاراستنی جەستە و، پێشگیریی کردن لە هاتنە نێوەوەی دوژمنەکانی جەستە و زەفەر پێبردنی.

## بەندی چوارەم: هێڵی دووەمی پاراستنی جەستە: پێشگیریی نێوەکیی:

ئێستاش سەرنج دەدەینە هێڵی دووەمی پاراستنی جەستە، تاکو بزانین: خوا (سبحانە وتعالی) چ تەگبیرێکی کردوە بۆ ئەوەی لە نێوخۆی جەستەدا، بەرگریی بکرێ، دوای ئەوەی ڤایرۆس و بەکتریاو...هتد، دەگەنە نێو جەستە، بابزانین: لەوێدا خوای پارێزەر(سبحانە وتعالی) چۆن جەستە دەپارێزێ؟!

کاتێك بەرهەڵستیی دەرەکیی (المناعة الخارجیة) ڕۆڵی نەما و ڤایرۆس و میکرۆبەکان هاتنە نێو جەستەوە، ئنجا کۆئەندامی پێشگیریی خوارِسك (الجهاز المناعي الفطري)، بە چوار (٤) قۆناغ بەرگریی لە جەستە دەکات:

**١)** هێنانی خانەکانی بەرگریی بۆ شوێنی تووش بوو بە میکرۆب، ئەویش لە میانی بەرهەم هێنانی چەند هۆکارێکی کیمیایی بە ناوی (سایتۆکینات) و، هەموو ئەو خانانەی کە بەرگریی لە جەستە دەکەن، لەوێ کۆیان دەکاتەوە، بۆ ئەوەی وەك هێزێکی پەلاماردەر، هێرش بکەنە سەر ئەو میکرۆبەی کە هاتۆتە نێو جەستەوە.

**٢)** کاراکردنی سیستمی تەواوکاریی (النظام المکمِّل)، کە بە مەبەستی دەستنیشانکردنی جۆرو چییەتی ئەو ماددە نامۆیانە، یاخود ئەو میکرۆبانە و، چالاککردنی خانە بەرهەڵستکارەکان، بۆ دژایەتیی کردن و بەگژداچوونەوەیان.

www.alibapir.com





**٣)** دیاریی کردنی شوێنی ئەو ماددە نامۆیانە، یاخود ئەو میکرۆبانە، چ لە خوێندا بن، چ لە شلەمەنییە لیمفاوییەکاندا بن، (لە خانە و شانەکاندا) پاشان پاکتاوکردنیان لەلایەن خڕۆکە سپییەکانەوە، کە ئیشی تایبەتییان، بریتیە لە بەگژداچوونەوەی ئەو میکرۆبانەی دێنە نێو جەستەوە.

**٤)** کاراکردنی کۆئەندامی بەرگرییکاریی لەلایەن خانە دژ پەیدا کەرەکان (الخلايا المستضدّات)ەوە، (سبحان الله الحكيم)!! هەندێ خانە لە جەستەدا هەن، ئیشیان تەنیا ئەوەیە دژی میکرۆب پەیدا بکەن، لە نێو خۆیاندا، هەندێك پڕۆتین و هەندێك ئەنزیم پەیدا دەکەن و بەکاردێنن، بەس بۆ دژایەتیی کردنی ئەو میکرۆب و تەنە نامۆیانەی دێنە نێو جەستەوە.

ئنجا بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەش، سێ ڕێباز و شێوازان دەگرنە بەر:

**میکانیزمی یەکەم:** هەوکردن (إلتهاب): مەبەست ئەوەیە: وەختێ ئینسان شوێنێکی هەو دەکات، ئەوە دەرەنجامی کۆبوونەوەی خڕۆکە سپییەکانە، لەو شوێنەدا کە تووشی ئەو میکرۆبە بووە، بۆ ئەوەی ئابڵووقەی میکرۆبەکە بدەن و دەوری بگرن و، نەهێڵن تەشەنە بکاو، بچێ بۆ شوێنەکانی دیکەی جەستە.

**میکانیزمی دووەم:** پێی دەگوترێ: سیستمی تەواوکاریی (النظام المكمِّل) کە سی و پێنج (٣٥) جۆرە پڕۆتینی گچکەن و، بە زۆریی لەلایەن جەرگەوە دروست دەکرێن و، ئەوانیش بە کۆمەڵێك کارلێکی بیوکیمیایی هەڵدەستن، بۆ دژایەتیی کردنی ئەو میکرۆبە.

**میکانیزمی سێیەم:** ئەوەیە کە دیوارە خانەییەکان، ڕێ دەگرن لەوەی ئەو دوژمنە بێتە نێویانەوە و، خڕۆکە سپییەکانیش کە بەو کارە هەڵدەستن، بەگشتیی حەوت (٧) جۆرن:

١- خانە هەڵلووشەرەکان (الخلايا الملْتَهِمَه) کە یەکسەر ئەو میکرۆبە هەڵدەلووشن و لە بەینی دەبەن.

٢- خانە لقییەکان (الخلايا المتُفرِّعة).

٣- خانە سروشتییە بکوژەکان (الخلايا الطبيعية القاتلة).

٤- خانە قەڵەوەکان، درشتە خانەکان (الخلايا البدينة).

٥- خانە دەنکۆڵەییە هاوسەنگەکان (الخلايا الحُبَيْبِيَّة المتعادلة).

٦- ترشە خانە دەنکۆڵەییەکان (الخلايا الحبيبيه الحامضية).

٧- تفتە خانە دەنکۆڵەییەکان (الخلايا الحبيبية القاعدية).

ڕەنگە یەکێك بڵێ: بۆچی خڕۆکە سپییەکان کە بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنرێن، حەوت جۆرن؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

هەر کامێك لەوانە دژایەتیی جۆرێك لەو میکرۆب و تەنە نامۆیانە دەکات، کە دێنە نێو جەستەوە و، هەشیانە دژایەتیی زیاتر لە جۆرێك دەکات.

شایانی باسیشە: هەر کام لەو مەسەلانەی لێرەدا بە خێرایی باسمان کردن، وردەکاریی زۆریان هەیە، بەڵام ئێمە -وەك پێشتریش گوتوومانە- تەنیا تا ئەو ئەندازەیە، بە وردەکاریی بابەتەکان دا دەچنە خوارێ، کە بیسەران و خوێنەران بە گشتیی بتوانن لێیان تێبگەن[1].

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) بۆ وردەکاریی زیاتری ئەو بابەتە (کۆئەندامی پێشگیریی) بڕوانە: (إبداع الرحمن في جسم الإنسان)، ص٣٧٥-٣٩١، (الجهاز المناعي).

## خاڵی سێزدەیەم: پێنج هەستەوەرەكان (الحواس الخمس)

بەرێـــــزان!

خوای پەروەردگار عزوجل بۆ پەیوەندیی كردنی مرۆڤ بە جیهانی دەرەوەیەوە، پەیوەندیی جەستەیی، پێنج هێڵی پەیوەندیی بۆ داناون: بیستن، دیتن، تامكردن، بۆنكردن، دەست لێكوتان.

ئنجا ئێمە لەم خاڵی سێزدەیەمەدا، لە پێنج بەنددا، ئەو پێنج هەستەوەرە دەتوێژینەوە:

بەندی یەكەم: كۆئەندامی بیستن.

بەندی دووەم: كۆئەندامی دیتن.

بەندی سێیەم: كۆئەندامی تامكردن.

بەندی چوارەم: كۆئەندامی بۆنكردن.

بەندی پێنجەم: كۆئەندامی دەستلێكوتان.



وێنەی (٢٧) پێنــج هەستەوەرەكان

www.alibapir.com




## بەندی یەکەم: کۆئەندامی بیستن:

هەستەوەری بیستن (حاسة السَّمع) وردەکارییەکانی هێندە زۆرن، بە کتێبێکیش مرۆڤ لێیان نابێتەوە، بەڵام من هەم لێرەدا، هەم لە باسەکانی دیکەدا ویستوومە: ئەوە کە خوا (سبحانه وتعالى) چۆن مشووری لە جەستەی مرۆڤ خواردوە و، سەرپەرشتیی کردوە و تەگبیری بۆ کردوە، هێڵەگشتییەکانی باس بکەم، ئەگەرنا وردەکارییەکان، هی ئەوە نین کە لە باسێکی ئاوادا بمانپەڕژێتە سەریان و، نە ئەو پسپۆڕییەشمان هەیە، کە بتوانین هەموو ئەو وردەکارییانە باس بکەین، ئەوەش کە باسی دەکەین، بێگومان بە بەهرە وەرگرتنە لە زانایانی پسپۆڕو شارەزای ئەو بوارە و، پێشتریش ئاماژەمان بە سەرچاوەکانداوە.



وێنەی (٢٨) کۆئەندامی بیستن

www.alibapir.com



لە چوار (٤) وردە خاڵان دا باسی کۆئەندامی بیستن دەکەین:

**یەکەم: پێکهاتەی کۆئەندامی بیستن:**

کۆئەندامی بیستن، لە سێ بەشان پێکهاتوە، ئاشکراشە ئێمە کە دەڵێین: (گوێ) تەنیا مەبەستمان پێی پەڕەی گوێ یە، بەڵام لە ڕاستییدا: گوێ زۆر لەوە ئاڵۆزترو گەلێك لەوە گرنگترە، کە تەنیا ئەو، ئەندامە پێی بوترێ: گوێ!

بەڵێ کۆئەندامی بیستن، لە سێ بەشان پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم: گوێی دەرێ (الأذن الخارجية):**

ئەمیش لە دوو ئەندامان پێکهاتوە:

**١)- پەڕەی گوێ (صَيوان الأذن):**

پەڕەی گوێ: ماددەیەکی کرۆژ کرۆژەییە (کرکراگەییە)، پێستێکی زۆر تەنکی بەسەرەوەیە و پێوەی چەسپ بووە، کارەکەشی بریتیە لە کۆکردنەوەی دەنگ.

**٢)- جۆگەلەی بیستن (القناة السمعية):**

**یەك:** تیرەکەی: (٧،٥ ملم) و درێژییەکەی: (٢٣ - ٣٠ ملم) دەبێت.

**دوو:** دوای ئەوەی لەڕێی پەڕەی گوێوە، دەنگەکان کۆ دەکرێنەوە: یەکسەر و بەخێرایی لە ڕێی جۆگەلەی بیستنەوە بەرەو نێوەوەی کۆئەندامی بیستن، بەڕێ دەکرێن، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە پەڕەی گوێ، ماددەکەی کرکراگەییە، کرۆژکرۆژەییە، نە ئێسکە، نە گۆشتیشە، چونکە گۆشت دەنگ کپ دەکات، ئێسکیش سەخت و ڕەقە، ئنجا ئەگەر ئینسان گوێی لە ئێسك دروست کرابایە، دوای ئەوەی ئێسکەکەی دەشکا، بێ گوێ دەمایەوە! بەڵام خوا (سبحانە وتعالى) لە ماددەیەکی کرکراگەیی دروستیکردوە، هەم دەنگ دەداتەوە، هەم دەنگ کۆدەکاتەوە و دەنگەکە نامژێ و، هەمیش ناشکێت!





**سێ:** ئەو لۆچ و پێچانەش کە لە پەڕەی گوێ دا هەن، هەموویان کاریگەرییان هەیە کە ئەو دەنگە کۆبکەنەوە.

**چوار:** کەناڵی گوێ، یاخود جۆگەلەی گوێ، هەندێك ئێسك و خانەی تێدا هەن، کە مێو (شمع) دروست دەکەن، ئەو چڵکەی نێو گوێ، کە ئێمە پێی قەڵسین! بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) ڕەحمەتێکی زۆری لەگەڵ بەکارهێناوین، کە ئەو ماددەیەی لە گوێ دا، داناوە و وای کردوە کە گوێ بۆ خۆی ئەو ماددەیە بەرهەم بێنێ، کە ئێمە پێی دەڵێین: (چڵکی گوێ) و قێزەون و تاڵیشە، بەڵام ئەو چڵکی گوێیە، ڕێ دەگرێ لە هاتنە ژوورەوەی زیندەوەران و، ئەو میکرۆبانەش کە ڕوو دەکەنە پەردەی گوێ و نێو گوێ، ئەو میکرۆبانەش دەکوژێ.

**بەشی دووەم: گوێی نێوەڕاست (الأذن الوسطى):**

گوێی نێوەڕاست لە سێ بەشان پێکهاتوە:

**١)-** پەردەی تەپڵ (غشاء الطبلة):

پەردەیەکی گۆشتیی تەنکە، تیرەکەی: (٨ ملم)ە و، پانتاییەکەی، ڕووبەرەکەی: (٥٥ملم٢) و، ئەستوورییەکەشی شەست (٦٠) مایکرۆ مەترە، واتە: لە هەزار بەشی میللی مەترێك، شەست (٦٠) بەشی(٦٠/١٠٠٠ملم) و، شێوەیەکی بازنەیی هەیە و کووڕ(مُحدَّب)ە، بە باری گوێی نێوەڕاستدا.

**٢)-** بۆشاییە تەپڵ (الفجوة الطبلية):

شوێنێکی بۆشە و هەوای تێدایە، هەڵبەتە کۆئەندامی بیستن، بەبێ هەوا، ناتوانێ دەنگەکان کۆبکاتەوە، ئنجا لە بۆشایی تەپڵدا: سێ (٣) پارچە ئێسکی گچکە هەن، کە پێیان دەگوترێ: چەکوش و سندان و ئاوزینگ (المِطْرَقَة وَالسِّنْدَان والرِّكَاب)، کە هەرسێکیان پێکەوە کاریان ئەوەیە، لەرینەوەکانی دەنگ بگەیەننە پەردەی پەنجەرەی هێلکەیی، کە بەشی دووەمی گوێی نێوەڕاستە.

**٣)- پەردەی پەنجەرەی هێلکەیی (غشاء النافذة البيضاوية):**

ڕووبەرەکەی: (٣ملم²) دەبێ و، لەسەر دیواری قۆزاخە (قوقعة)ی گوێیە و، ئەو قۆزاخەیە پڕە لە ماددەیەکی شل، کە لەرینەوە میکانیکییەکان دەگۆڕێ بۆ لەرینەوەی دەنگیی، بە هۆی ئەو شلەیەوە، کە لە نێو ئەو قۆزاخەیەدا هەیە.

**بەشی سێیەم: گوێی نێوەوە (الأذن الداخلية):**

زۆربەی وردەکارییەکانی کۆئەندامی بیستن، لەم گوێی نێوەوەدان، کە لە چەند ئەندامێك پێکهاتوە و گرنگترینیان، ئەم سێ ئەندامەن:

**١)- قۆزاخە (القَوْقَعَة):**

ئەمە ئەندامی سەرەکیی کۆئەندامی بیستنە و، بە ئەندازەی دەنکە فاسۆلیایەکە و، بریتیە لە پارچە ئێسقانێکی شێوەی بۆڕیی، درێژییەکەی: (٣٥ ملم) و تیرەکەی: چەند میللی مەترێکە و، بە شێوەیەکی لوول پێچ (حَلَزونِي) بە ئەندازەی دوو پێچ و نیو، پێچاو پێچ کراوە.

لە نێو ئەو قۆزاخەیەدا، سێ جۆگەلە هەن، لە شێوەی نیوە بازنەیی، یان هیلالیی دا، یانی: سێ پارچە ئێسقان هەن، کە هەندێکیان لە سەرووی هەندێکیانەوەن:

**أ/** یەکەمیان پێی دەگوترێ: جۆگەلەی بەرز.

**ب/** دووەمیان: جۆگەلەی نێوەڕاست.

**ج/** سێیەمیان: جۆگەلەی خواروو.

لە نێو هەر کام لەو جۆگەلانەدا پەردەیەك هەیە، چینێکی نەرم هەیە، کە شلەمەنیی لیمفاویی تێدا هەیە، ئنجا لە نێو (قۆزاخە)دا، ئامێری کۆرتیی (الجهاز الكورتي) هەیە، کە ئەمە بەرپرسیاری یەکەمە لە گۆڕانی شەپۆلە دەنگییەکان و جووڵە میکانیکییەکان، کە لەو شلەیەی لە نێو ئامێری کۆرتییدایە، هەن، بۆ ئاماژە مێشکییەکان و، دوایی گواستنەوەیان بۆ مێشك و، لە شێوەی شەپۆلی کارەبایی دا، (ئامێری کۆرتیی)یش، لە بیست و چوار





هەزار(٢٤،٠٠٠) خانەی تیسکدار (خَلایا مُهَدَّبَة)[١] کە لە دوو ڕیز (صَفَّین) دان، پێکهاتوە.

**٢)- پەنجەرەی هێلکەیی (النافذة البیضاویة):**

ڕووبەرەکەی: (٣،٢ ملم٢) و بە پەردەیەکی تەنك و نەرم داپۆشراوە و جۆگەلەی بەرز (القناة العُلیا) دادەخات و، ئێسکی ئاوزینگ (عظمە الرکاب)ی پێوە بەستراوە.

**٣)- پەنجەرەی بازنەیی (النافذة الدائریة):**

ئەمیش ڕووبەرەکەی بریتیە لە (٢ ملم٢)، ئەمیش جۆگەلەی ژێرەوە دادەخات.

**دووەم: چۆنیەتی بیستن:**

ئێمە بەمجۆرە شت دەبیستین:

پەڕەی گوێ، دەنگ کۆدەکاتەوە و بەو کەناڵەی بیستندا، کە لە بەشی دەرەوەی گوێیە، دەیگەیەنێ، بە پەردەی گوێ، لەوێشەوە دەچێ بۆ سێ ئێسقانەکان: (چەکوش و سندان و ئاوزینگ)، لەوێشەوە دەچێ بۆ نێو قۆزاخەی گوێ، لەوێشەوە بۆ دەمارە مێشکییەکان و، لە وێشەوە دەگوازرێتەوە بۆ نێو مێشك و، مرۆڤ تێ دەگات چ باسە!

**سێیەم: جۆگەلەی ئیستاکیوس و هاوسەنگیی:**

ئنجا پێویستە باسی ئەوەش بکەین، کە لە نێو کۆئەندامی بیستن دا، جۆگەلەیەك پێی دەگوترێ: (ئیستاکیوس)، کە درێژ دەبێتەوە بەلای قوڕگ و بۆشایی گوێی نێوەڕاستدا و، پەردەی گوێ، لە دیوی دەرەوە، سنووریەتی.

ئنجا ئەو جۆگەلەی ئیستاکیوس (قناة إستاکیوس)ە، ڕۆڵەکەی ئەوەیە کە: ئەو فشارەی هەوا کە لە دەرێ هەیە، بۆ ئەوەی هاوسەنگیی (إتِّزان)هەبێ، دەبێ لە نێویشدا فشارێك هەبێ، هەوا هەبێ و، ئەوەش زۆر پەیوەندیی هەیە بە

---

(١) هُدْبة: تیسك، کولْك، مُهَدَّبَة، کۆڵکدار، تیسکدار.

هاوسەنگیی مرۆڤەوە و، ئەو سێ پارچە ئێسکەی کە شێوەی هیلالیان هەیە، واتە: نیوە کەوانەیین، زۆر کاریگەرییان هەیە لە هاوسەنگیی جەستەی مرۆڤدا، کە مرۆڤ هاوسەنگ بێ و بەملاولادا نەچێت، هەر بۆیەش هەر کاتێك گوێی نێوەڕاست زیانی پێ بگات، یان هەو (إلتهاب) بکات، مرۆڤ هاوسەنگیی تێکدەچێ.

**چوارەم: کۆئەندامی بیستن و قسەکردن:**

هەروەها کۆئەندامی بیستن پەیوەندییشی هەیە بە قسە کردنەوە، چونکە ئەگەر ئینسان نەیبیستبایە، نەشیدەتوانی قسە بکات، هەر بۆیە ئەوانەی کە لە زگماکەوە کەڕن، لاڵیشن، چونکە ئەگەر هیچ دەنگێك و هیچ پیتێك نەچووە نێو کۆئەندامی بیستن و، لەوێشەوە نەگەیەندرا بە مێشك، ئەو وشەو دەنگانە لە مێشکدا تۆمار ناکرێن، کە چ مانایەکیان هەیە؟! بۆیە هەر کەسێك کەڕ بوو، بە سروشت لاڵیش دەبێ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لەسەرەتاوە کەڕ نەبێ، هەرچەندە دوایی کەڕیش بێ، لاڵ نابێ.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com







## بەندی دووەم: کۆئەندامی دیتن (الجهاز البصري):

لە پێنج وردە خاڵاندا باسی کۆئەندامی دیتن دەکەین:

### یەکەم: پێکهاتەی چاو:

چاوی مرۆڤ، بریتیە لە تۆپێکیی گۆشتیی پڕ لە شلەیەکی هولامیی ڕوون، وەك ماددەی جەلاتین، تیرەکەی دوو سانتیمەترو نیو (٢،٥ سم)ە و، کێشی چاو هەشت (٨) گرامە و، دیواری چاو ئەستوورییەکەی: (٢ ملم)ە و، سێ چینە:

١- یەکەمیان کۆڕنیا(قرنية)ی پێ دەگوترێ، هەروەها ماددە ڕەقەکە (الصَّلْبة) شی پێدەگوترێ.

٢- دووەمیان گلێنە (قزحية)ی پێ دەگوترێ، کە بیلبیلە (بُؤبؤ)ی چاوی تێدایە.



وێنەی (٢٩) کۆئەندامی دیـتـن

www.alibapir.com





٣- سێیەمیان تۆڕ(شبكية)ی پێ دەگوترێ، کە ئەو عەدەسەیەی چاو پێی دەبینێ، تێیدایە و، بە حەوت (٧) ماسوولکە دەورە دراوە.

شایانی باسە: (قەزەحییە) واتە: گلێنە، وێڵاشە چین (الطبقة المشيمية)شی پێ دەگوترێ، بۆچی وای پێ دەگوترێ؟ چونکە (مشيمية)، یانی: پزدان، ئاوەڵمنداڵ، ئەوەی کە کۆرپە لە نێو منداڵی دایکیدا، لە نێوی دایە، دوایی کە لە دایك دەبێ، ئەویشی لەگەڵ دێتە دەرێ.

ئنجا لەبەر ئەوەی وەك چۆن: هەرچی خواردن و پێداویستییەکانی منداڵە، بە هۆی ئەو پزدان، (ئاوەڵ منداڵ)ەوە، بۆی دابین دەکرێن، بە هەمان شێوەش: ئەو بەشەی چاویش کە ئەو ناوەیان لێناوە، ئەویش تۆڕێکی دەوڵەمەند لە مولوولە خوێنییەکانی تێدا هەیە، کە دەبنە هۆی خۆراك پێدانی چاو.

**دووەم: ماسوولکەکانی چـــاو:**

چاو، نۆ(٩) ماسوولکەی جووڵێنەری هەن:

١- شەش (٦) دانەیان تۆپی چاو بە هەموو لایەکدا دەسووڕێنن، ئنجا(سُبْحَانَ الله)! جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە هەردوو چاوەکانیش بە فەرمانی مێشك، بە یەك ئاڕاستەدا دەجووڵێن، نەك چاوێکیان لەولا بێ و چاوێکیان ڕوو لەولا بکات، چونکە بۆ وێنە: پەنجەی خۆت ڕابگرە و، دەست لەسەر چاوێك دابنێ و، بە چاوەکەی دیکە تەماشای بکە، لە شوێنێك دەیبینی، ئنجا ئەوجارە دەست لەسەر چاوەکەی دیکەت دابنێ و، بە چاوەکەی دیکەت تەماشای بکە، لە شوێنێکی دیکە دەیبینی! بەڵام بە فەرمانی مێشك، هەردوو چاوەکان تەرکیز دەخەنە سەر یەك خاڵ و، ئەو شتە زۆر بەڕێکیی دەبینی.

بەڵێ ئەو شەش (٦) ماسوولکەیە، تۆپی چاو بە هەموو لایەکدا دەجووڵێنن و، لە نێو چاڵی چاودان، چاویش لە نێو بۆشاییەکی ئێسقان دایە، کە لە کەللەی سەر دایە، پێی دەگوترێ: چاڵی چاو (مِحْجَرْ).

٢- دوو لەو ماسوولکانەش گلێنە (قزحية) دەجووڵێنن.

www.alibapir.com







٣- یەك ماسوولكەشیان عەدەسەی چاو دەجووڵێنێ.

**سێیەم: عەدەسەكانی چـــاو:**

چاو دوو عەدەسەی سەرەكیی هەن:

١- عەدەسەی كۆڕنیا (العَدَسة القَرْنِيّة): كە عەدەسەیەكی كووڕو چاڵیشە (محدَّبة - مُقَعَّرة) لە یەك كاتدا، ئاوێنە هەیە هەم كووڕە كە تەماشای دەكەی، خۆت بە بچووكیی دەبینی، هەم چاڵیشە، كە تەماشای خۆت دەكەی خۆت بە گەورە دەبینی، ئەو عەدەسەیەی چاویش، لە یەك كاتدا هەم كووڕیشەو، هەم چاڵیشە، بۆ ئەوەی ئەو وێنەیەی كە وەری دەگرێ، بتوانێ بە ڕوویەك بەبچووكیی وەری بگرێ و، دوایی بەولا گەورەی دەكاتەوە.

ئەو عەدەسەیە لایەكانی چەسپاون و، تیرەكەی: (١٢ ملم)ە، ئەستوورییەكەی: (٠،٥ ملم)ە و، ئەم عەدەسەی قەرنییە بەرپرسە لە: (٨٠٪)ی دانانی وێنە لەسەر تۆڕی چاو.

٢- عەدەسەی بلووریی (العدسة البلورية[1]): ئەمیش عەدەسەیەكە هەردوو دیوەكەی كووڕ، (مُحَدَّب)ن، بەڵام ئەندازەی كووڕییەكەی بە شێوەیەكی نەچەسپاوە و، بەجێهێڵراوە بۆ جووڵەی ماسوولكەكان، ئەم عەدەسەیە تیرەكەی: (٩ ملم)ە و، ئەستوورییەكەی: (٥ ملم)ە.

بۆیەش ئەندازەی كوڕییەكەی نەچەسپاوە، چونكە: كاتێك تیشكێكی زۆر دەبینی، ئۆتۆماتیكیی چاوت دێتەوە یەك، تاكو تیشكی كەمی بۆ بچێ، ئەگەرنا زیانی پێ دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر لە شوێنێكی تاریك بی ئۆتۆماتیكیی ماسوولكەكان چونكە ئازاد و دەستكراوەن، وا دەكەن: چاوت زیاتر بكرێتەوە، تاكو ڕووناكیی زیاتر بێ و، بتوانێ بەو ڕووناكییە كەمەش ببینی، بۆیە خوا (سبحانه وتعالى) ئەمەیانی بە شێوەی ئۆتۆماتیكیی داناوە، كە بەپێی ویستی مرۆڤ و بەبێ ویستی خۆیشی، بەڵكو بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكیی بە فەرمانی مێشك، پێویست بوو چاو دەكاتەوە و، پێویست بوو چاو دێنێتەوە یەك و، مەیلەو دەینووقێنێ.

---

(١) بلوري: یانی: ڕوون، درەوشاوە.

www.alibapir.com





**چوارەم: چۆنیەتی دیتنی چاو، چاو چۆن دەبینێ؟:**

**١)- یەکەمین هەنگاو:** بریتیە لەوە کە تۆڕی چاو، بە پێی پێویست ئەندازەی ڕووناکیی دەگۆڕێ، هەروەها تێکڕای وێنە گیراوەکان دەگۆڕێ، بۆ ئاماژە کارەباییەکان و، دەیاننێرێ بۆ مێشك، دەبێ ئەو وێنە گیراوانە، بگۆڕرێن بۆ لێدانەکان (نَبَضـات)ی کارەبایی.

تۆڕی چاویش ڕووبەرەکەی: (١١ سم٢)یە، (هەزارو سەد (١١٠٠ ملم٢))، ئەو پانتاییە دادەگرێ لە دیوی پشتەوەی دیواری چاو، بەرانبەر بە عەدەسە، کە ئەویش: (٧٢٪)ی دیواری نێوەوەی چاو دەگرێتەوە.

ئنجا تۆڕی چاو، لە دوو جۆرە خڕۆکەی هەستیار بە ڕووناکیی، پێکهاتوە:

**١)- جۆری یەکەمیان:** پێیان دەگوترێ خڕۆکە درێژکۆڵەییەکان (العُصَیات): ئەمانە ژمارەیان سەدو سی ملیۆن (١٣٠٠٠٠٠٠٠) دانە دەبێ و، ئەمانە تیشك هەر ڕەنگێکی هەبێ، وەری دەگرن و، زۆر هەستیارن بەرانبەر بە جووڵەی تەنەکان و، هەستیاریشن بەرانبەر بە تیشکی کەمیش.

**٢)- جۆری دووەمیان:** پێیان دەگوترێ: خانە خڕەکان، بازنەییەکان (المخاریط)، ئەمانەش هەستیارن بەرانبەر بە تیشك، بەڵام هێندەی جۆرەکانی پێشێ، هەستیار نین و، لە بەرانبەر ئەوەدا: ڕەنگەکان لێك جیا دەکەنەوە، ئەوانەی پێشێ، خانە درێژ کۆڵەییەکان بەس تیشك وەردەگرن، کەم بێ یان زۆر بێ، بەڵام ئەم خانە بازنەییانە، بەرانبەر بە تیشك، زۆر هەستیار نین، بەڵام ڕەنگەکان لێك جیادەکەنەوە، ئەو ئیمتیازەیان هەیە، ئەمانەش ژمارەیان: حەوت ملیۆن (٧٠٠٠٠٠٠) دەبێ.

کەواتە: هەنگاوی یەکەمی دیتن، ئەوەیە کە تۆڕی چاو لە ڕێی ئەو دوو جۆرە خڕۆکانەوە، ئەو تیشکەی کە لە تەنەکانەوە دێ، وەری دەگرێ.

www.alibapir.com





**٢)- دووەمین هەنگاو:** ئەوەیە کە ئەو تیشك و وێنانەی گۆڕاون بۆ لێدانە کارەباییەکان **(النّبضات الكهربائية)**، کە خانە هەستیارەکان بەرانبەر بە تیشك، بە هەردوو جۆرەکانیانەوە، بەرهەمیان دێنن، دەنێررێن بۆ مێشك، لە ڕێی دەماری دیتنەوە، بە هۆی: ملیۆنێك و دوو سەد هەزار (١،٢٠٠،٠٠٠) ڕیشاڵی دەمارییەوە، کە پەیوەندییان بە مێشکەوە هەیە، بە ڕیشاڵێك کە تیرەکەی: دوو مایکرۆنە و، هەمووشیان لە نێو کێبلێکدان، کە تیرەکەی: (١،٥) میللی مەتر تێپەڕ ناکات، پارێزراون، لەوێوە دەنێردرێن بۆ مێشك و، لەوێش مێشك تەرجەمەیان دەکاتەوە بۆ وێنەکان:

(الموسوعة العلمية الشاملة) ئاوا باسی چۆنیەتی بینین دەکات[1]، جێی خۆیەتی سەرنجی بدەین: دەڵێ: (الطَّرِيقَةُ الَّتِي تَعْمَلُ بِهَا العَيْنَانِ وَالدِّمَاغُ، لإِنْتَاج الصور، فَائِقَةُ الدقَّةِ والتعْقِيد، فالضوء الَّذِي تَستقْبلُهُ شَبَكَةُ العَيْنِ بَعْدَ انْكسَارِهِ المكيَّف، تُحوِّلُهُ خَلاَيَاها الحَسَّاسَة لِلضَّوْءِ، إِلى طاقةٍ كِيميَاوِيَةٍ، وَهَذِهِ الطَّاقَة تُفَعِّلُ الأَعْصَابَ لِنَقْلِ هَذِهِ الرِّسَالَةِ الكَهْرُو عَصَبية إِلى الدِّمَاغ الَّذِي يُحَلِّلُهَا وَيُجَسِّمُهَا، وَيُصْدِر التَّعْلِيمَاتِ المنَاسَبَةِ لمواجهَتِهَا... إِنَّ أَدَقَّ وَأَضْخَمَ الرُّوبُوطات وَالحَوَاسِيب، تَظَلّ عَاجِزَةً عَنْ تَحْقِيقِ بَعْض ذَلِكَ).

واتە: ئەو ڕێگایەی کە دوو چاوەکان و مێشك کاری پێ دەکەن، بۆ بەرهەمهێنانی وێنەکان، یەکجار زۆر وردە و زۆر زۆر ئاڵۆزە، چونکە ئەو تیشکە کە لە شتەکانەوە بۆ چاو دێ، تۆڕی چاو وەری دەگرێ، دوای ئەوە کە دەشکێتەوە و دەگونجێنرێ، ئنجا دەینێرێ بۆ خانە هەستیارەکانی کە بە تیشك هەستیارن (واتە: خانە درێژکۆڵەییەکان و خانە بازنەییەکان)، ئەوانیش دەیگۆڕن بۆ هێزێکی کیمیایی و، ئەو وزە کیمیاییە، دەمارە هەستییەکان، کارا دەکات بۆ ئەوەی ئەو نامە کەهرۆعەصەبییە (هەم وزەی کارەبایی هەیە، هەم وزەی دەماریی)، بینێرێ بۆ مێشك و، مێشکیش شی دەکاتەوە و بەرجەستەی دەکا لە شێوەی چەند وێنەیەکدا، (کە ئێمە دەیانبینین) و ڕێنماییە گونجاوەکان بۆ چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ کردنیان دەنێرێ.

---

(١) الموسوعة العلمية الشاملة، ص٢٠٤، بە ناوونیشانی: (الإبصار)، ئەو مەوسووعەیەش کۆمەڵێك زانای بیانی دایانناوە و تەرجەمەی عەرەبی کراوەتەوە.

www.alibapir.com


دوایی دەڵێ: وردترین و زەبەلاحترین ڕۆبۆت و حاسیبەکان، دەستەوسانن لە بەرانبەر ئەوەدا کە ئەوەی بەشێك لە چاو ئەنجامی دەدات، ئەنجامی بدەن!

کەچی سبحان الله! بەشەر ئەگەر حاسیبەیەك ببینێ، یان ڕۆبۆتێك ببینێ، کارێك ئەنجام بدات، زۆر دڵنیایە کە مرۆڤ دروستی کردوە، بەڵام ئەو چاوانە، هی مرۆڤ، هی ئەو هەموو ژیاندارو زیندەوەرانە، کە ئەو هەموو وردەکارییەیان تێدا هەیە، کە ئەگەر هەموو کۆمپیوتەرەکانی دنیا کۆبکەیەوە، بە قەدەر مێشك وردەکارییان تێدانیە!! هەروەها هەموو کامیرەکانی دنیا کۆبکەیەوە، بە قەدەر چاو وردەکارییان تێدا نیە!! کەچی وەرە مرۆڤ قەناعەت بەخۆت بێنی و شەیتان هەڵت خەڵەتێنێ و بڵێی: بێگومان ئەو ڕۆبۆت و حاسیبەو کامێرەیە، مرۆڤ دروستیکردوە، بەڵام ئەو هەموو کۆئەندامانەی مێشك و گوێ و چاو و .. هتدانە، کەس دروستی نەکردوون! بەڕاستیی ئەوە ئەو پەڕی بێ ئینصافییە بەرانبەر بە خوا (سبحانه وتعالى)، بۆیەش خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ ﴾ الإنفطار.

واتە: ئەی مرۆڤ! چ شتێك تۆی بوغڕا کردوە بەرانبەر بە پەروەردگاری بەخشندەت، کە تۆی وەدی هێناوە، پاشان تۆی ڕێك خستوە، {ئەندامەکانی بۆ داناوی و یەك تۆپەڵە گۆشت نی}، ﴿فَعَدَلَكَ﴾، ئنجا هاوسەنگیی کردووی، (دەستێکت لە دەستێکت درێژتر نیە، لاقێکت لە لاقێکت درێژتر نیە، چاوێکت لە چاوێکت گەورەتر نیە)، ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾، لە هەر وێنەیەکدا کە خۆی ویستوویەتی، تۆی پێکهێناوە، {قەدو قیافەو وێنەو دیمەنێکی ڕێکی پێداوی} ئەو پەروەردگارەت کە ئەو هەموو کاروبارەی بۆ کردووی، بۆچی بەرانبەری وا بوغڕاو لە خۆبایی؟!

ئنجا لێرەدا جێی خۆیەتی قسەیەکی دیکەش هەر لە: (الموسوعة العلمية الشاملة) وەربگرین، کە باسی چاو دەکات، کە یەکسەر بە کوردیی دەیهێنین:

www.alibapir.com





دەڵێ: چاوی مرۆڤ تۆپێکیی پتەوە، پڕە لە شلەمەنییەك كە لە چاڵی چاودا جێی گرتوە، کە چاڵێکی ئێسقانە، (ئینسان با هەر تەماشای شوێنی چاو بکات، چاو لە شوێنێك دایە، لە هەر لایەکەوە زەبری بۆ بێ، ئەو شوێنە قووڵە، ئەو چاوە دەپارێزێ، بیر بکەوە: چاوت لە نێو چاوانت بووایە، لەسەر تەپڵی سەرت بووایە، چەند زوو لە بەین دەچووا!)[1].

لە پێشەوەی چاو، چینێکی ڕوونی پارێزەر هەیە کە پێی دەگوترێ: کۆڕنیا (القرنية)، کە کاری زۆر دەکا لەسەر ئەوەی تیشك کە لە تەنەکانەوە دێ، کۆی بکاتەوە.

بەشێکی دیکەی چاو کە ڕەنگەکەی دیارە لە چاودا، پێی دەگوترێ: گلێنە (قُزَحيَّة)، ئەو تیشکە کە لە تەنەکانەوە دێ و بە بیلبیلەی چاودا تێ دەپەڕێ، ئەندازەکەی زەبت دەکا و لە کاتێکدا تیشکەکە زۆر بێ، بیلبیلەی چاو تەسك دەکاتەوە و، لە کاتێکدا تیشکەکە کەم بێ، فراوانی دەکا، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، کە پێشتریش باسمان کرد.

دوایی ئەو تیشکە دەگاتە عەدەسە و، عەدەسەش لەسەر تۆڕی چاو چڕی دەکاتەوە، تۆڕی چاویش کۆمەڵێك خانەی هەستیاری تێدان: سەدو سی ملیۆن (١٣٠،٠٠٠،٠٠٠) خانەی درێژ کۆڵە، (عُصيات) و حەوت ملیۆن (٧،٠٠٠،٠٠٠) خانەی بازنەیی (مخروطات)، ئنجا ئەو خانانە بە هەردوو جۆرەکانیانەوە، ئەو وێنانە لەڕێی ئاماژەکانی کەهرۆ عەصەبییەوە بۆ مێشك دەنێرێ، مێشکیش ئەوانە وەك زانیارییەك پێی دەگەن، ئەویش ئەو دنیا بینراوەی ئێمەیان لێ پێك دێنێ[2].

**پێنجەم: چوار وردە پێکهاتەی چاو:**

**١- فرمێسك:**

أ- فرمێسك ماددەیەکی لینجی تێدایە، پارێزگاریی لە چاو دەکا و، پاکی دەکاتەوەو تەڕو تازە ڕای دەگرێ.

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٠٤.

www.alibapir.com





ب- بۆ بەرگریی لێکردنی چاو لە بەرانبەر دوژمنەکانی دا، فرمێسك ژمارەیەك ئەنزیم و دژە میکرۆب و دژە بەکتریای تێدا هەن، لووی فرمێسك ڕێژیش، لە پشت چاوەوەیە، بۆ ئەوەی لەوێوە چاوەکان بشوات و، مەرج نیە تەنیا ئەو کاتەی ئینسان گریانی دێ، فرمێسکی بێ، بەڵکو هەمیشە ئەو لووە چاو دەشوات و فرمێسك دەڕێژێ و، حەوت هەتا دە (٧-١٠) جۆگەلەی بچووکی فرمێسك هەن.

٢- دوو پێڵووەکانی چاو:

بە هۆی پێڵووەکانی چاوەوە، مرۆڤ هەر کات بیەوێ چاوی دەکاتەوە و، هەر کاتییش بیەوێ چاوی دەنووقێنێ و دایدەخات، هەندێ کەس تووشی جۆرێك نەخۆشیی دەبێ، پێڵووی چاوی داناخرێ، هەمیشە چاوی لەدەرێیە و زۆر ماندوو دەبێ و، موعەڕەزە، کە تۆزو خۆڵی لێ بنیشێ، بەڵام بە هۆی پێڵووەکانیەوە، مرۆڤ هەر کاتێ ویستی چاوی دادەخات.

٣- برژانگی چاو:

ئەو مووە باریکانەی دەوری چاو، پارێزەرێکی دیکەینی و هۆکاری جوانیشینی، ئنجا عەجایب ئەوەیە: ئەو برژنگانە وەختێك کە دەشوەرن، دێنەوە، بەڵام دوایی زۆر درێژ نابن و لە ئەندازەی خۆیان ڕادەوەستن، بە پێچەوانەی مووەکانی دیکەی جەستەوە: مووی سەرو مووەکانی دیکە، لە ئەندازەی خۆیان تێدەپەڕن و پێویست بەوە دەکات بیان قرتێنی، بەڵام ئەگەر برژانگت لە ئەندازەی خۆی تێپەڕیبایە، چۆنت بۆ دەقرتا؟ زۆر بە زەحمەت بوو.

٤- برۆیەکانی پشت چاو:

ئەوانیش دیسان هەم جوانیی بە چاو دەدەن، هەم کاریگەرییشیان هەیە بۆ پاراستنی چاو لە ئارەقەو تۆزو خۆڵ و...هتد.

www.alibapir.com







## بەندی سێیەم: کۆئەندامی چێژتن، تامکردن (الذوق):

هەستی چێژتن لە نێو زار و زمان دایە، لە زاردا، دە هەزار (١٠٠٠٠) گۆپکەی چێژتن هەن، ئنجا ئەو گۆپکانەی لە زاردا هەن، بە زۆریی لەسەر ڕووی زمان و، هەندێکیشان لەسەر ڕووی مەڵاشوو و پووك و ئەملاو لای زاریش هەن.

هەر گۆپکەیەك لە: (٥٠ - ١٥٠) خانەی چێژتن (خلیە التذوق) پێك دێ، (١٠٠٠٠ × ١٥٠)= (١٥٠٠٠٠٠)، واتە: یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار خانە.

ئنجا لە نێو گۆپکەکانی چێژتن دا، وێڕای خانەی چێژتن، خانە بنکەییەکان (تفتە خانەکان) (الخلایا القاعدیة)ش هەن و، خانە پشتگیرەکان (الخلایا الداعمة)ش هەن، کە خانە بنکەییەکان (تفتە خانەکان) خانە چێژەرەکان بەرهەم



وێنەی (٣٠) کۆئەندامی چێژتـــن

دێنن، چونکە خانە چێژەرەکان، تەمەنیان لە دە (١٠) ڕۆژ زیاتر نیە، خانە هاوکارەکانیش، هاوکاریی خانە چێژەرەکان دەکەن و، دەوری بناغەیان بۆ دەگێڕن.

ئەو خانانەی کە پێشوازیی دەکەن لە تام و چێژەکان، زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، کە ئایا مرۆڤ دەتوانێ چەند جۆرە تام بچێژێ؟

هەندێکیان گوتوویانە پێنج (٥)، بەڵام هەندێکیان گەیاندوویانەتە: حەوت (٧)، کە ئەمانەن:

١- شیرینیی. ٢- سوێریی. ٣- ترشیی. ٤- تاڵیی. ٥- تامی گۆشت. ٦- تامی چەوریی. ٧- تفتیی.

ڕەنگە یەکێك بڵێ: ئەدی بۆچی ئینسان بیبەری تیژ دەخوات، هەست بە تیژییەکەی دەکا، هەروەها هاوێنەکانی وەك: بەهارات و زەنجەبیل و دارچین؟

پسپۆڕانی بواری توێکاریی دەڵێن: ئەوە هەستکردنی پێستە بە گشتی، نەك هەر هەستکردنی خانە چێژەرەکان.

بەهەرحاڵ ئەوانە هەندێك وردەکارییین کە زانایان تێیاندا ڕاجیاییان هەیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## بەندی چوارەم: كۆئەندامی بۆنكردن (الشم):

پێكهاتەكەی:

هەستی بۆنكردن دوو پێكهاتەی هەن:

**یەكەم: خانەكانی بۆنكردن:**

لە پێنج وردە خاڵدا باسی خانەكانی بۆنكردن (الخلايا الشَمِّية) دەكەین:

**١)**- دە ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠) خانەی بۆنكردن لە لووتدا هەن، لەسەر هەردووك پارچە شانەی بۆنكردن كە لە سەقف و بۆشایی لووت دان، لە هەر تفنكێكدا، ئەو خانانە لەسەر ڕووبەرێكی (٥ سم$^{٢}$)دا، دانراون.



وێنەی (٣١) كۆئەندامی بۆنـــكردن

www.alibapir.com



٢)- ماددەیەك كە ئەو خانانە دەری دەدەن، ماددەیەكی لینجی زەردە، كە دوایی دەبێتە چڵم، كە هەر بە هۆی ئەویشەوە مرۆڤ بۆن دەكات، یانی: ئەگەر كەسێك ئەو ماددەیەی لە لووت دا نەمێنێ، بۆنیش ناكات، كەواتە: چڵم تەنیا چڵم نیە، بەڵكو ئەو مادده شلە، بۆ ئەوەیە كە مرۆڤ بە هۆیەوە بۆن بكات.

٣)- شانەی بۆنكردن ئەستوورییەكەی: سی (٣٠) مایكرۆ مەترە[1] و سێ چینە:

أ-چینی سەرێی، پێی دەگوترێ: خانە بنكەییەكان، تفتە خانەكان (الخلایا القاعدیة).

ب- چینی نێوەڕاستی پێی دەگوترێ: خانە پێشوازییكەرەكانی بۆن (الخلایا المستقبلة للشم).

ج- چینی خوارێی، پێی دەگوترێ: (خانە ڕاگرەكان) و بەرهەم هێنەرەكانی خانەكانی بۆنكردن (الخلایا الداعمة).

٤)- شایانی باسە كە تەنیا خانەكانی بۆنكردن قەرەبوو دەبنەوە، لە نێو سەرجەم خانە مێشكیی و دەمارییەكان دا، چونكە وەك گوتمان: خانە مێشكیی و دەمارییەكان نامرن و، ئەوەی مرد، تازە نایەتەوە جێی، بەڵام خانەكانی بۆنكردن، خوا هەڵیواردوون لەو حاڵەتە و، دووبارە دەبنەوە و دروست دەبنەوە، چونكە تەمەنیان لە چوار تاكو هەشت (٤ - ٨) هەفتەیە، بۆیە دەبێ ئەگەر مردن، هی دیكەیان بێتەوە جێ، ئەگەرنا ئینسان هیچ بۆنێك ناكات.

٥)- خانە ڕاگرەكان (الخلایا الداعمة):

ئەمان چەند لووێكیان هەن، چەند ڕژێنێك، پێیان دەگوترێ: (باومان)، كە وەك پێشتریش گوتمان: جۆرە ماددەیەكی لینجی زەرد دەردەدەن، كە هەموو ڕووبەری ئەو پانتاییەی ئینسان بۆنی پێ دەكات، دایدەپۆشن و، ئەو تەنۆلكە فڕیوانە (الجزیئات المتطایرة)ی دێن، چونكە بۆنكردن بە هۆی ئەوەوەیە كە ئەو تەنۆلكانە دێنە نێو لووت، ئنجا تۆ بۆن دەكەی)، ئنجا لەو ماددانەدا كە بۆنیان

---

(١) مایكرۆمەتر= ١/١٠٠٠ملم و، ١/ ١،٠٠٠،٠٠٠م ە.

دەکرێ، ئەو ماددە شلە زەردباوە، ئەو تەنۆلکە فڕیوانە، دەتوێنێتەوە و بە هۆی ئەوەوە دەگاتە مێشك و بۆنیان دەکرێ، یانی: بۆنکردن دیسان لە مێشکەوە دێت، وەك تام کردن نیە، تەنیا پەیوەندیی بە زارەوە هەبێ.

**دووەم: پیازە بۆنییەکان (البصلات الشمِّیـة):**

لە چوار وردە خاڵێشدا باسی پیازە بۆنییەکان دەکەین:

١)- ئەو خانانەن کە لە شێوەی سەلکە پیوازی تەڕدان و، لە نێو کەللە سەردا هەن، لە سەرووی پەڕە بێژینگەییەکان (الصفائح الغربالیة)ەوە و، لە ژێر پل (فص)ەکانی تەوێڵ (جبهة)ەوە، کە بەشێکە لە نێوەڕاستی مێشك و، ئەویش بۆخۆی پێنج چینە.

٢)- ئنجا پیازە بۆنییەکان مشووری ئەو ئاماژە بۆنییانە دەخۆن کە لە خانە بۆنییەکانەوە دێن و، دەیاننێرن بۆ مێشك، بە هۆی چەند دەزوولەیەکی ڕیشاڵی مێشکییەوە، هەڵبەتە بە کەمتر لەو دەزوولەی ڕیشاڵە مێشکییانەی کە دێن، چونکە پێنج ملیۆن (٥،٠٠٠،٠٠٠) دەزوولەی ڕیشاڵی مێشکیی دێ بۆ نێو لووت.

٣)- پێویستە ئەوەش باس بکرێ کە: خانە پێشوازییکەرەکانی بۆن (الخلایا المستقبله للشم) زۆر هەستیارترن لە خانە چێژەرەکان، بە دە هەزار(١٠،٠٠٠) بەرانبەر، یانی: خانە بۆن وەرگرەکان، دە هەزار هێندەی خانە چێژەرەکان، هەستیارترن بەرانبەر بە بۆن.

٤)- هەستی بۆن کردنی مرۆڤ، دەتوانێ دە هەزار (١٠،٠٠٠) جۆرە بۆن لێك جیا بکاتەوە، لە حاڵێکدا کە ئەو شوێنەی لە لووتی ئینساندا هەیە و بۆنی پێ دەکات و، ئەو ماددە زەردباوە دەڕێژێ، پانتاییەکەی: (٥ سم٢)ە، بەڵام هی سەگ پانتاییەکەی: (٥٠ سم٢)ە، لە هەر کوونە لووتێکیدا و، هەستی بۆنکردنی سەگ، سەد(١٠٠) هێندەی هی مرۆڤ بەهێزە، بۆیەش سەگ بەکاردێنن بۆ بۆنکردنی شتەکان و، بۆ ناسینەوەی شتەکان بە هۆی بۆنەوە.

www.alibapir.com



## بەندی پێنجەم: کۆئەندامی دەستلێکوتان (اللَّمس):

پێشتر لە خاڵی نۆیەم و لە کاتی باسی (کۆئەندامی پێست)دا، باسی هەستی دەستلێکوتان(لمس)مان کرد، بۆیە ئێستا بە پێویستیی نازانین باسی بکەینەوە و بە کورتیی دەڵێین: مرۆڤ دەتوانێ: سەرما و گەرما، نەرمیی و ڕەقیی، لووسی و زبریی، هەستی بچووك و هەستی قورس، خۆشیی و ئازار، هەموو ئەوانە، لە ڕێی خانە هەستییەکانەوە هەست پێ بکات و، بەپێی زانیاریی و بەرچاو ڕوونییەك کە لە ڕێی ئەو هەستەوەر(حاسَّة)ەوە، پێی دەگات، مامەڵەیەکی ڕاست و تەندروست لەگەڵ دنیایی دەوروبەری و، پێشهاتەکان و، تەنە بەرکەوتەکانی دا بکات و، لە ئازار و زیان و مەترسیی پارێزراو بێ.

بۆ وێنە:

پێویستە گەورەترین پەند و دەرس لەوە وەربگیرێ، کە جاری وایە بابایەکی تووشبووی نەخۆشیی شەکرە (مرض السكَّري)، چونکە بە هۆی شەکرەوە خانە هەستییەکان (الخلايا الحِسِّيَّة) پێیەکانی زۆر سست بوون، یان مردوون، لە کاتی خەوتن دا، یان لە نەخافڵ، پێی کەوتۆتە سەر ئاگر و سووتاوە، بەڵام هەستی پێ نەکردوەو، بە خۆی نەزانیوە!



وێنەی (٣٢) کۆئەندامی دەستلێکوتان

www.alibapir.com




## خاڵی چواردەیەم: پوختەیەك لە بارەی چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤەوە:

کۆتا خاڵ کە دەمەوێ لە کۆتایی ئەم بابەتی سەرنجدانی ورد لە جەستەی مرۆڤدا، باسی بکەم، بریتیە لە: (پوختەیەك لە بارەی چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤەوە):

ئایا ئێمە کە ئێستا مرۆڤێکین و بەم شێوەیە هەین، بەم هەموو کۆئەندامانەوە کە لە خاڵەکانی ڕابردوودا باسمان کردن، ئەو مرۆڤە، چۆن دروست بووە، لە کوێوە هاتوە، چۆن چۆنی هاتوە؟! با سەرنجێکی خێرای لێ بدەین، ئەگەرنا ئەوەش پێویستیی بە باس و خواسێکی زۆر دەکات.

سەرنجدانەکەشمان لەبەر تیشکی دوو کۆمەڵە ئایەتدا ئەنجام دەدەین:

**١- کۆمەڵە ئایەتی یەکەم:**

خوا (سبحانە وتعالی) دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ ﴾ الطارق.

واتە: با مرۆڤ سەرنج بدات لە چی دروست بووە؟ لە ئاوێکی دەرقوڵیو دروست بووە، کە لە نێوان ئێسقانەکانی پشت و سینگەوە دێتە دەرێ.

**٢- کۆمەڵە ئایەتی دووەم:**

خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ المرسلات.

واتە: ئایا لە ئاوێکی بێز لێ کراو و بە کەم بایەخ تەماشا کراو، دروستمان نەکردوون! کە لە نشینگەیەکی مەحکەمدا دامانناوە (لە منداڵدانی دایکدا)، هەتا ئەندازەیەکی دیاریی کراو، ئەندازەگیریمان کردوە، ئێمە باشترین ئەندازەگیرین.

www.alibapir.com





وێنەی (٣٣) هێلکە و تۆو

لە هەموو ڕوویێکەوە خوا ئەندازەگیری کردوە، لە ڕووی کاتەوە، لە ڕووی شوێنەوە: کە منداڵدان بۆی فراوان دەبێ، لەو ڕووەوە کە بە هۆی ئاوەڵ منداڵ (پزدان)ەوە، هەموو خواردن و خۆراکێکی لە ڕێی نێوکییەوە پێ دەگات.

ئێستاش با لە نۆ (٩) بەندی کورت و گوشراودا، چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤ بخەینە ڕوو:

١- دوای پێکەوە جووتبوونی باب و دایك: زیندەوەرێکی وردیلەی نێو تۆو(مني)ی باب: ژیانداریی تۆویی(حیوان منوي)، (حَیمَنْ) کە بە ملیۆنانن، لەگەڵ زیندەوەرێکی گچکەی نێو تۆوی دایك: هێلکۆڵە (بُوَیضَة) یەکدەگرن و، بە هەردووکیان زیندەوەرێکی دیکەی سێیەم پێك دێنن، کە یەك خانە(خلیة واحدة) یە و، واپێدەچێ وشەی تۆویلکە(نطفة) مەبەست پێی ئەوە بێ، چونکە وشەی (نطفة) لە زمانی عەرەبیی دا، بە مانای ئاوێکی کەم (ماء قلیل)، یان ئاوێکی ساغ و ساف (ماء صافٍ) دێ و[1]، بێگومان ئەو ژیاندارە تۆویی (حیوان منوي) و هێلکۆڵە (بویضة)یەی، کە دوای گەشەکردن دەبنە کۆرپەلە و کۆرپە (جنین) لە چاو کۆی تۆوی باب و دایك، ئاوێکی کەم بگرە زۆر زۆریش کەمە و، جێی

---

(١) لسان العرب لابن منظور، ج١٤، ص١٨٧.

www.alibapir.com



سەرنجیش ئەوەیە كە پێغەمبەری كۆتایی (محمد(صلی الله علیه وسلم)) لە فەرموودەیەكی دا ئاماژەی پێكردوە كە كۆرپەلەی مرۆڤ لە كەمۆكەیەكی تۆوی باب و دایك دروست دەبێ نەك لە هەمووی، وەك فەرموویەتی: {مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ} (رواه مسلم: ٣٦٢٧ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِي).

٢- ئنجا ئەو زیندەوەرە یەك خانەییە (١) دابەش دەبێ و دەبێتە دوو خانە، دوایی ئەو دوو(٢) خانەیەش دابەش دەبن و دەبنە چوار(٤) و، ئەوانیش دەبنە هەشت (٨) و، ئنجا شازدە (١٦) و، سی و دوو (٣٢) و، شەست و چوار (٦٤) و، سەد و بیست و هەشت (١٢٨) و .. هتد، سەرەنجام: ئەو هەموو ئەندامانەی جەستەی مرۆڤ و، ئەو هەموو كۆئەندامە سەرسوڕهێنەرانەی كە ئێمە لە ڕابردوودا هەروا ئاماژەیەكمان پێیاندا، لەو خانانە(خلایا) كە دەبنە هەزاران و ملیۆنان و ملیاران، وردە وردە و پلە پلە و بە گوێرەی سیستم و بەرنامەیەك كە بۆیان دانراوە، دروست دەبن و كۆرپەی مرۆڤ پێك دێنن.

٣- هەر خانەیەك لە جەستەی مرۆڤدا، وا بەرمەجە كراوە كە كائینێكی دیكەی وەك خۆی لەخۆی بگرێتەوەو كۆپی بكات، كت و مت وەك خۆی، كە ئەوە پێی دەگوترێ: زۆربوونی خانەیی(التكاثر الخلوي)، هەر خانەیەك خانەیەكی وەك خۆی كت و مت بەبێ جیاوازیی، بە چل و شەش (٤٦) (كرۆمۆسۆم)ەوە كۆپی دەكاتەوە، خانە ئاساییەكان، هەموویان بەو جۆرەن.

٤- بەڵام خانە جینسییەكان (الخلایا الجنسیة)، چ هی پیاو: زیندەوەری مەنەویی (الحیوان المنوي)، چ هی ئافرەت: هێلكۆڵە (بویضة)، وانین، بەڵكو هی پیاو: بیست و سێ (٢٣) كرۆمۆسۆمی تێدایە و، هی ئافرەتیش بیست و سێ (٢٣) كرۆمۆسۆم و، بە هەردووكیان دەبنەوە بە چل و شەش (٤٦) كە پێكەوە یەك دەگرن و خانەیەكی دیكە، زیندەوەرێكی دیكە، پێك دێنن، كە پێی دەگوترێ: (نطفة)، كە ئەگەر هاتباو هەریەكەو چل و شەش (٤٦) كرۆمۆسۆمیان پێ بووایە: (٤٦ + ٤٦ =٩٢)، هەر خوا دەزانێ چ جۆرە زیندەوەرێك و مەخلووقێكی

www.alibapir.com



عەجایب دەردەچوو! بەڵام بەرنامەی خوا، هەڵە قبووڵ ناکات و هەرکام لە حەیمەن و هێلکۆڵە: هەر لە سەرەتاوە، یەکی بیست و سێ (٢٣) کرۆمۆسۆم لە کۆڵ خۆیان دەکەنەوە و، کاتێك پێکدەگەن: حەیمەنی پیاو و هێلکۆڵەی ئافرەت، تەنیا یەکی بیست و سێ (٢٣) کرۆمۆسۆمیان پێیە و، هی هەردووکیان دەکاتە: چل و شەش (٤٦)!

٥- ئاوی پیاو (مَنِيّ) شوێنی دروستبوون و کارگەکەی بریتیە لە هەردووك گونەکانی، ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ:

﴿يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ۝٧﴾ الطارق.

واتە: ئاوی دەرقوڵیو (ماء دافق) لە نێوان ئێسکەکانی پشت و سینگ، دێتە دەرێ؟! دەڵێین: بەڵێ تۆوی پیاو لە هەردوو گونەکانی دا دروست دەبێ و کارگەکەیان ئەوێیە، بەڵام پزیشکگەریی (طب) ئێستا، دەریخستوە: کۆرپە (جنين) کە دروست دەبێ: کوڕیش گونەکانی لە نێوان ئێسقانی پشت و سینگنی و، هەروەها ئافرەتیش هێلکەدانەکەی دیسان هەر لەوێیە، دوایی وردە وردە تا کۆرپەلە دەگاتە تەمەنی حەوت (٧) مانگیی، ئەوجار چ هێلکەدانی کۆرپەلەی کچ، چ گونەکانی کۆرپەلەی کوڕ، دادەبەزن بۆ شوێنی ئاسایی خۆیان! کەواتە: ئەوەی خوا (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی، ئەوە وایە و لەوێوە - لە ئێسقانی پشت و سینگەوە - هاتوون!.

٦- تۆو (مني) پیاو کە لە گونەکانیدا دروست دەبێ، زیندەوەرەکانی نێو ئاوی پیاو: هۆرمۆنی (تیستۆسترۆن) (testosterone) کە گرنگترین هۆرمۆنی کۆمەڵەی: ئەندرۆجین (androgens)ە، دەردەدات، کە هانی گون دەدا، بۆ بەرهەم هێنانی مەنیی پیاو و، پەیدا کردنی سیفەتەکانی پیاوەتیی لە پیاو دا، وەك: دەنگی گڕ و بەهێز، لەشی ماسوولکەیی، ڕوانی موو لەو شوێنانەی کە پیاوان لە ژنان جیا دەکاتەوە، وەك: ڕیش و سمێڵ، هەروەها جیاوازییەکانی دیکە، بە تایبەت لە ڕووی عەقڵیی و دەروونییەوە، ئەوە هەمووی کاریگەریی ئەو هۆرمۆنەیە کە لە نێو ئاوی پیاودایە و، لە نێو گوندا دروست دەبێ.

www.alibapir.com



٧- ئاوی ژن لە هێلکەدانەکاندا دروست دەبێ، کە ئەویش هەر تۆو(مَنيّ)پێ دەگوترێ، بەڵام ڕەنگەکەی جیایە لە هی پیاو، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ مَاءَ الرَّجُلِ غَلِيظٌ أَبْيَضُ وَمَاءَ الْمَرْأَةِ رَقِيقٌ أَصْفَرُ[١]} واتە: ئاوی پیاو خەست و سپیی و، ئاوی ژن ڕوون و زەردە..

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە هێلکۆڵەکان (بويضات) کە لە نێو ئاوی ئافرەتدا هەن، ئافرەت دوو هێلکەدانی هەن، وەك چۆن پیاو دوو لا گونی هەن، ئنجا هەر مانگە لایەکی هێلکەدان، هیلکۆڵەیەك دروست دەکات و، هێلکەدانی ئافرەتیش هۆڕمۆنی مێیینە دروست دەکات، کە دوو جۆرە هۆڕمۆنن:

أ- (ئیسترۆجین) (Estrogen).

ب- (پروجستیرۆن) (progesterone).

ئەوانیش کاریان ئەوەیە، هەم هانی هێلکەدانەکان دەدەن، جارێکی دیکە بۆ بەرهەم هێنانی هێلکۆڵەکان و، هەم سیفەتەکانی مێیینایەتیی، ئافرەتایەتیی، لە ئافرەتاندا پەیدا دەکەن و تۆخ دەکەنەوە.

٨- (١ سم$^{٣}$) لە ئاوی پیاو[٢]: سەد ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠) زیندەوەر (حیمن)ی تێدایە، واتە: ئەو زیندەوەرە بچووکانەی ئاوی پیاو پێك دێنن، چونکە مەنی پیاو، هەمووی زیندەوەری بچووکە، بەڵام ئێمە وەك ئاو دێتە بەرچاومان، ئنجا کاتێك پیاو لەگەڵ ژن دا جووت دەبێ، هەر جارە: دوو تا چوار (٢-٤ سم$^{٣}$) ئاو فڕێ دەدات و، مانای وایە: دەوری سێ سەد ملیۆن (٣٠٠٠٠٠٠٠٠)

---

(١) {عَنْ أنسٍ أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ حَدَّثَتْ أَنَّهَا سَأَلَتْ نَبِيَّ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم، عَنِ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: «إِذَا رَأَتْ ذَلِكِ الْمَرْأَةُ فَلْتَغْتَسِلْ»، فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ وَاسْتَحْيَيْتُ مِنْ ذَلِكَ قَالَتْ وَهَلْ يَكُونُ هَذَا فَقَالَ نَبِيُّ اللهِ صلى الله عليه وسلم: «نَعَمْ فَمِنْ أَيْنَ يَكُونُ الشَّبَهُ إِنَّ مَاءَ الرَّجُلِ غَلِيظٌ أَبْيَضُ، وَمَاءَ الْمَرْأَةِ رَقِيقٌ أَصْفَرُ فَمِنْ أَيِّهِمَا عَلاَ أَوْ سَبَقَ يَكُونُ مِنْهُ الشَّبَهُ»} رواه مسلم برقم: ٧٣٦، باب وُجُوبِ الْغُسْلِ عَلَى الْمَرْأَةِ بِخُرُوجِ الْمَنِيِّ مِنْهَا.

(٢) بەڵام (إعجاز القرآن في ما تُخفيه الأرحام) ص١١٢، گوتوویەتی: سێ میللی لیتر و نیو (٣،٥ ملل) لە مەنی پیاو: سێسەد و پەنجا ملیۆن (٣٥٠٠٠٠٠٠٠) (حیمن)ی تێدایە.

www.alibapir.com



زیندەوەری تۆوییان تێدا هەیە، بەڵام هێلکەدانەکانی ئافرەت لە سەرەتاوە: سێ ملیۆن (٣٠٠٠٠٠٠) هێلکۆڵەیان تێدایە، لە سەرەتاوە زۆرن، بەڵام دوایی ئافرەت کە باڵغ دەبێ، دەمێننەوە: پێنج تا شەش هەزار (٥٠٠٠ - ٦٠٠٠)، ئنجا لەو پێنج، شەش هەزارە، تەنیا چەند سەدێکیان لێ پێ دەگات، کە بگونجێ مرۆڤیان لێ دروست ببێ و، هەر مانگە یەکێ لەو هێلکۆڵانە لە هێلکەدانی ئافرەتەوە دێتەوە نێو منداڵدانی، ئنجا ئەگەر جووتبوون دروست بوو و، وا بوو کە منداڵ دروست ببێ، ئەو هێلکۆڵەیە لەگەڵ ئەو حەیوانی مەنەویی پیاودا، یەکدەگرن و زیندەوەرێکی یەك خانەیی پێك دێنن، کە وەك گوتمان: کە یەکی بیست و سێ (٢٣) کرۆمۆسۆمیان پێیە، بۆ ئەوەی سیفەتەکانی باب و دایك لەو منداڵەدا کۆببنەوە.

بەڵام ئەگەر ئەو منداڵە قەدەری وانەبوو دروست ببێ و، ئەو هێڵکۆڵەیە لەگەڵ حەیوانی مەنەویی دا یەك بگرن، لە کاتی خوێنی مانگانەدا، دێتە دەرێ، ئافرەت بۆچی هەموو مانگێك دەکەوێتەوە حەیزەوە و خوێنی پێدا دێ؟ چونکە ئەو منداڵە دروست نەبووەو، ئەگەر منداڵەکە دروست بێ، خوێنەکە نایەت و ئەو خوێنە لەوێدا دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو نوتفەیە لەوێ دا، گەشە بکات، واتە: وەك حەوزێکی ئاو لەوێدا دێت و دەچێ و گەشەی تێدا دەکات.

٩- هێڵکۆڵە (بویضة) تیرەکەی: سەدو بیست تاکو دوو سەد (١٢٠ - ٢٠٠) مایکرۆ مەتر[١] دەبێ، بەڵام حەیوانی مەنەویی: پەنجاو دوو (٥٢) مایکرۆنە، واتە: هێلکۆڵەی ئافرەت گەورەترە و دەگونجێ بە چاو ببینرێ و شێوەکەشی خڕ هەڵکەوتوە، بەڵام (حَیمَن) درێژ کۆڵەیە و، کلکێکی درێژیشی هەیە و، نیزیکەی (١٢/١١)ی درێژییەکەی، هی کلکەکەیەتی[٢].

---

(١) چونکە: درێژیی (حیمن): (٦/١٠٠ملم)ێکە، واتە: (٦٠) مایکرۆن، بەڵام سەری ئەو حەیمەنە، تەنیا (٥) مایکرۆنە و (٥٥) مایکرۆنەکەی دیکە، هی نێوەڕاست و کلکە درێژەکەیەتی.

(٢) پێشتر چەند جارێك گوتمان: مایکرۆ مەترێك: (١/١٠٠٠ملم)ێکە، بەڵام کتێبی (إعجاز القرآن..) دەڵێ: تیرەی هێلکۆڵە دەوری (٠،١٣)ملم، یانی: (١٣٠)مایکرۆ مەترە، بڕوانە: ص١١٢.

www.alibapir.com



ئنجا ئێمەی کە ئێستا خۆمان دەبینین و هەموو مرۆڤەکان کە خۆیان دەبینن، ئا بەو شێوەیە دروست بووین، ئەگەر تۆزێك عەقڵ و لۆژیك و زگماك (فطرة) و ویژدانمان بخەینە کار، ناگونجێ خوای بەدیهێنەر و خاوەن و پەروەردگار و تەگبیرکار و مشوورخۆری خاوەنی ئەو پەڕی بەزەیی و بەخشش و زانایی و کارزانیی، خۆمان نەناسین! بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (المؤمنون)دا - کە خوا پشتیوان بێ کاتێك کە ئێمە بە تەفسیرکردنی دەگەین[1]، لەو بارەوە، باسێکی درێژتر لەبارەی دروستبوونی مرۆڤەوە دەکەین - خوا (سبحانه وتعالى) دوای ئەوەی ئاماژە دەکات کە قۆناغەکانی دروستبوونی مرۆڤ، حەوت (٧) قۆناغن، خۆی بە بەرزیی و بەپیرۆزیی و شکۆمەندیی، وەسف دەکات و بە بەدیهێنەری هەرە چاك (أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ) خۆی دەناسێنێ، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾.

واتە: بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان لە خوڵاصەیەکی قوڕ دروستکردوە {چونکە: تۆوی پیاو و تۆوی ئافرەت، لە خوێن دروست دەبن، خوێنیش لەو خواردن و خۆراکانەی کە ئەوانیش سەرەنجام لە گڵ و ئاون، (گڵ + ئاو = قوڕ)}، دوایی گێڕاومانە بە نوتفەیەك لە نشینگەیەکی مەحکەمدا (واتە: یەکگرتنی حەیمەنێك لەگەڵ هێلکۆڵەیەك، پێی دەگوترێ: نوتفە و لەنێو منداڵداندا جێگیر دەبێ)، دوایی ئەو نوتفەیە دەگۆڕین بۆ عەلەقە، (زیندەوەرێك کە خۆی بە دیواری منداڵداندا هەڵدەواسێ و زۆر بچووکە)، دوایی ئەو عەلەقەیەش دەگۆڕین بۆ زارجوو(مُضغَة) (پارچە گۆشتێکی بە قەد زارجوویەك کە بجووڕێ)، دوایی ئەو زارجوو(مُضغَة)یەش دەگۆڕین بۆ ئێسقان، (یەکەمین قۆناغی دروستبوونی کۆرپەلە ئەوەیە کە ئێسقان دروست دەبێ و ئەوەی کە خوا فەرموویەتی:

---

(١) لە تەفسیرە کوردییەکەمان دا: (تەفسیری قورئانی بەرز و بە پێز).

www.alibapir.com





ئێستاش زانیاریی هەر ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە)، دوایی ئێسقانەکانیش بە گۆشت دادەپۆشین.

ئەدی قۆناغی حەوتەم چییە؟ ﴿ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَ﴾، دوایی کردمان بە دروستکراوێکی دیکە.

یانی: تاکو ئێستا بەس زیندوو بوو، بەس ژیانی هەبوو، بەڵام لەمەودا ڕووحی بەبەردا دەکرێ، کەواتە: ژیان لە ڕووح جیایە، ڕووح تایبەتە بە مرۆڤەوە، بەڵام ژیان: ڕووەکیش ژیانی تێدایە، زیندەوەرانیش ژیانیان تێدایە، ئاژەڵانیش ژیانیان تێدایە و، هەرکام لە: (نُّطفَةَ، وعَلَقَة، مُضۡغَةَ )ش ژیانیان تێدایە، بەڵام هەتا، دوای چوار مانگ و دە شەو کە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دیاریی دەکات، ڕووحی بەبەردا ناکرێ، بۆیە خوا دەفەرمووێ: دوایی کردمان بە دروستکراوێکی دی، یانی: دروستکراوێکی دیکەی ڕووحی بە بەردا کراو!

لە کۆتاییش دا خوا فەرموویەتی: ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ﴾، واتە: بەرزیی و بە پیرۆزیی و شکۆمەندیی بۆ خوای چاکترین بەدیهێنەر.

بەڵێ مرۆڤ ئاوا هاتوەو بەو شێوەیە دروستبووە، بۆیەش ئەهلی تەزکیە و عیرفان گوتوویانە: (مَنْ عَرَفَ نَفْسَهُ، فقد عَرَفَ رَبَّهُ)، هەر کەسێ خۆی بناسێ، بەدڵنیایی پەروەردگاری خۆیشی دەناسێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، خۆمان باشتر بناسین، هەم سەرەتای خۆمان، هەم پێکهاتەی جەستەیی و ڕووحیی خۆمان، چاکتر بناسین، تاکو پەروەردگارو خاوەنی خۆشمان باشتر بناسین و، بەو شێوەیەی کە بۆی شایستەیە، مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، کە بریتیە لە باش پەرستنی و، بەندایەتیی ساغ و ڕاست بۆ کردنی.

www.alibapir.com







# تـەوەری دووەم: ژینگـەی مرۆڤ

## دەستپێك

خوێنەری سەنگین!

ئەم تەوەری دووەمی: ڕوونکردنەوەی شەشەمین یاسای عەقڵیی[1]، کە بوونی خوای بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەن، وەك: گەورەترین ڕاستیی بوون (کبری حقائق الوجود) دەدرەوشێننەوە، بریتیە لە: (ژینگەی تێدا ژیانی مرۆڤ).

چونکە: خوا (سبحانە وتعالی) وەك چۆن مشووری خواردوە و تەگبیری کردوە بۆ مرۆڤ، لە نێو جەستەی دا، کە لە تەوەری یەکەم دا باسمان کرد، باسی ئەو هەموو کۆئەندامانەی جەستەی مرۆڤمان کرد، کە سەرجەم شازدە (١٦) کۆئەندام بوون و هەندێکیانمان بە کورتیی باس کردن و، هەندێکیشیان وردەکاریی زیاترمان تێدا خستنە ڕوو، بە هەمان شێوەش خوای بەخشەری میهرەبان لە دەرەوەی خۆیشی دا - لەو ژینگە و دەوروبەرەدا کە تێییدا دەژی - مشووری لێ خواردوە و تەگبیری لێ کردوە.

ئنجا ئێمە لەم تەوەری دووەمەدا، باسێکی کورت و پوختی: (ژینگە و دەوروبەری تێدا ژیانی مرۆڤ) دەکەین، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی یازدە (١١) ئایەت لە سووڕەتی (النبأ)دا، کە ئایەتەکانی: (٦ - ١٦)ن و، خوای کارزان تێیاندا باسی یازدە (١١) تەگبیرکردن و مشوور خواردن و سەرپەرشتییکردنی بۆ

---

(١) کە بریتیە لە: (هەبوونی مشوورخواردن و سەرپەرشتییکردن و تەگبیر کردن، بەڵگەی هەبوونی مشوورخۆرێك و، سەرپەرشتیارێك و تەگبیرکارێکە، کە خوایە)

www.alibapir.com



مرۆڤەکان دەکات، لەم سەر زەوییە، کە وەك گوتمان: ئەوە هەمووی ڕوونکردنەوەی یاسای شەشەمی عەقڵییە، کە عەقڵ شایەدیی بۆ بوونی خوا دەدا، لە میانی حەوت (٧) یاسادا کە شەش (٦)یانمان باسکردن و، ئەمە هەمووی هەر درێژە پێدانی ڕوونکردنەوەی یاسای شەشەمە، کە بریتیە لە: (مشوورخواردن و سەرپەرشتییکردن و تەگبیر کردن، بەڵگەو نیشانەی هەبوونی مشوورخۆرێك و سەرپەرشتیارێك و تەگبیرکارێکە، کە خوایە (سبحانە وتعالی)).

ئنجا ئێمە لە تەوەری یەکەمدا، باسمان کرد کە: خوا (سبحانە وتعالی) چۆن مشووری لە جەستەی مرۆڤ خواردوە، ئەو هەموو وردەکارییانە، کە ئێمە تەنیا کەمێکیشیانمان لێ باس کردن، ئەگەرنا وردەکارییەکان زۆر زۆرن و، زۆر زۆر وردترن، ئەویش تەنیا ئەوەیە کە تا ئێستا عەقڵی مرۆڤ پێیگەیشتوە و، مرۆڤ توانیویەتی دەرکی بکات، ئەویش بەم دوا دواییانە و، لەم دوو سێ سەدەی دواییدا، ئەگەرنا پێشتر ئەو هەموو وردەکارییانە نەزانرا بوون، کاتی خۆی نەزانراوە، کە جەستەی مرۆڤ لە سەد تریلیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) خانە پێك دێ و، هەر خانەیەك ئەو هەموو وردەکارییەی تێدایە، هەروەها نەزانراوە کە ئەو هەموو زیندەوەرانە، لە جەستەی مرۆڤ دا هەن، جگە لە خانەکانی خۆی، بەکتریا سوودبەخشەکان، هەروەها ڤایرۆس نەبینرابوو و کەڕووەکان (فطریات)و .. هتد، هیچیان نەدۆزرابوونەوە، تاکو (لویس پاستور) ئەو ئامێرەی (میکرۆسکۆب)ی دروستکردو، ئەو زیندەوەرە وردانەیان پێ ببینین.

بەڵام با بزانین خوا عزوجل بۆ سازکردنی ژینگە (البیئة) و هەلومەرجێك، بارودۆخێك کە مرۆڤ تێیدا بژی، چ تەگبیرێکی کردوە و چ مشوورێکی لێ خواردوە؟

خوا (سبحانە وتعالی) دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ۝٦ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ۝٧ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ۝٨ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ۝٩ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ۝١٠ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ۝١١ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ۝١٢ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ۝١٣ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ۝١٤ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ۝١٥ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ۝١٦ ﴾ النبأ.

www.alibapir.com


ئەمانە یازدە (١١) پێکهاتەن لە پێکهاتەکانی ئەو ژینگەیەی کە مرۆڤ تێیدا دەژین، کە بەبێ ئەوانە مرۆڤ نەیدەتوانی، ئەو ژیانەی کە ئێستا دەیگوزەرێنێ، بیگوزەرێنێ.

کافرەکان پرسیاریان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکرد و، لە نێو خۆیاندا ئەو پرسیارەیان دەورووژاند: کە ئایا ڕاستە ئەم دنیایە، ئاخر زەمانی بەسەردا دێ؟ ئایا ڕاستە ڕۆژێك دێ، کە ئێمە تێیدا هەڵدەستێنرێینەوە؟ واتە: ئایا ئاخر زەمان (الساعة) هەیە و، ئایا هەڵسانەوە و زیندووکرانەوە (القیامة) هەیە؟.

خوای بەرز و مەزن وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە و، لەو بارەوە دەفەرموێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴿ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ۝١ عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ ۝٢ الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ۝٣ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ۝٤ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ۝٥ ﴾ النبأ.

واتە: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، دەربارەی چی پرسیار دەکەن؟ دەربارەی هەواڵی مەزن، کە ئەوان تێیدا ڕاجیان!! با واز بێنن، نەخێر، وەك ئەوەی ئەوان گومان دەبەن وا نیە، لەمەودوا بۆیان دەردەکەوێ، جارێکی دیکەش با واز بێنن، وانیە وەك ئەوەی ئەوان گومان دەبەن، لەمەودوا بۆیان دەردەکەوێ.

ئنجا ئایا بە بەڵگەی چی بۆیان دەردەکەوێ، کە ئاخر زەمانیش هەیەو، هەستانەوەو زیندووکرانەوەش هەیە؟! خوا ئەم یازدە (١١) دیاردەو دیمەنە سروشتییە، کە ژینگەی ژیانی مرۆڤ پێك دێنن، وەك بەڵگە لەو بارەوە دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ:

١- ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴾: ئایا زەویمان نەکردوە بە لانکە (بێشکە)، هەروەها (مِهاد) بە ڕایەخیش دەگوترێ، بە فەرشێك کە ڕاخراوە.

ئنجا ئێمە جارێ هەر کورتە مانایەکەیان دەخەینەڕوو و، دوایی تۆزێ لە وردەکاریی هەندێکیان باس دەکەین.

www.alibapir.com





٢- ﴿وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾: ئایا چیاکانمان نەکردوونە گوڵمیخ.

(أوتاد) کۆی (وتد)ە، (وتد)یش، واتە: گوڵمیخ و سینگ، کە چادر و ڕەشماڵی پێ دەبەستنەوە، یان وڵاخی پێ دەبەستنەوە.

٣- ﴿وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا﴾: ئایا ئێوەمان بە جووت دروست نەکردوە؟! واتە: نێرو مێ، هەر لە ئادەم و حەوواوە بگرە، تاکو ئێستاو دوای ئێستاش.

٤- ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا﴾: ئایا نووستنی ئێوەمان، نەگێڕاوە، بە مایەی پشوودانتان؟!

٥- ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا﴾: ئایا شەوگارمان بۆ نەگێڕاون، بە پۆشاکێك (داتان دەپۆشێت).

٦- ﴿وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا﴾: ئایا ڕۆژگاریشمان بۆ نەگێڕاون، بە مایەی ژیان و گوزەران و کارو کاسبی تێدا کردن؟!

٧- ﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا﴾: ئایا لە سەرووی ئێوەوە، حەوت ئاسمانی مەحکەممان دروست نەکردوون؟!

٨- ﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾: ئایا چرایەکی زۆر ڕۆشن و تیشکدەرمان نەڕەخساندوە؟! (کە مەبەست پێی خۆرە).

٩- ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا﴾: ئایا لە گوشراوەکان، ئاوێکی بەخوڕزەممان دانەبەزاندوە؟!

(مُعْصِرَات) مەبەست پێی هەورەکانە، (مُعْصِرَات) لەسەر کێشی (مُفْعِلَة)ەیە، بەڵام، بە مانای (مَفْعُولَة)یە، واتە: ئەو هەورانەی کە دەگوشرێن، وەك: (غُرْفَةٌ مُضِيئَة) واتە: ژوورێکی ڕووناککراوە، نەك ڕووناککەرەوە.

١٠- ﴿لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا﴾: بۆ ئەوەی بەو ئاوە بە خوڕزەم دابەزێنراوە، لە هەورە گوشراوەکان، دانەوێڵەو ڕووەك دەربێنین.

www.alibapir.com



وەك جاری دیكەش باسمان كردوە: هەمیشە خوای زانا و كارزان باسی: ئاوی دابەزێنراو دەكات و، كەمتر وایە باسی باران (مطر) و بەفر (ثلج) و تەرزە (بَرَد) بە تایبەت بكات، چونكە وشەی (ماء) باران و بەفر و تەزرە، هەموویان دەگرێتەوە، ئنجا ئایا بۆچی خوا (سبحانه وتعالی) ئەو ئاو (ماء)ەی لە هەورە گوشراوەكان دابەزاندوە؟ تاكو دانەوێڵەو ڕووەكی پێ بڕوێنێ.

١١- ﴿وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا﴾: هەروەها تاكو بەو ئاوە دابەزێنراوە باغ و بێستانی چڕو پڕو پێكداچووی پێ بڕوێنێ.

لە كۆتایی دا خوا (سبحانه وتعالی) دەفەرموێ: ﴿إِنَّ يَوۡمَ ٱلۡفَصۡلِ كَانَ مِيقَٰتًا﴾، واتە: بە دڵنیایی ڕۆژی لێك جیاكردنەوە، تەوقیت كراوە، كاتێكی دیارییكراوی بۆ دانراوە، واتە: مادام خوا (سبحانه وتعالی) ئەم گەردوونەی ئاوا ڕێكخستوە و، ئەو هەموو مشوورانەی لە ژیانی مرۆڤ خواردوون، ناگونجێ ئەو مرۆڤە، كە ئەو هەموو مشوورانەی لێ خوراون، ئەو هەموو تەگبیرانەی بۆ كراون و، بەو شێوە پڕ وردەكاریی و، سەرسووڕهێنەرە سەرپەرشتییكراوە، ناگونجێ وێڵ بكرێ و، ئاخر زەمانی بەسەردا نەیەت و، پاشان قیامەت و هەڵسانەوەی بەسەردا نەیەت و، زیندوو نەكرێتەوەو، لێی نەپرسرێتەوە، چی كرد بەو نیعمەتانەی خواو، چۆن لەنێو ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی خوادا، ژیانی خۆی گوزەراند؟!

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## سەرنجدانێکی خێرا لەم یازدە (11) نیعمەتە:

**نیعمەتی یەکەم:**

١- ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا﴾، ئایا زەویمان بۆ نەکردوون بە لانکە، بێشکە؟! (مهاد) هەم بە مانای (مَهْد) دێ، وەك لە قورئانیش دا هاتوە:

﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا﴾ طه: ٥٣.

واتە: لانکەو بێشکە، هەم بە مانای (ڕاخراو)یش دێ، ڕایەخ، فەرش[١]، کە زەوی لەلایەکەوە بە هۆی جووڵەکەیەوە، کە چەند جۆرە جووڵەیەکی هەن، وەك چۆن (لانك) منداڵی تێدا ڕادەژەنرێ، یان جۆلانە، بێ ئەوەی بیکەوێنێ، لەو ڕووەوە زەوی وەك لانکەیەك و بێشکەیەك وایە، کە ئێمەی هەڵگرتوە و ڕامان دەژێنێ، بێ ئەوەی بمانکەوێنێ، لەو ڕووەشەوە کە ئێمە لەم سەر زەوییە، زۆر مورتاح و ئاسوودەین، بە هۆی ئەوەوە کە خوا (سبحانه وتعالى) هێزی کێشکردن (جاذبية)ی وا داناوە، ئێمە هەستی پێ ناکەین، چونکە لەسەر هەر سانتیمەتر دووجایەك (سم٢) تەنیا کیلۆغرامێك قورسایی هەیە، ئنجا ئەوە لە کوێ و، ئەوە لە کوێ کە ئەگەر هێزی کێشندەی زەویی، وەك هی سەر مانگ بووایە، ئەو کاتە دەبووایە بارێکی قورسیش لە کۆڵ خۆمان بکەین، ئنجا کە هەنگاویشمان هەڵدێنا، بەرزدەبووینەوە، چونکە مانگ (قمر) هێزی کێشندەکەی، یەك لەسەر پێنجی (١/٥)ی هی زەوییە، یانی: لێرە شتێك پێنج کیلۆ بێت، لەسەر مانگ یەك کیلۆیە و، مرۆڤێکی پەنجا کیلۆیی لەوێ، وەك دە کیلۆیی لێ دێ و، هەست دەکات سووك بووە.

---

(١) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص٤٩٥، ط١، المكتبه العصريه/ ٢٠١٢م، (المهد: ماتُهيِّئُ للصَّبي.. والمهدُ والمِهاد: المكان المُمَهَّد، الموطَّأ ... وذلك مثل قوله: ﴿ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا﴾ البقرة: ٢٢.

www.alibapir.com



دیسان ئەگەر هێزی کێشندەکەی وەك هی هەندێك لە خڕۆکەکانی دیکە بووایە، کە چەند بەرانبەری هی زەوی زیاترە، یاخود کەمترە، ئەو کاتە ژیانەکەمان نە دەسووڕا، بەڵام ئێستا زەوی، وەك ڕایەخێك وایە بۆ ئێمە، بە کەیفی خۆمان لەسەری دێین و دەچین و دەجووڵێین.

زەوی بەلای کەمەوە، پێنج جۆرە جووڵەو سووڕانەوەی هەن[1]:

**یەکەم:** خولانەوەی بە دەوری خۆیدا: زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا، بە خێرایی بیست و هەشت کیلۆمەتر (٢٨ کم) لە خولەکێکدا دەخولێتەوەو بە شەوو ڕۆژێك [(٢٤) سەعات] خولێك تەواو دەکات.

**دووەم:** سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا:

لە هەر چرکەیەکدا سی (٣٠ کم) دەبڕێ، واتە: زیاتر لە شەست (٦٠) ئەوەندەی خێرایی خولانەوەی بە دەوری خۆیدا، بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە، ئەویش بە سووڕگەیەکی بیست و سێ پلەو نیو (٢٣،٥) لار، کە ئەگەر بەو بیست و سێ پلەو نیو (٢٣،٥)ە، لار نەبووایە، چوار کەشەکانی ساڵ دروست نەدەبوون، بەڵکو ئێمە ئەو کاتە تەنیا دوو وەرزمان دەبوون: زستان و هاوین، بەڵام بەهارو پایز دروست نەدەبوون.

**سێیەم:** سووڕانەوەی بە دەوری داڵی وەستاودا:

زەوی بە خێرایی، بیست (٢٠ کم) لە چرکەیەکدا، بە دەوری داڵی ڕاوەستاو (الکوکب الجاثي)دا، دەسووڕێتەوە.

**چوارەم:** سووڕانەوەی بەدەوری چەقی کاکێشان دا:

زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا، واتە: خۆر و هەر نۆ (٩) خڕۆکەکەی: مەرریخ و زوحەل و عەتتاردو موشتەریی و ئۆڕانۆس و نیبتۆن و بلۆتۆو زوهرە)،

---

(١) پێشتریش باسی زەویی و پێنج خولانەوەکانیمان کردو، ئاماژەمان بەو سەرچاوانەشدا کە زانیارییەکانمان لێوەرگرتبوون، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

www.alibapir.com







بە خێرایی دووسەدو شەش (٢٠٦ کم) لە چرکەیەکدا، لەگەڵ کۆمەڵەی خۆریش بە دەوری چەقی کاکێشاندا دەخولێتەوە.

**پێنجەم:** سووڕانەوەی لەگەڵ کاکێشاندا:

هەروەها زەوی لەگەڵ کاکێشانیشدا بە خێرایی نۆسەدو هەشتا (٩٨٠ کم) لە چرکەیەکدا، جارێکی دیکە دەسووڕێتەوە.

زەوی بەلای کەمەوە ئەو پێنج سووڕانەوەی هەن و هی دیکەشی هەن بە تەئکید، چونکە کاکێشانەکەی ئێمەش لەگەڵ کۆمەڵێك کاکێشانی دیکەدا، ئەوانیش بە دەوری چەقێکی دیکەدا دەخولێنەوە، ئیدی هەر خوا دەزانێ چی دیکەش هەیە.

کەواتە: ئەم زەوییە لەگەڵ ئەو هەموو سووڕانەوانەدا، لە ڕاستییدا بۆ ئێمە وەك لانکە و بێشکەیەك وایە، ڕامان دەژێنێ و، ناشمان کەوێنێ، چەند وێچواندن (تشبیه)ێکی ڕێك و ڕاستە، لەگەڵ واقیعی زەویدا!!

**نیعمـــەتی دووەم:**

٢- ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا﴾: ئەو ڕستانە هەموویان بادەدرێنەوە، دەگێڕدرێنەوە بۆ سەر ڕستەی یەکەم ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا﴾، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا﴾، یانی: (أَلَمْ نَجْعَلِ الجِبَالَ أَوْتَاداً)، ئایا چیاکانمان نەکردوون بە گولمیخ، بە سینگ[1]؟!.

زانایانی زەوی ناس(جیۆلۆجیی) دەڵێن: بنکی هەر بەرزاییەك کە تۆ دەیبینی لەسەر زەوی، بنکی هەر یەك لەو چیاو تەپۆلکانە، دە، پازدە(١٠ - ١٥) هێندەی خۆی بە زەویدا چۆتە خوار، چەندی بەدەرەوەیە، دە، پازدە (١٠ - ١٥) هێندەی بە ناخی زەویدا چۆتە خوار، بۆ وێنە: لووتکەی (ئیڤرست) کە بەرزترین

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٥٤٤.

www.alibapir.com





وێنەی (٣٤) چیای هیمالایا

لووتکەی چیایە لە دنیادا، لەسەر زنجیرە چیای (هیمالایا) و، هەشت هەزارو هەشت سەدو شەست و چوار مەتر (٨،٨٦٤ م) لە ڕووی دەریاوە بەرزە، نیزیکەی نۆ کیلۆ مەتر (٩ کم)، بەڵام زانایانی جیۆلۆجیی بۆیان دەرکەوتوە کە سەدو سی کیلۆ مەتر (١٣٠ کم) بە ناخی زەویدا چۆتە خوار، واتە: سەدو سی هەزار مەتر (١٣٠،٠٠٠ م)، ئەگەر هەشت هەزارو هەشت سەدو شەست و چوار مەتر (٨،٨٦٤ م) بەرزە لە ئاستی ڕووی دەریاوە: سەدو سی هەزار مەتر (١٣٠،٠٠٠ م)ی، یانی: نیزیکەی پازدە هێندەی خۆی، بە ناخی زەویدا چۆتە خوار! بۆیەش خوای زانا و توانا دەفەرمویٚ: ئایا چیاکانمان بۆ نەکردوونە گوڵمیخ و سینگ، (وَتَد) ئەوەیە کە دایدەکوتریٚ و وڵاخی پیٚ دەبەستنەوە، یاخود چادرو ڕەشماڵی پیٚ ڕادەگرن، لەملاولای ڕەشماڵەکە سینگەکان دادەکوترێن، گوڵمیخ و سینگ هەمیشە بەشی کەمی بە دەرەوەیە و بەشی زۆری بە زەوی دا دەچێتە خوار.

خوا (سبحانە وتعالی) لە کاتێکدا کە جاریٚ زانستی جیۆلۆجیی پێشنەکەوتوە و، خەڵك نەیزانیوە لە بنی زەوی دا، چ باسە! ئەوەی فەرمووە، چونکە زاتێك کە زەوی خولڤاندوە، هەر ئەویش قورئانی ناردوە، بۆیە ئەوەی کە لە فەرمایشتی خوادا هاتوە، لەگەڵ ئەو واقیعەی کە دروستکراوەکانی خوا، هەیانە، هەمووی

پڕ بە پێستەو ڕێکە، خوا بۆ خۆی دەزانێ چی دروستکردوە و ئەوەش کە فەرموویەتی، بێگومان لەگەڵ ئەوەدا کە کردوویەتی، ناگونجێ نەگونجێ!

**نیعمـــەتی سێیەم:**

٣- ﴿وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا﴾: ئایا ئێوەمان بە جووت دروست نەکردوە؟! دیارە جووتیەتیی (زوجیة)، بنچینەی دروست کراوەکانی خوایە، بەبێ هەڵاواردن، بۆیە کە خوا دەفەرمویێ:

﴿وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ۝٣﴾ الفجر: ٣.

سوێند بە جووت و تاك، بێگومان تاکەکە تەنیا خۆیەتی و، جووتەکانیش هەمموو دروستکراوەکاننی، وەك دەفەرمویێ:

﴿وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ۝٤٩﴾ الذاريات.

واتە: لە هەمموو شتێك جووتمان دروست کردوە، ئایا بیرناکەنەوە (کە ئەوەی هەمموو شتێکی بە جووت و دووانە دروستکردوە، دەبێ خۆی تاك و بێ هاوەڵ بێ!).

کاتی خۆی زانایانی ڕووەکناس، وایان دەزانی تەنیا درەختێکی وەك دارخورما، کە تۆوی نێرەکەی دەبەنە لای مێیەکەی و، هەندێك لە ڕووەکەکانی دیکە، کە بە هۆی هەنگەکان و پەپوولە و مێش و مەگەز، یان بەهۆی باوە، متوربە دەبن:

﴿وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ﴾ الحجر: ٢٢.

واتە: بایەکانمان ناردوە متوربەکەرن.

وایان دەزانی هەر ئەوانە جووتیان تێدایە، بەڵام ئێستا بۆیان دەرکەوتوە، کە هەرچی ڕووەکە، هەمووی نێر و مێی تێدایە، هەمووی جووتە، بەڵام هەیە نێرو مێیەکەی جیان و، هەشە هەردووکیان لە نێو خۆی دان، ئنجا نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو ئێستا - وەك پێشتریش باسمان کرد - زانایانی لێکۆڵەرەوەی مادده، دەڵێن: لە نێو هەر یەکەیەکی وردی ماددەدا کە ئەتۆم (ذرة - Atom)ە، لەوێشدا جووت

www.alibapir.com





هەیە، پرۆتۆن بارگەیەكی موجیبی هەیە و ئەلیكترۆن بارگەیەكی سالیبی هەیە، واتە: ساردو گەرمن.

ئنجا ئەگەر تەماشای گەردوون بكەین: ساردو گەرم، ئاسمان و زەوی، ڕووناكیی و تاریكیی، دنیا و دوارۆژ، ڕووح و جەستە، هەموو دروستكراوەكانی خوا دووانەن، تەنیا خوا تاكە، وەك دەفەرمویَ:

﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ الإخلاص: ١.

واتە: بلّیَ خوا تاكە، (أحد) جیایە لە (واحد)، چونكە (واحد) یانی: یەك، ئنجا یەك، هەیە، بەڵام دووان (إثنین)یش هەیە، بەڵام تاك (أحد) ئەوەیە كە هاوتای نەبیَ، یەكێكی دیكەی وەك ئەو نەبیَ.

**نیعمـــەتی چـــوارەم:**

٤- ﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴾: ئایا خەوی ئێوەمان نەگێڕاوە بە مایەی ئیسرِاحەت و پشوودان؟!.

لە كاتی خەوتندا چی ڕوودەدات؟

**یەكەم:** زانایانی توێكاریی (تشریح) كە لە جەستەی مرۆڤ دەكۆڵنەوە، دەڵێن: لە كاتی خەوتندا، مێشك هۆڕمۆنی (سیرۆتۆنین) دەردەدا، كە خەوێنەرە، یانی: كاتیَ دەتەویَ بخەوی، مێشك ئەو هۆڕمۆنە دەردەدا كە خەوێنەرە، ئنجا خەوت لیَ دەكەویَ.

**دووەم:** لە كاتی خەوتن (نووستن)دا، هۆڕمۆنی گەشەكردن هانی خانەكان دەدا، كە خۆیان تازە بكەنەوە.

**سێیەم:** لە كاتی خەوتندا، بەكارهێنانی پرۆتینەكان لە مێشك و لە چاوەكاندا، زیاد دەكەن و، زیاتر بەرهەم دەهێنرێن.

**چوارەم:** خەوتن دەبێتە هۆی تازەكردنەوەی خانەكانی جەستە، بە تایبەت خانەكانی مێشك.

www.alibapir.com



**پێنجەم:** خەوتن دەبێتە هۆی ئەوە کە ئینسان دوای خەو، باشتر شتی بێتەوە بیر، جاری وایە مرۆڤ مێشکی کول دەبێ، ماندوو دەبێ، بەڵام کە دەخەوێ و ئیسڕاحەت دەکا و پشوو دەدا، باشتر شتی دێتەوە یاد.

**شەشەم:** لە کاتی خەوتندا، ئینسان لەو ژەهرانەی کە بریتین لە دەردراو و پاشەڕۆکی خانەکان، دەربازی دەبێ، دێنەوە نێو خوێن و، دوایی لە جەستە وەدەر دەنرێن.

کەواتە: ئەوە کە خوا فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا﴾، خەوی ئێوەمان گێڕاوە بە مایەی پشوودانتان، زۆر تەواوو لە جێی خۆیەتی و، پڕ بەپێستی واقیعە بێ کەم و زیاد[1].

**نیعمەتی پێنجەم:**

٥- ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا﴾: ئایا شەوگارمان نەکردوە بە پۆشاك؟

وەك چۆن ئینسان پۆشاك لەبەر دەکا و دایدەپۆشێ، شەوگاریش بەو شێوەیە دنیا دادەپۆشێ، ئنجا لە ڕاستییدا ئەو نووستنەی کە ئینسان لە شەودا، ئیسڕاحەتی پێ دەکاو پشووی پێ دەدا، هەرگیز بە خەوی ڕۆژێ، ئاوا ئیسڕاحەت ناکات.



وێنەی (٣٥) شەو و ڕۆژ

---

(١) بڕوانە: (الإنسان من الميلاد إلى البعث..) د. زغلول النجار، ص٤٤٥ - ٤٤٧. هەروەها: (الموسوعة الذهبية في إعجاز القرآن السنة النبوية) د. أحمد مصطفى متولي، ص٣٠٤-٣٠٧، ط/ ٢٠٠٥م، دار إبن الجوزي: القاهرة.





**نیعمەتی شەشەم:**

٦- ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴾: ئایا ڕۆژگاریشمان بۆ نەگێڕاون بە مایەی ژیان و گوزەران؟

ئەگەر دنیا ڕووناك نەبووایە بە هۆی ڕۆژگارەوە و، زەوی بە دەوری خۆیدا نەخولابایەوە، لە بەرانبەر خۆرداو، نیوەی نەبووبایە بە ڕۆژگار و، نیوەی نەبووبایە بە شەوگار، چۆن كەسابەتمان كردبایە بەو تاریكە شەوە؟!.

**نیعمەتی حەوتەم:**

٧- ﴿ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴾: ئایا لە سەرووی ئێوەوە حەوت (٧) ئاسمانی مەحكەممان نەخوڵقاندون؟! بەڵێ ئێمە نازانین سنووری ئەو حەوت (٧) ئاسمانانە، چۆنە؟ كاتی خۆی وایان زانیوە حەوت خڕۆكەن، دوایی زانییان كە: نەخێر گەردوون زۆر لەوە فراوانترە، بەڵام گرنگ ئەوەیە مادام بەگشتیی زانیمان: خوا (سبحانە وتعالى)، ئەو هەواڵانەی پێمان دەدات، هەموویان ڕاستن، دیارە ئەمەشیان هەروایە، با ئێمەش زانیارییمان پێی نەبێ! دووریش نیە كاتێك بێ زانیاریی بگاتە ئاستێك، نهێنیی ئەو حەوت (٧) ئاسمانانەشی بۆ دەربكەوێ.

**نیعمەتی هەشتەم:**

٨- ﴿ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴾: ئایا چرایەكی تیشكدەرو زۆر ڕۆشن و پڕشنگدارمان بۆ نەهێناونە دی؟

كە مەبەست پێی خۆرە، پێشتریش باسمان كرد كە خۆر لە هەر چركەیەكدا: شەش سەدو پەنجاو پێنج ملیۆن (٦٥٥٠٠٠٠٠٠) تەن هیدرۆجین دەگۆڕێ بۆ: شەش سەدو پەنجا ملیۆن (٦٥٠٠٠٠٠٠٠) تەن هیلیۆم، واتە: پێنج ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠) تەن لە هەر چركەیەكدا لە خۆر دەبێتە وزە، ئنجا ئەگەر بتەوێ بزانی لە ساڵێك دا چەندە؟! سەرەتا بۆ ئەوەی هی خولەكێك بزانی: ئەنجامی چركەكە جارانی (٦٠) خولەك بكە: (٥٠٠٠٠٠٠ × ٦٠ = ٣٠٠٠٠٠٠٠٠).

www.alibapir.com





دوایی ئەنجامی (٦٠) خولەکەکە، جارانی بیست و چوار (٢٤) سەعات بکە: (٣٠٠٠٠٠٠٠٠ × ٢٤ = ٧٢٠٠٠٠٠٠٠٠).

دوایی ئەنجامی بیست و چوار سەعاتەکەش، جارانی سێ سەدو شەست و پێنج (٣٦٥) ڕۆژ بکە و، ئەنجامی ساڵێکت بۆ دەردەچێ (واتە: وزەی پەیدابووی خۆر لە ماوەی ساڵێکدا: (٧٢٠٠٠٠٠٠٠٠ × ٣٦٥ = ٢٦٢٨٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، دوو تریلیۆن و شەشسەد و بیست و هەشت ملیارد، تەن وزە، لە ساڵێك دا.

کە بێگومان ئەندازەی وزەی سەرفکراوی خۆر لە ساڵێکدا زۆر زۆرە، بەڵام ئەدی بۆچی وزەی خۆر تەواو نابێ؟! چونکە: بە مەزەندەی زانایان دەڵێن: (خۆر) بایی پێنج ملیارد (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵی دیکە نایترۆجینی تێدا ماوە تاکو بیگۆڕێ بۆ هیلیۆم، یانی: خۆر زۆر زۆر گەورەیە و، چەندان تریلیۆن تەن قورسە.

پێشتریش باسی خۆرمان کردوە و، زانیاریی زۆرمان لە بارەیەوە خستۆتە ڕوو.

**نیعمـــەتی نۆیەم:**

٩- ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا﴾: ئایا لە هەورە گوشراوەکان، ئاوێکی بە خورزەممان نەناردۆتە خوار؟

هەورە گوشراوەکان، بەمجۆرە دێنە دی: تیشکی خۆر کە لە ئاوی دەریاکان دەدا، هەڵم پەیدا دەکات، هەڵمەکە دێ بۆ ناوچە ساردەکان، کە دێ بۆ ناوچە ساردەکان، بارگەی ساردو بارگەی گەرم پەیدا دەبێ لە هەورەکاندا، ئنجا ئەو بارگە ساردە، بۆ ئەوەی خۆی دەرباز بکات، بەرەو زەوی دێ و، لە کاتێکی دیارییکراودا، دەبێتە هەورە تریشقە، جاری واش هەیە بەرەو سەرێ دەچێ و، دەبێتە هەورە تریشقە، سەرەنجام ئەو هەورانە، دەبێ بگوشرێن و موتوربە ببن، ئنجا ئاویان لێ دێتە خوار، ئەگەرنا جاری وا هەیە هەوریش بە ئاسمانەوە هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی موتوربە نەبووە و نەگوشراوە، ئاوەکەی لێ نایەتە خوار.

www.alibapir.com







وێنەی (٣٦) هەور و بـاران

جاری دیکەش باسمان کردوە، کە خوا (سبحانە وتعالی) جار جار باسی (ودق) و[1] (مطر) دەکات، بەڵام بە زۆریی باسی ئاو (ماء) دەکات، چونکە (ئاو) هەم باران دەگرێتەوە، هەم بەفر و، هەم تەرزەش.

**نیعمەتی دەیەم:**

١٠- ﴿لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا﴾: بۆ ئەوەی بەو ئاوە کە دەینێرینە خوارێ، دانەوێڵەو ڕووەکی پێ دەربێنین.

دانەوێڵە بە هەموو جۆرەکانیەوە، ئێمە زیاتر شارەزای گەنم و جۆو نیسك و نۆك و ماشین، بە هەردوو جۆرەکەیەوە: ماشی سپی و ماشە ڕەشە، بەڵام

---

(١) (راغب الأصفهاني) (وَدْق) بە هەڵمی ئاوی نێو باران (شتێ) و بە باران (مطر)یش مانا دەکات، بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص٤٨٩ (مطر)، ص٥٥٠ (ودق).

www.alibapir.com



دانەوێڵە جۆری زۆرن، لە هەر ناوچەیەك، خەڵكی ئەو ناوچانە بەپێی ئەوەی كە لەگەڵ كەش و هەوای خۆیاندا دەگونجێ، دانەوێڵەی جۆراو جۆر دەڕوێنن، هەروەها ڕووەكەكانیش جۆراو جۆرن، ڕووەك (نبات) هەرچی سەوزەو دەڕوێ، وشەی ڕووەك دەیگرێتەوە.



وێنەی (٣٧) گەنـــم

**نیعمەتی یازدەیەم و كۆتـــایی:**

١١- ﴿وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا﴾، هەروەها باخە چڕ و پڕە لێك ئاڵاوەكان، لە نێو ڕووەكدا، بە تایبەت باسی باخە چڕو پڕەكان دەكا، (جنات) كۆی (جنة)ە، واتە: باغ و بێستان، (ألفاف)یش واتە: پێكداچوو و لێك ئاڵاون، لە (لَفَّ)ەوە هاتوە، ئەوانەی پێكداچوون، ئەوەندە چڕو پڕن.

كەواتە: خوای پەروەردگار (سبحانه وتعالى) ئاوا باسی ئەو ژینگەیەمان بۆ دەكات كە مرۆڤ تێیدا دەژیی، دوایی دەفەرموێ:



وێنەی (٣٦) باغ و دارستان

﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَـٰتًا ۝١٧﴾.

یانی: ئێوە لە بارەی هەواڵە مەزنەکەوە دەپرسن، بەڵام دڵنیابن خوایەك کە ئەو هەموو تەگبیرانەی بۆ ئێوە کردوون و، ئەو هەموو مشوورانەی لە ئێوە خواردوون، ڕۆژێکیش دێ، لێکتان جیا بکاتەوە و دادگاییتان بکات و بزانێ: چۆنتان لەگەڵ نیعمەتەکانی خوادا مامەڵە کرد و، هەر کەسە بەپێی خۆی، سزاو پاداشتی بدرێتەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## یاسای حەوتەم: وەڵامدانەوەی سەرجەم داخوازییەکانی دروستکراوەکان، بەڵگەی هەبوونی وەڵام دەرەوەیەکە:

ئەگەر بەوردیی سەرنج بدەین، دەزانین: هەموو دروستکراوەکان کۆمەڵێك داخوازییان هەن، ئنجا کاتێك تەماشای واقیعی ژیانی خۆشمان دەکەین، دەبینین: هەموو ئەو دروستکراوانە، داخوازییەکانیان وەڵام دراونەوە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمووێ:

﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا﴾ إبراهيم: ٣٤.

واتە: هەرچی داواتان کردوە پێی داون و، ئەگەر نیعمەتەکانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن.

ژماردن (عَدّ) بریتیە لەوەی بڵێی: یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج...، بەڵام سەرژمێر (إحصاء) ئەوەیە بڵێی: ژمارەکەی ئەوەندەیە، خوا دەفەرمووێ:

﴿وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا﴾.

واتە: دەتوانن ژمارە(عَدّ)یان بکەن، بەڵام ناتوانن سەرژمێر (إحصاء)یان بکەن و بزانن کۆی ژمارەیان چەندە!

ئەم یاسایە لە دوو بڕگەدا شی دەکەینەوە:

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر



**بڕگەی یەکەم: هەر کام لە مرۆڤ و ژیانداران و زیندەوەران و ڕووەك، پێویستییان بە شەش شتان هەیە و، هەموویانیان بۆ دابین کراون:**

مرۆڤ و ژیانداران: کە مەبەستم پێی ئەو خاوەن ژیانانەیە، ئەو ژیانلەبەرانەیە کە بەرهەستن یان گەورەن، هەروەها زیندەوەران: کە مەبەستم پێی وردەکانە کە بە چاو نابینرێن، یاخود دەبینرێن، بەڵام زۆر وردن، هەروەها ڕووەکیش بە هەموو جۆرەکانیەوە، هەموویان پێویستییان بەم شەش شتانە هەیە:

١) پێویستییان بە تیشکی خۆر هەیە.

٢) پێویستییان بە هەوا هەیە.

٣) پێویستییان بە ئاو هەیە.

٤) پێویستییان بە خۆراك هەیە.

٥) پێویستییان بە بەرگریی لە خۆکردن هەیە، بۆ مانەوەیان.

٦) پێویستیشیان بە زاوزێ و زۆربوون (التكاثر) هەیە.

ئنجا خوا (سبحانه وتعالى) هەموو ئەو شەش پێداویستییە، - بە ڕای بەندە و ڕەنگە زیاتریش هەبن - خوا هەر شەشیانی بۆ هەر کام لە دروستکراوەکانی دابین کردوون، وەك ئایەتەکەی سووڕەتی (إبراهيم) ئاماژەی پێدەکات:

﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾ (٣٤)، واتە: هەرچی داواتان کردوە، پێی داون.

ئنجا ئایا ئێمە بووین، تاکو داوای بکەین؟ نا، یانی: هەرچی بە زمانی حاڵ داواتان کردوەو هەرچی پێویستییتان پێیەتی، ئەگەرنا ئەگەر مرۆڤ، زمانی هەیەو عەقڵ و شعووری هەیە، داوا بکات، بەڵام ئاژەڵانی بەستەزمان و زیندەوەران و پەڕەورو ژیاندارەکانی نێو دەریا .. هتد، ئەوانە چۆن داوا بکەن؟! کەواتە: یانی: هەرچی بە زمانی حاڵ، داواتان کردوە، پێی داون.

www.alibapir.com



ئنجا ئەگەر بەوردیی سەرنج بدەین، دەبینین:

هەر شتێك مرۆڤ و ژیانداران و زیندەوەران و ڕووەك زیاتر پێویستییان پێی بێ، خوا زۆرتری کردوە:

**١- هەوا:** هەموو کاتێك پێویستیمان پێیەتی و لە هەموو شوێنێك هەیە.

**٢- ئاو:** لە دوای هەوا، هەموو کاتێك پێویستیمان پێی نیە، بۆیە خوا خستوویەتە زۆر شوێنانەوە، چ ئاوی شیرین، چ ئاوی سوێریش، کە سێ لەسەر چواری (٤/٣)ی پانتایی زەوی دادەگرێ.

**٣- تیشکی خۆر:** مەگەر چۆن، ئەگەرنا لە هەموو شوێنێك هەیە، چونکە زۆر پێویستیمان پێیەتی.

**٤- خۆراك:** ئەوە نیە هەموو دەمێ پەك لەسەری کەوتبێ، بەڵام سەرچاوەکانی خۆراك زۆرن.

**٥- بەرگریی لە خۆکردن:** هیچ کاتێك لە ژیاندار و زیندەوەران نیە، شێوازی بەرگریی لە خۆکردنی فێر نەکرابێ.

**٦- زاووزێ:** مەسەلەی زاووزێ، دوو میکانیزم و ڕێباز هەن، بۆ زۆربوون (تکاثر):

١) زۆربوونی جینسیی (التكاثر الجنسي).
٢) زۆربوونی ناجینسیی (التكاثر اللاجنسي).

١)- نا جینسیی: هی خانەکان و هی زیندەوەرە بچووکەکانە، (ئەمیبا) دەبێتە دووان، دوایی دووەکان دەبنە چوار، خانەکانی جەستەش دابەش دەبن و دەبنە دوو، خانەکان بە چی زیاد دەکەن؟! یەکە دەبێتە دووان، دوایی هەر کام لەو دووانە، دەبن بە دووانی دیکە و .. هەروەها ئەوە پێی دەگوترێ: زۆربوونی نا جینسیی، نا سێکسیی.

٢)- ئەوی دیکەش زۆربوونی جینسیی: ئەوەیە کە نێرو مێ پێك دەگەن، کە وەك پێشتر گوتمان: هەم ڕووەك وان، هەم ژیانداران، بە درشت و وردەوە و، مرۆڤیش ئەوە دیارە.

www.alibapir.com



بەڵێ خوای بەخشەر و پەروەردگار هەر شتێك دروستكراوەكانی زیاتر پێویستییان پێی بێ و، پەكیان لەسەری كەوتبێ، زۆرتری كردوە و باشتر بڵاوی كردۆتەوە، تاكو لە هەموو شوێنێك دەستیان بیگاتێ.

## بڕگەی دووەم: هەر ژیاندارێك پێویستیی بە هەرچییەك بێت بۆ بەڕێوەچوونی، فێری كراوە:

لێرەدا هەر باسی ژیانداران[1] دەكەین، ئەگەرنا لە گەردیلەوە تاكو كەهكەشان، هەمووی سیستم (نظام) و بەرنامە (منهج)ی بۆ دانراوە، بەڵام ئێمە بە تایبەت باسی ژیانداران دەكەین، چ خانەكانی جەستە، چ زیندەوەرە یەك خانەییەكان، چ زیندەوەرەكانی دی، تاكو پەڕەوەرەكان و ئاژەڵ و دڕندە و ژیاندارە دەریاییەكانیش.

ئنجا ئێمە بە گشتی پازدە (١٥) نموونەمان هێناونەوە، كە هەر كامیان سەرنجی بدەی، دەبینی: خوای زاناو شارەزا تێكڕای داخوازییەكانی بۆ جێبەجێ كردوون و، ئەوەی كە پێویستیەتی پێی بەردەوام بێ، فێری كردوە: چۆن بەڕێوە بچێ! چۆن ژیانی خۆی درێژە پێ بدات! چۆن بەرگریی لە خۆی بكات و خۆی بپارێزێ!.

### نموونەی یەكەم: خانە (الخلية):

پێش هەموو شتێك باسی خانەكانی جەستەی مرۆڤ دەكەین، هەرچەندە پێشتریش باسمان كردوە، بەڵام بەڕاستی زۆر جێی سەرنجە!! جەستەی مرۆڤ: زانایان دەڵێن: لە سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) خانە پێكهاتوە.

كە ئەوە ژمارەیەكی زۆر زۆر گەورەیە، ئنجا جەستەی مرۆڤ، لە هەر چركە(ثانية)یەكدا سەد و بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥٠٠٠٠٠٠) خانەی لێ

---

(١) لێرەدا وشەی ژیانداران (حيوانات) بە مانا و چەمكە گشتیی و فراوانەكەی بەكاردێنین، كە هەرچی ژیان (حياة)ی تێدا بێ، دەیگرێتەوە بە درشت و ورد و بینراوو نەبینراوەوە، تەنانەت ڕووەكیش.

www.alibapir.com



دەمرن و، خانەی دیکە شوێنیان پڕ دەکەنەوە و، بە موعەددەلیی لە ماوەی حەفتەیەك دا، تێكڕای خانەكانی جەستەی مرۆڤ دەمرن و، هی تازە شوێنیان پڕدەکەنەوە، جگە لە خانەكانی: كۆئەندامی مێشك و دەمار (جهاز الدماغ والأعصاب) كە ژمارەیان بە سەدملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) مەزندە دەكرێ، ئەوانە چەسپاون و هەركامیان مرد، تازە نابێتەوە[1].

ئنجا سەرنج بدە! ئەو سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) خانەیەی جەستەی مرۆڤ، سەرەتا شانەكان (أنسجة) پێك دێنن و، شانەكان ئەندامەكان (أعضاء) پێك دێنن و، ئەندامەكان كۆئەندامەكان (أجهزة) پێك دێنن، ئەو خانانە وەك سوپایەكی مەشق پێكراو (جيش مدرَّب) بگرە زۆر باشتر و كارامەتریش، هەموویان پێكەوە هاوكارن و فێریش كراون: چۆن ئەو جەستەی مرۆڤ پێك بێنن، بەشانەكان و ئەندام و كۆئەندامەكانیەوە!.

لەوەش سەرسوڕهێنەرتر ئەوەیە، كە هەر خانەیەكی جەستەی مرۆڤ، لە دەوری سەد تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) گەردیلە پێكهاتوە، كە بێگومان گەردیلەكانی نێو ئەو خانەیەش، ئەوانیش هەموویان پێكەوە هاوكارن، واتە: گەردیلەكانیش فێركراون، چۆن تەنەكانی دیكە پێكبێنن، ئنجا ئەگەر خانەیە، ئەگەر توخمەكانن، وەك: كاربۆن و هیدرۆجین و ئۆكسجین و هیلیۆم و ... هتد، هەم گەردیلەكان فێركراون چۆن توخمەكان پێكبێنن، یان چۆن ماددەی[2] ئەندامیی (المادة العضوية)، یاخود نائەندامیی پێكبێنن، هەم خانەكان فێركراون چۆن یەكەی لە خۆیان گەورەترو گەورەتر تا دەگاتە جەستەی مرۆڤ، پێكبێنن!

كەواتە: كە خوا لەسەر زمانی مووسا (عليه السلام) دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه.

---

(١) بڕوانە: الإنسان من الميلاد إلى البعث، د. زغلول النجار، ص٢٧٢.

(٢) جیاوازیی سەرەكیی نێوان ماددەی ئەندامیی و نائەندامیی، هەبوونی {كاربۆن (C)}ە، لە یەكەمیاندا و نەبوونیەتی لە دووەمیان دا.

www.alibapir.com



واتە: (مووسا) گوتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە بوونی بە هەموو شتێك داوە (هێناویەتە بوون)، دوایی ڕێنماییشی کردوە(چۆن بەڕێوە بچێ!).

ئەو فەرمایشتەی خوای زانا و شارەزا و کارزان، هەتا زانست زیاتر گەشە بکات، چاکتر و قووڵتر لێی تێدەگەین.

هەروەها شتێکی دیکەی سەرسووڕهێنەر ئەوەیە کە: لە نێو خانەکانی جەستەی مرۆڤ دا، خانە جینسییەکانیش هەن، کە خانە جینسییەکان بە پێچەوانەی هەموو خانەکانی دیکەوە، کاتێك حەیوانی مەنەویی پیاو (حیمن) لەگەڵ هێلکۆڵە (بویضة)ی ئافرەتدا یەکدەگرن، هەموو خانەکانی دیکە کاتێك دابەش دەبن، چل و شەش (٤٦) کڕۆمۆسۆم لە هەر کامێکیان دا هەیە، بەڵام خانە جینسییەکان، بیست و سێ (٢٣)یان تێدایە، واتە: هەرکام لە حەیمەنی پیاو و هێلکۆڵەی ئافرەت، کە دابەش دەبن و دواتر پێکەوە یەکدەگرن بۆ پێکهێنانی خانە (خلیة) یەکی دیکە کە پێی دەگوترێ: تۆویلکە (نطفة)، یەکی تەنیا بیست و سێ(٢٣) کڕۆمۆسۆمیان تێدایە، نەك وەك تێکڕای خانەکانی دیکەی جەستە کە دوای دابەشبوونیان، هەر کامێکیان چل و شەش (٤٦) کڕۆمۆسۆمەکەی هەر تێدایە!

ئنجا وەك پێشتریش - لە کاتی توێژینەوەی یاسای شەشەمی عەقڵیی دا لە بارەی بوونی خواوە - باسمان کرد: حیکمەتی ئەو کارەی خوای کارزانیش (یان یەکێك لە حیکمەتەکانی) ئەوەیە کە ئەو منداڵەی لەو نوتفەیە پێك دێ، بە یەکسانیی لە تۆوی هەرکام لە بابی و دایکی دروست بێ و، لە سیفەتە بۆ ماوەییەکان (الصفات الوراثیة)ی هەردووکیانی تێدا بێ!.

کەواتە: (٢٣ + ٢٣ = ٤٦).

ئنجا ئاوی پیاو، خانەکانی هەمووی لە جۆری (y) یان (X)ن، بەڵام هی ئافرەت هەموویان یەك جۆرن، جۆری (X)، ئنجا ئەگەر بێت و خانەیەکی جۆری (y) لەگەڵ جۆری (X) یەکبگرێ، ئەو کۆرپەلەیە دەبێتە نێر.

www.alibapir.com



بەڵام ئەگەر جۆری (X) لەگەڵ (X) یەکبگرێ، دەبێتە مێ و، خانەکانی نێو ئاوی ئافرەتیش - وەك گوتمان - هەموویان لە جۆری (X)ن.

بەڵام هی پیاو هەردووك جۆری: (X وy)ن، بۆیە کاتێك کە منداڵێك نێر دەبێ، یان مێ دەبێ، لە ڕاستییدا هۆکاری نێربوونەکەی، تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ پیاو و، ئافرەت هیچ کاریگەریی لەسەری نیە، چونکە ئەو تەنیا دەتوانێ کرۆمۆسۆمەکانی کە لە جۆری (X)ن، کە تەنیا دەتوانێ مێینە پەیدا بکات، بەڵام تۆوی پیاوە، کە دیاریی دەکات: ئایا کۆرپەلە ڕەگەزی نێر دەبێ، یان مێ؟.

**نموونەی دووەم: کەتەلۆکی زانیاریی:**

هەموو ژیاندارێك کەتەلۆکی زانیاریی خۆی لەگەڵ دایە، هەموو ژیاندارێك هەر ژیان(حیاة)ی تێدا بێ، هەر لە ئەمیبایەکەوە بگرە، تاکو کۆتایی کەتەلۆکی خۆی لەگەڵ دایە، وەك (فرنسیس کۆلنز) بەڕێوبەری پڕۆژەی جینۆمی بەشەریی، کتێبێکی داناوە بە ئینگلیزیی بە ناوی:

(the language of God)، یانی: زمانی خوا، خوا، بە چ زمانێك دەدوێ؟.

دەڵێ: هەر لە (سیانۆ بەکتریا)وە بگرە، کە بە حیساب بچووکترین یەکەی زیندوویە، هەتاکو هەر ژیاندارێکی دیکە، هەمووی لە جینۆمی تایبەتییاندا، هەرچی زانیارییە لە بارەیانەوە، هەیە، بە شێوەی جفرە و بە سیستمی جفرەی چواریی: (ATCG) کە کورتکراوەی: (adenine-thymine-Cytosine-guanine)یە.

یانی: هەرچی زانیاریی لە بارەی ئەو زیندەوەرەوە، یان ئەو ژیاندارەوە، هەیە، لەوێدا، هەڵگیراوە، لە نێو کرۆمۆسۆمدا و، لە نێو کرۆمۆسۆمدا: (DNA) هەیە، کە ئەو (DNA)یە لە شێوەی شریتێکی درێژ دایە، کە پیتەکانی بۆماوەیی (وراثي) هەڵگرتوون و، سەرجەم زانیارییەکانی تێدا تۆمار کراون، ئنجا ئەو شریتەش جووت شریتە، دووانن، یەکیان لە ماددەی شەکرو، یەکیان لە




**وێنەی (٣٩) DNA**

ماددەی فۆسفات، پێکهاتوون، لە شێوەی پەیژەی پێچاو پێچدا، (لە کتێبەکاندا وێنەیان هەیە)، کە لێك ئالاون، - وەك چۆن دوو ماری ئاشقەو باشقە خۆیان لێك دەئالێنن - هەروەها پلە پلەن، واتە: وەك چۆن پەیژە پلەی هەن، کە نێوانی هەر دوو پلە، یەك لەسەر سێی (٣/١)ی نانۆمەترێکەوە، (نانۆمەتریش بریتیە لە یەك لەسەر یەك ملیار(١/١٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ی مەترێك)، واتە: لە درێژیی یەك سانتیمەتردا، جێی سی ملیۆن (٣٠٠٠٠٠٠٠) لەو پیتانە دەبێتەوە، کە زانیارییان لە بارەی ئەو دروستکراوەوە تێدایە، درێژیی شریتەکەش: دوو مەترە (٢م) و پانییەکەی: دوو (٢) نانۆمەترە، بەڵام دوای ئەوەی ئەو شریتە دوو مەترییە لەنێو خانەدا، دەپێچرێتەوە، دەبێتە: نەوەد (٩٠) مایکرۆمەتر، مایکرۆمەتریش: یەك لەسەر هەزار (١/١٠٠٠)ی میللی مەترێکە.

www.alibapir.com





ئنجا شریتەکەش هەمووی بە هەر چل و شەش (٤٦) کرۆمۆسۆمەکەوە: سێ ملیار (٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠) جووت پیتی بۆماوەیی تێدایە، سێ ملیار (٣٠٠٠٠٠٠٠٠٠) جووت پیت، واتە: شەش ملیار (٦٠٠٠٠٠٠٠٠٠)پیتی تێدایە!!.

ئنجا کرۆمۆسۆمی یەکەم لەو چل و شەشە، لە هەموویان درێژترە و، بە تەنیا دوو سەدو چل و حەوت ملیۆن (٢٤٧٠٠٠٠٠٠) جووت پیتی تێدایە[١]، هەر کام لەو کرۆمۆسۆمانەش، یەکی دەوری: (٢٠٠٠٠) بۆ ماوە هێڵەر (مورِّث - GENES)یان تێدایە[٢].

ئنجا جینۆمی مرۆڤ (واتە: ئەوەی کە تەنیا لە یەك خانەی جەستەی مرۆڤ دا هەیە، کە وەك گوتمان: هەر خانەیەك چل و شەش (٤٦) کرۆمۆسۆمی تێدایە)، ئەو زانیارییانەی کە تێیدان، زانایان مەزندەیان کردوە بە: هەزار بەرگ کتێب، هەر بەرگەی لە پێنج سەد لاپەڕە، واتە: پێنج سەد هەزار (٥٠٠٠٠٠) لاپەڕە زانیاریی لە یەك خانەی جەستەی مرۆڤ دا هەیە، کە لەو چل و شەش (٤٦) کرۆمۆسۆمەدا، هەڵگیراون و، هەرچی جەستەی ئەو مرۆڤە پێویستیی پێیەتی لە زانیاریی لەوێ دا تۆمار کراوە، هەر بۆیەش هەمیشە: مرۆڤ هەر مرۆڤ دەردەچێتەوە! کە ئەمە باشترین هەڵوەشێنەرەوەیە - وەك دواتر باسی دەکەین - بۆ بیردۆزەی داروین، چونکە هەرگیز ناگونجێ لە مرۆڤ، هەر مرۆڤ پەیدا نەبێ، هەروەها لە هەر ژیاندارێك، هەر دەبێ ئەو ژیانداره پەیدا ببێ و گۆڕانی بەسەردا نایەت، چونکە کاتێك دەگونجێ گۆڕانی بەسەردا بێت، دەستکاریی کرۆمۆسۆمەکەی بکرێ، دەستکاریی جینەکانی، کە سیفەتەکان لە باب و دایکەوە دەگوازنەوە بۆ ڕۆڵە، دەبێ دەستکاریی ئەوێ بکرێ، ئەگەرنا چۆن و چی بووە، هەر ئەوە دەردەچێتەوە، بەڵام کە چۆنە، ئاوا دەردەچێتەوە، مەرج نیە، کچ و کوڕ، ڕێك وەك باب و دایکیان بن، بەڵکو: دەچنەوە سەر بابیان،

---

(١) بڕوانە: (إبداع الرحمن في جسم الإنسان)، ص ٢٦.

(٢) بڕوانە: (بیولوجیا الإنسان) ص٤٨.

www.alibapir.com



دەچنەوە سەر دایكیان، دەچنەوە سەر خاڵیان، دەچنەوە سەر مامیان، دەچنەوە سەر بابی دایكیان، بابی بابیان، هەتاكو دەگاتەوە ئادەم و حەووا سەلامی خوایان لێبێ، ئەو منداڵە بۆی هەیە بە هەر كەسێك لەوانە بچێ، چونكە لەوانەوە هاتوە، لە ئادەم و حەواو بەرە و خوار، ئەو كرۆمۆسۆمانە، لەوێوە هاتوون[1].

**نموونەی سێیەم: مێشوولە:**



وێنەی (٤٠) مێشوولە بەگەورەكراویی

ئەو مێشوولەیەی كە زۆر جار مرۆڤ جارِز دەكات و ئەزیەتی دەدات، هەڵبەتە مێشوولەش جۆری زۆرن، دەڵێن: مێشوولە هەیە لە باشووری ئەفریقیا هەر بە مرۆڤەوە بدات، وای لێ دەكات بخەوێ تاكو دەمرێ، بەخەبەر نەیەتەوە، بە هەر حاڵ مێشوولە جۆری زۆرە، مێشوولە هەیە مەلاریا بڵاو دەكاتەوە، مێشوولە هەیە نەخۆشیی دیكە بڵاو دەكاتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەر مێشوولەیەك بیگری، تەنانەت ئەوانەش كە زۆر بچووكن و، بە چاو بە زەحمەت دەبینرێن، بە گشتی ئەم دە (١٠) سیفەتەی هەن:

١- سەد (١٠٠) چاوی هەن، لەسەریدا.

٢- چل و هەشت (٤٨) ددانی هەن لە زاریدا، شتیان پێ دەبڕێ.

٣- سێ (٣) دڵی هەن، دڵ بە هەموو بەشەكانیەوە.

---

(١) بڕوانە: (معجزة خلق الإنسان)، هارون یحیی، ص٢١،٢٢ هەروەها (عیادة الملحدین) د. هَیْثَم طلعت، ص١٥، هەروەها (بیولوجیا الإنسان) د.حمید أحمد الحاج ص٢٩.

www.alibapir.com



٤- شەش (٦)چەقۆی لە خورتوومەکەیدا هەن، لە لووتیدا، شتیان پێ کون دەکات، هەر کامێکیان ئەرکێکی تایبەتی هەیە.

٥- شەش (٦) باڵی هەن، هەر لایەی سێ (٣) باڵ، وەك باڵندەی کەوو کۆترو... هتد، نیە، هەر لایەی باڵێك بێت، بەڵکو هەر لایەی سێ باڵی هەن.

٦- ئامێرێکی گەرمیی هەیە، کە بە سیستمی تیشکی ژێر سوور(تحت الحمراء) کار دەکات، کاریشی ئەوەیە کە لە تاریکییدا وێنەی پێستی ژیاندار بە ڕەنگی بنەوشەیی بنوێنێ، تاکو بیبینێ، یانی: ئامێرێکی هەیە تیشکەکەی دەگرێتە پێستی ژیانداریك، کە دەیەوێ خوێنەکەی بمژێ، بۆ ئەوەی بە ڕەنگی بنەوشەیی بێتە بەرچاوی.

٧- ئامێرێکی سڕکەری شوێنیی (تَخْدِير مَوْضعي) هەیە، یارمەتیی دەدا بۆ چەقاندنی لمبۆزەکەی، بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێ بکات، ڕەنگە بڵێی: با، هەست دەکەم کە مێشوولە پێم وەدەدات! بەڵام ئەوە دوای مژرانی خوێنەکەتە، ئەگەرنا لە سەرەتاوە هەست پێناکەی، چونکە دەرزییەکی سڕکەر(مخدِّر)ی هەیە لەو شوێنەی دەدا سڕی دەکات و، هەست بە ئازار ناکەی، دوایی کە خوێنەکە دەمژێ، تەماشا دەکەی سوور بۆتەوەو دەزوورێتەوە، دوای ئەوەی مێشوولەکە ئیشی خۆی تەواو کردوە!

٨- ئامێرێکی پشکنینی خوێنی هەیە، جۆری خوێنەکە دەپشکنێ، چونکە مێشوولەش هەموو خوێنێك ناخوات، هەندێك کەس زۆر باکی نیە بە مێشوولە، هی وا هەیە باکی بە کێچ نیە، دیارە خوێنی ئەو جۆرە کەسانەیان بە کەیفێ نیە، یەك بە یەکی دەڵێ: (فلان کەس خوێنی شیرینە!).

٩- ئامێرێکی شلکردنەوەی خوێنیشی پێیە، تاکو خوێنەکە بە خورتوومە باریکەکەیدا بڕوات، چونکە ئەگەر ئەو خوێنەکە شل نەکرێتەوە، خورتوومەکەی، لووتەکەی هێندە باریکە، خوێنەکەی پێدا ناڕوات، بەڵام ئەو ئامێرێکی پێیە، ماددەیەکی تێدایە، خوێنەکە شل دەکاتەوە.

www.alibapir.com



١٠- ئامێرێکی بۆن کردنی هەیە، لە ماوەی یەك کیلۆ مەتردا بۆنی ئارەقەی مرۆڤ دەکات، ئاخر مێشوولە خۆت چی و، بۆنکردنی ماوەی یەك کیلۆمەترییت چی؟![1]،

بەڵام بێگومان مشوورخۆریی خوا (سبحانه وتعالى) بۆ دروستکراوەکانی و، بەخشش و بەزەیی و کەرەمی لەگەڵیاندا، سنووری نیە، هەروەك زانیاریی و دەستەڵاتیشی ڕەها و بێ سنوورن.

بەڵێ بەڕێزان!

هەموو زیندەوەرێك داخوازییەکانی جێ بەجێ کراون و، فێرکراوە چۆن بژی! بڕوانن! مێشوولە خوا ئەو هەموو تەگبیرانەی بۆ کردوون، هەرچی مێشوولە پێویستیی پێیەتی، خوای پەروەردگار بۆی دابین کردوە، بێگومان خوا(سبحانه وتعالى) زۆر سەخیی و بەخشەرە، دەنا مێشوولەی وایە ڕەنگە تەمەنی چەند سەعاتێك بێت، یان ئەو پەڕی چەند ڕۆژێك بێت، کە چی خوا ئەو هەموو شتانەی داونێ! ئنجا بە ملیاران و بگرە بە تریلیۆنان مێشوولە دەفەوتێن و ئەو

---

(١) ئەو زانیارییانە لە کتێبی: (الرد على الملحِدين العرب) نووسینی: (د. هيثم طلعت)دا، هاتووون، کە ئەویش لە کۆمەڵێك سەرچاوەی بیانییەوە، وەریگرتوون، بڕوانە: ص٧٦، ٧٧.

هەڵبەتە من بە پێویستی نازانم: سەرچاوە ئەصڵییەکانی کە ئەم سەرچاوانە لێیانەوە نەقڵ دەکەن، ناوەکانیان لە ئینگلیزییەوە بێنم، ئەگەرنا هەر کام لەوانە بە زۆریی لە سەرچاوە بیانییەکانەوە دەیانهێنن، کە بە داخەوە دەڵێم: ئێستا نامسوڵمانان زۆر زۆر پێشکەوتووترن لە مسوڵمانان، بۆ دۆزینەوەی ئەو نهێنییانەی کە خوا لە دروستکراوەکانیدا دایناون، ڕەنگە بۆیەش ئەو ئایەتە موبارەکەی کۆتایی سوورەتی (فصلت)، ئاوا هاتبێ:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾،

نەیفەرمووە: (سنريكم)، فەرموویەتی: ( سَنُرِيهِمْ ) پێشانیان دەدەین، پێشانی کێ؟ پێشانی نامسوڵمانانی دەدەین، واتە: نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆیەکان و لە نەفسی خۆشیان دا پێشان دەدەین، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە قورئان هەقە، (یان کە خوای پەروەردگار هەقە)، ئایا بەس نیە کە پەروەردگارت ئاگاداری هەموو شتێکە!

www.alibapir.com



هەموو پێداویستییانەشیان بۆ دابین کراون، بەڵام خوا هیچ پەکی پێ ناکەوێ، خەزێنەی خوا هەرگیز کۆتایی نایەت، تەماشا دەکەین: لە بەهاراندا زۆر جۆرە گوڵ و گیا و ڕووەك دەڕوێن، لە بەیانییەوە هەن تاکو ئێوارێ و دوایی تەواو دەبن!! چەندان زیندەوەر هەن، چەند خولەکێك یان سەعاتێك دەژین! بەڵام خوا سەخییە، کەرەم و بەخششی خوا، سنووری نیە و پەکی پێ ناکەوێ.

**نموونەی چوارەم: پەپوولە:**

جۆرێکە لە پەپوولەکان - کە پەپوولەش بە هەزاران جۆری هەن - لەسەر باڵەکانی چاوی هەن، کە وەك ژیاندارێکی ترسناك دەری دەخەن، چاوەکان پێیان نابینێ، بەڵام تەنیا لە شێوەی چاودان و، بەهۆیانەوە، وەك ژیاندارێکی ترسناك دەردەکەوێ و، بەو جۆرەش لە زیانی باڵندە ڕاوکەرەکان دەپارێزرێ، کە



وێنەی (٤١) پەپوولـــــە

تەماشای دەکەن: وا دەزانن ژیاندارێکی ترسناکە و لێی دەترسێن، پەلاماری نادەن، پەپوولەی فەقیر کە خۆی دەسەڵاتی هیچی نیە، خوای کارزان ئەو هۆکارەی بۆ پاراستنی دابین کردوە.

www.alibapir.com



هەندێك پەپوولە هەن، شێوەی كوندە پەپوو لەسەر باڵەكانیان پەیدا دەكەن، پەپوولە، كاتێك تەماشای بكەی، وا دەزانی كوندە پەپوویە، چونكە كوندە پەپوو، باڵندەیەكی ترسناكە بۆ ئەو زیندەوەرانەی، پەپوولە ڕاو دەكەن.

واتە: ئەو زیندەوەرانەی پەپوولە ڕاو دەكەن، لە كوندە پەپوو، دەترسن، بۆ نموونە: نێرەی هەنگ، هەڵبەتە پەپوولە خۆی نازانێ كە كوندە پەپوو، دوژمنی دوژمنەكەیەتی و، ناشتوانێ وێنەی كوندە پەپوو لەسەر باڵەكانی خۆی بنەخشێنێ، بەڵام خوای مشوورخۆر و بەبەزەیی، وای لێكردوە، باڵەكانی ئەو نەخشەیان لەسەر بێ، كە شێوەی كوندە پەپوو دەكات و، دەبێتە جێی ترس، بۆ دوژمنەكانی پەپوولە، كە وابزانن كوندە پەپوویە، نەك وابزانن پەپوولەیە، تاكو لێی بسڵەمنەوە، تەماعی تێ نەكەن و نەیخۆن، خوا (سبحانه وتعالى) ئاوا تەگبیری بۆ پەپوولە كردوە[1].

نموونەی پێنجەم: جاڵجاڵۆكە:

كە لە هەندێ شوێن (پیرە مۆتەی) پێ دەڵێن، بەڵام كورد زیاتر جاڵجاڵۆكەی پێ دەڵێن.

دەزووی جاڵجاڵۆكە، پێنج هێندەی پۆڵا لە قەبارەی خۆیدا، بەهێزترە، یانی: ئەگەر پۆڵا بە قەدەر دەزووی جاڵجاڵۆكە بێت، دەزووی جاڵجاڵۆكە پێنج هێندەی پۆڵا بەهێزترە و، ئەگەر پەتێك لە دەزووی جاڵجاڵۆكە دروست بكرێت، تیرەكەی شەست میللی مەتر (٦٠ ملم) بێت، واتە: شەش سانتیم (٦ سم)، دەتوانێ سەدو پەنجا (١٥٠) سەیارە، كە لەسەر یەك كەڵەكە بن، هەموویان هەڵبگرێ!

ئنجا فیشەك، فیشەكی تفەنگ، كە بە خێرایی سەدو پەنجا مەتر (١٥٠م) شت دەبڕێ، واتە: كە لە شتێكی دەدەی، بە خێرایی سەدو پەنجا مەتر (١٥٠م) لە چركەیەكدا، ئەو شتە دەبڕێ، بەڵام قوماشی (كافلار) كە لە شێوەی دەزووی جاڵجاڵۆكەدا دروست كراوە و، فیشەك نایبڕێ، بەڵام دەزووی جاڵجاڵۆكە،

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٨٣.



وێنەی (٤٢) جاڵجالۆکە

دە(١٠) هێندەی قوماشی (کافلار) کە فیشەك نایبڕێ، قایمترە! بۆیە ئەگەر بگوترێ: دەزووی جاڵجاڵۆکە لە قەبارەی خۆیدا، بەهێزترین ماددەیە لەسەر زەوی، زێدەڕۆیی نەکراوە.[1]

**نموونەی شەشەم: مێرووولەی سپیی:**

ملیۆن و نیوێك (١،٥٠٠،٠٠٠) مێرووولەی سپی کۆ دەبنەوە، هەرچەندە نابینا و کوێریشن! پێکەوە هاوکاریی دەکەن و خانووێکی چوار مەتر بەرز، دروست دەکەن، مێرووولەی سپیی لە وڵاتی ئێمە نیە، لە وڵاتی ئێمە تەنیا دوو جۆرە مێرووولەمان بینیوە: مێرووولەی ڕەش و سوور، بەڵام مێرووولەی سپی هەیە، لە هەندێك لە وڵاتان، بۆ وێنە: لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەیە،

ئنجا ئەو خانووە چوار مەتر (٤ م) بەرزە، کە مێرووولەی سپیی دروستی دەکەن:

١- شوێنی تایبەتی شاژنی تێدایە.

٢- شوێنی کشتوکاڵی تێدایە.

---

(١) هەمان سەرچاوە و لاپەڕ.

www.alibapir.com







٣- شوێنی عەمبارکردن و زەخیرە داکردنی تێدایە.

٤- ڕاڕەوی هەوا گۆڕینی تێدایە ...هتد[1].

**نموونەی حەوتەم: خانووی هەنگ:**

هەنگ: لە شێوەی شەش پاڵوو (مسدَّس)دا، خانەکانی شانەکەی خۆی دروست دەکات، چونکە گونجاوترین شێوەی ئەندازەییە و، کەمترین شوێن خەسار نابێ، بەڵام ئەگەر چوارگۆشەیی، یان لاکێشەیی، یان بازنەیی، یان سێگۆشەیی، بووایە، لێی زایە دەبوو، بەڵام شێوەی شەش پاڵوو، هەموویان دەچنە نێو یەك و، بۆشایی نابێت لە نێوان گۆشەکاندا.



وێنەی (٤٣) خـانوی هەنگ

هەڵبەتە ژیانی هەنگ ئەگەر لێی بکۆڵینەوە، هەر تەواو نابێ! کە چۆن هەنگوین دروست دەکات؟ چۆن شیلەی گوڵان دەمژێ؟ لە نێو خۆیاندا چۆن

---

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە: ٨٥.

www.alibapir.com



کاروبارەکانیان دابەش کردوون و، چۆن مامەڵە دەکەن؟ ئەگەر زیندەوەرێکی زیانبەخش ڕوویان تێ بکات، چی لێ دەکەن؟! ئنجا ئەوانەیان کە نەخۆش دەبن، یان ئەوانەیان کە پیس دەبن، دەچن بە شوێنێکی پیسەوە دەنیشن، دوایی چۆن سزایان دەدەن و، دەریان دەکەن لە خانەکەیان؟ لە ژیانی هەنگ دا وردەکاریی زۆر زۆر هەیە[١].

**نموونەی هەشتەم: ماسییە کارەباییەکان:**

دوازدە (١٢) جۆر ماسیی کارەبایی هەیە، جۆرێکیان بارگەیەکی پێنج سەد (٥٠٠) ڤۆڵتیی لە تەوژمیی کارەبا دروست دەکا، بۆ بەرگریی لە خۆ کردن و، هێرش بردن، هەروەها وەك هۆیەکی پەیوەندیی کردن، واتە: ئەو جۆرە ماسیی یە بەو پێنج سەد (٥٠٠) ڤۆڵت تەوژمە کارەباییە، هەم بۆ پەیوەندیی کردن، هەم بۆ بەرگریی لەخۆ کردن، هەم بۆ ڕاوکردنیش، خوا (سبحانه وتعالى) ئەو ئامرازەی بۆ ئەو جۆرە ماسییانەش دابین کردوە[٢].

**نموونەی نۆیەم: ماسییە پاککەرەوەکان:**

هەندێك جۆرە ماسیی دەچنە نێو زاری ماسییە گەورەکان و پاکی دەکەنەوە، نەهەنگ و ماسییە زلەکان، کرم و بەکتریاو زیندەوەری زیانبەخش، لەسەر ددان و زاریان پەیدا دەبێ، ئنجا ماسیی گچکە دەچن ئەو زیندەوەرە زیانبەخشانە، دەخۆن، واتە: ئەوەی کە بۆ ماسییە گەورەکان زیانبەخشە، بۆ ئەوان دەبێتە خۆراك و دەچن دەیخۆن و زیانیشیان لێ نادەن، ماسییە گەورەکان ماسییە گچکەکان ناخۆن، واتە: ڕێککەوتنێکی پێشوەختەیان لە بەیندا هەیە، بەڵکو ماسییە گەورەکان دەچنە لای ماسی گچکەکان، ئەو شوێنەی ماسییە گچکەکانی لێن و، خۆیان بە جۆرێك

---

(١) ستایش و سوپاس بۆ خوا: ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی: (النحل)دا، باسێکی تاڕاددەیەك تێر و تەسەلمان، لە بارەی هەنگ و هەنگوینیەوە کردوە، کە دەکەوێتە بەرگی (١٣)ی (تەفسیری قورئانی بەرز و بە پێز)ەوە.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٦٥.

www.alibapir.com



پێشان دەدەن و دەگۆڕن، کە جێی مەترسییان نەبن و، دەمیشیان بۆ دەکەنەوە، ئەو ماسییە گچکانەش دەچنە نێو زاریان و پاکی دەکەنەوە.

نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو جۆرە باڵندەیەك ڕێککەوتوە، لەگەڵ ژیاندارانی وەك کەرکەدەن و هەندێك ژیانداری دیکەی گەورەدا، زاریان دەکەنەوە و ئەوانیش دەچنە نێو زاریان و زاریان پاك دەکەنەوە، واتە: ئەوەی کە لە دەمیان دایە بۆ ئەوان دەبێتە خۆراك، بۆ ئەو ژیاندارە گەورانەش دەبێتە مایەی پاککردنەوەو ئاسوودە بوونیان[1].

**نموونەی دەیەم: خۆشاردنەوەی گەرای نێو قۆزاخە:**

هەندێك گەرا، یەکسەر قۆزاخەکان (شرانق) کە لێیان دێنە دەرێ، بە وردە بەردی زۆر گچکە، خۆیان دادەپۆشن، چونکە زیندەوەری گچکەن و، بە ئاسانیی دەخورێن و زەفەریان پێ دەبردرێ، بۆیە بە وردە بەردی گچکە، خۆیان دادەپۆشن، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و لە سەرەتای تەمەنیانەوە، چونکە جارێ تەمەنیان گچکەیە و ئەزموونی ژیانیان نیە، تاکو بگوترێ: فێری بوون! بەڵکو خوای تەگبیرکار و بەخشەر، فێری کردوون، چونکە ناتوانن ڕابکەن و بەرگریی لە خۆیان بکەن! بۆیە خوا فێری کردوون، بەو وردە بەردە گچکانە خۆیان دابپۆشن و، خۆیان بشارنەوە، تاکو پارێزراو بن[2].

**نموونەی یازدەیەم: قرژاڵەکانی دەریـــا:**

قرژاڵەکانی دەریا - کە بێگومان قرژاڵیش جۆری زۆرن و ئەمانە جۆرێکیانن - ئنجا ئەم جۆرەیان پارچە ڕووەکەکان دەبڕێ، یاخود ماددەیەکی شلی چەسپ دەردەدا، تاکو لق و پۆپی گیاو گۆڵ بەخۆیەوە بلکێنێ، یان پارچە ئیسفەنج، کە لە نێو دەریادا هەیە، دەیبڕێ و دەیکاتە پۆشەر، بۆ ئەوەی خۆی پەنهان بکات لە دوژمنەکانی، ئەمەش وەك تاکتیکی سەربازیی کە سەربازەکان جاری وایە

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٢٦.

(٢) هەمان سەرچاوە و لاپەڕ.

www.alibapir.com





وێنەی (٤٤) قرژاڵــی دەریــا

بە درەخت خۆیان دادەپۆشن، بۆ ئەوەی دوژمن لە دوورەوە کە تەماشا دەکات، نەیانبینێ و، بچنە نزیکی دوژمن و زەفەری پێ بەرن، خوای پەروەردگار ئەوەشی فێری قرژاڵی دەریا کردوە، کە مرۆڤ دوای تەمەنێکی زۆر، ئنجا بەو تاکتیکە گەیشتوە[١].

**نموونەی دوازدەیەم: ڕاوکردنی هەزار پێ (أُخطبوط):**

(أخطبوط): بە کوردیی (هەزار پێ)ی پێ دەڵێن، ژیانداریکی دەریاییە، خۆی بڵاو دەکاتەوە و پێی زۆرن، ئنجا هەندێك ماسی عادەتیان وایە قۆزاخەکان (أصداف) دەخۆن، بۆیە (أخطبوط) زۆر قۆزاخان لە خۆی دەئاڵێنێ و لە خۆییان کۆدەکاتەوە، تاکو ماسییەکان هان بدات بە تەماعی خواردنی قۆزاخەکان، نیزیك ببنەوە، ئنجا کە لێی نزیك بوونەوە، ئەو ماسییانە بۆی دەبنە ژەمێکی خۆش و بەلەززەت و، دەیانگرێ و دەیانخوات، تەماشا بکەن! ئوخطبووطیش چ تاکتیکێك بەکاردێنێ[٢]!!

---

(١) هەمان سەرچاوە و لاپەڕ.

(٢) هەمان سەرچاوە و لاپەڕ.

www.alibapir.com







**نموونەی سێزدەیەم: باڵندەی زێڕین:**

لە (باتاكۆنیا)، كە ناوچەیەكە، جۆرێك باڵندە هەیە پێی دەگوترێ: باڵندەی زێڕین، لە كاتێكدا مەترسیی نیزیك دەبێتەوە لە هێلانەكەی، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی نیە بەرگریی لە خۆی بكات، خۆی دوور دەخاتەوە و، خۆی وەك باڵندەی باڵشكاو پیشان دەدا، كە بە ئاسانیی ڕاو دەكرێ، خۆی بە لایەكی دادەخات و، دەڕوا دەڕوا بە لۆژە لۆژ و بە باڵ شكاویی، ئەو دڕندەیەش بەدوای دەكەوێ، بە تەماعی ئەوەی بیگرێ و بیخوا، هەتا لە هێلانەكەی دووری دەخاتەوە، ئنجا كە لە هێلانەكەی دووری خستەوە، خۆی دەخاتەوە حاڵەتی ئاسایی و دەفڕێ، بەو شێوەیە هێلانەكەی خۆیی و هێلكەكانی دەرباز دەكات، ئیدی واز لەو نواندن (تمثیل)ە دێنێ، كە تەنیا مەبەستی پێی ئەوە بوو، بەچكەكانی، یاخود هێلكەكانی و هێلانەكەی، سەلامەت بن[١].

**نموونەی چواردەیەم: باڵندەكانی جەمسەری باكوور:**

باڵندەكانی بەستەڵەكی باكوور، سەرووی دنیا، چاویان بە ڕەگی ڕەش دەورە دراوە، ئەگەر تەماشای باڵندەكانی بەستەڵەكی باكوور بكەی، دەبینی دەوری چاویان ڕەنگی ڕەشە، تاكو چاوەكانیان لە تیشكی عەكس بووەوەی بەفر، بپارێزرێن، كە دەبێتە هۆی كوێر بوونیان، مرۆڤیش ئەگەر زۆر تەماشای بەفر بكات، دوایی تەماشای هەر شتێك بكات چاك نایبینێ.

هەروەها ئەو باڵندانە ڕەنگی تووك و باڵیشیان، بە پێی چوار كەشەكانی ساڵ و بەپێی ژینگەكەیان دەگۆڕێ، تاكو خۆیان پەنهان بكەن، لە كەشی پایزدا، شت زەرد دەنوێنێ، ئەوانیش دەتوانن ڕەنگی خۆیان زەرد بكەن، لە بەهاردا ئەگەر شوێنەكەیان سەوز بێ، خۆیان سەوز دەكەن، هەروەها بەپێی ئەو شوێنە كە لێینی و، بەپێی كەشەكانی ساڵ ڕەنگی خۆیان دەنوێنن[٢].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٨٢.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٨١.

www.alibapir.com



نموونەی پازدەیەم، حوشتر:

حوشتر ژیاندارێکە، هەموومان دەزانین، چۆنە؟ بەڵێ لە ناوچەی ئێمەدا نیە، بەڵام زۆربەمان بینیومانە.



وێنەی (٤٥) حـــوشـتر

چەند شتێك لەبارەی حوشترەوە باس دەکەین:

١) حوشتر دەتوانێ هەشت ڕۆژان بەبێ خواردن و خواردنەوە، لە پلەی پەنجا (٥٠)ی گەرمییدا مەدار بکات و، لە ماوەی دە (١٠) خولەکدا، ئەگەر ئاوی دەست کەوێ، سێیەك (٣/١)ی کێشی خۆی ئاو دەخواتەوە، واتە: سەدو سی (١٣٠) لیتر، چونکە هەموو دەمێ ناگاتەوە ئاو، لە بیابان، جاری وایە چەند ڕۆژان خەڵك دەڕوا، ناگاتە ئاوێ.

٢) لە دونگی سەر پشتی حوشتردا: چل(٤٠) کیلۆگرام چەوریی هەیە، بۆ ئەوەی بەرگەی برسیەتیی بگرێ، لە کاتی برسیەتییدا، ئەو چەورییە دێتەوە

www.alibapir.com







نێو خوێنەکەی و صەرف دەبێ و، بەرگەی ئەوە دەگرێ کە زیاتر لە هەفتەیەك، بەبێ خواردن و خواردنەوە مەدار بکات.

٣) ددان و لێوەکانی حوشتر بە جۆرێکن، هەموو شتێکی تیژو زبری بۆ بخورێ، گیای حوشتر خۆرکە بەس حوشتر دەیخوات، هەندێك گژو گیای دڕکاویی و زبر هەیە لە بیابان دەڕوێ، بیابان بەس ئەوەی لێیە خوا (سبحانە وتعالی) ددان و لێوەکانی حوشتری وا دروست کردوون، هەموو ئەو شتانەی بۆ بخورێ، چونکە لە بیابان هەر ئەوانەی چنگ دەکەوێ و، ئەگەر ئەوانەشی بۆ نەخورابایە، لە برسان دەمرد.

٤) برژانگەکانی چاوی حوشتر و پێڵووەکانی چاوی، ڕوون(شفّاف)ن، چونکە لە بیابان کاتێك گەردەلوولی بیابان و ئەو هەموو تۆزو خۆڵ و بایە دێ، ناچارە زۆر چاو بنووقێنێ و دەبێ ڕێگاش ببینێ و، ناکرێ، لەبەر ئەوەی با دێ، نەڕوات، جاری وایە لە بەیانی تاکو ئێوارە، لە ئێوارە تاکو بەیانی با دێ، دەبێ حوشتر بڕوا، ئیدی کە دەڕوات چاو دەنووقێنێ، بەڵام پێڵوەکان و برژانگەکانی ڕوونن، بۆ ئەوەی ڕێی خۆی ببینێ.

٥) لووتی حوشتر بەجۆرێك هەڵخراوە، هەر کاتێك ویستی لووتی خۆی دادەخات، وەك ئێمە نیە، ئێستا ئێمە ناتوانین لووتی خۆمان دابخەین، بەڵام حوشتر دەتوانێ لووتی خۆی دابخات، هەردوو کونە تفنکەکانی دابخات، کاتێك گەردەلوولی بیابان هەڵدەکات.

٦) ئەسپ و ماین و کەرو ئێستر سمیان هەیە و ئەوانە پێیان دەگوترێ: یەك سم، بەڵام ڕەشە وڵاخ و بزن و مەڕ، پێیان دەگوترێ: دوو سم، واتە: پێیان دوویە، بەڵام حوشتر خوففی هەیە، (سم) ڕەقە، ئێسقانە، بەڵام خوففی حوشتر، جۆرێ لە گۆشت و چەرمە، بەڵام زۆر پتەوە، ئێسقان نیە، ئەگەر ئێسقان بووایە، لە بیابان زۆر بە قووڵی بە لمدا دەچووە خوارێ، بەڵام خوففەکانی حوشتر، جۆرێکن، کە دایاندەنێ، پان دەبنەوە، بۆ ئەوەی لاقی بە نێو لمدا نەچێتە خوارێ.

٧) حوشتر لاقەکانی زۆر درێژن، تاکو لە زەوی بەرز بێتەوە و بەرسکی نەسووتێ.

www.alibapir.com



٨) پێستی حوشتر چەند ناوچەیەكی ڕەق و وشكی هەن، وەك كڵاوەی ئەژنۆو بەرزگی، تاكو لە كاتی یەخ بوون دا، كاتێك دەنیشێتە سەر زەوی، نەسووتێ.

بۆیەش خوا (سبحانە وتعالی) فەرموویەتی:

﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ١٧﴾ الغاشية.

واتە: ئایا سەرنجی حوشتریان نەداوە، چۆن دروست كراوە؟! تەماشای بكە، ئنجا دەزانی: ئەو زاتەی ئەو هەموو پێداویستییانەی بۆ حوشتر جێ بەجێ كردوون و، ئەو هەموو داخوازییانەی پێ داون و، ئاوا بەو شێوەیەی لێكردوە، كە بتوانێ كاری خۆی ڕایی بكات، خوای پەروەردگارە (سبحانە وتعالی)[1].

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٨٣،٨٤.





## باسی سێیەم



# زانست گەواهیدەری بوونی خوایە
# (العِلْمٌ شَاهِدٌ عَلَى وُجودِ الله)

## دەستپێك

سەرەتا دەڵێین: مەبەستمان لە زانست (عِلم) لێرەدا، زانیاریی ئەزموونیی (العلم التجربي)یە، کە لە ئەنجامی ئەزموونکاریی لە تاقیگەکاندا پەیدا دەبێ، لە ئەنجامی بەکارهێنانی مرۆڤ بۆ پێنج هەستەوەرەکانی: (دیتن و بیستن و بۆنکردن و تامکردن و دەستلێکوتان)دا و، لە ئەنجامی مامەڵەی لەگەڵ دەوروبەری دا و، بە هاوکاریی عەقڵ، زانیاریی ئەزموونکاریی پەیدا دەبێ.

گومانی تێدانیە کە بەبێ هاوکاریی و ئەنجامگیریی عەقڵ، ئەو وردە زانیارییانە، کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە کۆدەکرێنەوە و، بە تۆڕو شەداوی پێنج هەستەکان کۆدەکرێنەوە، ئەو کەرەسە خاوە، هیچ کەلێنێك بۆ مرۆڤ ناگرێ، چونکە پێنج هەستەکان تەنیا دەتوانن: دیمەنە بینراوەکان (المناظر المرئية) و دەنگە بیستراوەکان (الأصوات المسموعة)، پاشان تامەکان، چێژراوەکان (المذوقات) و دوایی بۆنکراوەکان (المشمومات) و دوایی دەستلێکوتراوەکان (الملموسات)، ئەو جۆرە زانیارییە جوزئییانە، کۆبکەنەوە.

www.alibapir.com



ئنجا کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانەش، خاڵی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و زۆر لە ژیاندارانی دیکەیە، ئەوانیش: دەشبیستن و، دەشبینن و، تامیش دەکەن و، بۆنیش دەکەن و، لەمسیش دەکەن، بەڵکو جاری وا هەیە، ئەو هەستانەیان لە مرۆڤیش زۆر بەهێزترە.

کەواتە: زانست بە مانای تایبەت و تەسکی، کە زانیاریی ئەزموونیی، یان زانیاریی سروشتیی، پێ دەڵێن، لە جوغز و بازنەی دیاردە سروشتییە بەرهەستەکان دایە و، هەقی بەسەر دەرەوەی ئەو بازنەیەوە نیە، نە بە چاك، نە بە خراپ.

واتە: زانیارییەك کە لەڕێی پێنج هەستەکانەوە وەدەست دێ، تەنیا ڕواڵەتەکانی ماددە - ڕەنگەکانیان، دەنگەکانیان، تامەکانیان، بۆنەکانیان، قەبارەکانیان - دەبینێ و، حەقی بەسەر دەرەوەی جوغزی ماددەوە نیە.

کەواتە: ئەگەر زانیاریی ئەزموونیی، ناگونجێ ڕاستەوخۆ ببێتە بەڵگەو شاهێدی بوونی خوا، بەهەمان شێوەش هیچ کەس بۆی نیە، بە ناوی زانستەوە، قسە لەبارەی شتێکەوە بکات، وەك: خوا (سبحانه وتعالى)، فریشتەکان، ڕووح، ڕۆژی دوایی، کە دەکەوێتە دەرەوەی جوغزی زانستەوە.

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دەکرێ:

ئەدی بۆچی ئێمە دەڵێین: زانست گەواهییدەری بوونی خوایە؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئێمە مەبەستمان ئەوەیە: زانست باشترین کەرەستەی خاو، دەخاتە بەردەستی عەقڵ و فیطرەتی مرۆڤ، تاکو بۆ ناسینی خوا، لێی بەهرەمەند بن.

چونکە زانستی ئەزموونکاریی، تەنیا باسی دروستکراوی خواو یاساکانی و نهێنییەکانی دەکات، باسی سروشت و دیاردەکانی سروشت و دیمەنەکانی سروشت، دەکات، کە یاساکانی خوا، لەو سروشتەدا و، لەو دیاردەو دیمەنانەی دا بەرجەستە بوون، هەر بۆیەش مرۆڤ، هەتا لەبارەی دروستکراوی خوای شارەزاوە، بەرچاو ڕوونتر بێ، دەگونجێ خواناستر بێ.

www.alibapir.com



واقیع وایە و ئەوەی بزانێ: خوا دروستکراوەکانی خۆی چۆن دروست کردوون و، چ وردەکارییەکی تێدا بەکارهێناون، زیاتر قەدری خوا دەزانێ، زیاتر خوا دەناسێ، زانیاریی خوا، توانای خوا، میهرەبانیی خوا، حیکمەت و کارزانیی خوا، زیاتر دەزانێ.

ئنجا وێڕای ئەو بەڵگە واقیعیی و عەقڵییەش، دوو ئایەتیش هەن، لە سوورەتی (فاطر)دا، زۆر بە ڕوونیی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەدرەوشێننەوە، خوا دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَـٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾﴾.

ڕاستە مانای ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، ئاوایە:

ئایا سەرنج نادەی؟! (بە چاوی عەقڵ و دڵ)، چۆن خوا لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوە و، لە میوەکان، میوەی ڕەنگ جیا جیای پێ دەرهێناون، (ئەوە سێو: سێوی زەردە، سێوی سەوزە، سێوی سوورە، ئنجا ئەوە خۆخە، ئەوە هەنجیرە، چەندان جۆر، ئەوە ترێ: چەندان جۆرە، ئەوە هەرمێ، ئەوە بەهێ، ئەوە ئەو هەموو جۆرە میوانە کە ناژمێردرێن، ڕەنگیان جیا جیا).

﴿وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾.

نەك هەر لە میوەکان و درەختەکان، بەڵکو لە چیاکانیشدا: هێڵی سپی و هێڵی سوور، ئەوانیش بە ڕەنگی جیا جیا و، ڕەشی زۆر تۆخ.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَـٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ﴾.

هەروەها لە خەڵك و لە ژیانداران، (پێڕۆیەکان کە بەسەر زەویدا دەڕۆن) و لە ئاژەڵەکانیش، (واتە: لە حوشتر و ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن)، ئەوانیش ڕەنگیان جیا جیایە.

﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾.

بە دڵنیایی تەنیا زانایان لە بەندەکانی خوا، وەك پێویست سام و هەیبەتی خوایان لە دڵدا هەیە و، خوا زاڵی لێبوردەیە.

کەواتە: مەبەست لە زانایان (العلماء) لێرەدا بە پێی سیاقی ئایەتەکە، ئەو زانایانەن، کە بە سروشتی خوا، ئاشنان، ئەو زانایانەی کە دەزانن، باران چۆن دەباریّ! ڕووەکەکان چۆن دەڕوێن! میوەکان بۆچی ڕەنگاو ڕەنگن؟ هەروەها چیایەکان و ژیانداران و...هتد، کەواتە: دەبێ زانیارییان هەبێ بە چۆنیەتی باران بارین و، زانیاریی ڕووەك ناسییان هەبێ و، زانیاریی زەویی ناسیی (جیۆلۆجیا) یان هەبێ و، زانیاریی ئاژەڵناسییان هەبێ بە هەموو جۆرەکانیەوە، دەبێ هەموو ئەو زانیارییانەیان هەبێ، ئنجا ئا ئەو زانایانە چاك، سام و هەیبەتی خوای پەروەردگاریان لە دڵ دا هەیە، کە بێگومان لێرەدا مەبەست پێی زانیاریی زانایان نیە بە زانستە شەرعییەکان، چونکە باسی زانستی شەرعیی نەکراوە، بەڵکو باسی کۆمەڵێك لە دیاردەو دیمەنە سروشتییەکان کراوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# ڕوونكردنەوەی شایەدییدانی زانست، لەسەر بوونی خوای بێ هاوتا

بەڕێـــــزان!

خوا پشتیوان بێ بە پێنج هەنگاو و، لە پێنج خاڵاندا، چۆنیەتیی شایەدییدانی زانست، لەسەر بوونی خوا، ڕوون دەكەینەوە:

## خاڵی یەكەم: بە چراو شەداوی زانستی ئەزموونیی و، لە جوغزی ماددە و سروشتدا، بۆ خوا گەڕان و پشكنین، هەڵەیەكی كوشندەو، شتێكی زۆر نا مەنتیقییە:

ئێمە پێشتر - لە باسی حەوتەمی بەشی یەكەمدا - گوتمان: دەبێ بۆ هەر شتە بە شێوازی خۆی و لە شوێنی خۆی دا، بۆی بگەڕێی، ئەگەرنا جگە لە ماندووبوون، هیچمان دەستگیر نابێ، ئەو كاتەش: (عَدَمُ العِلْمِ لاَ یَسْتَلْزِمُ عِلْمَ العدم) زانیاریی نەبوون بە شتێك، نابێتە بەڵگە و زانیاریی، لەسەر نەبوونی ئەو شتە.

بۆ وێنە: كەسێك بە چاوی سەر بیەوێ خوا ببینێ، خوا بە چاوی سەر نابینرێ، نەك خوا (سبحانه وتعالی) بەڵكو زۆر لە دروستكراوەكانی خواش، بە چاوی سەر نابینرێن، ئنجا ئایا هەر شتێك بە چاوی سەر نەتدیت، هەر شتێك دەنگت نەبیست، هەر شتێك بە پێنج هەستەكان نەتتوانی پەیوەندیی پێوە بكەی، دەبێ نكووڵیی لێ بكەی؟! ئەگەر وا بێ، دەبێ نكووڵیی لە ڕووحی خۆیشت بكەی و، لە عەقڵی خۆیشت بكەی، بگرە نكووڵیی لە (٩٩٪)ی دروستكراوەكانی خوا بكەی، چونكە هەر ئەم ماددەیە كە ئێمە

www.alibapir.com







مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین، یەکەکانی ماددە (وحدات المادة) کە گەردیلەکان (ذرَّات - Atorns)ن، هیچ کەس نە دیتوونی، نەبیستوونی، نە تام، نە بۆن، نە دەستلێکوتان، بەڵکو بەس بە شوێنەوارەکانیان دەزانین، کە هەن، پێشتر باسمان کرد کە: ئەلیکترۆن، کە بە دەوری پڕۆتۆن و نیۆترۆن لە نێوکی گەردیلەدا، دەخولێتەوە، کەس نەیدیوە، هەروەها نێوکی گەردیلەش، ئەویش بە هەمان شێوە هیچ کەس نەیبینیوە و، بە شوێنەوارەکانیان بوونیان دەزانین، هەروەها هێزی کێشندەو، هێزی موگناتیسیی و گەلێك شتی دیکەش.

ئنجا با سێ(٣) نموونەی دیکەش بهێنینەوە:

١)- ئایا بە پێنج هەستەکان، جگە لە ئەندازەیەك ئاوو، چەند جۆرە گازو کانزایەك، هیچی دیکە لە مرۆڤ دا چنگ دەکەوێ؟ نەخێر، ئنجا ئایا دەگونجێ بڵێین: مرۆڤ بەس ئەوەندەیە؟.

با تۆزێك بە زمانی ژمارەکان (لغة الأرقام) سەرنجی جەستەی مرۆڤ بدەین، شارەزا و پسپۆڕانی توێکاریی (تشريح) دەڵێن: جەستەی مرۆڤێکی ئاسایی ئەمانە پێکهاتەکاننی:

١) سەدو چل(١٤٠) ڕەتڵ ئاو، دەوری (٦٣)کیلۆگرام و[1]، (٧٠٪)ی جەستەی مرۆڤ، ئاوە.

٢) بایی ئەوەندە کە حەوت (٧) پارچە صابوونی لێ دروست بکرێن، چەوریی.

٣) بایی ئەوەندە کە شەش هەزار(٦٠٠٠) قەڵەمی ڕەصاصی لێ دروست بکرێ، ڕەصاص.

٤) پڕی یەك کەوچکی گچکە، خوێ.

٥) بایی ئەوەندەی دوو هەزار (٢،٠٠٠) دەنکە شقارتەی لێ دروست بکرێ، فۆسفۆڕ.

---

(١) رِطل (پاوەند) = ٤٥٣،٥ گرام، ١٤٠ ڕەطڵ = ٦٣،٥ کیلۆگرام





٦) مەگنیسیۆمی ئەوەندە تێدایە کە جورعەیەك، خوێیە نەرم کەرەوەکانی (جرعة من الأملاح المُليِّنَة) لێ دروست بکرێن.

٧) بایی دروستکردنی بزمارێکی درێژ، ئاسن.

٨) بایی ئەوەندەی تۆپی منداڵانی پێ بتەقێنرێ، پۆتاسیۆم.

٩) پڕی شووشەیەکی ئاسایی، شەکر.

ئنجا ئایا ئەگەر بە کەسێك بڵێی: جەستەی تۆ لەم شتانە دروست بووە و، وەرە بۆت دەنرخێنم و تۆ بایی ئەوەندەی! قبووڵی دەکات؟ بێگومان نەخێر، چونکە مرۆڤ تەنیا ئەو شتانە نیە، بەڵێ لە تاقیگە (مُختبر)دا هەر ئەوانە دەردەچن، بەڵام مرۆڤ هەر ئەوانە نیە، بەڵکو جەوهەری مرۆڤ، لە ڕووحەکەی دایە.

٢)- ئایا ئاوازێکی مۆسیقایی، یان شیعرێك لە ڕووی ماددیی و بەرهەستەوە، جگە لە دەنگێکی بیستراو، یان چەند وشەیەکی نووسراو، هیچی دیکەیە؟ بەدڵنیایی نەخێر، بەڵام ئایا ئاوازێکی مۆزیك، یان شیعرێك تەنیا بە ڕواڵەتەکەیان، هەڵدەسەنگێنرێن؟ نەخێر.

٣)- ئایا تابلۆ ناودارەکەی: (لیۆن درافنشی)، کە هی (مۆنالیزا)یە و، تابلۆیەکی ناودارە، لە ڕووە ڕوواڵەتییەکەیەوە، جیاوازیی چییە لە ئەندازەیەکی هاووێنەی، لە ڕەنگی جۆراو جۆری ڕێژراو بەسەر پارچە مقەبایەکدا؟ تۆش بە ئەندازەی ئەو ڕەنگانەی کە لەو دیمەن و تابلۆی مونالیزایەدا، بەکارهێنراون، لەلایەن (لیۆن درافنشی)یەوە، ڕەنگ و کەرەستە بێنە، ئایا وەك یەکن؟! ئەو تابلۆیە بە چەند ملیۆن دۆلار دەفرۆشرێ، بەڵام ئەوەی دیکە کەس پارەی پێنادا، هەرچەندە لە ڕووی ئەندازەی ماددییەوە، هێندەی یەکن!! کەواتە: ئێمە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە، پەی بە جەوهەر و ماهییەتی شتەکان نابەین.

www.alibapir.com



## خاڵی دووەم: مرۆڤ لە سەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا، بەهۆی لە خۆبایی بوونییەوە، بە زانیاریی ئەزموونیی، ڕۆڵی عەقڵ و فیطرەت و وەحیی بچووك کردەوە، بەڵام دواتر حاڵی بوو کە حاڵی نەبووە:

ئێمە ئەم بابەتە، لە باسی یەکەمی بەشی سێیەمدا: (سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ئەورووپا) بە درێژیی باس دەکەین، بەڵام لێرەش هەروا ئاماژەیەکی پێ دەکەین:

پێشتریش باسمان کرد کە لە ڕۆژئاوا، بەگشتیی و بە تایبەت لە ئەورووپادا: سەرەتا بە هۆی فەلسەفەی (ئەرەستۆ)وە، پاشان بە هۆی کاریگەریی ئایینی شێوێندراوی نەصرانییەوە، ڕۆڵی عەقڵ و زانستی ئەزموونیی زۆر بەر تەسك کرایەوە، بەڵکو ڕێی لێگیرا و دژایەتیی کرا، بۆیە دواتر بەپێی یاسای:

(بۆ هەر کارێك کاردانەوەیەك هەیە، لە ئاڕاستەدا پێچەوانەیەتی و لە هێزدا بارتەقایەتی)، حاڵەتەکە پێچەوانە بۆوە، واتە: ئنجا لە ڕۆژئاواو لە ئەورووپادا، ئەوەی برەوی پێدراو گرنگیی پێدراو، نرخ و بوونی بۆ دادەنرا، تەنیا زانستی ئەزموونیی بوو و، هەموو جۆرە زانستەکانی دیکە: زانستی عەقڵیی و، زانستی وەحیی و، زانستی ڕووحیی و ئەوانە، هەموویان نادیدە گیران، کە بێگومان هەردووك هەڵوێستەکەش، هەڵە بوون و هەمیشە کارو کاردانەوە، خەڵك تووشی هەڵە دەکات.

ئاشکرایە کە بە ناوی زانستەوەو، بە بیانووی بەرهەست نەبوونی خوا (سبحانه وتعالى)، نکووڵیی کردن لە بوونی خوا، شتێکی نەفامانەی دژ بە عەقڵ و عیلم و فیطرەت و واقیعە، چونکە:

بۆ وێنە:

دوای ئەوەی عەقڵ و واقیع ناچارمان دەکەن، دان بە بوونی هێزی کێشندە، ڕاکێشان (قوة الجاذبية)دا بێنین، ناگونجێ بە بیانووی بەهەرست نەبوونییەوە،

www.alibapir.com



لاملیی لە بوونی بکەین، چونکە ئەم گەردوونە، کەهکەشانەکانی هەرکامیان لە ملیاران ئەستێرە پێك هاتوون و، تیرە (قطر)ی گەردوون، بە (١٣ — ١٥) ملیار (١٣،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵی تیشکیی، مەزەندە دەکرێ و[1]، کاکێشانەکەی خۆمان دەڵێن: نزیکەی تریلیۆنێك ئەستێرەی تێدا هەیە و، تا ئێستا دەوری دوو سەد هەزار ملیۆن (٢٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)، کەهکەشان لە گەردوون دا مەزەندە دەکرێن[2]، ئەوانە هەموویان بە هۆی هێزی ڕاکێشانەوە وەستاون، ئنجا ئایا دەگونجێ نکووڵیی لە بوونی هێزی کێشکردن بکەین، هەر لەبەر ئەوەی بەرهەست نیە؟ نە بە چاو دەبینرێ، نە بە گوێ کەس بیستوویەتی، نە تام دەکرێ، نە بۆن دەکرێ، نە دەستی لێ دەدرێ، ئەدی چۆن دەزانین هەیە؟ بێگومان شوێنەوارەکانی ناچارمان دەکەن، ئێستا ئەگەر کەسێك نکووڵیی لە هێزی کێشندە بکات، هەر بە شێتی دادەنێین! ئنجا هێزی کێشندە کە دروستکراوێکی خوایە، ناتوانی بە پێنج هەستەکان پەی پێ بەری، بەدڵنیایی خوای تاك و پاك (سبحانە وتعالی)، زۆر لەوە مەزنترە، کە بەو پێنج هەستە داماوانە، کە ناتوانی هێزی کێشندەیان پێ دەرك بکەی، ناتوانی هێزی موگناتیسییان پێ دەرك بکەی، ناتوانی ڕووحیان پێ دەرك بکەی، کە لە نێو دوو تەنیشتەکانی خۆت دایە، ناتوانی ئەو هەموو جۆرە تیشکانە ببینی: تیشکی گاما، تیشکی سینیی، تیشکی ژێر سوور، تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، ئەوانە هیچیان ناتوانی بە پێنج هەستەکانت دەرك بکەی، بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئەو هەموو دروستکراوانە، زۆر لەوە مەزن و بەرزترە، کە تۆ تەماعی ئەوەت بێ، بەو پێنج هەستانە، دەرکی بکەی!

ئنجا تەماشا دەکەی کە تۆ هیچ کام لە مۆڵکۆل و گەردیلەو تەنۆلکەکان (الجزیئات، والذرات، والجُسَیمات)، یانی: نەك گەردیلە (Atom) نابینین، بەڵکو گەرد (Mocol)یش نابینین، چ جای تەنۆلکەکانی نێو گەردیلە، کە ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیۆترۆنە و، چ جای تەنۆلکە پێکهێنەرەکانی، هەر کام لە پرۆتۆن و نیۆترۆن، واتە: کوارکەکان (Guarks)!.

---

(١) الكون بين العلم والقرآن، ص٥٣.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٣٦.

ئنجا ئایا هیچ کەس ئێستا بەناوی زانستەوە، نکوولّیی دەکات لە بوونی ئەو شتانە، لەبەر ئەوەی کە بەرهەست نین؟ نەخێر، چونکە شوێنەوارەکانیان ناچارمان دەکەن.

کەواتە: دەتوانین بڵێین: زانستی ئەزموونیی (العلم التجربي) ئێستا هەتا بناگوێیان بە غەیب دا چۆتە خوار، هەتا بناگوێیان تێی چەقیوە و، زانست هەتا زیاتر بەرەو پێشەوە دەچێ، زیاتر دەزانێ کە دروستکراوە نەبینراوەکانی خوا، زۆر زۆر زیاترن لە دروستکراوە بینراوەکان، هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالی) دەفەرموێ:

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾﴾ الحاقة.

واتە: نەخێر، سوێند دەخۆم بەوەی کە دەیبینن و، بەوەش کە نایبینن.

کە بە تەئکید ئەوانەی نایانبینین، زۆر زیاترن لەوانەی دەیانبینین.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com







## خاڵی سێیەم: هەتا زانست بەرەو پێشەوەتر بچێ، ناسینی خوا عزوجل ئاشكراترو درەوشاوەتر دەبێ:

لەو بارەوە حەز دەكەم قسەیەكی (جفري برون) نووسەری كتێبی: (الحضارة الأوربیة في القرن التاسع عشر)، كە بە عەرەبیی تەرجەمە كراوە: (شارستانیەتیی ئەورووپا لە سەدەی نۆزدەدا)، بێنین، لە كتێبەكەیدا[1] كە (عبلة حجاب) تەرجەمەی كردوە، دەڵێ:

كاتێك (دیمتری مەندەلیف) هەڵسا بە بڵاو كردنەوەی یاسای دەوریی خۆی بۆ توخمەكان، لە ساڵی (١٨٦٩)زدا و، ڕوونی كردەوە كە توخمەكان، {كە ئێستا سەدو نۆ (١٠٩) توخم دۆزراونەوە، لە هیدرۆجین و تا دەگاتە توخمەكانی دوایی}، گوتی: ئەگەر بێت و ئەوانە ڕیز بكرێن بەپێی كێشی گەردیلەییان، ئەوە هەر توخمێكی هەشتەمی ئەو سەدو نۆ (١٠٩) توخمە، تایبەتمەندییەكانی لەگەڵ هەشتەمەكەی دیكەدا وێك دەچن، ئەمە سەرنجی خەڵكی ڕاكێشا، وەك بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی كە سروشت دەگونجێ مرۆڤ چاك لێی تێ بگات و، لەو كاتەدا بڕوایەكی بەهێز پەیدا بوو كە هەموو دیاردە ماددییە بەرهەستەكان لە گەردووندا، بە شێوەیەكی مەنتیقیی و لۆژیكییانە ڕەفتار دەكەن و، ئەوەی وای لە مرۆڤ كردوە، چاك لێیان تێ نەگات، عەقڵی نارێكی خۆیەتی، (ئەگەرنا ئەوەی كە لە سروشتدا هەیە، زۆر بەڕێكیی و زۆر بە وردەكاریی سستمیانە دانراوە).

---

(١) ص١٤١، ط١٩٦٣.

## خاڵی چوارەم: بیرۆکەی پێکەوە ناکۆك بوونی خواناسیی و زانست، زادەو دەرهاویشتەی کێشەو تێکگیرانی نێوان ڕەوتی زانست و ئایینی شێوێنراوی کڵێسایە:

بەڕێـــــزان!

ئەم بیرۆکەیە: (خواناسیی لەگەڵ زانستدا تێکدەگیرێ)، بە ڕاستیی ئەوە ئەفسانەیەکە و لە ئەورووپاوە پەیدا بوو، لە ڕۆژئاواوە، کە لەوێ ڕەوتی زانستی ئەزموونگەرایی، لە کاردانەوەی کارو کردەوەکانی کڵێساو چینی کەهەنووتی کڵێسادا، ئیعلانی دژایەتیی خۆی بۆ ئایین بە گشتیی و، تێکگیرانی خۆی لەگەڵیدا کرد، چونکە کڵێساییەکان دەیانویست هەموو شتێك لە ڕوانگەی کتێبی پیرۆزەوە، ئەو کتێبە کە ناویان لێ نابوو (الكتاب المقدس)، بەڵام پڕیان کردبوو لە شتی هەڵەو پێچەوانەی عەقڵ و عیلم و واقیع، دەیانویست هەموو شتێك لەبەر ڕۆشنایی ئەو کتێبەدا بزانن و، هەر شتێك ئەو کتێبە لەگەڵی نەهاتبایەوە، قبووڵیان نەدەکرد، هەرچەندە عەقڵیش پێویستی کردبا و، زانستیش پێویستی کردبا و، واقیعیش پێویستی کردبایە.

ئنجا ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی دوورو درێژە، کە ئێمە لە هەندێك لە کتێبەکانی خۆماندا، قسەمان لە بارەوە کردوە، بۆ وێنە:

١- لە کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا، لە باسی (سیکۆلاریزم)دا ئەو بەسەرهاتەمان تا ڕاددەیەك باسکردوە.

٢- هەروەها لە کتێبێکی دیکەماندا بەناوی: (دیموکراسیی و سیکۆلاریزم لە ئەزموونی کوردستان دا) دیسان باسمان کردوە.

٣- دیسان لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان)دا، لەوێشدا باسمان کردوە.

www.alibapir.com



٤- هەروەها لە: (الكتاب الحادي عشر)، (کتێبی یازدەیەم) لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)ش دا، قسەمان لە بارەوە کردوە.

٥- بەڵام ڕەنگە لە هەمووی وردتر لە باسی یەکەم لە بەشی سێیەمدا، باسی بکەین و، تیشکێکی چاکی بخەینە سەر، بەناوونیشانی: (سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ڕۆژئاوا).

لێرەشدا هەر بە کورتی لەو بارەوە دەڵێین:

لە ئەنجامی ئەوەدا کە کڵێسا بۆچوونەکانی (ئەرەسطۆ)و هەندێك لە فەیلەسووفەکانی دیکەی یۆنانی تەبەننیی کردبوو، وەك: (بەتلیموس) و (ئیقلیدس) لە بارەی جوگرافیا و گەردووونناسییەوە و (جالینۆس) لە ڕووی پزیشکییەوە، فیکری بەشەریش بەستراوەتەوە بەو هەل و مەرج و ژینگەیە کە تێیدا دەژی و، شتێکی ڕێژەییە، بەڵام کڵێساییەکان ئەو بۆچوونانەیان کردبوون بە بەشێك لە ئایینی نەصرانیی، ئنجا کاتێك کە زانست بەرەو پێشەوە چوو، لەگەڵ ئەو شتە ناڕاستانەدا تێکگیرا و، ئەوانیش نەیاندەگوت: زانست لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی ئەرەستۆدا، کە لەلایەن کڵێساوە تەبەننیی کراون، تێکگیراوە، بەڵکو دەیانگوت: زانست لەگەڵ دیندا تێکگیراوە، بۆیە زانایان و لێکۆڵەرەوان لەخودی ئایینەکە کەوتنە گومانەوە و گوتیان: دیارە ئەو ئایینە، ئەو کتێبە پیرۆز، (پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ)، بە هەردووکیان پێیان دەگوترێ: (کتێبی پیرۆز)، لەگەڵ عەقڵ و عیلم و واقیعدا، تێکدەگیرێ، بۆیە لە هەمووی کەوتنە گومانەوە و، لەوێوە ئەو کێشەیە سەری هەڵدا.

هەروەها لە ئەنجامی هەڵسوکەوتە ناڕاستەکانی کڵێساو پیاوانی کڵێسادا - کە پێشتریش ئاماژەیەکمان پێداوە - بۆ وێنە: دادگای پشکنینیان دروست کردبوو، کە هەزاران خەڵکیان بە بیانووی ئەوە کە لە ئایینی مەسیح هەڵگەڕاوەنەوە، ئیعدام دەکرد و دەسووتاند، کاتێك ڕوویان لە ئیسلام دەکرد، یان ڕوویان لە ئایینێکی دیکە دەکرد، یاخود بڕوای بە هیچ ئایینێکی ئاسمانیی نەدەما، هەروەها لە ئەنجامی ئەوەدا کە کڵێسا بوو بوو بە بەشێك لەو سێکوچکەیەی

www.alibapir.com





(پاپا + دەرەبەگ + پادشا) کە ساڵان و سەدانێکی زۆر تاریکی، بەسەر ئەورووپادا فەرز کردبوون، کە پێیان دەگوترێ: سەدەکانی نێوەڕاست، کە لە سەدەی شەشەمی زایینی تاکو سەدەی شازدەیەم، یاخود لە سەدەی پێنجەم تاکو سەدەی پازدەیەم، واتە: دە (١٠) سەدە دەوامی کرد، سێکوچکەیەك دروست بووبوو، لە نێوان ئەم سێ لایەنەدا:

١- پاپا و هاوکارانی پاپا، چینی کەهەنووت (ئەکلیرۆس).

٢- دەرەبەگ و خاوەن زەوی.

٣- پـــادشـــا.

ئەو سێکوچکەیە، کەوتبوە ویژەی خەڵك و جەماوەر و، خەڵك و جەماوەریان بێزار کردبوو، چونکە لە ڕووی سیاسیی و ئایینی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە، دەیانچەوساندەوە.

ئەگەرنا لەلای زانایانی ئیسلام ئەو باس و خواسە نەبووە، کە زانست لەگەڵ وەحییدا تێك بگیرێ، یان عەقڵ لەگەڵ وەحییدا تێك بگیرێ و، زانایانی ئیسلام بنچینەیەکیان داناوە، دەڵێ: (لا يَتَعَارَضُ صَرِيحُ العَقْلِ مَعَ صَحِيحُ النَّقْلِ)، واتە: عەقڵی ڕاست، لەگەڵ نەقڵی ساغ دا، هەرگیز تێك ناگیرێن.

ئنجا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێداوە: (إبن تيمية) کتێبێکی گەورەی هەیە بە ناوی: (دَرءُ التَّعَارُضِ بَيْنَ العَقْلِ وَالنَّقْل)، واتە: (لابردنی تێکگیران، لە نێوان عەقڵ و نەقڵ دا).

هەروەها (إبن رشد) کتێبێکی ناوداری هەیە بە ناوی: (فَصْلُ المَقَال فِيمَا بَيْنَ الشَّرِيعَةِ وَالحِكْمَةِ مِنَ الإتِّصَال)، واتە: (قسەی ڕوون، لە بارەی ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان شەریعەت و حیکمەتدایە)، وشەی (حكمة)یش، مەبەستی پێی فەلسەفەیە، کە بەرهەمی عەقڵە.

www.alibapir.com


خاڵی پێنجەم و کۆتایی: زانستەکانی گەردووناسیی، فیزیا، کیمیا، زیندەوەرزانیی، ڕووەکناسیی، زەوی ناسیی، پزیشکیی، دەروونزانیی، کۆمەڵناسیی...هتد، هەموویان شایەدیی دەدەن کە دروستکراوەکانی خوا، ئەو پەڕی یاسادارو سیستماتیك و ڕێك و پێکن، هەر کام لەو لقانەی زانیاریی لە بواری خۆیدا، شایەدیی دەدا کە: دروستکراوەکانی خوا، لەو پەڕی ڕێك و پێکیی و یاساداریی و وردەکاریی دان:

ئنجا با بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵی پێنجەمە، ئەم چوار سەرنجە بخەینە ڕوو:

**١)** ئێمە بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە (دروستکراوەکانی خوا یاسادار و ڕێك و پێکن) لە ڕابردوودا چەندان وێنەمان هێنانەوە، بۆیە بەوەی لەویٚ گوتوومانە وازدێنین و، لێرە قسەی زیاتر لەو بارەوە، بە پێویست نازانین.

**٢)** ئێمە تەنیا کاتێك لە هەموو حیکمەت و نهێنییەکانی دروستکراوەکانی خوا (سبحانه وتعالی)، تێدەگەین، کە بە ئەندازەی خوا زانیارییمان هەبیٚ، کە ئەوەش مەحاڵە و، ئێمە لە قەدەر خۆمان زانیارییمان هەیە، وەك خوا دەفەرمویٚ:

﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ الإسراء: ٨٥.

واتە: ئەندازەیەکی کەم نەبیٚ زانیارییتان پیٚ نەدراوە، واتە: تەنیا ئەندازەیەکی کەم لە زانیاریی دەتوانین وەدەست بێنین و، ئەوەی وەدەستی دێنین، هەرچەندێك بیٚ، لەچاو نهێنییەکانی گەردوون و دەوروبەرمان، هەر کەمە.

**٣)** وەك چۆن لە قورئاندا، ئایەتەکانی مانا ڕۆشن (محکم) و مانا وێکچوو (متشابە) هەن، بە هەمان شێوە: لە دروستکراوەکانیشدا، شتانێك هەن، کە زۆر بە ڕوونیی حیکمەت و نهێنییەکەیان دیارە، بەڵام شتانێکیش هەن، کە مرۆڤ جاریٚ لە حیکمەت و نهێنییەکەیان نەگەیشتوە، بەڵام جێی سەرسووڕمانە کە ئەو هەموو

www.alibapir.com





یاساداریی و سیستماتیکیی و ڕێك و پێکییە، لە گەردووندا هەیە، کەچی بابای مولحید ناچێ سەرنجی ئەو هەمموو ڕێك و پێکییە بدات، دەچێ وەشتێك دەڕزێ[1] کە سەری لێ دەرناچێ، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە خۆی زانیارییەکەی ناتەواو و کرچ و کاڵە، وەك پێشتر قسەکەی (جفري برون)مان هێنا، نووسەری کتێبی: (شارستانیەتی ئەورووپا لە سەدەی نۆزەدەیەم دا)، کە ئەوەی مرۆڤ بە ناڕێك و پێکیی، تێیدەگات، هەڵەی مێشك و عەقڵی خۆیەتی و خۆی تێینەگەیشتوە.

ئەو ڕاستییەش زۆر جار دەرکەوتوە، بۆ وێنە: هەندێك لەو زانایانەی کە بە بیردۆزەی (داروینیزم) کارتێکراو (مُتَأَثِّر)ن، داروینیزمیان تەبەننیی کردوە، هەندێ شتیان ڕەخنە لێگرتوە لە جەستەی مرۆڤ دا، کە گوایە هیچ کارێکیان نیە و، لە ئەنجامی پەرەسەندن و گەشەسەندنی ژیاندارانەوە، ئەو ئەندامانە کە زیادن و پێویست نین، ماونەوە!

بۆ نموونە:

**یەکەم:** یەکێك لەوانە (ڕیخۆڵە کوێرە)، کە ئێستا زانایان و پسپۆڕان بۆیان دەرکەوتوە، کە ڕیخۆڵە کوێرە کۆمەڵێکی جۆراو جۆر لە بەکتریا بەرهەم دێنێ، کە ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینن بۆ کۆئەندامی هەرس و یارمەتی دەدەن، پاشان ڕێگاش دەگرن، لە هەندێك نەخۆشیی وەك: کۆلێرا (سکچوون)، کە جاری وا هەیە لە ئەنجامی ئەو سکچوون (إسهال)ەدا، مرۆڤ هەرچی شلەمەنیی نێو جەستەیەتی دەچێتە دەر و سەرەنجام دەمرێ[2].

**دووەم:** یەکی دیکە دوولەوزەکان (لَوْزَتَيْن)ن، باسی لەوزەتێنیان کردوە، کە سوودیان نیە، بەڵام ئێستا دەرکەوتوە، کە نەك هەر بێ سوود نین، بەڵکو دوو پاسەوانی زۆر گورج و گۆڵ و زەبر دەستن، لەملاو لای قورگ، کە هەر میکرۆبێك، هەر تەنێکی نامۆ، لە زار و لووتەوە، ڕوو لە جەستە بکات، ئەوان لەگەڵی بەشەڕ دێن و ڕێگای لێ دەگرن و، کە جاری وایە ئەستوور دەبن، لە

---

(١) وەشتێك دەڕزێ: خەریکی شتێك دەبێ، مەراق و خولیای شتێکی دەبێ.

(٢) بڕوانە: (الإعجاز الرباني في جسم الإنسان)، ص٣٧٢.

ئەنجامی ئەوەدایە کە زۆریان خەبات کردوە و فیداکارییان کردوە لە پاریزگاریی لێ کردنی جەستەدا، بۆیە لە ئەنجامدا، خۆیان تووشی ئاوسان بوون.

٤) چەندە لێ ورد بوونەوە و تێوە ڕامانی قورئان، پێویستە، هی گەردوون و ژیانی ئینسانیش، هێندە پێویستە، چونکە وەك چۆن کتێبی خوێنراوەی خوا (کتاب الله المقروء)، ئەم قورئانە بەرزو مەزن و بەخشندەیە، گەردوونیش، کتێبی بینراوی خوا (کتاب الله المنظور)یە و، هەردووکیان هەر کتێبی خوان، یەکەمیانی فەرمووەو ئەوی دیکەشیانی دروستکردوە، ئنجا موستەحیلە فەرمایشتی خوا، لەگەڵ دروستکراوی خوادا تێك بگیرێن.

ئێستا ئەم قورئانە ساغ و دەستکاریی نەکراوە، تەحەددا دەکەین کەسێك بە مەرجێك لە قورئان تێ بگات و شارەزای زمانی عەرەبیی بێ، نەك ئایەتێك، بێنێ، بەڵکو ڕستەیەك، بگرە وشەیەك، لە قورئان بێنێ، کە لەگەڵ زانستدا تێك بگیرێ، چونکە قورئان وەحیی پارێزراوی خوایە و، گوازراوەی ڕاست (نقل صحیح)ە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە عەقڵەکەش ساغ (صریح)بێ، (واتە: ئەو مەسەلە عیلمییەش سەلمێنراو بێ)، نەك وەك ئەفسانەی داروینیزم، کە وەك دوایی پێی دەگەین، (لە بەشی سێیەمی ئەم بابەتە فراوانەدا)، ئێستا لێك و پێك هەڵوەشاوە، کەچی ماوەیەکی زۆرە و ئێستاش لەگەڵدا بێ، لە زۆر لە کتێبەکاندا دەخوێنرێ، وەك حەقیقەتێکی سەلمێنراو، نەك وەك بیردۆزەیەکیش!!.

بەڵێ ئێمە وەك چۆن لەسەرمان پێویستە، لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تێبگەین، کە سوننەتیش هەر بەرجەستەکردن و پراکتیککردنی قورئانە، بە هەمان شێوەش لەسەرمان پێویستە، لە کتێبی بیندراوی خواش، چاك شارەزا بین و پێی ئاشنا بین، ئەو کاتەش:

**یەکەم:** وەك چۆن بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوەی خوا فەرموویەتی، ڕاستە، کە دەفەرموێ:

﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ ﴾ الأنعام: ١١٥.

واتە: وشەکانی پەروەردگارت تەواویان کردوە لە ڕاستیی و دادگەریی دا.

www.alibapir.com







چونكە وشەكانی پەروەردگار بە گشتیی دەبنەوە دوو بەش:

أ- یان هەواڵن، هەواڵەكان هەموویان لە لووتكەی ڕاستیی دان.

**ب-** یاخود یاساو بڕیارن، یاساو بڕیارەكانیش هەموویان دادگەرانەن و، لە لووتكەی دادگەریی دان، ئنجا وەك چۆن قورئان لە ڕاستیی و لە دادگەریی دا، تەواوی كردوە.

**دووەم:** بە هەمان شێوەش بۆمان دەردەكەوێ كە: دروستكراوی خواش، ئەم گەردوونەش، بێ كەم و كوڕییە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ ...مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ ۖ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾ الملك.

واتە: لە دروستكراوی خوای خاوەن بەزەییدا، ناڕێكیی نابینی، جار لە دوای جار چاوبگێڕەوەو سەرنج بدە، بزانە هیچ ناڕێكیی دەبینی، دوایی چەندان جار دووبارەی بكەوەو سەرنج بدە، بەڵام چاوت بۆلا دەگەڕێتەوە بە ماندوویەتی، بەبێ ئەوەی هیچی دەستگیر بووبێ (لە دۆزینەوەی ناڕێكیی و كەم و كوڕیی).

لێرەش دا وەك دەبینین: خوا تەحەددا دەكات، وەك چۆن تەحەددا دەكات و دەفەرموێ: ناتوانن وێنەی قورئان بێنن، بەڵكو ناتوانن وێنەی دە(١٠) سووڕەت و، بەڵكو سووڕەتێكش بێنن، فەرموون ئەگەر ڕاست دەكەن، قورئان لە خواوە نەهاتوە، وێنەی وی بێنن، دڵنیا بن كە وێنەشی ناهێنن! بەهەمان شێوەش خوا تەحەددای ئینس و جینیش دەكات و دەفەرموێ: بێ منەت بن لە دروستكراوی خوادا، ناڕێكییەك بدۆزنەوە، بەڵام بە مسۆگەریی ناتوانن، چونكە خوا دروستكراوی خۆی بەو پەڕی وردەكاریی و یاساداریی دروستكردوە، وەك لە ئایەتی (٨٨)ی سووڕەتی (النمل)دا دەفەرموێ:

﴿ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ ﴾.

واتە: دروستكراوی ئەو خوایەی كە هەموو شتێكی بە ئەوپەڕی وردەكاریی دروستكردوە.

www.alibapir.com



هەروەها لە ئایەتی (٧)ی سوورەتی (السَّجدة)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴾.

واتە: ئەو خوایەی کە هەرچی دروستیکردوە، بە باشترین شێوە دروستیکردوە.

لێرەش - لە ئایەتەکانی : (٣و٤)ی (الملك)دا - دەفەرمویٚ: لە دروستکراوی خاوەن بە بەزەیی دا نارێکیی و، بیٚ یاسایی، نابینی، هەرچەندە زۆریش سەرنج بدەی، بەڵکو تاکو زیاتر سەرنجی گەردوون بدەی، زیاتر ڕێك و پێکیی دەبینی.

بەڵیٚ ئێمە وەك چۆن لێتێگەیشتن و سەرنجدانی کتێبی خوێنراوەی خوامان، لەسەر پێویستە، پیٚ ئاشنابوون و لیٚ شارەزابوونی کتێبی گەردوونیشمان، لەسەر پێویستە، ئنجا ئەو کاتەش، وەك چۆن هەر کەسیٚ تاکو زیاتر لە قورئان تیٚ بگات، زیاتر قەدری قورئان دەزانیٚ و، دەزانیٚ خوا (سبحانه وتعالى) چ فەرمایشتێکی بەرزو مەزن و، چ فەرمایشتێکی بیٚ وێنەی فەرمووە؟! بە هەمان شێوەش، ئەگەر شارەزای گەردوونیش بیٚ، شارەزای دروستکراوەکانیش بیٚ، ئەو کاتە دەزانیٚ کە خوا، چەند بە وردەکارییەوە دروستکراوەکانی هێناونەدی، وەك فەرموویەتی:

﴿ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ ﴾ النمل: ٨٨.

دروستکراوی ئەو خوایەی کە هەموو شتێکی بەوپەڕی وردەکاریی دروستکردوە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴾ السجدة: ٧.

ئەو خوایەی کە هەرچی دروستیکردوە، بە باشترین شێوە دروستیکردوە.

www.alibapir.com



# باسی چوارەم و كۆتایی

## وەحیی بەڵگەی بوونی خوایە (سبحانه وتعالی)

بەڕێـــــزان!

ئێمە لە ڕابردوودا خستمانە ڕوو كە هەر كام لە: زگماك (فِطرة) و، عەقڵ و، زانست، شایەدیی دەدەن كە خوا (سبحانه وتعالی) بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشوور خۆری، ئەم گەردوونەو، سەرجەم پێكهاتەكانی ئەم گەردوونەیە.

بەڵام لێرەدا چەند پرسیارێك دەكرێن:

١- ئایا ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارە، زاتی چۆنە؟

٢- سیفەتەكانی چین؟

٣- ئەم گەردوونەی بۆچی هێناوەتە دی؟

٤- پێویستە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بكەین؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە و هاووێنەكانیان، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ وەحیی، وەڵامی ئەو پرسیارانە بە تەواویی نە لەلای فیطرەت دەست دەكەون، نە لەلای عەقڵ دەست دەكەون، نە لەلای زانست دەست دەكەون.

ئنجا لێرەدا بە پێویستی دەزانم تیشكێك بخەینە سەر مەسەلەیەك، كە كاتی خۆی قسەیەكمان لێ كرد، بەڵام بۆ ئێرەمان هەڵگرت، ئەویش ئەوەیە كە هەندێك

www.alibapir.com



لەسەرانی ئەهلی تەصەووف، لە تەوژمی کەشف و ئیشراق (الكَشْفُ والإِشْرَاق)، ئەو تەوژمەی پێشتر باسمان کرد، کە قەناعەتیان وایە: ئەگەر بێت و ئینسان زۆر نەفسی خۆی پاڵفتە بکات و خۆ پاککردنەوە لە سیفەتە نزم و پەستەکان و، خۆڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو جوانەکان، بکاتە پیشەو دڵ و دەروونی خۆی پاك بکاتەوە، ئەو کاتە ئەمە، دەبێتە ئەڵتەرناتیڤ و بەدیلێك بۆ وەحیی!

هەندێك لە ئەهلی تەصەووف ئەو قسەیان کردوە.

کە لە ڕاستییدا ئەوە دەچێتە خانەی (شَطحات) و، ئەو تێپەڕاندنانەی کە لە ئەنجامی دوورکەوتنەوە لە شەریعەت و، لە ئەنجامی کەوتنە ژێر کاریگەریی عاتیفەو سۆزیی سۆفیگەریی دا، هەندێك لە ئەهلی تەصەووف، ئەو جۆرە قسانەیان کردوون، هەڵبەتە پێشەوا گەورەکانی تەزکیە و تەصەووف، نا، بەڵام هەندێکیان، لەو جۆرە قسانەیان کردوون.

یانی: پێیان وابووە کە ئەگەر مرۆڤ، چاك تەزکیەی نەفسی خۆی بکات و، دەروون و دڵی خۆی پاك بکاتەوە، ئا ئەوە مرۆڤ بێ نیاز دەکات لە شەریعەت، بە تایبەت لە بواری خواناسییدا، هەندێکیان گوتوویانە: تەنیا لە بواری خواناسییدا، مرۆڤ لەوە بێ نیاز دەبێ، ئەگەرنا بۆ پابەندیی بۆ یاسا کردەییەکان (الأحكام العملية)ەوە، هەر دەبێ بگەڕێینەوە بۆ شەریعەت.

با بۆ وێنە: سەرنجی بەشێك لە نامەیەکی (محي الدين بن عربي)، کە بە (الشيخ الأكبر) ناسراوە و، پێم وایە نازناوەکەی زۆر لێ خەسارە، چونکە یەکێك بووە لە بانگەشەکەران بۆ یەکبوونیی (وحدة الوجود)، یانی: خواو هەرچی کە هەیە، هەمووی بە یەك زانیوە، هەندێ لە قسەکانی وایان لێ وەردەگیرێ، بەڵکو زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی ئەو جۆرە قسانە دەکا، هەم لە کتێبی: (الفتوحات المكية)دا، هەم لە کتێبی: (فُصوص الحكم)دا، کە هەموویم بە وردیی خوێندۆتەوە، بە شەرحەوە و، زۆر شوێنی: (الفتوحات المكية)شم تەماشا کردوە، ئەو بیرۆکەیەی زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی گوتوە، هەرچەند دوایی قسەی دیکەشی گوتوون، کە لەگەڵ ئەو قسانەیدا تێکدەگیرێن.

www.alibapir.com





(محي الدين بن عربي) له ساڵی (٦٣٨)ی كۆچیی و (١٢٤٠)ی زاییینیدا، مردوه.

نامەیەك دەنووسێ بۆ (فخر الدين الرازي)، خاوەنی (مفاتيح الغيب - التفسير الكبير).

من هەندێ لە نامەكەی - كە شوێنی مەبەستە - دێنم، نووسیویەتی:

(وَيَجِلُّ اللهُ أَنْ يَعْرِفَهُ العَقْلُ بِنَظَرِهِ وَفِكْرِهِ، فَيَنْبَغِي لِلْعَاقِلِ أَنْ يُخْلِيَ قَلْبَهُ عَنِ الفِكْرِ، إِذَا أَرَادَ مَعْرِفَةَ اللهِ مِنْ حَيْثُ المُشَاهَدَةُ.. فَارْفَعِ الهِمَّةَ فِي أَلاَّ تَأْخُذَ عِلْماً إِلاَّ مَا مَنَحَهُ سُبْحَانَهُ عَلَى الكَشْفِ، فَإِنَّ عِنْدَ المُحَقِّقِينَ أَلاَّ فَاعِلَ إِلاَّ اللهَ، فَإِذَاً لاَ يَأْخُذُونَ إِلاَّ عَنِ اللهِ، لَكِن كَشْفَاً لاَ عَقْلاً، وَمَا فَازَ أَهْلُ الهِمَّةِ، إِلاَّ بالوصُولِ إِلى عَيْنِ اليَقِينِ، أَنَفَةَ بقَاءٍ مَعَ عِلْمِ اليَقِينِ)[1].

واتە: خوا لەوە بەرزترە كە عەقڵ بە هۆی سەرنجدان و بیركردنەوەی خۆیەوە، بیناسێ، بۆیە پێویستە بۆ بابای عاقڵ، دڵی خۆی لە بیركردنەوە خاڵی بكات، ئەگەر بیەوێ خوا وەك بینین بناسێ، (واتە: بە چاوی عەقڵ و دڵ بیبینێ، ئنجا دوای چەند قسەیەك دەڵێ:) هیممەتی خۆت بەرزبكەوە كە زانیاریی وەرنەگری، مەگەر ئەو زانیارییە كە خوای پاك و بێگەرد بە هۆی كەشفەوە پێت دەدا، چونكە لەلای لێكۆڵەرەوان، ئەوە سەلێمنراوە كە هیچ بكەرێك نیە جگە لە خوا، كەواتە: زانست تەنیا لە خوا وەردەگرن، بەڵام بە كەشف، (یانی: بە دەركەوتن، دەركەوتنی ڕاستەوخۆ، نەك بە بیركردنەوە، بەهۆی عەقڵەوە)، ئەوانەی خاوەن هیممەتیشن، بەوە گەیشتوون بە (عين اليقين)، كە ڕازیی نەبوون كە لە قۆناغی (علم اليقين)دا بمێننەوە.

بەڵام یەكێك لە پێشەوایانی تەصەووف بە ناوی (أحمد بن عبدالأحد السرهندي)، كە لە ساڵی (١٠٣٤)ی كۆچیی و (١٦٢٦)ی زاییینیدا، كۆچی دوایی كردوە، كە بە: (مُجَدِّد الألف الثاني) و بە: (الإمام الربَّاني)یش مەشهوورە،

---

(١) ئەمە لە كتێبێكی دا بەناوی (ثلاث رسائل)دا هاتوە، كە لە كتێبی: (محاضرات في الفكر والدعوة)ی: (أبو حسن الندوي) ج٢، ص١٨٤، وەرمانگرتوە.

www.alibapir.com



کتێبێکی ناوداری هەیە بە ناوی: (المکتوبات) کە دوو بەرگە و، ئەصڵی خۆی بە فارسیی نووسیویەتی، بەڵام تەرجەمەی عەرەبییش کراوە، لەوێدا گوتوویەتی:

(مِنْ أَعْجَبِ الأُمُورِ أَنَّ الشّيخ مُحي الدين بن عَرَبِي، يَبْدُو مِنَ المَقْبُولِيْنَ عِنْدَالله، وَلَكِنَ أَكْثَرَ علُومِهِ الَّتِي جَانَبَ فِيهَا مَذْهَبَ أَهْلِ الحَقّ "أَتْبَاعَ الكِتَاب وَالسُّنَّة" يَتَجَلّى فِيهَا الخَطَأَ وَالبُعْدُ عَنْ الصواب)[١].

واتە: لە سەرسوڕهێنەرترین شتەکان ئەوەیە کە (شیخ محي الدين بن عربي)، کە وا پێدەچێ لە پەسندان بێ، لەلای خوا، (لە ڕێی کەشفەوە دەبێ شتێکی بۆ دەرکەوتبێ، هەرچەندە ئەو کەشفەش دیسان جێی دڵنیایی نیە)[٢]، بەڵام زۆربەی ئەو زانیارییانەی کە تێیاندا لە ئەهلی حەق دوورکەوتۆتەوە (واتە: شوێنکەوتووانی قوڕئان و سوننەت)، (مەبەستی ئەو زانیارییانەیە کە لە ڕێی کەشفەوە بەرهەمی هێناون)، هەڵەو دوورکەوتنەوە لە ڕاستییان تێدایە.

هەروەها لە جێیەکی دیکەدا لە بارەیەوە دەڵێ: (إِنَّ أَكْثَرَ مَعَارِفِهِ الكَشْفِيَّة الَّتِي خَالَفَت عُلُومَ أَهْلُ السّنّة بعِيدَة عَنِ الصَّوَاب)[٣]، واتە: زۆربەی زانستە کەشفییەکانی، کە پێچەوانەی زانیارییەکانی ئەهلی سوننەتن، لە ڕاستییەوە دوورن.

هەروەها هەر لە سەرچاوەی ئاماژە پێکراودا، دەڵێ:

(مَهْمَا اقْتَرَبَ العَقْلُ وَاتَّصَلَ باللهِ تَعَالى، إلاَّ أَنَّ عَلاَقَتَهُ بهَذَا الجِسْمِ المَادّية، لاَ تَزُولُ بَتَاتَاً وَلاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَتَجَرَّدَ عَنْهُ تَمَامَاً، فَلاَ بُدَّ مِنْ حُدُوثِ الأَوْهَامِ وَالشُّبُهَاتِ بِصِفَةِ دَائِمَة، وَلاَ تُفَارِقُهُ القُوَّة المتخَيِّلة وَالشَّهْوَانِيَّة والغَضَبيَّة بأَي حَالٍ، وَكَذَلِك رَذَائِل الطَّمَعِ وَالشَّره، تَرَافِقُهُ بِصِفَةٍ مُسْتَمِرّة، أَضِف إِلى ذَلِكَ صِفَات السَّهْوِ وَالنِّسْيَانِ وَالخَطَأ...)[٤].

---

(١) مجموع الرسائل، ج١، رقم: ٢٦٦.

(٢) نێوان کەوانەکان قسەی خۆمە.

(٣) هەمان سەرچاوە.

(٤) هەمان سەرچاوە.

www.alibapir.com





واتە: هەر چەندە عەقڵ زۆر لە خوا نزیك بێتەوە و، پەیوەست بێ بە خوای بەرزەوە، بەڵام پەیوەندیی بەم جەستە ماددییەوە هەر دەمێنێ و لاناچێت و، ناتوانێ خۆی لەو پەیوەندییە لەگەڵ ئەو جەستە ماددییە، دابڕنێ، بۆیە وەهم هەر ڕووی تێ دەكات و، گومان ڕووی تێ دەكەن بە بەردەوامیی و، هێزی خەیاڵ و ئەندێشەی هەر لەگەڵدا دەبێ، هەروەها هێزی ئارەزوو و هێزی تووڕەبوون، (كە ئەوانە هەموویان دەبنە هۆی لێڵ كردنی چەشمەندازی ڕووح و سروشت)[1]، هەروەها سیفەتە نزمەكانی وەك: تەماع و، نەوسنیی و چاوبڕینە شت، ئەوانەی هەر لەگەڵ دا دەبن، وێڕای لێ تێك چوون و، لەبیر چوون و، بەهەڵەدا چوون.

كەواتە: مرۆڤ بە پشت بەستن بە خۆی و بە ناخی خۆی، موستەحیلە ئەو شتانەی بۆ دەركەون، كە لەڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن.

ئەوەتا (محي الدين بن عربي) كە بە حیساب ئامۆژگاریی (فخر الدين الرازي) كردوە، كەچی (فخر الدين الرازي) كەس نەیگوتوە: لە بازنەی ئیسلام چۆتە دەرێ، بەڵام (إبن عربي) بە هۆی ئەو جۆرە بیركردنەوە و قسانەوە، خۆی كردۆتەوە جێی گومان و تۆمەت، هەرچەندە (سيد أحمد السرهندي) دەڵێ: لە پەسندان(مقبولين)ە، لە لای خوا، بەڵام ئەویش دەڵێ: ئەو زانیارییانەی كە ئیدیعای كردوە، لە ڕێی كەشفەوە بۆی دەركەوتوون، هەڵەو پەڵەیان تێدان.

یەكێك لەو شتانەی كە (محي الدين ابن عربي) باسی كردوون، - وەك أبو حسن الندوي گوتوویەتی - باسی (عقول) و (أفلاك) و ئەوانەیە، چونكە كارتێكراو بووە بەو فیكرو كلتوورەی كە لە سەردەمی خۆیدا بووە، ئەگەرنا ئەوانە ئێستا دەركەوتوە كە ئەفسانەن، نە نۆ (٩) عەقڵ هەن و، نە دە (١٠) فەلەك هەن، بەڵكو ملیاران خڕۆكە هەن، ئەگەر مەبەست خڕۆكەكان بێ و، تریلیۆنان ئەستێرە هەن، ئەگەر مەبەست ئەستێرەكان بێ.

كەواتە: مرۆڤ هەر چۆن بێ، كارتێكراو دەبێ بە كلتوورو تەوژمە فكریی و سیاسییەكانی كە لە ڕۆژگاری خۆیدان و، بە تایبەت بۆ مامەڵە لەگەڵ خوای

---

(١) نێوان كەوانەكان قسەی خۆمە.

www.alibapir.com


بەرزدا، دەبێ بگەڕێتەوە بۆ وەحیی، زانیاریی بێ خلّتە، کە لە خواوە (سبحانه وتعالى) دێت لەبارەی خۆیەوەو جیهانی ئەودیوە سروشتەوە.

چونکە مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکەوە سنووردارە:

١- پێنج هەستەکانی مرۆڤ، کە پێشتریش باسمان کرد و دواتریش باسی دەکەین، سنووردارن:

**أ:** چاو تاکو ئەندازەیەك دەبینێ، لە شتی ورد و، لەوە وردتر نابینێ، هەروەها لە شتی درشت و، لە شتی دووریش تاکو مەودایەکی دیارییکراو دەبینێ.

**ب:** هەروەها گوێ لە بیست (٢٠) لەرینەوە، هێرتز (Hertz) تاکو بیست هەزار (٢٠٠٠٠) لەرینەوە (٢٠ - ٢٠٠٠٠) دەبیستێ.

**ج،د،هـ:** هەروەها سێ هەستەکەی دیکەش: تامکردن، بۆنکردن، هەستکردن (لمس)، بە هەمان شێوە.

٢- عەقڵی مرۆڤیش بە هەمان شێوە سنووردارە.

٣- ئنجا ڕووحەکەشی هەر سنووردارە، وەك جەستەکەی.

تەنیا خوا موتڵەق و بێ سنوورە، بە تایبەتی ڕووح هەتا لە جەستەدا بێ، کارتێکراو دەبێ بە داخوازییەکانی جەستە، بە غەریزەکانی جەستە، جەستەیەك کە لەم خاکە دروست بووە، بۆیە هەرگیز مرۆڤ ناتوانێ بە پشت بەستن تەنیا بە خۆی، ئنجا چ بە ڕووحی بێ، بە عەقڵی بێ، بەدڵی بێ، بە پێنج هەستەکانی بێ، ناتوانێ بگاتە ڕاستییە ڕەهاییەکان، بە تایبەت لە بارەی ناسینی خواوە، بۆیە پێویستە مرۆڤ، پشت بە وەحیی ببەستێ و، بزانێ خوای بەرزو مەزن، چۆن باسی خۆی دەکات و، چۆن خۆی بە ئێمەی ناساندوە؟

بەڵام ئێمە لێرەدا ڕایدەگەیەنین: کە وەحیی تەنیا ناسێنەری خوای بەرزو مەزن نیە و، تەنیا بۆ ناسینی خوا، یان بۆ ڕاست ناسینی خوا، پێویستییمان بە وەحیی نیە و، پەکمان لەسەر وەحیی نەکەوتوە، بەڵکو وێڕای ئەوە، وەحیی بەڵگەی ئیسپاتی بوونی خوای پەروەردگاریشە، با بزانین چۆن!

www.alibapir.com


# ڕۆڵی وەحیی و قورئان
# لە ناسینی خوای بەرز و مەزن و
# سەلماندنی بوونی دا

بەڕێـــــزان!

هەوڵدەدەین لە پێنج خاڵاندا، تیشك بخەینە سەر ڕۆڵی وەحیی خوای بەرجەستە لە قورئانی بە پیزدا، لە بواری ناسینی خوای بێ وێنە و هاوەڵ و، ئیسپاتی بوونیشی دا:

## یەکەم: خستنە ڕووی پێناسەی ڕاست و شایستەی خوا عزوجل:

ئێمە تەنیا لە سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی وەحییدا، پێناسەی ڕاستەقینەو شایستەی خوامان (سبحانە وتعالی) دەست دەکەوێ، چونکە - وەك لە ڕابردووشدا باسمان کرد - هۆیەکی سەرەکیی بەرەو ئیلحادو بێ دینایەتیی چوونی خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوا، بریتی بوو لە ئایینی شێوێنراوی نەصرانیی، هەر وەك لە باسی یەکەمی بەشی سێیەمیشدا بە وردیی باسی دەکەین و، تیشکێکی باشی دەخەینە سەر، چونکە هۆکارێکی سەرەکیی لادانی خەڵکی ڕۆژئاوا و، دوورکەوتنەوەیان لە خوا و، بێزرانی ئایین لەبەر چاویان، ئەوە بوو کە خوای پەروەردگاریان لەوەدا کە پێی دەگوترێ: کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس - Holy Book)، بە شێوەیەك پێ ناسێنراوە، کە بەهیچ شێوەیەك شایستەی خوا نیە، وەك دوایی باسی دەکەین و لە هەردووك: (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ)دا، چەندان بەڵگە لەو بارەوە دێنین.

www.alibapir.com



هەروەها کە کتێبی پیرۆز (Holy Book) باسی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)ی بە شێوەی زۆر ناشایست، کردوە و کۆمەڵێك تاوان و کاری قێزەونی پاڵداونە لا، بۆیە خەڵکی ئەورووپا کە ئاوای بینیوە، ئایینی لەبەر چاو بێزراوە و لە خوا دوورکەوتۆتەوە و، بە زمانی حاڵ گوتوویانە: بڕوامان بەو خوایە نیە، کە کتێبی پیرۆز پێمان دەناسێنێ!

بۆیە دواتر لە ئەورووپا ڕەوتێك سەری هەڵدا، بەناوی ئایینی دانراو (الدین الوضعي)، واتە: ئایینێك کە باسی کڵێساو ئەکلیرۆس و دروشمەکانی دینداریی، تێدا نەبێ، بەس بڕوای بەخوا بێ و تەواو، بەڵکو هەندێکیان گوتیان: ئێمە حەقی خواشمان نیە، بەڵام ئایین پێویستە بۆ ژیان، چونکە بەها بۆ مرۆڤ پەیدا دەکات، ڕەوشت بۆ مرۆڤ پەیدا دەکات، مانای حەڵاڵ و حەڕام و پابەندیی بە یاساوە، بۆ مرۆڤ پەیدا دەکات، بۆیە پێویستییمان بە ئایین هەیە، بەڵام هەقمان نیە بەسەر خواوە، هەقمان نیە بەسەر وەحییەوە، هەقمان نیە بەسەر ڕۆژی دواییەوە! لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە کتێبی پیرۆزی خۆیان سڵەمیبوونەوە، کە ئەو هەموو هەڵە و پەڵە و ئەفسانانەی تێدان، وەك دوایی باسیان دەکەین.

هەر بۆیە: ناسینی خوا عزوجل، وەك بۆ خۆی فەرموویەتی، هەنگاوی یەکەمی بەرەو خواناسیی چوونە، ئەوەش وەحیی ڕاست و دروست، دەستەبەری دەکات و، تاکە نوسخەی وەحیی دەستکاریی نەکراوو ڕاست و دروستیش لەبەر دەستمان دا هەبێ، لەبەر دەستی مرۆڤایەتیی دا هەبێ، بریتیە لە قورئان، پاشان سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم).

ئێستاش با سێ (٣) نموونە لە قورئان بێنینەوە، لە بارەی ناساندنی خوای بەرز و مەزن و تاك و پاك و بێ وێنەوە، کە بریتین لە:

١- سوورەتی: (الإخلاص).

٢- (آیة الكرسي) ئایەتی ژمارە (٢٥٥)ی (البقرة).

٣- ئایەتی ژمارە (٥٤)ی (الأعراف).

www.alibapir.com



یەکەم: سوورەتی: (الإخلاص):

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ﴿٣﴾ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴿٤﴾﴾.

واتە: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، بڵێ خوا تاکە، جێی نیازو بێ نیازە، کەسی لێ نەبووەو لە کەس نەبووە، هیچ کەسیش هاوتای وی نیە.

ئنجا دەپرسین:

ئەمە لە کوێ و، ئەوە لە کوێ کە لە پەیمانی کۆندا دەیخوێنیەوە، دەڵێ: خوا زۆرانی لەگەڵ یەعقووبدا، گرتوە و، یەعووبیشی پێ لە عەرزێ نەدراوە و دوایی گوتوویەتی: یەعقووب! بەرمبدە، با بچمەوە ئاسمانێ!!

هەروەها ئەو قسەیەی (پەیمانی کۆن) لە کوێ و، ئەمە لە کوێ، کە خوا دەفەرموێ:

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾ الشورى: ١١، واتە: هیچ شتێ وەك خوا نیە.

دووەم: ئایەتی (الكرسـي):

خوا لە (آية الكُرسي)دا، لە دە(١٠) بڕگەدا، خۆیمان پێ دەناسێنێ، ناساندنێك کە شایستەی خوای زانا و توانا خۆیەتی، چ لە ڕووی زاتیی و، چ لە ڕووی سیفەتەکانیەوە:

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾﴾ البقرة.

www.alibapir.com



(آية الكرسي) لە دە(١٠) ڕستە پێكهاتوە و، هەر كام لەو ڕستانە، وەسفێكی خوای پەروەردگار، یان پێناسەیەكی ویيان تێدایەو، بە هەموویان خوا وەسف و پێناسە دەكەن، بە شێوەیەك كە زۆر ڕوون بێ و، هیچ ئایەتێك نیە لە قوڕئاندا، بە قەدەر ئەم ئایەتە وەسف و پێناسەی خوای بەرزو مەزنی تێدابێ، بۆیەش گەورەترین ئایەتە، بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وەك لە (صحيح مسلم) و (مسند)ی (أحمد) و (مصنَّف)ی (ابن أبي شيبه)دا هاتوە[1].

ئەمەش شیكردنەوەیەكی كورتی ئەو دە (١٠) ڕستە و بڕگەیەی ئەو ئایەتە بە پێزە، كە هەموو ئەو شتانەی خوای بێ وێنە، لەم ئایەتەدا لە بارەی خۆیەوە باسیكردوون، تایبەتن بە خۆیەوە و، هیچ كەس و شتێكی دیكە پشك و بەشی تێیاندا نیە:

**ڕستەی یەكەم:** ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، خوا، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، ئەمە یەكەم پێناسەی خوایە (سبحانه وتعالى)، ( ٱللَّهُ ): ناوی تایبەتیی و ناسێنەر(عَلَم)ی خوایە، بۆیە دووان (تَثْنِية) ناكرێ و، كۆ (جمع)یش ناكرێتەوە، كەواتە: لە زمانی كوردییدا كە هەندێ لە نووسەران و هەندێ مەلایەكانیش دەڵێن: (خوایەكان) ئەوە هەڵەیە، چونكە (خوا) ئەگەر تەرجەمەی وشەی: ( ٱللَّهُ )بێ، كۆ ناكرێتەوە، بەڵام وشەی: (إلَه) دووان (تَثْنِية) دەكرێ و كۆ(جمع) یش دەكرێتەوە: (إله) (إلهان) (إلهين) (آلِهَه)، چونكە پەرستراو (إلَه) دەگونجێ زۆر جۆراو جۆربێ، بەڵام خوا ( ٱللَّهُ ) یەكێكە، ئەو زاتەی كەون كائیناتی دروستكردوە، یەكێكە، بۆیەش (دووان) ناكرێ و كۆش ناكرێتەوە، بەڵام ئەو شتانەی كە خەڵك دەیان پەرستن، دەگونجێ زۆر و جۆراو جۆربن، یەكێ هەواو ئارەزوو دەپەرستێ، یەكێ حیزبێك دەپەرستێ، یەكێ فیرعەون دەپەرستێ، یەكێ شەیتان دەپەرستێ، یەكێ دارو بەرد دەپەرستێ، یەكێ مانگ و خۆر دەپەرستێ.

---

(١) صحيح مسلم: ٥٢٩/١، (المصنف): ١٣٤٩.

www.alibapir.com



﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، واتە: پەرستراوی بە هەق (إله حق)، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق، زۆرن، بەڵام پەرستراوێك کە شایستەی پەرستن بێ، یەکە، ئەویش خوایە (سبحانه وتعالى).

ڕستەی دووەم: ﴿ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾، زیندووی مشوورگێڕە، بۆ خۆی خاوەنی ژیانە، ژیانێك کە سەرەتای نیە و کۆتاییشی نیە، بۆ غەیری خۆیشی، زۆر زۆر مشوورگێڕو سەرپەرشتیار و تەگبیرکارە.

چونکە (ٱلْقَيُّومُ ): (صيغة المبالغة)ی (قائم)ە، یانی: سەرپەرشتیار و مشوورخۆر.

ڕستەی سێیەم: ﴿ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ﴾، نەوەنەوز دەیگرێ، نەخەوی لێدەکەوێ.

ئنجا ئەگەر وا نەبێت، چۆن سەرپەرشتیاریی کەون و کائیناتی پێدەکرێ؟ بۆیەش فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: بە دڵنیایی حەوت چین (ئاسمان)یان لە سەرووتانەوە دروستکردوون و، لە دروستکراوی خۆمان بێ ئاگا نین.

ڕستەی چوارەم: ﴿ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هی ویە.

هیچ کەسێك نیە خاوەنی هیچ شتێك بێ، بەڵکو ئەو کەسە خۆیشی و ئەوەی هەشیەتی، موڵکی خوایە (سبحانه وتعالى).

ڕستەی پێنجەم: ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾، کێ هەیە تکا بکات لە لای خوا، مەگەر بە مۆڵەتی خوا.

نەك هەر هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نیە، هیچ کەس تەنانەت توانای تکاکردنیشی نیە لە لای خوا، جاری وایە کەسێك بۆ خۆی دەسەڵاتی نیە، بەڵام دەتوانێ تکا بکات لە لای دەسەڵاتدارێك، یان بۆ خۆی شتێکی نیە، بەڵام دەتوانێ داوا بکات لە کەسێك کە هەیەتی، بەڵام خوای باڵادەست دەفەرموێ:

www.alibapir.com





هیچ کەس توانای تکا کردن و داواکردنیشی لەلای خوا نیە، مەگەر خوای بەبەزەیی بۆ خۆی مۆڵەتی پێ بدا.

**ڕستەی شەشەم:** ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ﴾، هەرچی لە پێشیانەوەیەو، هەرچی لە دوایانەوەیە، هەمووی دەزانێ.

یانی: داهاتوو هەمووی دەزانێ تا کۆتایی، ڕابردووش هەمووی دەزانێ، ئنجا ئایا کێ هەیە هەموو ڕابردوو بزانێ و داهاتووش هەمووی بزانێ؟ دەگونجێ مرۆڤ شتێك لەڕابردوو بزانێ، بەڵام تێکەڵ بە نەزانییەکی زۆر، هەروەها دەگونجێ بۆ داهاتوو هەندێ پێشبینی بکات، بەڵام بە هەڵەی زۆرەوە، تەنیا خوای زاناو شارەزا، زانیاریی تەواوی هەیە بە ڕابردوو و داهاتوو.

**ڕستەی حەوتەم:** ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ﴾، (ئینسانەکان، یان دروستکراوەکان) هیچ شتێ لە زانیاریی خوا نازانن، مەگەر ئەوەی بۆ خۆی بیەوێ، ئەو هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام دروستکراوەکان هیچ شتێك لەو زانیارییەی خوای زانا و شارەزا پەی پێ نابەن، مەگەر ئەوەی بۆ خۆی ئیزنی لەسەربێ.

کەواتە: ئینسان هەرچی بیزانێ، هەر بە ئیزنی خوایە و، هەر لەو سنوورە دایە، کە خوا مۆڵەتی داوەو، خوای بەرزومەزن بە پێویستی زانیوە بیزانێ و، ژیانی پێ بەڕێوە بچێ.

**ڕستەی هەشتەم:** ﴿وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ﴾، کورسیی خوا ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە.

وشەی کورسیی لێرەدا بە مانای زانیاریی و، بە مانای دەستەڵات و، بە مانای حوکمڕانیی دێ[1]، هەندێکیش گوتوویانە: کورسیی جیسمێکەو دروستکراوێکی خوای بێ وێنەیە، وەك لە هەندێ فەرموودە و شوێنەواردا هاتوە، کە: ئاڵقەیەك کە لە بیابانێکدا فڕێ دەدرێ، لە چاو بیابانەکە چەندە،

---

(١) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص٤٤٦، المكتبة العصرية، ط ٢٠١٢م.

www.alibapir.com





ئاسمانەكان و زەوییش لە چاو كورسیی خوای بێ هاوتا، ئەوەندەن[١].

**ڕستەی نۆیەم:** ﴿ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَا ﴾، پارێزگاریی لێكردنی خوا (سبحانه وتعالى) بۆ ئاسمانەكان و زەوی، خوا ماندوو ناكات.

﴿ وَلَا يَـُٔودُهُۥ ﴾، واتە: (وَلاَ يُتْعِبُهُ) ماندووی ناكات، ئنجا ئایا بۆچی خوا ماندوو نابێ؟ چونكە توانای خوای تواناداری بێ سنوورە، كە تواناشی بێ سنوور بوو، مانای وایە ماندوو نابێ، كێ ماندوو دەبێ؟ ئەو كەسەی كە توانایەكەی سنووردارە.

**ڕستەی دەیەم:** ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، ئەو (خوا) هەتا بڵێی بەرزە، هەتا بڵێی مەزنە.

بەرزیی و مەزنییەك كە بۆ خوا شایستەن و، بە هەموو واتایەكانی بەرزیی و مەزنیی، كە بۆ خوا شایستەن، خوا بەرزو مەزنە.

**سێیەم: ئایەتی (٥٤)ی سووڕەتی: (الأعراف):**

خوا لە سووڕەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٥٤ ﴾.

واتە: بەدڵنیاییی پەروەردگارتان ئەو خوایەیە كە ئاسمانەكان و زەوی لە شەش ڕۆژان دا (بە شەش قۆناغ) هێناونە دی، دوایی چووە سەر بارەگا، بە شەوگار، ڕۆژگار دادەپۆشێ بە خێرایی شوێنی دەكەوێ، هەروەها: خۆر و مانگ و

---

(١) روي عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم): {ما السمواتُ السَّبع والأرضون السَّبْعَ في جنبِ الكرسي إلاَّ كحَلقةٍ مُلقاةٍ في أرض فلاةٍ، والكرسي عند العرش كذلك} أخرجه البيهقي في الأسماء والصفات، ٨٦٢، وأخرجه ابن حبان في صحيحه: ٣٦٢، والآجري في (الأربعين): ٤٤، وأبو الشيخ في (العظمة): ٢٥٩.

www.alibapir.com



ئەستێرەکانیش، بە فەرمانی وی ملکەچ و ڕامکراون، ئاگادار بن! بەدیهێنان و فەرمانکردن تەنیا هی وین، بەرز و بە پێزە خوای پەروەردگاری جیهانییان.

ئنجا ئەمە لە کوێ، ئەو ئاستە بەرزەی ناساندنی خوا (سبحانه وتعالى)، لەگەڵ ئەوەی کە لە پەیمانی کۆندا بە تایبەتیی و لە پەیمانی نوێشدا، تاکو ڕاددەیەك، هاتوە، هەروەها سەرجەم کتێبە فەلسەفیی و ئایینیەکانی دیکەی غەیری ئیسلام.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## دووەم: قورئان ڕێبازی دروستی خواناسیی و، ئیسپاتی بوونی خوا، دەخاتە ڕوو:

واتە: وێڕای ئەوەی کە بە هۆی وەحیی خواوە، کە لە قورئاندا بەرجەستەیە و لە دوای قورئان، لە ڕێبازی ڕاستی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، خوا وەك خۆی، دەناسین، دیسان قورئان، ڕێبازی دروستی سەلماندن و ئیسپاتی بوونی خواشمان، دەخاتە بەردەست.

بۆ وێنە:

١) لە سوورەتی (الطور)دا، خوا دەفەرمویٚ: ﴿أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾﴾.

واتە: ئایا بەبیٚ بەدیهێنەر دروست بوو ون؟ یان خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن، یاخود ئایا ئاسمانەکان زەوییان دروستکردوون، بەڵکو زانیارییەکی جێی دڵنیاییان نیە؟ (بە دوای گومان و شوبهە دەکەون).

واتە: تەنیا سیٚ ئەگەر هەن - وەك پێشتر باسمان کرد - بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی گەردوون و ئەو شتانەی دروست بوون:

١)- یان دەبیٚ بەبیٚ بەدیهێنەر هاتبنە دی، کە ئەوە مەحاڵە.

٢)- یان دەبیٚ خۆیان بەدیهێنەری خۆیان بن، ئەوەش مەحاڵە.

٣)- مایەوە ئەوە کە بەدیهێنەرێك وەدی هێنابن، کە بوونەکەی بەردەوامە و، بوونێکی زاتیی هەیە، کە خوای پەروەردگارە.

دووەم: هەروەها ئەو دوو ئایەتەی سوورەتی (طه): ﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾﴾.

www.alibapir.com



واتە: (فیرعەون) گوتی: ئایا پەروەردگاری ئێوە، کێیە ئەی مووسا؟ (تۆو هاڕوون پەروەردگارتان کێیە؟)، (مووسا) فەرمووی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوەو، دوایی ڕێنماییشی کردوە، واتە: سیستمی بۆ داناوە و فێری کردوە چۆن بەڕێوە بچێ!

هەڵبەتە نموونە زۆر زۆرن لە قورئاندا، کە خوا (سبحانه وتعالی) باشترین و ڕێك و پێکترین شێوازی ئیسپاتی بوونی خۆیمان فێر دەکات.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## سێیەم: قورئان بەڵگەی بوونی خوایە:

قورئان نەك بەڵگەكانی بوونی خوامان دەخاتە بەردەست، بەڵكو هەر خۆی پتەوترین بەڵگەی بوونی خوایە، چونكە لە قورئاندا خوا باسی خۆی دەكات و، داوا لە مرۆڤەكان دەكات، بیناسن و بیپەرستن و، ئەگەر لە گومان و دوودڵییشدان، با وێنەی ئەو قورئانەی خوا فەرموویەتی، قورئانێك بێنن، ئنجا ئەگەر نەیانتوانی، با دە (١٠) سوورەت بێنن، ئەگەر هەر نەیانتوانی، با سوورەتێك بێنن، سەرەتاش خوای زانا و توانا پێی فەرموون، كە ناتوانن، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرمویّ:

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: ئەی مرۆڤەكان! ئەگەر لە گوماندان، لەوەدا كە دامانبەزاندوە بۆ سەر بەندەكەی خۆمان (كە موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم))، ئەوە سوورەتێكی وەك ئەو بێنن، {سوورەتێك وەك سوورەتی (الكوثر) یان سوورەتی (العصر)، كە یەكی سیّ ئایەتن}، هەموو ئەوانەی شایەدییشتان بۆ دەدەن لەسەر ئەوە كە قورئان فەرمایشتی خوا نیە، بانگیان بكەن، هاوكاریی لە هەموویان وەربگرن، ئەگەر ڕاست دەكەن - كە قورئان فەرموودەی دابەزێنراوی خوا نیە - ئنجا ئەگەر نەتانتوانی، نەتانكرد و هەرگیزیش ناتوانن، - بە هۆی ئیمان هێنانەوە - خۆتان لە ئاگرێك بپارێزن كە سووتەمەنییەكەی مرۆڤ و بەردن، بۆ بێبڕوایان سازكراوە.

بەڕێـــزان!

مرۆڤ دەتوانیّ بە كەسێك بڵیّ: ئەگەر توانیت وا بكە، بەڵام پێش وەختەش پێی بڵیّ: هەرگیزیش ناتوانی! ئەوە بەس خوا دەتوانیّ شتی وا بفەرمویّ و،

www.alibapir.com







تەنیا خوا هێندە بێ باك و منەتە، هێندە لە خۆی ڕادەبینێ و هێندە پشت ئەستوورە، بە فەرمایشتەکەی خۆی، کە هیچ کەس ناتوانێ وەك وی بفەرموێ، نەك وەك هەموو قورئان، کە شەش هەزارو دوو سەدو سی و شەش (٦٢٣٦) ئایەتە، بەڵکو تەنانەت سوورەتێکی سێ ئایەتیی، وەك: سوورەتی (الکوثر)و سوورەتی (العصر)یش!!

کەواتە: خوا لە قورئان دا دەفەرموێ: ئەی مرۆڤەکان! ئەوە فەرمایشتی منە و خۆی بە ئێمە ناساندوە و، بانگمان دەکات: بەندایەتیی بۆ بکەین، ئنجا دەفەرموێ: ئەگەر بڕواش ناکەن ئەو فەرمایشتە هی من بێ، فەرموون مەیدان مشکان نەیانکێڵاوە، ئەوە عەرزو ئەوە گەز، قورئانێك نا، دە (١٠) سوورەت، دە (١٠) سوورەتیش نا، فەرموون سوورەتێکی سێ ئایەتیی بێنن، ئنجا ئەگەر نەتانتوانی، دەبێ بزانن کە ئەوە فەرمایشتی خوایە.

کەواتە: قورئان بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا (سبحانه وتعالی).

پاشان هەر کەس لە قورئان وردبێتەوە، دڵنیا دەبێ، کە بێجگە لە خوا (سبحانه وتعالی) نە هیچ کەس هەیە، بەو جۆرە بدوێ و، نە هیچ کەسیش ئەوەی لە توانادا هەیە، وەك لە: (الکتاب السادس)ی (موسوعة: الإسلام کما یتجلی في کتاب الله)دا، باسمان کردوە.

هەروەها لە: (الکتاب السابع)یشدا، کە باسی پێغەمبەری خاتەممان (صلی الله علیه وسلم) کردوە و، بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) (براهین نُبُّوة محمد)مان باسکردوون و، لە نێویاندا باسی قورئانمان کردوە و، ڕوونمان کردۆتەوە کە یەکێك لە ڕووەکانی موعجیزە بوونی قورئان، ئەوەیە کە لە قورئاندا خوا بە شێوەیەك دواوە و فەرمایشتی فەرمووە، هەرگیز مرۆڤ وا قسە ناکات و ئاوا نادوێت، بەشەر دیارە چۆن دەدوێ، خواش (سبحانه وتعالی) دیارە چۆن دەدوێ.

